

ڕێڕەوی تێکۆشان
بیرەوەریەکانی کەریم ئەحمەد
وەرگێڕانی : جلال دەباغ

# ڕێڕەوی تێکۆشان

## بیرەوەرییەکانی

## کەریم ئەحمەد

وەرگێڕانی: جەلال دەباغ

٢٠٠٧

- *ناوی کتێب:* **ڕێڕەوی تێکۆشان**
- *نووسینی:* **کەریم ئەحمەد**
- *وەرگێڕانی:* **جەلال دەباغ**
- *بابەت:* **بیرەوەری**
- *چاپ:* **چاپخانەی ڕەهەند-سلێمانی-شەقامی مەولەوی (٠٧٧٠١٥٠٨٢٥٣)**
- *دیزاینی ناوەوە:* **ئارام لوقمان**
- *تیراژ:* **(٢٠٠٠) دانە**
- *ژمارەی سپاردن:* **(٨٨٨) ساڵی ٢٠٠٦**

# وشەیەك بۆ ئاگاداریی خوێنەران

## کەریم ئەحمەد

**خوێنەرانی بەرێز !.**

کتێبی (المسيرة) بەعەرەبی چاپو بڵاوکرایەوەو هەمووی لەبازاڕدا فرۆشراو بەدەیان داواکاری لەخوێنەرانی عەرەبییەوە هات بۆ داوای کتێبەکە، من هەموو ژمارەکانیم بەحزبی شیوعی عێراقو حزبی شیوعی کوردستان پێشکەش کرد، ئەو داواکارییانەش بۆ هەردوو حزب نێردران کە سەرلەنوێ چاپو بڵاو بکرێتەوەو، هیوادارم ئەم داواکارییانە جێبەجێ بکرێن.

هەروا بەسەدان داواکاری لەخوێنەرانی زمانی کوردییەوە گەیشتن کە پێویستە ئەم کتێبە بەکوردیش چاپو بڵاوبکرێتەوە، لەبەر ئەوە پێشنیازم خستە بەردەم هاوڕێ جەلال دەباغ کە وەریگێڕێتە سەر زمانی کوردی، بۆ خزمەتی رۆشنبیرانو خوێنەرانی کورد، ئەویش بەسوپاسەوە بڕیاری لەسەردا کە بەزوویی بیکاتە کوردی، ئەوەتە چاپە کوردییەکەشی دەکەوێتە بەردەست جەماوەری گەلی کوردستان. تکام وایە بەشێك بێت لەئەزموونی سیاسیی درێژخایەنو پڕ لەقوربانیدانی گەلی کوردستانمان.

هاوڕێ جەلال هەندێ باری سەرنجی نووسیوە لەبواری بەشداریی خۆیدا، یان وەکوتر بڵێین سەرکردایەتی کردنی ئەو کۆمیتە حزبییەی پرۆسەی گەیاندنی یارمەتییەکانی بەهێزەکانی پێشمەرگە شیوعییەکان رێکخست کە بەشدار بوون لە شۆرشی رزگاریخوازیی کوردستاندا، وەك ناردنی چەكو گەیاندنی هاوڕێیانی پێشمەرگەی شیوعی کە مەشقیان کردبوو، دەچوونە پاڵ شۆڕشو، هەروا گەیاندنی پێداویستییەکانی تری (پ.م) لەوەشدا کە هاوڕێ جەلال دەباغ نووسیویەتی لەسەر هەقە.

چاوەڕوان بووم سەرنجو تێبینی تر لەوهاوڕێیانەوە بێت کە کتێبی (المسیرە)یان خوێندۆتەوە، بەڵام هیچ سەرنجوتێبینییەکیان بە نووسراوی نەنارد، جگە لەهەندێ تێبینی بە گوتار کە ئەوانیش تێبینی پۆزەتیڤ بوون.

تکـام وایــە کتێبەکــە بــۆ خوێنــەرانی کــوردی بەتایبــەتی بــۆ شــیوعییەکانو دۆستەکانی حزب بەسود بێت، چونکە گەلێك بڕگەی گرنگی لەژیانی ناوخۆیی حزب گرتۆتەخۆ.

سوپاس بۆ هاوڕێ جەلال دەباغ کە کتێبەکەی کردە کوردی.

# پێشەکی چاپی کوردی

## جەلال دەباغ

**خوێنەرانی بەرێز !..**

ئەم بیرەوەرییانەی هاوڕێ کەریم کەبەناونیشانی (المسیرة–ڕێڕەو) چاپی یەکەمی بەعەرەبی بە(٢٠٠٠) دانە لەهەولێر لە کۆتایی ٢٠٠٦دا چاپکراوە، دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو لەلای هاوڕێیان و خوێنەرانی عەرەبی بەگشتی..

پێموایە لەریزی پێشەوەی ئەو هاوڕێیانەی ئێمەیە وابە مەوزوعی و راستگۆیانە بنووسێت و هەموو کەم و کورتییەکان نەخەنە ئەستۆی حزب و کەسانی ترو لە هەموو شتێکدا هەر خۆیان بەراست بزانن .

لەراستیدا ئەم دانراوەی (المسیرە–ڕێڕەو) کە بەکوردییەکەی بە(ڕێڕەوی تێکۆشان) ناومان لێناو لەسەر داوای خۆی کردمانە کوردی، وێڕای هەموو لایەنە گەشەدارەکانی، بەهیچ جۆرێك شەست ساڵەی تێکۆشان و زیاتری هاوڕێ کەریم بەچاکی دەرناخات و بەڵکو دڵۆپێکە لەدەریای تێکۆشان و قوربانیدانی هاوڕێی سەرکردە کەریم ئەحمەدو حزب و هاوڕێیانی.

لە خوێندنەوەی ئەم بیرەوەرییانەوە بەئاشکرا دەردەکەوێت کە هاوڕێ کەریم بەوردی نەگەڕاوەتەوە بۆ بەڵگەنامەکان و لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان و بۆ هاوڕێیانی دێرینی خۆی تا زۆر شتی وەبیر بهێننەوەو باشتر بکەوێتە بەردیدی خوێنەران.

راستە وەك دەیان و سەدان هاوڕێی تر بەهۆی خەباتی نهێنی و سەختیو گرانیی ڕۆژانی بەندیخانەو خۆشاردنەوەو جۆرەها کۆسپ و تەگەرەو ترس و دڵەڕاوکێی ئاشکرابوونی نووسینەکانەوە لەبەردەم دوژمنو داموودەزگاکانیدا نەیتوانیوە ڕۆژانەی بیرەوەرییەکانی و دۆکومێنتەکان ئاشکرا بکات و لەنووسیندا پەنای بردۆتە بەر یادوبیرەوەریی خۆیو هەندێ سەرچاوەو زۆرباشە کە دەستی

نووسینی لەم بیرەوەرییانەدا گەیاندۆتە قەڵەم.

بۆیە لەکاتێکدا بەگشتی ئەم دانراوەی بیرەوەرییەکانی بەچاکیو دەستخۆشی لێکردن هەڵدەسەنگێنم و، لەو باوەڕەدام کەئەگەر (بەکاوخۆ) بکەوێتە نووسینەوەیەکی دیکەی بیرەوەرییەکانی لە گشت بوارەکانی تێکۆشانی حزبی و خەباتی دڵسۆزانەی لەناو بزافی رزگاریخوازیی نیشتمانی گەلی عێراق و کوردستانماندا، بەچەندان بەرگی وەك ئەمە تەواو نابێ.

من ناڵێم ئەم بیرەوەرییانە بێ کەموکورتین، لەو گۆشەنیگایەوەو بەبڕیاری هاوڕێم چەند پەراوێزێکم بۆ وەرگێڕانە کوردییەکە نووسیوە، بەڵام ئەمانە لەنرخی گەورەی بیرەوەرییەکانی کەم ناکەنەوەو هیوادارم بەسەرنجو تێبینییەکانی هاوڕێیانی تریش دەوڵەمەندبێ و باشترو وردتر بکەونە بەر دیدی خوێنەران.

خوێنەرانی بەرێز !...

من لێرەدا بەچاکی دەزانم پێشنیازی خۆم بخەمە بەردەست هاوڕێی نووسەرو خوێنەران کە وای بەباش دەزانم هاوڕێ کەریم هەموو وتارو نووسین و دیدارەکانی لەچەند بەرگێکدا بە کوردیو عەرەبی بەچاپ بگەیەنێت و، لەکاتێکدا ئەگەر خۆیشی ئەم کارە نەکات دڵنیام لە دوارۆژدا شیوعییەکانی کوردستان و عێراق هەر ئەنجامی دەدەن، بەڵام بەلامەوە باشترە لەژیانی خۆیدا رۆشنایی ببینن.

وێرای ئەوەش پێشنیاز دەکەم کە بەرەبەرە لەسەر بیرەوەرییەکانی خۆی شتی تر بنووسێت و ئەوەی لێرەدا تۆمار نەکراوە تۆماری بکات و لەکۆتاییدا چەند وێنەی مێژوویی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی و شوێنی ژیانیو هاوڕێیانی کە لەبەردەستدا بن بڵاو بکاتەوە تا لەفەوتان رزگاریان بێت.

داخەکەم حزبی ئێمە تائێستا بەهۆی کاری نهێنی و ساڵانی سەختی تێکۆشانەوە ئەرشیفێکی یەکگرتووی وای نەبووە کە تێکۆشەرێکی وەك هاوڕێ کەریم تێیدا بتوانێ تەواوی بەڵگەنامەکان ببینێتەوەو لە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانیدا کەڵکی لێوەربگرێت. ئەرشیفەکەمان، لەم وڵات و لەو وڵاتو لەم ژێرخان و لەو ژێر زەمیندا بڵاوەو، تائەمڕۆ نەتوانراوە بایەخی پێویستی پێبدرێت و یەکخرێت.

لەکۆتایی ئەم چەند دێڕەمدا هیوادارم هاوڕێ کەریم ئەحمەد تەمەنی درێژو تەندروست و پارێزراو بێت، تا بتوانێ خزمەتی زیاتر، تا دوا هەناسەی بەگەلو نیشتمانەکەی بکات. لەو بڕوایەشدام حزبو گەلەکەمان ڕەنج و تێکۆشان و ماندو بوون و قوربانییەکانی ڕۆڵە دڵسۆزەکانی لەبیر ناکات...

**ڕێڕەوی تێکۆشان**
**ئەگەر پێشکەش کردن پێویست بێت:**

**پێشکەشە بەئێوە ئەی یەکەمین مامۆستایانی هەردوو قوتابخانـەی حـزب و بزاڤـی کوردستان، ئەی ئەوانەی کەمتەرخەم نەبوون لە پێـشکەشکردنی هەرشـتێک لـەپێناو ڕزگارکردنی گەلەکەمان و بەختیاریدا، بەهەر پیاو وژنێـک کەراسـتیە سـادەکانیان بەچرپە، بەوشە یان بەبلاوکراوە گەیاندە خەڵک...**

**پێشکەشە بەهەر هاوڕێیەکی نەناسراو کەبوبێ ماڵئاوایی سەری نایەوە..**

**کەریم ئەحمەد**

# پێشەکی

-١-

چەند ساڵێکە زۆر لەهاوڕێیان و کەسانی تر داوام لێدەکەن یاداشتەکانم لەبارەی حزبەوە بنووسمەوە، یان لەماوەی تاقیکردنەوەمدا لەحزبی شیوعی عێراقدا. منیش خۆم لەداواکانیان دەدزیەوە، چونکە پێش ئەوە بڕم لە نووسینی ئەم یاداشتانە نەکردبۆوە، لەبەر ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بەو بەرپرسە گەورەیەوە هەیە لەبەرانبەر هەر وشەیەکدا کە دەیڵێم و هەر ڕووداوێك کەبەراستی باسی دەکەم، بەتایبەتی کەبەشێوەی پێویست بەڵگەنامەی حزبیم لەبەردەستدا نین‌و ئەمەش بەزۆری لەبەر هۆکاری بابەتییە نەك خودی، واتە دەبێ تارادەیەکی زۆر لەنووسیندا پشت بەبیرهاتنەوە ببەستم، وێڕای ئەوەش دواجار بەدەنگ داواکەی هاوڕێیانەوە هاتم، بەڵکو سودێك بەوان و بەتێکۆشەرە نیشتمانپەروەرە پێشکەوتنخوازەکانیتر بگەیەنم، بەوەی کە وێنەی بەشدارییەکەم لەتاقیکردنەوەی بزاڤی نیشتمانی عێراق وبزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستاندا بکێشم.

هەرچۆنێك بێت بڕیارمداوە پشت بەتوانای سنووردارم ئەم ئەرکە گەورەیە بەجێ بگەیەنم، داوای لێبووردنیش دەکەم ئەگەر هەموو شتێك بەوردی‌و درێژی باس نەکەم، بەتایبەتی سەبارەت بەهەڵوێستی فیکری‌و سیاسی هاوڕێیانم،لەپێگە جۆربەجۆرەکانداو لەهەڵسوکەوتی خۆیاندا. چونکە هیچ سودێکی خەباتی مێژوویی لە باسکردنیاندا نابینم، چ جای ئەوەی ئەم شێوازە بارێکی سەرنجی خۆیی دەداتە کارێك دژی کاری بەکۆمەڵ و بەرپرسیی بەکۆمەڵ لەخەباتی حزب و پەیوەندیی نێوان دەستە حزبییەکاندا هەر لەبەر ئەوەش بوو خۆم بەدوورگرت لە ڕۆیشتن بەم ڕێگە سەخت و نامەبدەئییەدا.

-٢-

ژمارەیـەك لـەو یاداشـتانەم خوێنـدەوە کـە هەنـدێ لـەهاوڕێیان نووسـیویانە سەرنجمدا هەندێکیان بەچەشنێکی شـێوێندراو وێنـەی ژیـانی حزبییـان پێشکەش کردووە ، وەك ئەو ژیانە تەنیا چەند ناکۆکیو کێشەیەکی حزبیـی خۆبـەخۆ بێـت، ئـــەو هاوڕێیانـــە خۆیـــان لـــە دیـــاریکردن و بڕیـــاردانی سیاســـەتی حـــزب دزیوەتەوە،بەتایبـەتی لـەو کاتـە جۆربەجۆرانـەدا کـە خۆیـان لەپلـەو پایـەی بڕیارداندابوون و لەبەرپرسێتی (هەڵەکان) خۆیان دەربـاز کـردووە کـەخۆیان وایـان بینیوون یان ڕەنگە ڕۆژێك لەرۆژان هەندێ سەرنجیان دەربڕی بێـت و یـاخود مـافی خۆیان پەیڕەو کردبێ بـۆ ڕەخنـەگرتن لەهەنـدێ هەڵوێـست و بڕیارەکـانی دەسـتە سەرکردەکانی حزب، هەروەك گوایە بەدرێژایی ژیانی حزبایـەتییان بەرهەڵـستکاری سیاسەت و ڕێبازی حزب بووبن.

بـەمجۆرە مـن لـەو بـاوەڕەدام ئەوانـە سیاسـەت و هەڵوێـستی حـزبو ژیـانی ناوخۆییـان لەحزبـدا شـێواندووەو دەشمویـست بەدرێـژی وەڵامـی هەنـدێ لـەو یاداشـتانە بدەمـەوە بـەڵام ئەمـە کۆشـشێکی گـەورەی دەوێ بـۆ گـەڕان بـەدوای بەڵگەنامەو کۆنووسەکانی کۆمیتـەی ناوەنـدی و بڕیارەکـانی کـۆنفرانس و کـۆنگرە حزبییەکانداو هەروا پێویستی بەدیدارە لەگەڵ ژمارەیەك لە سـەرکردە دێرینـەکانی حزبدا و پتر لەوەش پێویستی بەنووسینێکی زۆرو بارودۆخ و میزاجێکی گونجاو بـۆ نووسین هەیە.

کەواتە تائێستاکە بەڕای خـۆم مـەرج و هەلومەرجـەکانی وەڵامدانـەوەی هەنـدێ لەو یاداشتانە لەئارادا نییە بەلای کەمـەوە، بـۆ کەسـێکی وەك مـن، ناشـزانم ئـاخۆ یەکێك لەڕابەرانی حزب یان دەستەیەکی حزبی ئەم ئەرکە لەئەستۆ دەگرن؟

-٣-

هەنـدێ جـار هەنـدێ لـەهاوڕێیان "ئازایانـە" شـان دەدەنـە بـەر ئـەركی هەڵسەنگاندنی سیاسەتی حزب و ڕەخنەگرتنی توندو لـە تێهەڵچونێكی خۆییـەوە، ڕەخنە لەسـەركردایەتییەكانی حـزب لـەكاتی جۆربـەجۆری مێـژووی تێكۆشـانیاندا دەگرن، بـێ ئـەوەی بگەڕێنـەوە بـۆ بەڵگەنامـەكانی حـزب و بڕیارەكـانی دەسـتە جۆربـەجۆرەكانی سـەركردایەتی كەبەرۆشـنی و ئازایانـە هەڵسەنگاندنی حـزب بـۆ سیاسەتەكەی لەزۆر ماوەی جیاوازی مێژوویی كارو چـالاكییەكانیدا دەخەنـە ڕوو. ئەم میكانیزمە لەژیانی حزبدا هەر هەبووە چونكە لەهەر قۆناغێكدا حزب پێویستی بەهەڵوێـستەكردن بـووە بـۆ پێداچـونەوەی هەڵوێـست و تەكتیكـەكانی و ئاسـتی گونجانـدنیان لەگـەڵ ئەركـە نیـشتمانی و دیمـوكراتی و كۆمەڵایەتییەكانـدا كەلەبەرنامەكەیدا هاتوون، هەروا لەگەڵ بڕیارەكانی كۆنگرەكانیدا.

چاودێرانی چالاكی و كاروباری حـزب زۆر چـاك ئاگـاداری هەڵوێـستەكانی حـزبن لەئاست هەڵەكانی، ئەمەش بەرێگەی ڕاپۆرتەكانی كۆمیتەی ناوەندیو كۆنفرانس و كۆنگرەكـانی، چـونكە زۆربـاش دەزانـن كـە ڕاگەیانـدنی هەڵـەو ڕێوشـوێنی چارەسـەركردنیانو، ڕەخنـەو ڕەخنـە لـەخۆگرتن، حـزب دەخاتـە بـەردەم ئـەركی چارەسەركردنی هەڵەو ئەركی خۆ نوێكردنەوە بەپێی هەلومەرجی نوێ كـە هـەموو جـارێكیش ئـەركی نـوێ دێنێتـە پـێش حـزب. لەوانەشـە هەنـدێ لـەهاوڕێیان بـۆ چارەسـەركردنی هەڵـەكان و نوێكردنـەوە بیرۆكـەی گـۆڕینی هەنـدێك یـان هـەموو هاوڕێیانی سەركردایەتی حزب لە گۆشەی خۆییەوە بێننە پێشەوە، ئەمە لەكاتێكدا حزب ڕووبەڕووی ئەركی ئـاڵوگۆڕی سیاسـەتەكەی و هەڵوێستەكانی و گرتنەبـەری ڕێبـازێكی نـوێ لەسیاسـەت و بیروبـاوەڕو ڕێكخـستندا دەبێتـەوە، كەلەگـەڵ پێداویستییەكانی هەلومەرجی نوێدا بگونجێت.

خاسیەتی ڕاستەقینەی تێكۆشەری شیوعی ئەوەیە بەچاكیو بـەردەوام لـەواقیع و ئاڵوگۆڕەكـانی بكۆڵێتـەوەو، بـەوردی بەسـەریاندا بـچێتەوە بەمەبەسـتی پوختەكردنی ئەو ئەركە تازانەی ژیان دەیانكاتـە پێویـست و ئـەم لێكۆڵینەوانـەش

دەکرێنە بڕیاری دەستە سەرکردەییەکانی حزب و دەبنە سیاسەتی حزب، هەروا تێکۆشەری شیوعی بەردەوام خۆی نوێ دەکاتەوە، چونکە ئەگەر وانەکات دەبێتە بەستەڵۆك و زیان بەحزب دەگەیەنێت لەبەر ئەوەی لەراستیدا شتی نوێ نابینێت و ئەوجا بەستەڵۆکەکان خۆیان دەبنە بابەتی ئاڵوگۆڕ.

-٤-

لەماوەکانی رابردوودا کۆمیتەی ناوەندی و هەندێ جاریش لە کۆنگرەکانی حزبدا بڕیاری پێکهێنانی کۆمیتەیەکی تایبەتی دەدرا بۆ نووسینەوەی مێژووی حزب، بەڵام ئەم بڕیاردانە لەبەر زۆر هۆکار جێبەجێ نەدەکران و لەپێش هەموو شتێکدا بەهۆی نەبوونی بەڵگەنامەکانی حزبەوە، لەپێش و لەکات و لەدوای دامەزراندنیداو، هەروا نەبوونی ئەرشیف بۆ پاراستنی ئەم بەڵگەنامانە. وەك بەڵگەنامەی گشتیی ئاشکراو بڵاوکراوەی تایبەتی نهێنیو نامەو کۆنووسی کۆبوونەوەکانی دەستەکانی سەرکردایەتیی بڕیاردەر، چونکە حزبی ئێمە لەبارودۆخێکدا نەبوو بتوانێ ئەرشیفێکی وای هەبێت لەبەر ئەوەی بەنهێنی کاری دەکردو زۆرجاریش بەپێی توانا هەوڵی پاراستنی ئەمجۆرە بەڵگەنامانەمان دەدا بەڵام بەدەگمەن دەمانتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ پارێزگارییان بکەین نەوەك بکەونە دەست دامودەزگاکانی ئاسایش لەو کاتانەدا کەبۆ گەڕان بەدوای هاوڕێیان و بەڵگەنامەکاندا پەلاماری ماڵانیان دەدا.

گوتم هەوڵدانی نووسینەوەی مێژووی حزب بەرێگەی پێکهێنانی دەستەیەك کە ئەم ئەرکە جێبەجێ بکەن تووشی ژێرکەوتن هات، هاوڕێی کۆچکردو زەکی خەیری (ئەبویەحیا) هەوڵیدا ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات، بێ ئەوەی پشت بەبەڵگەنامەکانی حزب ببەستێ و دیدار لەگەڵ هاوڕێیانی دێرینی سەرکردایەتی حزب سازبکات، بەڵکو بەپێی بیرەوەرییەکانی خۆی و خەباتی سیاسی درێژخایەنی لەکاتێکدا لەسەرەتای دامەزراندنی حزبدا بۆ کاتێکی کورت نەبێ لەریزەکانی حزب نەمابوەوەو تاقمەکەی خۆی (گروپەکەی) کە مارکسی بوو هەڵنەدەوەشاندەوەو

هەرلەدەرەوەی حزب مایەوە تادیدارەکەی لەگەڵ هاورێی شەهید یوسف سەلمان یوسف (فەهد) لەناو بەندیخانەی کووتدا ساڵی ۱۹٤۷، ئیتر شتێکی نووسی بەناوی (مێژووی حزبی شیوعی عێراق.) بەهۆی دەرچوونی ئەم کتێبەو دابەشکردنییەوە، بەبێ ئاگاداریی حزب بڕیاری لێپرسینەوەی دراو لەسەر ئەم کارە تەنیاییەی ڕەخنەی لێگیراو هەروا پێویستیی کێشانەوەی کتێبەکەی لەبازارو گۆڕینی ناونیشانەکەی داواکراو، مەکتەبی سیاسی هاوڕێ عەزیز محەمەدو منی بۆ ئەم ئەرکە ڕاسپارد، ئەوە بوو ڕەخنەی لێگیراو خۆیشی دانی بەهەڵەکەیدا ناو ناونیشانی کتێبەکەی گۆڕیو بەکۆششێکی خۆی دانا کە بیروڕای حزب دەرنابڕێت، چونکە هەڵسەنگاندن و بیروڕاو گۆشەنیگای تایبەتیی خۆی لەبارەی دامەزراندنی حزب و سیاسەتو هەڵوێستەکانییەوە تێدا باسکردبوو، لەکاتێکدا مێژووی حزب دەبێ هەڵسەنگاندن و بیروڕای تایبەتی هیچ کەسێك نەگرێتەخۆی، بەڵکو پشت بەبەڵگەنامە فەرمییەکانی حزب ببەستێ و تەنانەت هەڵسەنگاندنەکانیش دەبێ بیروڕاو باری سەرنجی دەستە سەرکردایەتییەکانی شەرعیی حزب و بەتایبەتی کۆنگرەکانی حزب پیشان بدات. هەروا دەبێ ڕەشنووسی مێژووی حزب لەلایەن دەستەیەکی دەسەڵات پێدراوەوە بنووسرێو ڕەشنووسەکە بخرێتە پێش بەرزترین دەستەی حزبی بۆ بڕیاردانی کەئەویش کۆنگرەی حزبە.

لەم ساڵانەی دواییشدا سەرکردایەتی حزب هاوڕێ عەزیز سباهیی ڕاسپارد کە هەوڵی کۆکردنەوەی بەڵگەنامەکانی حزب بداتو زانیاری کۆبکاتەوە بۆ نووسینی پرۆژەی مێژووی حزب. ئەوە بوو هاوڕێ سباهی کۆششێکی زۆری کرد بۆ دەستخستنی هەندێ بەڵگەنامەو کۆکردنەوەی زانیاری لەهەندێ هاوڕێیانی سەرکردایەتیو دێرینی حزب، بەڵام ئەو هەموو زانیاریو بەڵگەنامانەی بەکارهێنا بۆ نووسینی کتێبێك بەناوی (دەیان ساڵ لەمێژووی حزبی شیوعی عێراق) بەناوی خۆیەوە وەك تۆژەرەوەیەك، ئیتر هەڵسەنگاندن و بەئەنجام گەیشتن و بیروڕای خۆی لەسەر سیاسەتی حزب و هەڵوێستەکانی لە گشت قۆناغەکانی خەباتداو، چوونە ناو گۆڕەپانی کێشەی سیاسیو چینایەتی (کۆمەڵایەتی) و نیشتمانی تێدا دەربڕیو، بەمەش کتێبەکە نرخی خۆی لەدەستدا وەك پرۆژەیەك بۆ گفتوگۆ

لەدەستە حزبییە باڵاکانی شەرعیی حزبداو بڕیاردانی تاسەرچاوەیەکی فەرمیی مێژووی حزب بێت.

جا وێڕای ناوەرۆکی هەردوو کتێبەکەی زەکی خەیریی کۆچکردو و هاوڕێ عەزیز سباهی و ئەو بیروڕاو بەئەنجام گەیشتن و هەڵسەنگاندنی کەسایەتییەکەیان هەردوکیان بەبەرهەمی گرنگ دادەنرێن لە کۆکردنەوەی زانیاریدا لەبارەی مێژووی حزبەوەو، بوونەتە دوو سەرچاوە بۆ توێژەرەوەکان، هەروا ئەو یاداشتانەی هەندێ لەهاوڕێیان لەبارەی حزبەوە نووسیویانن دەشێ لەبواری کۆکردنەوەی زانیاریدا لەبارەی حزبەوە سودیان لێوەربگیرێت.

-٥-

هەرلەو کاتەوە کەیەکەمین ئەڵقەی مارکسییەکان لەعێراقدا دامەزراون و حزبی شیوعی عێراق وەك پێداویستییەکی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی پێکهاتووەو هاتۆتە ناو گۆڕەپانی خەباتی سیاسی (نیشتمانی و چینایەتییەوە) تا ڕۆژی ئەمڕۆمان تەواوی مێژووی دەوڵەتی عێراق هاوپەیوەندبووە لەگەڵ چالاکیو خەباتی حزبی شیوعی عێراق لەدژی ئیستعماری بەریتانی لە عێراقدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ١٩٣٠ کە بەکۆتێك دادەنرا بۆ بەستنەوەی عێراق لە ڕووی سیاسیو ئابوورییەوە لەگەڵ ئیستعمارداو بەپێی ئەو پەیمانەش دوو بنکەی سوپایی لە شوعەیبەو حەبانییە دامەزرابوون بووبوونە هێزێکی سوپایی بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیا نەوتییەکانی بیانیو، هەروا هێزێکی پاراستنی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق و هێزێکی ڕیشەکێش کردنی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی گەلی عێراقو کوردستان.

جا هەرچەندە حزبی شیوعی لەسەربنچینەی ڕێکخراوێکی سیاسی چینایەتی چینی کرێکاری عێراق دامەزراوە خەباتیش دەکات لەپێناو سۆسیالیزم و هێنانەدی دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە ئاییندەی دووردا و ئەوکاتەی پێداویستییەکانی خەباتی ڕاستەوخۆ پەیدا دەبن، لەبەر ئەمە لەمەوبەرو ئێستاش بەرنامەکەی ئامانجە نیشتمانیو دیموکراتییەکان دەردەبڕێو بەرگری لەبەرژەوەندییەکانی کرێکاران و

جوتیارانو زەحمەتکێشانی شارەکان و رۆشنبیرانی پێشکەوتنخواز دەکاتو داوای چاکسازیی ئـابوریو کۆمەلأیـەتی دەکـات بـۆ بەرژەوەنـدی بنیاتنـانی ئابوریيـەکی نیشتمانی سەرمایەداری پێشکەوتنخواز و سەربەخۆ کەپشت بەکەرتەکانی گشتیو تێکـەلأو تایبـەتی دەبەسـتێو، رۆلأو شـوێنەواری هـەر کـەرتێك لەبەرهەمـدا دیاریـدەکات. هـەروا دیـاریکردنی پەیوەنـدیو هەلأسوران لەگـەلأ سیـستەمی سـەرمایەداریی جیهـانیو رێگـەدان بەبەرهـەمهێنانی سـەرمایەی بیـانی بـەپێی بەرژەوەندیی هاوبەش.

حزبی شیوعی عێراق هـەر لەسـەرەتای دامەزراندنیيـەوە مەسـەلەی نیـشتمانیو دیموکراسی خستۆتە پێش هـەموو مەسـەلەکانی تـرەوەو گشت رێکخـراوەو حزبـە نیـشتمانییە عێراقییـەکانی بـانگ کـردووە بـۆ هاوکـاری لەبەرەيـەکی نیـشتمانی یـەکگرتوودا، رادەیەکیـشی دانـا بـۆ خۆبەدەسـتەوەدانێك کـە بـۆ مەسـەلەی سەربەخۆییو سەروەریی نیـشتمانی زیانـدار بێـت. کۆششەکانی حزبـی شـیوعیو خەباتـەکانی گـەلی عێـراقیش سـەرکەوتنیان دەسخـست و، ژمارەيـەکی زۆر کـەم لەپیاوانی دەولأەتی عێراقی جارجارە حزبەکانیان لەدژی حزبە نیشتمانپەروەرەکان پێکدەهێناو، نۆکەرایـەتی ئیـستیعماریان دەکـردو بـەنۆرە دەسـەلأتی سیاسـییان دەگرتـە دەسـت لەکاتێکـدا حزبـە نیـشتمانپەروەرەکان دوور بـوون لـە خۆبەدەستەوەدان بۆ ئیستیعمار تا لەساڵی ۱۹٥۷دا بـەرەی نیـشتمانی هاتـەدی و لە ١٤ی تەمموزی ۱۹٥۸دا سەرکردایەتی پرۆسەی شۆڕشگێریی کـردو بۆیەکـەمجار سـەربەخۆیی نیـشتمانیی راسـتەقینە هاتـەدیو پـەیمانی۱۹۳۰و پـەیمانی بەغـدا هەلأوەشێندرانەوەو هەردوو بنکەی شـوعەیبەو حەبانییـە پاکتـاوکران ، چـاککردنی کشتوکالأ بۆ بەرژەوەندیی جوتیاران هاتەدی و ئازادییە دیموکراتییەکان ئەگەرچـی سنوردارو بـۆ ماوەيـەکی دیـاریکراویش بێـت دابینکـران و، سـاڵی۱۹٥۹ حکومـەتی عەبدولکەریم قاسم بەرەولای راست رووی وەرگێـڕاو بـووە یاریـدەدەری هێزەکـانی کۆنەپەرستیو نەتەوەپـەروەری شـۆڤێنی کـە شـوێنەواری خۆیـان بـەهێز بکـەن و کودەتایە رەشەکەی شوباتی ۱۹٦۳ئەنجام بدەن.

رووداوەکانو پەرەسەندنی باری سیاسی عێـراق هـەر لەسـەرەتای دامەزرانـدنی

حزبـی شـیوعی عێراقــەوە، چ بـەپۆزەتیف یـان نیگـەتیف سـەلماندویانە کـە بەربـەرەکانی شـیوعییەکان و چەوسـانەوەو کوشـتو بڕیـان لەبنەڕەتـدا هاوپەیوەنـدبوون لەگـەڵ نیـشتمانپەروەریی ڕاسـتو دروسـتی حزبـی شـیوعیو شیوعییەکان وخەباتی قوربانیدەرانـەیان بـۆ هێنانـەدی سـەربەخۆیی نیشتمانییو پێشکەوتنی عێراقو بەختیاریی گەلو، بەربەستی کردنـی ئیـستیعمارو دەسـەڵاتی ئیمپریالیزم و هێنانەدی ڕژێمێکی دیموکراسیو بڕیاردانی مافی چارەنووس بۆ گەلی کوردستانمانو چاری مەسەلەی کورد لە عێراقدا بەپێی ئەو مەبدەئـەو سـەرنجدانی پەرەسـەندنی بزاڤـی ڕزگـاریخوازیی کوردسـتان لەسـەر ڕۆشـنایی هەلومـەرجی دەوروپـشتی، لـەنێو هەرێمەکـەو نێودەوڵەتانـداو پەرەسـەندنی ڕژێمـی حـوکمی دیموکراسی لە عێراقدا کە گەلی کـورد لەسـایەیدا بتـوانێ مـافی خـۆی لەهێنانـەدی یەکێتی ئارەزوومەندانە لەگەڵ گەلی عەرەبی عێراقـدا پێکبهێنێـت واتـە پێکهێنـانی ڕژێمێکی دیموکراتی هەمەلایەنەی فیدراڵی یان کۆنفیدراڵی. هاوڕێی شەهید فەهدی دامەزرێنەری حزب لەکاتی دادگایی کردنەکەیدا لەساڵی ١٩٤٧دا ئەمـەی سـەلماند کە گوتی:

من نیشتمانپەروەر بـووم پـێش ئـەوەی شـیوعی بم. کـاتێکیش بوومـە شـیوعی هەستم بەبەرپرسییەکی گەورەترکرد لەئاست نیشتمانەکەمدا.

بیروباوەڕی نیشتمانپەروەریو ڕزگاریخوازی بەتەوژمێکی پەرەسەندو لەناومانـدا بڵاوبوو بۆوەو، خەباتی شیوعییەکان لەپێشەنگی بزووتنەوەی نیشتمانیدا بـوو بـێ ئەوەی لایەنێك پێشبڕکێی لەگەڵدا بکـاتو، ئێمـەی نـاو (حزبـی شـیوعی) هـەردەم ئامـادەی هـەموو شـتێك بـووین جگـە لـە سەرشـۆڕکردن بـۆ کۆنەپەرسـتیو ئیمپریـالیزم. گیـانی پێـشکەوتوانەی شـیوعییە پێـشەنگەکانی عێـراقو قوربانییەکانیان و خۆنەویستییان بـوو ئێمـەی زیـاتر سـوورکرد بـۆ چـوونە کـۆڕی شێوازەکانی خەباتـەوە، هەرئـەوەش بـوو بـۆ تاهەتایـە حزبـی شـیوعی بـەگیانی خۆبەختکاری و شەهیدبوونێکی ئەووتۆ ڕەنگ کرد کەلەگشت گۆشـەیەکی جیهـانی ئەمڕۆماندا نمونەی کەم بووە، تائێستاش وتەکانی فەهـدی دامەزرێنـەری حـزب لـە گوێی من و گشت شـیوعییە عێراقییـەکان و لـەپێش ئەوانیـشدا لـەگوێی دوژمنـانی

شیوعییەتدا دەزرنگێنەوە کە لەکاتێکدا بەرەو پەتی سێدارە هەنگاوی دەنا هاواری کرد: شیوعییەت لەمردن بەهێزترو لەسێدارە بڵندترە. بەڵێ حزبێکی نیشتمانی راستەقینەیەو بەرگریکارێکی پتەوە لەمافەکانی چینی کرێکارو جوتیاران و زەحمەتکێشان ورۆشنبیران و سەرمایەدارانی نیشتمانیی بەرهەمهێن، هەروا حزبێکی نێونەتەوەیی چەسپاوە. حزبێکە ڕەگی لەناو قوڵایی گەلی عێراقدا رۆچووە بەچینە کۆمەڵایەتییە پێشکەوتووەکانییەوەو بەگشت نەتەوەو ئایین‌و تایەفەکانییەوەو هەر لەبەرئەوەشە دوژمنەکانی نەخشی لەناوبردنیان بۆ داناوە هیچیان پێنەکراوەو، پاش هەرنەخشێکی ژێرکەوتوویان، حزب بەسەربەرزی ماوەتەوەو لەناو گشت کۆسپ‌و تەگەرەیەکدا بەهێزتر دەرچووەو، بەچەشنێکی بەهێزتر گەلی ڕەنجدەرو تێکۆشەرمان لەدەوری کۆبوەتەوە، چونکە دوارۆژی تێدا دیوەتەوە بۆ دامەزراندنی (نیشتمانێکی ئازادو گەلێکی بەختیار).

کەواتە ئەمەبوو ئەو حزبەی لافاوە مەزنەکەی منیشی راکێشا بۆ ئەوەی لە کۆڕی تێکۆشانیدا بەرەو سەرەوەو خوارەوە مەلەبکەم‌و هێشتا هەرمایەی شانازیمە کە پتر لەشەست ساڵە بوومەتە ئەندامی ئەم حزبە. ئەوە ئێستاش ئەم زانیارییانە لەبارەی ساڵانی ئەندامێتیمەوە پێشکەش دەکەم بەڵکو بەسودبن بۆ شیوعییەکان‌و نیشتمانپەروەرانی پێشکەوتنخواز لەعەرەب‌و کوردو نەتەوەکانی عێراق‌و، سیاسەتمەداران و توێژەرەوەکان لە مێژووی نیشتمانی‌و نێونەتەوەیی پتەوی ئەم حزبە.

جالەسەر بنچینەی ڕووداو و بەسەرهات‌و هەڵوێستەکان ئەم کتێبە دابەشکراوەو لەناو دەقەکەیدا چەند ناونیشانی دیکەی بۆدانراوەو هیچ ناڕێکییەکم لەم چەشنە ڕێکخستنەیدا نەبینیوەو، ڕەنگە خوێنەری بەڕێز لێرەو لەوێدا تێپەڕبوونێك سەرنج بدا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە ڕوداوو بەسەرهاتەکان هەندێجار لای من خراونە ریزی پێشەوە نەك ساڵان و مێژووەکان کەکاتی نووسین لەنێوانیاندا بازیان پێدراوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لەم تەمەنە گەورەیەمدا زۆر هەڵوێست‌و ڕووداوەکان‌و مێژووەکانیان بەوردی کارێکی گران بووە بۆمن، بەڵکو لەسەر هەر ڕووداوێکم نووسیوە کەلای من گرنگ بووبێ‌و خۆم راستەوخۆ بەشداریم تێدا

کردبن‌و لەهەڵوێست‌و بڕیاردانی تایبەتیدا لەو ڕووداوەدا بەشداریم کردبێ، ئەمەش مانای وانییە مێژووی ڕووداوەکانیان‌و زنجیرەی قۆناغەکانیانم پشتگوێ خستبێ.

خوێنەری بەرێز دەبینی من لەسەر چەندان ڕووداوی گەورەو گرنگ لەمێژوومانـدا شتێکم نەنووسیوە، هـۆی ئەمـەش ئەوەیـە لـەکاتی ڕوودانیانـدا لـەناو جەرگەیانـدا نەبووم‌و، کاتی ڕوودانیان ڕاستـەوخۆ بەشـداریی درێـژەی ڕووداوەکانیـان نـەبووم، لەبەر ئەمەبووە نەك هەنـدێ ڕووداوم پـشتگوێ خـستبێ‌و لەسـەر هەنـدێکیان پـێم داگرتبێ.

لـەم بارەیەشـەوە دەمـەوێ خوێنـەری بـەرێز سـەرنجی هەنـدێ سەرچـاوەی جۆربـەجۆر بـدات کـە مـن پـشتم پـێ بەسـتوون، ڕەنگـە کـەڵکیان هـەبێ بـۆ وردکردنـەوەی هەنـدێ مێـژو و سـاڵان‌و کەسـایەتییەکان‌و شـتی تـریش. ئـەم سەرچاوانەش لەکۆتایی کتێبەکەدا باسکراون‌و، ڕاستـەوخۆ بەدەگمـەن نـەبێ شـتم لێوەرنەگرتوون، بەڵکو لەهەندێ شتدا پشتم پێبەستوون.

دەشمەوێ داوای لێبوردن لەو هاوڕێیانەو دۆستانەم بکەم کەمۆڵـەتم نـەبووە لـەم کتێبەدا ناویان ببەم، چـونکە ئـەوەی نووسـیومە وەك باسیـشم کـردووە یاداشـت‌و بیرەوەریـی زۆر فـراوان‌و ورد نییـە کەدرێـژەی ڕووداوەکـانی ڕۆژانــەو بەسـەرهاتە شەخـسییەکانیان گرتبێتـەخۆ، بـەڵکو کتێبەکـە زیـاتر لەسـەر حزبـە نـەك لەسـەر کەسایەتی خۆم. باهەموو ئەوانەی کە باسـم نـەکردوون دڵنیـابن کەهەمیـشە لـەناو دڵمدان.

* * *

دواجار ئەم کتێبەی لەبەردەستاندایە، بەرهەمێکی سادەو ساکاریترە لـەڕێڕەوی حـزبیم، هەرچـەندە بـەدەیان وتـارم لەرۆژنامـەی نهێنـی‌و ئاشـکرای حزبـداو لەئەدەبیاتە ناوخۆییەکانیدا بڵاوکردۆتەوەو، بەهۆی هەلومەرجی قـورس‌و گرانـەوە کە هەموومان پێیدا تێپەڕ بووین بۆم نەکراوە کۆیان بکەمـەوەو، ئەگـەر هـەموویانم لەکتێبێکـدا کۆبکردایـەوە بەڵگەیـەکی گـرنگ دەبـوو بـۆ پـرۆژەی ئـەم کتێبـەم کەڕاستگۆیانە تکام وایە خشتێکیتر دابنێ لەبنیاتی حزبداو لەڕێڕەوی بزووتنـەوەی نیشتمانیی عێراقی و کوردستانیدا..

# سەرەتای ژیانم

لەناو خێزانێکی جوتیاریی هەژاردا کەبستە زەوییەکیان نەبوو، لە گوندی "کەسنەزان" کەیەکێکە لەگوندەکانی (دزەیی) لەدایك بووم. بەهۆی زۆرو جەوری دەرەبەگەکانەوە لەگوندێکەوە بۆ گوندێکی ترمان دەگواستەوە، چونکە وێڕای پێدانی بەشی دەرەبەگ لەبەرهەمی وەرزەکەدا، دەبوو جوتیاران بەزۆرەملێ ئەو کاروبارانەش ئەنجام بدەن کەدەرەبەگەکە پێی دەسپاردن.

باوکم توانای ئەنجامدانی بەزۆرەملێ کارکردنی نەبوو، لەگەڵ دەرەبەگەکە لەسەر ئەوە رێکدەکەوت کە ئەم چەشنەکارەی پێ نەکات. بەدەگمەن خاوەن موڵکی لەو جۆرەمان دەدیتەوەو، هەر لەبەر ئەوەش بوو بۆ ئەو گوندەمان دەگواستەوە کەئەم جۆرە بەخشینەمان تێیدا هەبوو، بەتایبەتی لەبەر ئەوەش کەباوکم ناوبانگێکی باشی هەبوو، چونکە پیاوێکی ئاینپەروەر بوو، خەلیفەی شێخی تەریقەت بوو، بەخەلیفە ئەحمەد ناوی دەبرا.

نامەوێ بەدرێژی باسی خێزانەکەمان بکەم مەگەر هەرهێندەی پێوەندی بەباری چینایەتی و کۆمەلآیەتییمەوە هەبێت.

ئێمە چواربرا بووین، منداڵبووین کەباوکمان کۆچی دوایی کردو گەورەکەمان لە هەشت ساڵان پتر نەبوو، ئەودەم من تەمەنم شەش ساڵان بوو دووبرایەکەی تریشم لە دووساڵ و چوارساڵیان تێپەڕ نەکردبوو. برا گەورەکەمان بەختیار بوو کەخرایە لای مەلا بۆ خوێندنی زانستە ئاینییەکان و ئیتر لە من بەولاوە کەسێکی تر لەخێزانەکەمان بۆکارکردن نەمایەوە. هێشتا زۆر منداڵ بووم بەرخۆلەکانم دەلەوەڕاندو پاشان بوومە شوانی مەڕ. هەموو دەوری دایکمان دەدا کە گشتمانی دەپاراستو، لەبەر سەرپەرشتی خاڵیشماندا بووین کەوێڕای ئەوە مێردی خوشکێکم بوو کە باوکم لەگەڵ دایکم (ژن بەژنی)پێکردبوو، کچی ژنێکی دیکەی بوو.

لێرەدا دەبێ ئەوەش باس بکەم کەباوکم سێ ژنی هێنابوو، یەکەمیان کەدایکی ئەو خوشکەم بوو لە باوکم‌و ژنی خاڵم بوو، کۆچی دوایی کردبوو، دووەمیان تەنیا کوڕێکی هەبوو ئیتر لێك جودا بووبوونەوە، دوازنیشی دایکی من بوو کە پێنج کوڕو کچێکی هەبوو، کوڕێك‌و کچەکەی کۆچی دوییان کردبوو، مابووینەوە چوار کوڕ.

پاشان دایکم کە ئێمەی کۆکردبۆوە کۆچی دوایی کردو هەروا داپیرەشم کەلەدوای مەرگی دایکم سەرپەرشتی دەکردین کۆچی دوایی کرد، ئەوجا هەموومان هاتینە هەولێر ئەوکاتە تەمەنم لە نۆسالان تێپەڕی نەکردبوو. هەرسێ براکەم گەڕانەوە لادێ و تەنیا خۆم لەهەولێر مامەوە.

# وەرچەرخانێکی گەورە لەژیانمدا

داپیرەم لەپێش مەرگیدا ناسیاویی لەگەڵ یەکێك لەخێزانە باش‌و ناسراوو بنەماڵەکانی هەولێردا پەیدا کردبوو کە(خێزانی چیچۆ) بوون‌و دوای گەڕانەوەی هەموویان بۆ لادێ منی لای ئەو خێزانە هێشتەوە ، ئەوانیش منیان ڕادەسپارد بەهێنانەوەی شت کڕینی بەیانیان وەك سەوزەو گۆشت‌و شتی وا لەبازاڕەوە بۆ ماڵەوە، سەرگەورەی خێزانەکە پیاوێکی بازرگانی پێستەو خوری بوو، منیش پێستەی مەڕو بزنم خوێدەکردن و لەبەر هەتاو هەڵم دەخستن‌و پاش وشکبوونەوەیان کرێکارانی گەورەو کەسانی تر دەهاتن بەش بەشی گەورە دەیانپێچانەوەو دەیانبەستن‌و لەلۆرییان باردەکردن‌و بۆ موسڵ‌و بەغدایان دەناردن، ئەمە وێڕای ناردنی گونییە مازو کەبۆ خۆشکردنی پێستە بەکاردێت.

کاتێك گەیشتمە تەمەنی دەساڵان‌و وەك منداڵانی تر زۆر حەزم بەخوێندن دەکردو بە بیرمداهات کەلەگەڵ خێزانەکەی خانەخوێمدا قسە بکەم بەڵام وامدەزانی کە داواکەم دەدەنە دواوە. دوای هەفتەیەك لە دوودڵی بێئارام بووم‌و لەکاتێکی باشدا کەخێزانەکە هەموو دڵیان خۆش بوو خەریکی ناردنی کوڕە گچکەکەیان بوون بۆ قوتابخانە کە تەمەنی گەیشتبووە ئاستی خوێندن، قسەم لەگەڵ خێزانەکە کردو حەزی خۆم بۆ دەربڕین ، ئەوانیش بڕیاریانداو پێم شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، بەڵام خۆ قوتابخانە داوای دەفتەری نفوسم لێدەکاو منداڵانی لادێش نییانە، لەراستیدا خەڵکی لادێ کاتی لەدایکبوونی منداڵەکانیان تۆماریان نەدەکردن، بۆیە داوایەکم بە دایەرەی نفوسی هەولێر پێشکەشکرد کە دەفتەری نفوسم بدەنێ، لیژنەیەکیان پێکهێنا بۆ دەستنیشانکردنی تەمەنم کە بەدوانزەساڵیان دانام‌و ئیتر هەرلەوکاتەوە مێژووی لەدایکبوونم بووە (١٩٢٢)، ئەوکاتەی کەلە پۆلی یەکەمی سەرەتایی وەرگیرام.

بەمجۆرە ژیانم گۆڕانی بەسەردا هات‌و بوومە قوتابی، قوتابییەکی زیرەك بووم‌و بڕیارمدا کە بەردەوام بخوێنم تاخوێندنی سەرەتایی تەواو دەکەم‌و لای خۆمەوە

بیرم دەکردەوە تۆ بڵێی ناسیاوەکانم بەبەردەوامبوونم لەسەر خوێندن تا دوا قۆناغەکان قایلبن. لەراستیدا چەند کۆسپێکیش هاتنە پێش خوێندنی سەرەتاییم و توانیم بەسەریاندا زاڵبمو بەهەزارحاڵ خوێندنی سەرەتاییم تەواوکرد.

داوای خوێندنم لەخانەی مامۆستایانی لادێ پێشکەش کردو وەرگیرام، بەمجۆرە لەژیانمدا سەربەخۆ بوومو، کەوتمە ژیانی بەکۆمەڵ لەگەڵ قوتابییە لاوەکاندا کەلەم خانەی مامۆستایانە دەژیانو ئامادە دەکران کە ببنە پەروەردەکاری رۆڵەکانی گەلە رنجدەرەکەمانو، ئەوانە خۆشیان سەر بەرۆڵەی ئەم چینە رەنجدەرەن کە نەیانتوانیوە بەهۆی باری گوزەرانیانەوە لەسەر تەواوکردنی خوێندن بەردەوام بنو، وێرای ئەوەش کەسوکاریان پارەیەکی کەمیان بۆ خەرجیی رۆژانەیان بۆ دەناردن کە بەزەحمەت بەشی دەکردن، بەلام کەسێکی وانەبوو کەبتوانێ ئەم برە پارە کەمە بۆ من بنێرێت لەبەر ئەوە بەرنامەیەکم بۆ خۆم دانابوو کەلەپشوی هاویندا کار بکەم تائەم پارە کەمە بۆ خەرجیی رۆژانەی کاتی خوێندنم لەخانەی مامۆستایاندا پاشەکەوت بکەم.

زۆریشم حەز لەیارییەکانی وەرزش بوو، هەموو یارییەکانم دەکرد، لەبەر ئەمە پاش دەرچوونم لەخانەی مامۆستایان، داوام کرد لەپەیمانگای وەرزش وەرگیرامو ساڵی ١٩٤٧دەرچوومو لەقوتابخانەی ناوەندی کۆیە بەمامۆستای وەرزش دانرام.

بەمجۆرە ساڵانی پڕ لەخۆشی تێپەڕ بوون و ژیانی گرانی خوێندنم کۆتایی هات و دەستم بەژیانێکی نوێ کرد کە بۆمن وێرای گرفتەکانی ژیانێکی بەختیار بوو.

بەتایبەتی چونکە خۆم دووساڵ پێش دەرچوونم ئەو ژیانەم هەڵبژاردو چوومە ناو حزبی شیوعی عێراقەوە، حزبی جەماوەری زەحمەتکێشی گەلەکەمان.

حزبیش وێرای گیروگرفتەکانی ناوخۆی، بایەخێکی تایبەتیدا بەخانەکانی مامۆستایان، بەتایبەتی خانەی مامۆستایانی لادێ، چونکە دەرچوانی هاوپەیوەند بوون لەگەڵ کۆڕو کۆمەڵەکانی رۆشنبیران و بزووتنەوەی قوتابیان و بزووتنەوەی جوتیاران.

رۆژانی خوێندن لەخانەی مامۆستایان، رۆژانێکی پڕتەو بوون نەك تەنیا بۆ من بەڵکو لەگشت مێژووی مرۆڤایەتیدا، بەم یان بەو شێوازە منیشی گرتەوە، بزانم

یان نەزانم ڕاپێچی ڕووداوەکان کرام، ئەوەش کاتێك بوو کە شەڕی دووەمی جیهان بەرپابوو، هۆی بەرپابوونی شەڕەکە تەنگو چەڵەمەی گشتیی ڕژێمی سەرمایەداریی جیهانی بوو، یان بە وشە یەکیتر یەکرێزی نێوان دەوڵەتانی سەرمایەداری بوو، وەك دەوڵەتانی هاوپەیمان ، ئینگلتەراو فەرەنساو ئەمریکا، لەلایەکەوە، کەدەسەلآتیان بەسەر بازارەکانی جیهانییداو بەسەر دەوڵەتە ژێردەستەکانیاندا لە ئەمریکای لاتینیو ئەفریکاو ئاسیادا گرتبوو، لەوبەریشەوە دەوڵەتانی تەوەر، ئەڵمانیاو ئیتالیاو ژاپۆن کە بازارەکانو دەوڵەتە ژێردەستەکانیان لەدەستدەچوو داوان دەکرد سەرلەنوێ بازارەکانو ناوچەکانی دەسەلآت دابەش بکرێنەوە. بەلآم دەوڵەتانی هاوپەیمان داخوازیی زۆری دەوڵەتانی تەوەرەکەیان بەجێ نەگەیاندو شەڕ لەنێوان هەردوو لایاندا قەوما تا ئەمە ڕێگەیەك بێت بۆچارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی ئابوری کەلەسەر حسابی گەلانی ولآتە ژێردەستەکان رژێمی سەرمایەداریی جیهانی داگرتبوو.

لەسەرەتادا لای قوتابیانی خانەی مامۆستایان ئامانجەکانی شەڕی دووەمی جیهان نەزانرابوون و قوتابییەکان بەم سێ ڕێبازەی خوارەوەدا گفتوگۆیان گەرم بوو:

١. هەندێك لایەنگیری دەوڵەتانی تەوەرەکەیان دەکرد، بەتایبەتی ئەڵمانیا، ئەمانە نەتەوە پەروەرانی عەرەب بوون، بیانووشیان رزگاربوون لە ئیستیعماری بەریتانی بوو، داوای لایەنگریی داگیرکاریی ئەڵمانیایان لە جیێ داگیرکاریی بەریتانیا دەکرد.

٢. هەندێکیتر لایەنگیری رزگاربوونیان لە ئیستیعماری بەریتانی دەکرد تا سەربەخۆیی نیشتمانی بهێنرێتەدی، ئەمانیش قوتابییە نیشتمانپەروەرەکان بوون.

٣. هەندێك لە قوتابیانی کورد کەلایەنگیری هاوپەیمانەکان و کۆششی شەڕەکەی بەریتانیا بوون، ئەمانیش نەتەوەپەروەرە کوردەکان بوون کە سەربەحزبی (هیوا) بوون بەو هیوایەی کەبەریتانیا بەڵێنی

هێنانەدی سەربەخۆیی کوردستانی پێدابوون.

٤. هەندێکی تریش بێلایەن وەستابوون‌و بەلایانەوە گرنگ نەبوو کێ شەڕەکە بەرێتەوە، بەو بیانووەی ئێمە دەوڵەتێکی لاوازین و ناتوانین لەگەڵ لایەنێکی شەڕکاران بین.

من لایەنگیری ئەوانە بووم کەداوای سەربەخۆیی نیشتمانیی‌و رزگاربوونیان لەئیستیعماری بەریتانیا دەکردو لایەنگیری ئەڵمانیاشیان نەدەکرد کە لەجێگەی بەریتانییەکان عێراق داگیر بکات. هۆشمەندی نیشتمانیم لەپێش ئەم کاتەوە لادروست بوو بوو، لەوکاتەوە کەلەپۆلی چوارەمی سەرەتایی بووم، لەخوێندنی زمانی عەرەبیدا زۆر لەپێش بووم، مامۆستای زمانی عەرەبی عەبدولاّ زەهاوی بوو کتێبێکی وێنەداری کلیلەو دمنەی پێشکەش کردم، هەمیشە بەتاسەوە ئەم کتێبەم دەخوێندەوەو، تەمەنیشم یارمەتیدەرم بوو بۆ تێگەیشتنی ناوەرۆکی کتێبەکەو بەستنەوەی نمونەکانی بە ڕووداوەکانی ناو کۆمەڵگەی عێراقی‌و ناو رژێمی حوکم بۆیە لەدژی زۆروجەورو زۆرداران و لەدژی حوکمی زۆرداران و داگیرکاریی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە ڕق‌و کینەم لاپەیدا بووبوو.

بەرەبەیانیی هەموو پێنج شەموانی هەفتەیەك و پێش چوونە ناو پۆلەکان قوتابیەکان لەگۆرەپانی قوتابخانەکە کۆدەکرانەوەو، یەکێك لەقوتابییەکان دەهاتە پێشەوە بۆ خوێندنەوەی وتاری پێنج شەممە، لەیادم ماوە جارێکیان مامۆستای چاودێر منی راسپارد کە وتاری پێنج شەمە پێشکەش بکەم بەلاّم پێش رۆژێك کەوتمە خۆئامادەکردن بۆئەم بۆنەیە. وتارێکم ئامادەکردو دامە مامۆستا شاکر شیشانی کە (پیاوباشێکی چەرکەسی بوو کەسیش بەتەواوی نەیدەزانی لەچ مێژوویەکدا خێزانە قەفقاسییەکەی بۆ بەغدا کۆچیان کردووە). وتارەکەم بەسەردێری (پشت بەخۆبەستن) بوو بەپێی توانای خۆم ناوەرۆکی ئەم ناونیشانە گەورەیەم دەبڕی بوو، باسی ناتەواوییەکانمان و پشت بەستنمان بەغەیری خۆمان کردبوو نووسیبووم ئێمە لەهەموو شتێکدا هەژارین‌و هەوڵیش نادەین بۆچاری گرفتەکانمان و باری لاوازیمان پشت بەخۆمان ببەستین.. تەماشای ئەو پەیکەرە

بکەن کەلەبەری کەرخ لەسەر سنگمان دامەزراوە (پەیکەری ژەنرالْ مۆد) کە نیشانەی داگیرکردنی زاڵمانەی ولاتەکەمانە لەلایەن بەریتانیاوەو هەوڵدەدەین بۆ چاری گیروگرفتەکانمان پشت بەبیانی ببەستین لەکاتێکدا ئەوان لەپێناوی بەرژەوەندیی خۆیاندا هاتوون نەك بۆ بەرژەوەندیی ئێمە. بۆ چاری گیروگرفتەکانمان دەبێ پێش هەموو شتێك پشت بەخۆمان ببەستین ، جا وێرای بچووکیی تەمەنم باوەڕم بەهەموو ئەو بیروڕایانە هەبوو لەبەر ئەوەش بوو حەزم بەفێربوونی زمانی ئینگلیزی نەدەکرد (کاتێك بوومە ئەندامی حزبی شیوعی عێراق-هەستم بەهەڵەکەی خۆم کرد بەڵام دوای بەسەرچوونی کات).

لەبەرئەوە یەکێك بووم لە کۆمەڵەی قوتابییە نیشتمانپەروەرەکان‌و لەگەڵ ناسیۆنالیستە عەرەبەکان یان کوردەکان نەبووم و لەگەڵ ئەوانەش نەبووم کە لەبەرزاییەوە وەك بەرزەکی بانان بێ پەروا تەماشای دەوروپشتیان دەکرد. لەگەڵ یەکێتی گەلی عێراق بووم بەگشت نەتەوەکانییەوەولەگەڵ شۆڤێنی عەرەبدا نەبووم هەروا لەگەڵ کەلاکەوتنی نەتەوەیی نەبووم، بەڵام لەگەڵ مافی گەلی کورد بووم لەپەیڕەوکردنی مافە رۆشنبیری و بەرێوەبەرێتییەکانیدا لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقدا (ئەمەبوو باری سەرنجم لەسەرەتای هۆشمەندیی سیاسیمدا)، لەگەڵ ئەوە نەبووم لاوانی کورد ببنە سەربازی سوپای(لیڤی) بەریتانی لەشەڕی دووەمی جیهاندا، بەم هۆیەشەوە کەوتمەبەر تەنگ پێهەڵچنینی نەتەوەپەروەرە کوردەکانی حزبی هیوا.

لەساڵی ١٩٤١دا بزووتنەوەی ئەفسەرە نەتەوەپەروەرەکانی عەرەب کە بەبزووتنەوەی رەشید عالی گەیلانی ناسرابوو یاخی بوون. جا وێرای دوژمنایەتیکردنی ئینگلیز، لەگەڵ کۆمەڵە قوتابییە نیشتمانپەروەرە عێراقییەکاندا (کەبێگومان کۆمەڵەیەکی رێکخراونەبوون) پشتگیری ئەوەمان دەکرد کە هەردوو بنکەی شوعەیبەو حەبانییە لابرێن و پەیمانی زۆردارانەی ١٩٣٠کە بەسەر عێراقدا سەپێندرابوو هەڵوەشێتەوەو سەربەخۆیی نیشتمانی بێتە دی، بەڵام ئێمە لەدژی ئەوە بووین لەگەڵ تەوەری ئەڵمانی هاوپەیمانی بکرێت‌و، ئەوەمان بەگۆڕینی ئیستیعمارێك بەیەکێکی تر دادەنا. کۆمەڵەی نیشتمانپەروەرە عێراقییەکان

لەهەموو هەڵوێستە سیاسییەکانیانداو تەنانەت لەئاستی عێراقیشدا یەکگرتوو نەبوون بۆ نمونە هەڵوێستیان پشتگیریی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد نەبوونەوەش لەژێر دروشمی هەموومان عێراقین و لەمافو ئەرکەکانماندا یەکسانین، من پێم دەگوتن: ڕاستە ئێمە هەموومان عێراقین و لەئەرکەکانماندا یەکسانین بەڵام لەمافەکانماندا یەکسان نین! ژمارەیەکی کەم لەقوتابیانی عەرەبی عێراق ئەم باری سەرنجەمیان پشتگیری دەکردو منیش خۆم لێیان نزیك دەکردەوەودۆستایەتیم لەگەڵ بەهێز دەکردنو هەوڵم دەدا تێیان بگەم ئەمانە چ جۆرە عەرەبێکن، چونکە بەئاسانی ناسنامەی سیاسی خۆیان دەرنەدەخست و نەشمدەزانی ئەمانە سەربەحزبێکی سیاسین، چونکە لەعێراقدا ژیانێکی حزبیو حزبە سیاسیەکان بەومانایەی بەربڵاوەنەبوون. هەروا نەشمدەزانی کە حزبی نهێنی هەن. حکومەتی ڕەشید عالی گەیلانی ڕووخاو نوری سەعیدو عەبدولئیلا کە هەردوکیان لەئەنجامی کودەتاکەدا بۆ ئەردەن رایان کردبوو گەڕانەوەو، ژمارەیەکی زۆری هێزەکانی بەریتانیا هاتنە ناو عێراقەوەو، دیسان لەباری عەسکەرییەوە داگیرکاریی بەریتانیا داسەپێنرایەوە.

لەئەنجامی دانانی حکومەتی رەشید عالیدا خوێندن لە قوتابخانەکاندا ڕاگیرابوو، ئێمەشیان لە ڕۆستەمییەوە بۆ بەغدا نزیك خانەی مامۆستایان هێناو لەوێ چەند ڕۆژێك ماینەوە، ئەوەبوو حکومەتی کودەتا رووخاو نەمانتوانی بگەڕێینەوە بۆ خوێندن و، قوتابییەکان هەموو بۆ ماڵەکانیان گەڕانەوە بەو هیوایەی کەلەکۆتایی پشوی هاوینەدا بگەڕێنەوەو تاقیکردنوەی ساڵانە ئەنجام بدەن.

لەماوەی پشووداندا چوم بۆ نەجەف تا لای یەکێك لەناسیاوەکانم بمێنمەوەو، لەبەرەبەیانی سەفەرەکەمدا لەبەغدا هەندێ ڕووداوی داخدار قەومان، ڕووداوی تالانیو داگیرکردنی موڵكو ماڵی جولەکەکان و دەستدرێژی کردنە سەریانو ئابڕووبردنیان، گوترا ڕێکخراوە زایۆنیەکان ئەم پیلانە گلاوەیان گێڕاوە بۆ ئاگرخۆشکردنی رقو کینە لەنێوان جولەکەو عەرەبداو بەمەبەستی ڕاکردنیان بۆ فەلەستینو دەرچونیان لەعێراق .

گەیشتمە نەجەفو لەماڵی ناسیاوەکەم مامەوەو پەیوەندیم بەدۆستانم لە

ڕۆڵەکانی نەجەف کرد- بەتایبەتی لەگەڵ عەزیز حاجی عەبود- کە لەخانەی مامۆستایانی لادێ دەیانخوێند، پاش دوو ڕۆژ لەگەیشتنم خۆپیشاندانێکی گەورەی جەماوەری بەڕێ خراو ئاڵای عێراقی تێدا بەرزکرایەوە لەژێر ئەم دروشمەدا (ئەی ئیستیعمارگەرانی ئینگلیز لە ولاتەکەمان وەدەرکەون). لەپێشڕەوی خۆپیشاندانەکەدا لاوێکی بالآبەرزی لاواز ئاڵای عێراقی بەرزکردبۆوە، لە دۆستەکانم پرسی ئەو لاوە کێیە؟، گوتیان ئەوە (حسين الرضي)یە داوای خوێندنی لەخانەی مامۆستایانی سەرەتایی کردوە، قوتابییەکی زیرەك و نیشتمانپەروەرەو، یەکێکە لەدۆستەکانمان. پاشان دیار نەماو چەند ڕۆژێك لەچاو ونبوو چونکە پۆلیس بەدوایدا دەگەڕان . پاش هێدی بوونەوەی بارودۆخی شارەکەو بەردانی گیراوەکان حسين الرضي لەناو دۆستەکاندا دەرکەوتەوەو منیان پێناساند کە قوتابییەکی خانەی مامۆستایانی لادێم و کەسێکی نیشتمانپەروەری عێراقیم و سەربە نەتەوەی کوردم.

بەمجۆرە لەگەڵ حسين الرضي بۆیەکەمجار یەکترمان ناسیو ئەو کاتە ئەندامی حزبی شیوعی عێراق نەبوو بەڵکو نیشتمانپەروەرێکی بێ ڕێکخستن بوو.

ئیتر دوای گەڕانەوەی نوری سەعیدو عەبدول ئیلاو داگیرکاریی ڕاستەوخۆی ئینگلیز بیروڕامان ئاڵوگۆڕ دەکردو لەبارودۆخەکەمان دەکۆڵییەوەو گفتوگۆمان دەکردو، لەبیروڕادا جیاوازیمان نەبوو دۆستە نەجەفییەکانم دەیانویست باسی گەلی کوردو شێخ مەحمودو بزووتنەوەکەیان بۆ بکەم، جا هەرچەندە زانیاریم لەبواری بزووتنەوەی کورددا کەمبوو بەڵام سەرنجم دەدا گوێم لێدەگرن‌و لەقسە کەمەکانم دڵخۆش دەبوون‌و دەیانویست زۆرتر لەسەر بزووتنەوەی کورد بزانن.

پاش تەواوبوونی پشووی هاوینە، برادەران لێکجودابوونەوە، هەرکەس بەرێگەی خۆیداو بۆ قوتابخانەو پەیمانگەکەی، منیش لەگەڵ خوێندکاران گەرامەوە بۆ خانەی مامۆستایانی لادێ لە ڕۆستەمییە، بۆ درێژەپێدانی خوێندنمان و پێشکەشکردنی تاقیکردنەوەی ساڵانە کەبەهۆی کودەتایەکەی ڕەشید عالیەوەو لەئەنجامی گەڕانەوەی داگیرکاریی سوپایی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە دواکەوتبوون.

لەکاتێکدا لەنەجەف بووم ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی لەرەوتی شەڕی دووەمی جیهاندا ڕوویدا، ئەوەبوو دوای ئەوەی هێزەکانی ئەڵمانیای نازی پەلاماری ئەورووپایانداو گرتیان وجگە لەدورگەی بەریتانیاو ئیرلەندە، کەوتە ژێردەستیان، ئەوجا هێزەکانی ئەڵمانیا ڕوویان کردە یەکێتی سۆڤیەت، بەلاّم تەماعکارییەکانی هیتلەر بۆ دەسەلاّتگرتن بەسەر هەموو جیهانداو دوژمنایەتی کردنی شیوعیەت و دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت و دارمانی یەك لەدوای یەکی دەوڵەتانی ئەورووپا لەبەردەم هێزە سەربازییەکانی ئەڵمانیاداو، خۆئامادەکردنی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی شەڕێکی لەمجۆرەو سەرقاڵبوونی بەبنیاتنانی سۆسیالیستییەوەو سەرقاڵبوونی حزبی شیوعی سۆڤیەت بەکێشە ناوخۆییەکانییەوە.. ئەمانە هەمووی وایان لە هیتلەر کرد بێتە سەر ئەو باوەڕەی داگیرکردنی یەکێتی سۆڤیەت لەتوانایدایە.

دەستدرێژیی ئەڵمانیا بۆ سەر یەکێتی سۆڤیەت و داگیرکردنی هەندێ ناوچەو، بەشدار بوونی یەکێتی سۆڤیەت لەشەرەکەدا دژی ئەڵمانیای نازیو چوونە ناو هاوپەیمانی لەگەڵ سوێندخۆرەکاندا، ڕەوتی شەڕی دووەمی جیهان و ئامانجەکانی و ناوەڕۆکەکەی گۆڕی، ئەوە بوو ئەڵمانیای نازیست و ئیتالیای فاشیست و ژاپۆنی عەسکەرتاریا بوونە سەرسەختترین دوژمنانی مرۆڤایەتیو مەترسیدارترینیان بۆ مێژوو و چارەنووسی گەلان، هەر ئەمەش وای لەگەلان کرد کەئەرکە مێژووییەکانیان ڕاپەڕێنن بۆ پشتگیریی توانای شەڕی سوێندخۆرەکان بەمەبەستی لەناوبردنی ئەم دوژمنە.

لەهەموو شوێنێك قسەوباس دەربارەی شەڕو بەشداریی یەکێتی سۆڤیەت لەپاڵ سوێندخۆرەکاندا گەرم بوو. ئەوکاتە لەسەر یەکێتی سۆڤیەت هیچم نەدەزانی ئەوە نەبێ کە لەدایکی زەکی خەیریم دەبیست کە ڕوسیا حکومەتی کرێکاران وجوتیارانەو هاتوچۆی یەکێك لەماڵە ناسیاوەکانمی دەکردو باسی بارودۆخی کوڕەکەی بۆ دەکردم کە زەکی خەیری بوو، کە ئەودەم حکومەت بۆ (ڕومادی) دووری خستبۆوە، جارێکیان لیمپرسی لەبەرچی حکومەت بەردەوام زەکی دووردەخاتەوە، گوتی: دەڵێن شیوعییە. منیش پێمگوت شیوعییەت چییە؟ ئەمە لەساڵی ١٩٣٩دا بوو بەدوومانگ پێش بەرپابوونی شەڕی دووەمی جیهان،

لەوەلأمدا گوتی: کوڕم تۆ هەقت بەسەرەوە نەبێ، تۆ لەم مەسەلەیە تێناگەیت. زۆر پرسیاری دیکەم لێدەکرد ئەویش زۆر بەکورتی وەلأمی دەدامەوە، زۆریشی لەسەر شیوعیەت نەدەزانی. دەیگوت شیوعیەکان لەدژی ئینگلیزن‌و دژی حکومەتن‌و بەرگری لەکرێکاران‌و جوتیاران‌و هەژاران دەکەن، لە ڕوسیا شۆڕشێکی بەلشەفی ڕوویداوەو قەیسەریان ڕووخاندووەو حکومەتی کرێکاران‌و جوتیارانیان پێکهێناوە...هتد.

نەمدەتوانی بەشداری ئەو گفتوگۆیانە بکەم کەلەناو خەڵکدا دەکران، بەتایبەتی لەناو قوتابیاندا، نەتەوەپەروەرە عەرەبەکان لایەنگری ئەڵمانیا بوون و دەیانگوت ئەڵمانیا دەسەلأت بەسەر دنیادا دەگرێ‌و یەکبوونی عەرەب بەسەرکردەیی هیتلەر دێنێتەدی‌و، نیشتمانپەروەرانی عێراقی دەیانگوت بەشداری یەکێتی سۆڤیەت لەشەڕەکەدا مانای کۆتایی هاتنی ئەڵمانیای نازیستەو دوای شەڕەکە ئینگلیز لەعێراق دەردەچن‌و پەیمانی ١٩٣٠هەڵدەوەشێندرێتەوەو هەردوو بنکەی شوعەیبەو حەبانییە هەڵدەگیرێن‌و، کوردەکانیش دەیانگوت ئێمە سەربەخۆیی دێنینەدی. دەوڵەمەندانی شەڕیش دەیانویست شەڕەکە بەردەوام بێت‌و ئەوە گرنگ نییە کێ لەسەردەکەوێت.

منیش هاوسۆزبووم لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت‌و داگیرکردنی خاکی سۆڤیەت لەلایەن نازییەکانەوە زۆر پەستی دەکردم‌و بەوپەڕی توانامەوە لەناو قوتابییەکاندا دەنگم بەرز دەکردەوەو هاوارم دەکرد (بژی مام ستالین). ڕۆژێکیان بەڕێوەبەری خانەی مامۆستایان بانگی کردم‌و گوتی: دەمانەوێ جێگەکەت بپشکنین. ڕۆیشتنە ئەو بەشە ناوخۆییەی تێیدا دەژیام‌و دۆلأب‌و جێگەو کتێبەکانمیان پشکنی بەلأم ئەوەی دەیانویست نەیاندیتەوەو، لەبەر ئەوەی نەمدەزانی چییان دەوێت بە بەرێوەبەرم گوت ئێوە بۆچی دەگەڕێن گوتی بۆهیچ، پاشان دەرکەوت کە بۆ بەیاننامەیەك دەگەڕان لەلایەن حزبی شیوعی عێراقەوە لەبارەی شەڕەوە دەرکرابوو پشتگیریی کۆششی شەڕی سوێندخۆرەکانی تێدا بوو لەدژی دەوڵەتانی تەوەرو لەوێدا فاشیزم بەدوژمنی گەلان ناوبرابوو، ئەم بەیاننامەیە بەفراوانی پەخش کرابوو بەلأم من تائەو کاتە نەمدیتبوو نەمخوێندبۆوە.

# ئامانجی خۆم دیتەوە

کەوابوو حزبێکی شیوعی هەیەو شیوعییەکان ئەم بەیاننامەیەیان بڵاو کردۆتەوەو، بەڕێوەبەرێتی خانەی مامۆستایان بەپێی هەواڵگری یەکێك لە سیخوڕەکانی گومانی دەکرد کەریم ئەحمەد شیوعی بێت چونکە هاواری کردووە بژی مام ستالین! لەئەنجامدا من خۆم بەدوای ئەندامێکی ئەم حزبەدا دەگەڕام بەڵام چۆن‌و لەکوێ دەیدۆزمەوە، دەبێ لەخانەی مامۆستایان یاخود لەشوێنێکی تردا بێ؟ لەگەڵ هەندێ برادەرم باسمکرد ئایا کەسێکی شیوعی لەخانەی مامۆستایان دەناسن. جارێکیان یەکێك لەبرادەرانم باسی کرد کەوا گومان دەکا یەکێك لە قوتابییەکان شیوعی بێت، زۆر بەباشی باسی دەکردو بەشان‌وباڵیدا هەڵیدەگوت‌و زۆر ڕەوشتی باشی دەدایە پاڵی کەزانیارییەکی زۆری لەسەر بارودۆخی عێراق‌و جیهان‌و ڕوسیا هەیەو قوتابییەکی زیرەك‌و بەڕێزو خۆشەویستەومنیش ئەم قوتابییەم دەناسی بێئەوەی شتێك لەسەر قسەکانی برادەرەکەم لەبارەی ئەو برادەرەوە بڵێم‌و بێ ئەوەی بەکەس بڵێم.. بڕیارمدا پەیوەندیی لەگەڵ بکەم.

بۆ ڕۆژی دووەم پەیوەندیم لەگەڵ کردو کەوتمە پرسیاری بارودۆخی سیاسیی وڵات‌و پەرەسەندنەکانی شەڕەکەو لەسەر یەکێتی سۆڤیەت وەك دەوڵەتێك کە دەستدرێژی کراوەتەسەرو ئەویش بەرگری لەنیشتمان دەکات لەدژی دەستدرێژی ئەڵمانیا. برادەرەکەم ناسنامەی سیاسیی (حزبی) خۆی ئاشکرا نەکردو منیش ئەوەم لێنەپرسی. سەرنجمدا بایەخی بەپرسیارەکانم دەداو بە وریاییشەوە وەڵامی دەدامەوە، پەیوەندیی هەردولامان پەرەی سەندو دوای نیوەڕۆی ڕۆژانی پێنج شەمە دەچووینە بەغداو ئەو لەگەڵ برادەرانی خۆی یەکتریان دەدی‌و باسی پەرەسەندنەکانی شەڕیان دەکرد کە چۆن ئەڵمانەکان گەیشتونەتە دەوروپشتی مۆسکۆ، بەڵام هەمیشە گەشبین بوو کەسەرکەوتن بەسەر فاشیزمدا دێتەدی و

هەروا گەشبین بوو لەئەنجامەکانی شەڕەکە کە شەری ڕزگارکردنی گەلانە. ڕۆژێکیان منی بەکرێکارێکی پێستەخۆشکردن ناساندو ئەویش کاتی دیداری بۆ دیاریکردن کەمانگی دووجار لەڕۆژانی هەینیدا یەکتر ببینین‌و ئامۆژگاریی کردم کەنابێ لەمەولا دیداری ئەو قوتابییە بکەم کە پێکەوە لەخانەی مامۆستایان دەخوێنین.

هەروا ئامۆژگاریی کردم کەدیدارەکانمان بەنهێنی بمێنێتەوەو هاواری ژیانی ستالین‌و یەکێتی شورەوی نەکەم‌و پەیوەندیم لەگەڵ ئەو کەسانە نەبێ کە بەپەیوەندی لەگەڵ حزبدا ناسراون، ئینجا گوتی: ئێمە سیاسەتمان و بیروباوەڕمان دەردەبڕین بێئەوەی بڵێین ئێمە شیوعین. ئەمە بۆ من یەکەم دەرس بوو لەبواری نهێنی کارکردن‌و ئیلتیزامی حزبییەوە، لەبەر ئەمە پەیوەندیم بەبرادەرەکانەوەو ڕەوشتم تەواو گۆڕدرا، برادەرەکانیشم سەرنجی ئەم ئاڵوگۆڕەیاندا کە لەقسەوباسەکانمداو لەگفتوگۆو ڕەوتی منداڵانەی جارانمدا ڕوویداوە.

**برادەرەکانم لەناو نیشتمانپەروەرە عێراقییەکاندا دووجۆر بوون:**

یەکەمیان نیشتمانپەروەرانی بێ ڕێکخستن بوون، یان بێ پەیوەندی بوون لەگەڵ هەر حزبێك، دووەمیان نیشتمانپەروەرانی خاوەن پەیوەندی بوون لەگەڵ حزبی شیوعی‌و ئەمانە لەگەڵ بەشی یەکەم لەئاستی فیکری‌و سیاسی‌و ڕۆشنبیریی گشتیدا لێك جیاوازبوون هەروا لەڕەوشت‌و هەستکردنیاندا بەبەرپرسیی نیشتمانی.

بەشی یەکەم دەیانگوت: چ پێویستە بابەتۆ لەئێستاوە خۆت ئامادە دەکەی ببیە مامۆستاو دەڵێی دارعاسات قوتداوە، مەبەست لەوەیە هەرکەسێك بابڵێین گوایە دارعاسا قوتبدات لەشی هەروەك کەسێکی لوتبەرز ڕەپ رادەوەستێ... بەلام بەشی دووەمیان هەستیان بەوە کردبوو کەئەم ئاڵوگۆڕە لەئەنجامی پەیوەندیمدایە لەگەڵ حزبدا، لەراستیشدا وام هەست دەکرد کەمن لەهەموو قسەکانم بەرپرسم‌و لەسەرم حساب دەکرێ، بۆیە دەستم کردە چاودێریی خۆم‌و لێپرسینەوەی خۆم، چونکە هەموو ڕەوتێکی نامۆ لەسەر حزب حساب دەکرێ بۆیە لێی دوور دەکەومەوەو زۆر لەخۆم دەکەم کەبۆ حەزو ئارەزووی تایبەتیم جلەو شل نەکەم، گشت هەڵسوکەوتێکم ملکەچی زەبت‌و ڕەبتی حزبی بکەم‌و لەهەر شتێك دوور

بکەومەوە کەبۆ ناوبانگی حزب خراپ بێت.

ئـەم پەیوەندییـەم لەسـەرەتای ١٩٤٤دابـوو کـە کرێکـاری پێـستە خۆشـکردن محەمەد ساڵح قەدوری منی بۆ ئەندامەتی حزب پالأوتو هەربەم بۆنەیەشەوە، ئـەو ڕاپۆرتـە سیاسـییەی پێشکەش کـردم کـە هـاوڕێی شـەهید (فەهـد) لەکۆنفرانـسی یەکەمدا پێشکەشی کردبوو، لەگـەڵ پەیماننامـەی نیـشتمانی کـە وەك بەرنامـەی حزب بڕیاردرا، ئەم دوو بەڵگەنامەیەی حزب بەهۆیانەوە توانی قـەوارەی سیاسـیو ڕێبازی نیشتمانیو چینایەتی خۆی جێگیر بکات.

ئـەو سـاڵە سـاڵی سـەرکەوتنەکانی حـزبو سـەرکەوتنەکانی سـوپای سـور بـوو کەچەندان گورزی لەسوپایەکانی فاشی دەسرەواندو دەگوباسەکانیش هەواڵی ئـەو سەرکەوتنانەیان پێڕادەگەیاندینو پارسەنگی هێزەکانی سەربازی بـۆ بەرژەوەنـدی سـوێندخۆرەکان گـۆڕدراو، ئـەم سـەرکەوتنانە بـوون بە هۆکـاری کردنـەوەی خێـرای بەرەی دووەم لەلایەن ئینگلتـەراو ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکاوە کـە هێـزە کۆنەپەرستەکانی ئەمریکایيو بەریتانی هەوڵی دواخستنیان دەدا. زنجیرەی سەرکەوتنـەکانی بەرەودوای سوپای ئەڵمانیای نازیست لەسەر دەستی سـوپای سـوور کەبـەخێرایی ڕووی لەئـەڵمانیا کـرد، ئەمـە وێـرای هێرشـی هـەوایی تێکوپێکـدەری فرۆکـەکانی سوێندخۆران بۆسەر بەرلینو شارەکانی تری ئەڵمانیاو بۆسەر وڵاتـانی داگیرکـراوی ئەورووپا لەبەرەی ئیتالیای فاشیست، ئەمانە هەموویان لەبەردەم هەردوو کۆنگرەی تارانو مۆسکۆدا دەرگایان ئاواڵـە کـردەوە تاچارەنووسـی شـەڕەکەو چارەنووسـی ئەڵمانیا یەکلا بکەنەوەو، لەئـەنجامی شـەڕەکەدا مرۆڤایـەتی قوربـانیی گرانبـەهای بەخـشی، چ لەسـەرو گیـانی خـەڵك یـان لـەوێرانکردنی شـارەکان و کارگـە بەرهەمهێنەکانو کێڵگەکانو، لـەم قوربانیانەشـدا یـەکێتی شـورەوی بەشـی هـەرە گەورەی بەرکەوت. گەلانی جیهانیش تامەزرۆی بنیاتنانی ئاشتیانەو ئازادیو مافی چارەنووس بوون، هەروا هەڵبژاردنی ئەو شێوە حوکمڕانییـەی لـەدوای ئـەم شـەڕە دەیەوێتو لەئاسۆشیدا سەرەتای ڕووخاندنی ڕژێمی نازیست لەئەڵمانیاو فاشیـست لەئیتالیاو عەسـکەرتاریا لـەژاپۆن دەردەکـەوێتو، کارێکـە هـەر دەبێتـە ئـەنجامی قوربانییەکانو خۆڕاگریو نەبەزینی یەکێتی سۆڤیەت.

هەروا حزب لەسیاسەتە نیشتمانییەکەیداو لەپێکهێنانی بنکەی ڕێکخراوەییدا سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێنا، ئەوەبوو کۆنفرانسی یەکەمی بەست تاسیاسەتەکەی بڕیاربداو هەڵوێستە نیشتمانییەکانی بەگەڵی عێراقمان ڕابگەیەنێ‌و بەرنامەی نیشتمانی‌و دیموکراتی خۆی بەشێوەیەکی چڕوپڕ لەشێوەی پەیماننامەی نیشتمانییدا بڕیاربدات کە بۆ گەل‌و هێزە نیشتمانییەکانی بڵاوکردەوەو داوای لێکردن بەرەی نیشتمانی پێکبێنن‌و، حزب قەوارەی سیاسی خۆی وەك پێشڕەوێك لەبزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی‌و دیموکراتیدا چەسپاند.

ئەو ئەرکانەی کەلەسەرتای دامەزراندنییەوە تاساڵی ١٩٤٤ ڕووبەڕووی حزب بوونەوە، بەکورتی ئەمانە بوون:

١- چەسپاندنی قەوارەی سیاسیی حزب وەك حزبێکی پێشڕەوی نیشتمانی‌و چینایەتی لەبزاڤی ڕزگاریخوازیی‌و دیموکراتیدا.

٢-کارکردنە سەر هێزە سیاسییەکان لەدەستنیشانکردنی دوژمنی سەرەکیدا لەخەباتی نیشتمانیدا، کەئەویش ئیستعمارو دەستە کۆنەپەرستەکەی فەرمانڕەوایی عێراق بوو کەوابەستەی ئیستیعمار بوو، بەتایبەتی ئیستیعماری بەریتانی، بۆ بەرگری لەبەرژەوەندییەکانی مۆنۆپۆڵە سەرمایەدارەکان.

٣-ڕزگاربوون لەکەسانی هەلپەرست کەلەحزب جیابوونەوەو قەوارەی سیاسی‌و ڕێکخستنیان لەدەرەوەی حزب پێکهێناو ئەمەش زیانی زۆری بەحزب گەیاندو بەشێوییەکی فراوانی لەحزبدا هێشتەوەو هەندێ ناوەندی تایبەتی لەناو شیوعییە باشەکاندا بەوانە هەڵخەڵەتان‌و لەریزی حزب دەرچوون و چوونە ناو ئەو کەرتکارە هەلپەرستانەوە کەهەندێکیان دەستپێشخەرییان کرد ڕێکخراوەکانیان هەڵوەشاندەوەو بەبێ شەرت‌و مەرج خۆیان خستە بەردەست دایەرەی تەحقیقاتی جینائی.

شتێکی ئاشکرایە کە ناکۆکی ناوخۆیی حزب مەسەلەیەکی ئاساییەو هەردەبێ جیاوازیی لەبۆچووندا ڕووبدات، چونکە ئەمە مەرجێکی گرنگ‌و سەرچاوەیەکی زیندووی پەرەسەندن‌و بەهێزبوونی حزبە لەرووی سیاسی‌و بیری‌و ڕێکوپێکییەوە، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی مەبدەئی ڕاست‌و دروست بڕوابەڕێوەو، ئەگەر پەیرەوی

مەبدەئی زۆربەو کەمایەتی لەناو دەستە حزبییە جۆربەجۆرەکاندا تێدا بکرێو زۆربە بەبڕیارو کەمایەتی بە بیروڕا دابنرێنو، کەمایەتی ملکەچی زۆربەبێتو بڕیارەکانی جێبەجێ بکات، بەبێ هیچ شەرتو مەرجێکو، دەبێ گشت هاوڕێو ڕێکخراوەکانی حزب، ئەگەرچی لایەنگیر بن یان لەگەڵی نەبن بڕیارەکان جێبەجێ بکەن، چونکە ئەوە یەکێتی حزبو یەکێتی کارکردنی دەپارێزێت، دەشبێ کەمایەتی ڕاستبێ بەلآم ئەرکی ئەوەیە هەر هەوڵبدات بۆ قەناعەت پێکردنی زۆربە کە بیروڕایەکەی ڕاستە تاکەمایەتی ببێتە زۆربە لەکێشەی ناوخۆییداو تا بیروڕایەکەی پێشووی ببێتە بڕیارو بڕیاری زۆربەی پێشوو هەڵوەشێنێتەوە. ئەمەش پێویستی بەئاستێکی فیکریو سیاسیو ڕێکخستنی باش هەیە لەلایەن کەسانو ئەندامانی هەیئە حزبییەکانەوە، بەتایبەتی ئەندامانی هەیئەکانی سەرکردایەتی. لەڕاستیدا کێشەی ناوخۆیی حزب، بەتایبەتی ئەگەر بووبەکێشەی نێوان کەسەکانو سروشتێکی خۆیی وەرگرت ئەوکاتە زۆر لەکێشە لەگەڵ دوژمن گرانترە، جا ئەو کەسانەی ناتوانن بەپێی مەبدەئی کێشەی ناوخۆو شێوازی بەڕێوەبردنی بڕۆن بەڕێوەو یان دەیانەوێ ئەم کێشەیە سروشتێکی خۆیی وەربگرێت، ئەوا ئەمانە بۆسەر یەکێتی حزب دەبنە مەترسیو، سەرچاوەی کەرتبوونو دەستەبەش دروست کردنن.

ئەو کەسە هەڵەیە بڵێ لەناو حزبدا بیروڕای جیاواز نەبووە، حزب هەمیشە مەبدەئی زۆربەو کەمینەی لەو گفتوگۆیانەدا پەیڕەوکردووە کەلەناو دەستە حزبییە سەرکردەکاندا ئەنجام دراون، بەمەرجێك کەمینە نەبێتە دەستە بەشێكو درێژەی پێبدرێ، دەبێ هەرکاتێك گفتوگۆ کۆتایی هاتو لەسەر هەر پرۆژەیەك دەنگدرا ئیتر هەموو دەبێ بکەونە پەیڕەوکردنی دوابڕیار. بەلآم وێڕای ئەمەش کەمایەتی بیروڕای خۆی دەپارێزێت بێ ئەوەی کۆسپو تەگەرە بخاتە ڕێگای جێبەجێ کردنی بڕیاری زۆربە، ئەمەیە ژیانی ڕاستو دروست لەحزبدا. بەلآم ئەو کەرتکارییانەی لەژیانی حزبدا ڕوویاندا لەلایەن کەمینەی بەرەلآوە ئەنجام دەدران چونکە ئەوانە گوێڕایەڵی ئەو بنەمایانە نەدەبوون کە حزبیان لەسەر دروستکراوە، ئەو جۆرە کەمینەیە لەهەر وەرچەرخانێکی سیاسی پۆزەتیڤ یان نیگەتیڤدا

هەوڵیان دەدا سەریەشەو گیروگرفت بخەنە پێش ڕەوتی حزب، لەبەر ئەوە حزب کۆششی خۆی لەدژی تەوژمە فیکرییە هەلپەرستەکانی ناوحزب تەرخانکرد، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بیریو سیاسیو ڕێکخراوەیی ئەندامانو ڕێکخراوەکانو دەستە سەرکردەکانی حزب، ئەوە بوو لەدوای یەکەمین کۆنفرانسو بڕیاردانی ڕاپۆرتە سیاسییەکەی هاوڕێی شەهید (فەهد)ەوە نامەیەکی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی هاوڕێ (عەزیز عەبدولهادی) بۆ نارد..

٤- نامەی وەڵامدانەوەکە بەسەردێڕی (حزبێکی شیوعی نەك سۆسیال دیموکرات)بوو، لەوێدا بنچینەکانی تیئۆریو ڕێکخستنی بۆ دامەزراندنی حزب دارشت تاحزب هەروا ببێتە خاوەنی پەیڕەوی ناوخۆ، پاش ئەوەی بووە خاوەنی سیاسەتو نەخشەو بەرنامەی خۆی، لەم قۆناغەدا حزب کۆششێکی زۆری بەخت کرد بۆ ئەنجامدانی کۆنگرەی یەکەمو پەسەندکردنی پەیڕەوی ناخۆ، تاحزب خاوەنی بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆبێتو بۆ هەڵبژاردنی سەرکردایەتی بۆ یەکەمین جارو بەشێوەیەکی دیموکراسیو ڕەوا. ئەمەش لەساڵی ١٩٤٥دابوو، ساڵی سەرکەوتنەکان بەسەر فاشیزمدا، ساڵی داگیرکردنی پایتەختی ئەڵمانیای نازیست لەلایەن سوپای سوورەوەو سەرکەوتنی سوێندخوارەکان بەسەر تەوەرداو، دەستکردن بەپێکهێنانی سازمانی نەتەوە یەکگرتووەکانو ئەنجومەنی ئاسایشو ڕووکردنە بنیاتنانی ئاشتیانەو هەوڵدان بۆ دورخستنەوەی شەڕو گۆڕینی ئەنجامەکانی شەڕەکە بۆ ڕزگار بوونی گەلان لەئیستیعمارو بۆ هێنانەدی سەربەخۆیی نیشتمانی.

بەڵام لەعێراقیش کەسەرەتای شەڕی دووەمی جیهانبوو ڕووکرایە بەرەڵاکردنی ئازادییە دیموکراسییەکانو لەوانەش وەرگرتنی مۆڵەتی حزبەکانو خەبات بۆ گۆڕینی شێوازی فەرمانڕەوایی بەرێگای ئاشتییانەو ڕامالینی هێزە کۆنەپەرستەکانی وابەستەی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزمو، پێویستی پەیڕەوکردنی دەستورو دەرنەچوون لەتەواوی بەندەکانیو دانانی یاسای دیموکراسی بەپێی ئەو دەستورە، دەستەی کۆنەپەرستی وابەستەی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزمو ڕژێمی پاشایەتی ویستیان لەپێش چاوی دنیاو

گەلانی عەرەبدا خۆیان وادەربخەن کەشێوازی فەرمانڕەواییان دەگۆڕن‌و بەشێکی زۆر لەئازادییە دیموکراسییەکان دابین دەکەن‌و مۆڵەتی ئەم پێنج حزبەیان بڕیاردا: حزبی نیشتمانی دیموکراسی‌و، حزبی ئیستیقلال (سەربەخۆیی)و، حزبی گەل‌و، حزبی یەکێتی نیشتمانی‌و حزبی ئازادیخوازان. حزبی شیوعی داوای مۆڵەتی بەناوی حزبی رزگاریی نیشتمانی پێشکەشکرد، چونکە یاسایەکانی عێراق مافی کاری ڕەوای ئاشکرایان لەبەردەم شیوعییەکاندا قەدەغەکردبوو، لەبەر ئەوە حزبەکەمان، حزبی شیوعی عێراق، بەشێوازی نهێنی خۆی ڕێکخستبوو بەڵام چالاکییەکانی سیاسی‌و بەرنامەکەی بەشێوەیەکی ئاشکرا بوون، وێڕای تیرۆرو داپڵۆسین‌و ئازارو بەندیخانەو ئیعدام‌و ئاوارەکردن. هەروا مۆڵەت درا بە(کۆمەڵەی بەربەرکانیی زایۆنیزم) کە ڕۆژنامەکەی بەناوی (العصبە) دەرکرد. بەڵام حزبی رزگاریی نیشتمانی مۆڵەتی تەواو نەبوو، وەزارەتی ناوخۆ بڕیاری مۆڵەت پێدانی نەدا ئەگەرچی داوایەکەی دەستەی دامەزرێنەری حزبەکەی نەدایەدواوە ، دەستەی ناوبراو لەم کەسانە پێکهاتبوو: هاوڕێی شەهید حسین محەمەد ئەلشەبیبی‌و، سالم عوبەید نعمان و محەمەد حسین ئەبولعیس‌و مەحمود ساڵح ئەلسەعید و محەمەد عەلی یوسف و محەمەد عەلی زەرقا و عەبدولجەبار جاروڵڵا.

کۆتایی ساڵی ١٩٤٥و سەرەتای ساڵی ١٩٤٦ قۆناغی جەنگی مۆڵەتدانی حزب‌و نەقابەو ڕێکخراوە جوتیاری‌و پیشەییەکان بوو. حزبە نیشتمانپەروەرە مۆڵەت پێدراوەکان دەستیان بەچالاکی ئاشکراو دەرکردنی ڕۆژنامەکانیان کردو، سیاسەتی ناوخۆی حکومەتی عێراق باشبونێکی نیسبی بەسەرداهات. سارودۆخی مۆڵەتنەدان (بەفەرمانی باڵیۆزی بەریتانیا)و نەدانەدواوەی، ئازادییەکیان بۆ دەستەی دامەزرێنەری حزبی ڕزگاریی نیشتمانی هێنایە ئاراوە کە دەستپێشخەری بکات بۆ دەستکردن بەچالاکی جۆربەجۆر لەناو بزافی نیشتمانیی دیموکراسیدا. هەر لەوکاتەشدا حزبی رزگاریی نیشتمانی لەگشت لایەکی عێراقدا بەکوردستانیشەوە ڕێکخستنی فراوانی پێکهێناو، بووە بەرینترین حزبی جەماوەریی لە هەموو وڵاتدا، چالاکییەکانی سیاسی‌و جەماوەری هەموو گۆڕەپانی بزافی نیشتمانی دیموکراسی عێراقی گرتەوە، ئەگەرچی ڕژێم بەتوندی بەرەنگاریی

ئەم چالاکییانەی دەکرد. ئەم چالاکییانە سروشتێکی سیاسی ئاشتیانەیان هەبوو، وەك مەزیەتەو یاداشت پێشکەشکردنو ناردنی وەفدو مانگرتنی کرێکارانو خۆپیشاندانی سیاسیو بەیاننامە دەرکردنو چاپکردنی کتێبو نامیلکە لەبارەی مەسەلەکانی نیشتمانی و ئابوری و سیاسیمانەوە، وەك سەربەخۆیی و سەروەریی نیشتمانیو ئابوریی نیشتمانیمانو بارەی نیشتمانی و پێداویستییەکانی تێکۆشانی نیشتمانیمان. جگە لەمانە حزبی رزگاریی نیشتمانی بەرنامەکەی خۆی ڕاگەیاندو لەوێدا ئامانجە نیشتمانی و دیموکراسیەکانو ئامانجەکانی گشت دەستەو بەشەکانی کۆمەڵگەی عێراق خرانەڕوو، وێڕای بەرژەوەندییەکانی بۆرژوای نیشتمانپەروەرو بەرهەمهێن. لێرەدا دەمەوێ باری سەرنج بۆ ئەوە ڕاکێشم کەبەرنامەکە بەشێوەیەکی ڕۆشن مەسەلەی کوردی تێدا چارەسەرکراو دووپاتی کردەوە کە گەلی عێراق لە دوو نەتەوەی عەرەبو کوردو کەمەنەتەوەکان پێکدێتو، ئەوەشی دووپات کردەوە کەپێویستە گەلی کوردمان بەمافە نەتەوایەتییەکانی شادبێت.

حزبی رزگاریی نیشتمانی شێوازی جۆربەجۆری تێکۆشانی بەکارهێنا، وەك کۆکردنەوەی ئیمزا، ڕێکخستنی وەفدی جەماوەریی، مانگرتنی کرێکارانو خۆپیشاندانی گەلی و دەرکردنی بەیاننامە بەناوی دەستەی دامەزرێنەرەوە، بەمەبەستی مەشق پێکردنو مۆڵەتدانو جولاندنی جەماوەر بۆ پەیڕەو کردنی مافی خۆیو بەجێگەیاندنی داخوازییە سیاسی و ئابورییەکانیانو باشکردنی باری گوزەرانی ژیانیان. لێرەشدا دەبێ بڵێم ئێمەی ئەندامانی حزبی شیوعی لەسەرمان پێویست بوو کە لەپێشڕەوی کاری جەماوەریدا بینو لەپێشەنگی ئەم چالاکییانەدا بین، ئێمە لەشانە حزبییەکاندا بەبایەخەوە لەئامۆژگارییە حزبییەکان دەکۆڵینەوەو نەخشەمان بۆ جێبەجێکردنیان دەکێشاو، خۆمان لەتیپی کارکردندا ڕێکخستبوو، لەنێوان ئەم تیپانەشدا پێشبڕکێ دەکرا کە بەپێشبڕکێی سۆسیالیستی ناوزەدمان دەکرد، دوای هەرکارو چالاکییەکیش ڕاپۆرتێکمان لەسەر ئەنجامەکانی کارەکەمان دەدایە دەستە حزبییەکەی بەرەوژوورترو لەشانەکەی خۆمانو لەدەستە حزبییەکەی سەروتردا ئەنجامەکانی کارەکە هەڵدەسەنگێندران. ئەم شێوازە

لەکاری حزبیدا بەوردی هاوڕێیانی داهێنەر لەکارەکەدا دەستنیشان دەکاتو، دەبێتە مایەی ناسینی هاوڕێ بەهۆی ئەنجامەکانی کارەکەوە. هەروا ئەم شێوازە دەبێتە هۆی دۆزینەوەی کەسانی تەمەڵو زۆربڵێو فیشاڵکارو خاوەن بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی، هەروا کاری حزب لەوەشدا ئاسان دەکات کە هەڵسەنگاندنێکی وردی هەبێ بۆ هێزە تێکۆشەرە گوێڕایەڵەکانی خۆیو هەروا کارئاسانی دەکات بۆ پاکژکردنەوەی خۆی، لە وەرچەرخانو بارودۆخە سیاسییە قورسەکاندا، لەوکەسانەی ناتوانن شانوملی شلو لاوازیان بدەنەبەر قورساییەکانی ئەم بارودۆخە.

حزب کە پێی نایە سالی-١٩٤٦-ەوە بەرەبەرە کەڵکی زۆری لەو بارودۆخە وەرگرت کەپاش کۆتایی شەڕەکە پەیدا بووبوو، هەروا لەو ئازادییە دیموکراسییە کەمەی دەستەی کۆنەپەرستی فەرمانڕەوا ناچار بوو لەژێر زەبری بارو دۆخی نێودەوڵەتیو ناوخۆدا ڕێگەی بدات، وەك مۆڵەتی هەندێ لەحزبو کۆمەڵەو نەقابەکان و دەرکردنی ڕۆژنامەکانیان، ئەمەش بەمەبەستی پەیوەندی کردن بەفراوانترین جەماوەرەوە، لە دەستەو چینە کۆمەلایەتییە جۆربەجۆرەکان و حزبە سیاسییەکانی بۆئەوەی شارەزای سیاسەتو بەرنامەکەی بنو، خەڵکی هانبدرێ بۆ خەبات لەبۆ هێنانەدی ئامانجە نیشتمانیو دیموکراتییەکانو باشکردنی ژیانی کرێکارانو زەحمەتکێشانی تر، ئەوە بوو دەیان هەزار ئیمزا کۆکرانەوە بۆ داوای مۆڵەتدانی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی، ئەم ئیمزایانەش لەکرێکاران و جوتیارانو زەحمەتکێشانی شارەکانو ڕۆشنبیرانو پیاوانی ئایینی ئیسلام (لەشیعەو سونە)و دیانەکانو کەسانی ترەوە، درانە وەزارەتی ناخۆو حزبە مۆڵەت پێدراوەکان، ئەوە بوو حزبی ڕزگاریی نیشتمانی مۆڵەتی پێنەدراو بووە فراوانترینو گەورەترین حزب لەعێراقی ئەو ڕۆژانەدا، بەلام بووە ڕاستییەکی دیتراو کە زەحمەت بوو پشتگوێ بخرێت. ئێمە ئەم ئیمزایانەمان بۆ حزبە ئاشکراکان دەبردو داوامان لێدەکردن پشتگیریی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی بکەنو داوای مۆڵەتدانی بکەنو بەرەی نیشتمانی دامەزرێنن، بەلام ئەم حزبانە کە هەندێکیان لە بەرەی چەپبوون، بەتایبەتی حزبی گەلو یەکێتی نیشتمانی، دەیانگوت پێویستە حزبی ڕزگاری

پەیوەندی خۆی لەگەڵ حزبی شیوعی نهێنی بپچڕێت و حسین شەبیبی لەدەستەی دامەزرێنەری لاببات و هەر ئەمەش بوو کە هەروا حکومەت داوای دەکرد. ئێمەی لاو گفتوگۆمان لەگەڵ دەکردن‌و بەپێی هەڵوێست‌و باری سەرنجی حزب وەڵاممان دەدانەوەو، دەستەی دامەزرێنەریش هەڵدەسوڕا بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ سەرکردایەتی حزبەکان بۆ بەرپەرچی بیروڕای پێکهێنانی تاقە یەك حزب بۆ هێزە دیموکراسییەکان لەجیاتی بەرەی نیشتمانی.وەڵامدانەوەی حزب بۆ ئەوە وابوو کە ئێمە پشتگیرییان دەکەین‌و ستایشی تەقەلایان بۆ کۆکردنەوەی هەموو دیموکراتخوازەکان لەیەك حزبدا دەکەین، بەڵام مەسەلەی دامەزراندنی بەرەی نیشتمانی ئەرکێکی نیشتمانییە کە لەژێر چەترەکەیدا گشت توێژو چینە کۆمەڵایەتییەکان‌و نوێنەرانی سیاسەتمەدارە نیشتمانپەروەرەکان لەبەرەیەکی نیشتمانیدا کۆببنەوە بەپێی بەرنامەیەکی هاوبەش‌و کاروچالاکیی ڕێکخراوی نێوان ئەم هێزانە لەلایەك‌و حزبی چینی کرێکاری عێراق لەلایەکی ترەوە.

جا وێڕای کۆششەکانی حزب بۆ ڕێکخستن‌و مۆڵدانی جەماوەرێکی فراوان و جولاندنیان بۆ کۆکردنەوەی ئیمزاو ناردنی وەفدەکان و ئەنجامدانی مانگرتنی کرێکاران‌و خۆپیشاندانی میللی‌و گۆڕینی شەقامەکان بۆ گۆڕەپانی خەباتی سیاسی، وێڕای ئەمە حزب هەستی بەوە کردبوو چەند بایەخدارە بتوانرێ حزبە نیشتمانی‌و دیموکراتەکان ڕابکێشرێن بۆ بەشداری لەخەباتی نیشتمانی‌و بەرگری لە ئازادییە دیموکراتییەکان و ڕاوەستان بەرووی کۆنەپەرستیی فەرمانڕەواداو بۆ ڕیسواکردنی. لەئەنجامی چالاکییە سیاسییەکانی حزبی ڕزگاریدا لەدژی سیاسەتی حکومەتە کۆنەپەرستەکان، ئیتر پێنج حزبە مۆڵەت پێدراوەکە نەیاندەتوانی لەبەرزییەوە بووەستن‌و تەماشای ئەوەبکەن حکومەت ئازادییە دیموکراتییەکان پێشێل بکات‌و پەنابەرێتە بەر زەبروزەنگ بۆڕیشەکێشانی چالاکی سیاسیی ئاشتیخوازانەو تووشبوونی کارێکی پڕ شەرمەزاریی ساختەکردن لەئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران، لەبەر ئەمەبوو هەر پێنج حزبە ئاشکرا (فەرمییەکە) بەیاننامەیەکی هاوبەشیان دەرکردو لەرۆژنامەکانیاندا بلاویان کردەوەو لەوێدا ئەوەیان ڕیسوا کرد کە حکومەت (حکومەتی نوری سەعید)

تـەزویری لەهەڵبژاردنەکانـدا کـردووەو وایـان دانـا کـە ئەنجومەنەکـە داتاشـراوەو نوێنەرایەتی ئەوانە ناکات کە هەڵیانبـژاردوون‌و لەبەیاننامەکـەدا داوایـان کـردووە ئەنجومەنەکە هەڵبوەشێندرێتەوەو سەرلەنوێ هەڵبـژاردنێکی ئازادانـە بکرێتـەوەو، هەر لەبەر ئەمەش ئەو حزبانە ڕایانگەیاند کە نوێنەرانیان لەئەنجومـەنی نوێنـەرانی ساختە خۆیان دەکێشنەوە.

شتێکی ئاسایی بـوو کـە حزبـی ڕزگـاریی نیـشتمانی دەستپێشخەری بکـات بـۆ ڕێکخستنی خۆپیشاندانێکی گـەورەی میللـی لـەکانونی یەکـەمی سـاڵی١٩٤٦دا کـە بەشەقامی ڕەشیددا تێپەڕ بوو داوای ئازادییە دیموکراسییەکانیان دەکـردو گەمـەی هەڵبژاردنەکـەی سـەردەمی نـوری سـەعیدیان ڕیـسوا دەکـردو داوای ڕووخانـدنی وەزاەتـە کۆنەپەرسـتو نۆکەرەکـەیان دەکـرد. بـەڵام حکومـەت بـەزەبری هێـز خۆپیشاندانەکەیان بڵاوە پێکردو پۆلیسیش دەستەی دامەزرێنەری حزبی ڕزگـاریی نیشتمانیان دەسگیر کرد.

حزبـی ڕزگـاریی نیـشتمانی تـەنیا حزبێـک بـوو کـە ڕووبـەڕووی دەسـەڵاتداری وەستایەوە، حزبە مۆڵەتپێدراوەکانیش تـەنیا لـەناو بارەگاکانیانـدا کۆبوونـەوەیان دەکردو بەیاننامەیان بۆ پرۆتیستی کاری داپڵۆسـێنەرانەی حکومـەت دەردەکـردو، ڕۆژانە سەرشـەقامەکانیان بـەکارێکی منداڵانـە دەزانـی، بەهـەرحاڵ هەنـدێ لەحزبـە مۆڵەتـدراوەکان بەشـداریی هەڵبـژاردنیان نـەکردو هەنـدێکی تریـشیان بەشـداریی هەڵبـژاردنیان کـرد. بـەڵام پاشـان لەبـەر زەبـری جـەماوەری سەرشـەقامەکاندا نوێنەرەکانی خۆیان ڕاکێشایەوە.

حزب ئەوپەڕی تەقەلای خۆی بەختکرد بۆ کـەڵك وەرگرتن لـە کـەمترین ئاسـتی ئازادییە دیموکراتییەکان بۆ پـەیوەندی کردن بەجەماوەرەوەو هۆشمەندکردنـەوەی خەڵك‌و ڕوونکردنەوەی سیاسەت‌و بەرنامـەی حـزب بـۆ بـەرینترین کـۆڕو کۆمـەڵانی خەڵك‌و دەستنیشانکردنی ئەرکە سیاسییەکان و پێداگرتن لەسەر ئەڵقەی ناوەند لە ئامانجـەکانی قۆناغەکـەداو کۆکردنـەوەی خـەڵك لـە دەوریـان‌و ڕێکخـستنیان‌و ڕاکێشانیان بـۆ کـارکردن‌و خـەبات لـە دژی دوژمنـی سـەرەکی، هـەروا کاتێـك ئـەو قۆناغە مێژووییە دیاریدەکات کە بزافەکەی پێدا تێپەڕ دەبـێ و ئامانجـەکانی ڕوون

دەکاتــەوە لەئەنجامــدا هــەروا هێــزە کۆمەڵایــەتیو سیاســییەکانی ئــەم قۆناغــە دیاریــدەکاتو، بەمــەش ئــەم هێزانــە بــانگ دەکــات بــۆ هاوپــەیمانی لەبەرەیــەکی نیــشتمانی بەرفراوانــدا بــەپێی بەرنامــەو ئامــانجی هاوبــەشو بــۆ هێنانــەدییان بانگیانکردن بۆ کاری هاوبەش و بەشێوازی جۆراوجۆرو ڕێکوپێکی خەبات.

سەرنجدەرانی ڕووداوە سیاسییەکانی عێراق زۆر چاك دەزانن حزبی شیوعی عێـراق لەسـاڵی١٩٤٦دا چـەند چـالاکی سیاسـیو جـەماوەری و ڕێکخراوەیـی و نەقابەگـەریو دیموکراسـیو فیکـری و بـەرەیی لـەدژی ئیـستیعماری بـەریتانیاو پــەیمانو بنکــەکانی ســوپایی لــە حەبانییــەو شــوعێبەو لــەدژی فــەرمانڕەوا کۆنەپەرستەکان، لـە دژی ئەوانـەی بـەرگرییان لـە بەرژەوەندییـەکانی ئیـستیعمار دەکرد ئەنجامداوەو ئەم چالاکییانەش پڕاوپڕی بەرژەوەندە نیشتمانییەکان بوون.

کۆنەپەرسـتی فـەرمانڕەوا زۆر پەسـتو بێزاربـوو لـەو ئازادییـە دیمەکراسـییە کەمــەی کەبــەهۆی کۆتــایی هــاتنی شــەڕی دووەمــی جیهــانو ســەرکەوتنی سوێندخۆرانو تێکشکانو بەزینی فاشیزمەوە دەستبەرداری بوون بۆ بزووتنـەوەی نیـشتمانیو، دەسـتیان دایـە بەربـەرەکانی ئـەو ئازادییانــەو ڕووبەڕووبوونـەوەی هەربزووتنەوەیەکی جەماوەریی بەڕێگای توندوتیژی و ئەوەبوو وەزارەتی ئەرشـەد عومــەری بــەزەبری گوللــە بــەرەنگاریی خۆپیــشاندانەکەی ٢٨ی حــوزەیرانی ١٩٤٦بۆوە، پاش ئەوەی خۆپیشاندانەکە گەیشتە بـەری کـەرخ، لەمـەدا یەکـەمین شەهیدی شیوعی کە شائول تویق بوو لەنزیك پەیکەرەکەی سەرکردەی بـەریتانی ژەنەراڵ (مۆد) شەهید کرا، خاوەنی ئەو پەیکەرە ئەو ژەنەراڵـە بەریتانییـەبوو کـە لەشەڕی یەکـەمی جیهانـدا بەغدای گـرت. هـەروا مانگرتنەکـەی کرێکـارانی نـەوت لەکەرکوك لەتەموزی ١٩٤٦دا بە گوللە بەرەنگاری کراو دەیان قوربانی لە کرێکاران گـلانو، ئەمــەش لەلایــەن نەقابــەکانی کرێکــارانی بەغــداو حزبــە دیموکراتییــە مۆڵەتدراوەکانی وەك حزبی نیشتمانیی دیموکراتیو حزبی گەلو یەکێتی نیشتمانی پرۆتێستو بێـزاری لـەدژی ئـەم تاوانـە گەورەیـە پیـشاندراو لـە خۆپیـشاندانەکەی ئەیلولدا داواکرا سزای پیاوکوژان بدرێ و حکومەتی ئەرشەد عومەری بڕوخێت. جا لەبەر ئەوەی دەسەڵاتداریی کۆنەپەرستی نۆکەر نەخشەیەکیان کێشابوو بۆ لێدانی

بزووتنەوەی نیشتمانیو لەپێشەوە حزبی شیوعی، حکومەتی عومەری دەستی لەکار کێشایەوەو نوری سەعید حکومەتێکی تازەی دامەزراند تالەو بارودۆخە پڕ لەداپڵۆسینو تیرۆرەدا هەڵبژاردنی نوێنەران بکرێ ئەوە بوو پێنج حزبە مۆڵەتدراوەکە بەشدارییان نەکردو وەزیرەکانیشیان لە وەزارەتی نوری سەعید کێشایەوە.

ئەوکاتە لەهەولێر بووم و حزب بەیاننامەیەکی دەرکردو لەوێدا گاڵتەجاڕیی هەڵبژاردنیان ڕیسوا کردو داوای ڕووخاندنی وەزارەتی نوری سەعید کرا، بەشی خۆمان لەو بەیاننامەیە گەیشتە لامانو، ئێمە سێ کەس بووین هاوڕێ عەزیز محەمەد و مەجید ڕەئوف کە لە دەرەوەی هەولێرەوە هاتبوو، لەگەڵ خۆم، ئێمە بەیاننامەکەمان بەمجۆرە دابەشکرد: هەولێرمان کردە سێ ناوچە، بەشی من لەگەڕەکی عارەبانو سەراو تەعجیل بوو، بەشی مەجید ڕەئوف خانەقاو تەیراوەو بەشی هاوڕێ عەزیز قەلاّ بوو. وارێکەوتین کە دوای دابەشکردنی بەیاننامەکە لەشەقامی گشتیو لەبەردەمی چاپخانەی جەمیلدا هاوڕێ عەزیز ببینمو مەجید ڕەئوفیش بەرێگەی خۆیدا بڕوات. بەمجۆرە بەفراوانی بەیاننامەکەمان بەهەموو لایەکی شاردا بلاّوکردەوەو، حکومەت نەیتوانی کەس بگرێ، خەلك لەشێوازو فراوانیی بلاّوکردنەوەی بەیاننامەکە سەرسام بوون کەوا بەوردیو بەبێ ئەوەی پۆلیس تانیوەڕۆی ڕۆژی دوایی هەستی پێ بکەن دابەشکرا، بەلاّم بۆ سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی خەڵك باسیاندەکردو لەبارەی بلاّوکردنەوەی بەیاننامەکەوە قسەوباسی زۆر شتیان هەڵدەبەست.

لەبەغداش بارودۆخەکە لەهەڵچووندابوو، کۆنەپەرستی ئارامی لەبەربڕابوو دەرهەق بەو ئازدییە کەمەی کەمابۆوە، بۆیە حکومەت گشت کتێبفرۆشەکانی ئاگادار کردەوە کە ڕۆژنامەی (العصبة-کۆمەڵە) دابەش نەکەنو نەفرۆشن، تەنانەت فرۆشیارە گەڕۆکەکانیش ئاگادار کران. حزب ناچار بوو لەبەرامبەر ئەمەدا ڕێکخراوە حزبییەکان ئاگادار بکاتەوە کەچاری ئەم گیروگرفتە بکەن.

ڕێکخراوەکان چەندان تیپیان پێکهێنا بۆ دابەشکردنی ڕۆژنامەی (العصبة)، لەم تیپانەشدا بەشداربووم و، ناوچەکەی من لە باب المعظم تا حەیدەرخانە بوو،

زۆرزوو لەپەیمانگای پەروەردەی لەش دەردەچووم کە دەکەوتە بەرامبەر تەختی پاشایەتی‌و لەبەردەم یاریگای کەشافەداو لەوێ بەشی خۆم وەردەگرت‌و دەکەوتمە خوێندنەوەی سەردێڕی ئەو وتارانەی تێیدا بڵاوکرابوونەوە، هەندێ جاریش دەکەوتینە بەر ڕاوودوونان لەلایەن پۆلیسەوەو دەچووینە ناو کۆڵان‌و جادەکانی بەغداو ئەگەر ناچار بووینایە دەچووینە ناو ماڵەکان‌و پێمان دەگوتن ئێمە فرۆشیاری ڕۆژنامەی (العصبة)ین‌و ئیتر خەڵکەکە بەگەرمی پێشوازییان لێدەکردین‌و دەیان پاراستین. لەسەرەتای ئازاری ١٩٤٦داو لەسەر بانگهێشتنی حکومەتی عێراق کۆمیتەی ئەنگلۆ-ئەمریکی گەیشتە بەغدا، کۆمەڵەی بەربەرەکانێی زایۆنیزم بەیاننامەیەکی دەرکرد بۆ ریسواکردنی نیازو مەبەستەکانی هاتنی ئەم کۆمیتەیە کە ئەوەتە ئیستیعمارگەرانی ئەنگلۆ-ئەمریکی دەیانەوێ نیازو ئامانجەکانی خۆیان لەرۆژهەلاتی ناوەراستدا جێبەجێ بکەن و تەماعکارییەکانی زایۆنیزم بێننەدی، داواشکرابوو پەیوەندی لەگەڵ ئەم کۆمیتەیە بپچڕن، بەلام حکومەت لەجیاتی پەیوەندی پچڕاندن بەگەرمی پێشوازییان لێکردن‌و کۆمیتەکەش پەیوەندی بەهەندێ لەکەسایەتییە نیشتمانپەروەرەکانەوە کردو لەکوێڕا هاتبوو بۆ ئەوێ گەڕایەوەو هەندێ بڕیاریان بۆ بەرژەوەندی زایۆنیزم دەرکرد،ئەمەش حزبە نیشتمانییەکانی ناچارکرد داوای مانگرتنی گشتی لە ١٠ی ئاداری ١٩٤٦دا بکەن. شانبەشانی مانگرتنی گشتی حزبی شیوعی داوای خۆپیشاندانی کرد، بەلام حزبە نیشتمانییە مۆڵەتدراوەکان لەگەڵ دەسەلاتی فەرمانڕەوا هاوکارییان کرد بۆ ڕێگەگرتن لە خۆپیشاندان‌و ئەندامەکانیان بەشەقامەکانی بەغدادا دەسوڕانەوەو بەهاوکاری لەگەڵ پۆلیسدا بۆ قەدەغەکردنی هەر بزووتنەوەیەکی جەماوەری کە بۆ مانگرتن بێت، منیش یەکێك بووم لەبەشدارانی ئەو خۆپیشاندانەی قوتابیان کە لەکۆلیژی ئەندازیارییەوە دەرچوو، هەروا ئەفسەران‌و سەربازان لە سوپاگەی سەربازیی کەرەنتینەوە دەرچوون‌و دەستیان بەهاوکاریکردن لەگەڵ خۆپیشاندەراندا کرد، کاتێك خۆپیشاندانەکەی خوێندکاران گەیشتە بەردەم وەزارەتی دەرەوە، بەرامبەر بەگرتووخانەی گشتی- بەندیخانەی بەغدا، لەوێدا هێزێکی گەورەی پۆلیس زاڵبوون‌و خۆپیشاندانەکە

بـلاوەی لێکـراو چــەند کەسـێکمان لـێگیران و ئـەوانی دیکـە گەیـشتنە کۆلیـژی ئەنـدازیاری بـۆ پـەناگیری ڕاگەیانـدن لـەوێ. هێزێکـی گـەورەی پـۆلیس گـەمارۆی کۆلیژی ئەندازیارییانداو چەند جارێك هەوڵیانـدا پـەلاماری کۆلیژەکـە بـدەن بـەڵام خوێندکاران بەبەردو پارچە خشت بەرپەرچیان دەدانەوەو ئێمە تا نزیکەی سەعات دەی ئەو ئێوارەیە گەمارۆ درابووین ئیتر وتووێـژ لەگـەڵ پـۆلیس و کۆمیتـەی حزبـە مۆڵەتدراوەکان دەست پێکراو داوامانکرد خوێندکارە گیراوەکان ئازادبکرێن، داواکە پەسـەند کـراو دەرگاکـانی کۆلیــژ کرانــەوەو لــە گــەمارۆ دەرچــووین. لەگــەڵ خوێندکارەکانی تر منیش گەڕامەوە بۆ پەیمانگای پەروەردەی لەش.

بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆژنامەکانی حزبەکان و حکومەت وتارەکانیان تەرخان کـرد بـۆ هێـرش کردنـە سـەر خۆپیـشاندانەکەو بـەکاری تێکدەرانـەو شـێواندنی (پیرۆزیـی) مانگرتن ناویان برد، بەڵام ڕۆژنامـەی (العصبە) وەڵامـی ئـەو ڕۆژنامانـەی بەچـەند زنجـیرە وتارێـك دایـەوە کـە هـاوڕێی نـەمر (فەهـد) نووسـیبوونی بەسـەردێری (پێداویستییەکانی تێکۆشانی نیشتمانیی) بەرپەرچی بۆچوونەکانی ئەو ڕۆژنامانەی حزبەکانی دایەوەو وایدانا کە خۆپیشاندان ئامرازێکە بۆ پشتگیریی حزبەکان، نـەك وەك ئەوەی خاوەن وتارەکانی ناو ڕۆژنامەکانی حزبەکان و حکومەت لاف لێدەدەن.

# دیداری هاوڕێ فەهد

ساڵی ١٩٤٦ لەپەیمانگەی پەروەردەی لەش دەرچووم‌و، پێش دەرچوونەکەم هاتوچۆی نووسینگەکەی سالم عوبەید نوعمانی پارێزەرم کرد کەئەندامی دەستەی دامەزرێنەری حزبی ڕزگاریی نیشتمانی بوو، نووسینگەکەی لە باب الآغای نزیك بازاری مزگەوتەکان بوو، ئەم نووسینگەیە کرابووە بارەگای (نافەرمی) چالاکییەکانی حزب، لەگەڵ چەند خوێندکارێکی پەیمانگەی پەروەردەی لەش چووینە ئەو نووسینگەیەو، توانیمان بۆ یەکەمین جار گوێ لەکۆڕێکی ڕۆشنبیرێکی تێگەیشتوو بگرین کە هاوڕێیەکی جولەکە بوو، چەند مەحازەرەیەکی پێشکەش کردین ئەوەی لەیادمبێت یەکەمیان بەناونیشانی: نەتەوەگەریو مەسەلەی نیشتمانی. لەوێدا بۆ یەکەمین جار توانیم بەشێوەیەکی ڕوون لەمەسەلەی کورد تێبگەم کە چۆن لەپاش شەڕی یەکەمی جیهان وڵاتی کورد بەپێی بەرژەوەندی ئیستیعمارگەران‌و دابەشکردنی بازاڕەکان‌و ناوچەکانی دەسەڵات لەنێوان مۆنۆپۆڵە سەرمایەدارەکاندا دابەشکراوەو، چۆن کوردستانی باشوور کە وڵاتی منە خراوەتە سەر دەوڵەتی تازەی عێراق کە ئیستیعمارگەران پێکیان هێناوە. ئینجا هەردوو هاوڕێ حسین محەمەد ئەلشەبیبی و زەکی بەسیم ناسی‌و پێشتریش سالم عوبەید نوعمانم ناسی. هاوڕێ زەکی لەلایەنی حزبییەوە بایەخی بەمن دەداو پەیوەندیی حزبی شیوعی لەگەڵ حزبی ڕزگاریی نیشتمانی بۆ ڕونکردمەوەو جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە هەر ئەندامێکی حزبی شیوعی ئەندامە لەحزبی ڕزگاریی نیشتمانیدا بەڵام هەر ئەندامێکی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی ئەندامی حزبی شیوعی نییە. چونکە حزبی ڕزگاریی نیشتمانی حزبێکە بۆ فراوانترین بەشی جەماوەری گەل لەکرێکاران‌و جوتیاران‌و زەحمەتکێشان‌و ڕۆشنبیران‌و بۆرژوای بچوك بەگشتی‌و لەهەموو نەتەتەوەو ئایین‌و تایەفەکان، لەکاتێکدا حزبی شیوعی پێشڕەوی بزووتنەوەی ئەم چین‌و توێژە کۆمەڵایەتییانەیە. هەروا بایەخی

کارکردنی ئاشکرای بۆ ڕوونکردمەوەو چۆن دەستەلأتدارانی کۆنەپەرستانی تۆکەر ڕێگەی کاری ڕەواو ئاشکرا بەحزب نادەن، چونکە شارەزای ڕۆڵی حزبن بۆ بەربەستیی ئیستیعمارو بەرگری لەدیموکراسیو بەرژەوەندەکانی جەماوەری زەحمەتکێش، لەسەر ئەم بنەمایە حزب داوای مۆڵەتدانی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی کرد تا ببێتە ڕوکاری ئاشکرای حزب و،ئەوەشی بۆ باسکردم کەچۆن حزب لەساڵی ١٩٤٥دا هیوادار بوو حزبی گەل کە عەزیز شەریف سەرکردایەتی دەکرد ببێتە ڕووکاری ئاشکرامانو ڕۆژنامەی(گەل—الشعب) کە خاوەنەکەی قاسم حەسەن بوو ببێتە ئۆرگانی ئەم حزبە، بەلأم مامۆستا عەزیز شەریف بەڵێنەکانی خۆی نەبردەسەرو مۆڵەتی حزبی گەلی بۆ خۆی قۆرخ کرد بۆیە حزب ناچاربوو داوایەکیتر بۆ مۆڵەتپێدانی حزبی رزگاریی نیشتمانی پێشکەش بکات.

لەسەر دەستی ئەو هاوڕێ قارەمانانە لەو ڕۆژانەدا فێرکرام و قوتابی ئەوان بوومو یەکەمین دەرسەکانی خەباتم وەرگرتو هەر ئەوانیش بوون ئێمەی نەوەی تازەیان هۆشیارکردەوەو هەنگاوەکانمانیان بەرێگەی ڕزگاریدا بۆ ڕۆشنکردینەوەو، هەرئەو سەردەمە فێربوون کەخەبات نەخشەی کارکردنو ئامانجی پێشینەی هەیە: کەدەبێ یەکەمجار ئەوپەڕی کەلك لەئازادییە دیموکراتییە کەمەکان وەربگرین بۆ ناسینی بیروڕاو باری سەرنجو سیاسەتو بەرنامەی حزب بەفراوانترین جەماوەرو، دووەم جەماوەر ڕێکخەینو لەناو حزبی ڕزگاریی نیشتمانیو ڕێکخراوە دیموکراتیو نەقابیو پیشەییو جوتیارییەکان و ئەوانی تردا کۆیان بکەینەوە. ئامادەی گشت کۆبوونەوە جەماوەرییەکانی کۆمەڵەی بەربەرەکانی زایۆنیزم دەبووم کە لەبارەگاکەیان لەبەری کەرخ سازدەکران، زۆریش ئەو مەحازەرەو وتارانەم پێباش بوون کە هاوڕێی شەهید محەمەد حسین ئەبو ئەلعیس پێشکەشی دەکردن چونکە وتاربێژێکی جەماوەریی گەورەو دەنگ دلێر بوو کە تائێستا لەگوێمدا دەزرنگێتەوە، بۆیە زەخیرەیەکی ڕۆشنبیریو ڕێکخستنی سەرەتاییم لادروست بوو کە بەوە بتوانم سیاسەتو هەلوێستو بەرنامەکەی حزب بۆ خەڵکی ڕوون بکەمەوە، چونکە حزبیش بەردەوام جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەبێ ئەو ئامانە بخوێنینەوەو دیراسە بکەین کە لەحزبی ڕزگاریی نیشتمانییەوە

دەردەچوون، هەروا ئەو بڵاوکراوەی ناوبەناوو گۆڤارانەی چاپو بڵاو دەرکانەوەو بۆمان دەهاتن، لە میسرەوە (الفجر الجدید)و لەسودانەوە (ام دەرمان)و لەفەلەستینەوە (الغد) دەگەیشتن، جگە لەونامیلکەو کتێبانەی لەلایەن کۆمپانیای چاپو بڵاوکردنەوەی (دارالحکمة)ەوە وەردەگێڕدرانو ئەو مەسەلە سیاسیو فیکرییانەی کە لەهەردوو ڕۆژنامەی العصبة و القاعدە دابڵاو دەکرانەوەو زۆر شتی تریش.

پشووی هاوینە داهاتومن لەساڵی دوایی خوێندندا بووم، دوای پێشکەشکردنی دوا تاقیکردنەوەمان دەبوو بگەڕێمەوە بۆ هەولێر، تا لەوێ وەك مامۆستای وەرزش لەسەر میلاکی پەروەردەی مەعاریفی هەولێر دابنرێم، بەرپرسە حزبییەکەم لەمە ئاگادار کردو ئەویش گوتی پێویستە ئاگاداری هاوڕێ زەکی بەسیم بکەیت، چومە نووسینگەکەی سالم عوبەید نوعمان و لەگەڵ هاوڕێ زەکی کۆبوومەوەو ئەویش بەکورتی پەرەسەندنەکانی بارودۆخەکەی بۆ باسکردمو گوتی سبەینێ دیدارێکی ترمان دەبێت بەڵام لێرە نابێ، پێبڕاگەیاندم پەیوەندی لەگەڵ بەرپرسە حزبییەکەم بکەمو ئەویش لەشوێنی دیدارمان ئاگادارت دەکاتەوە، بۆ ڕۆژی دواتر بەرپرسە حزبییەکەم دیتەوەو پێدەچوو ئاگادار کرابێ، پێکەوە ڕۆیشتین بۆ ماڵێك لە(عگد الکرد)و پاش کەمێك هاوڕێ زەکی بەسیمو هاوڕێیەکی تر هاتنە ژوورێ ، هاوڕێیەکەی تر پانتۆڵو کراسێکی لەبەردابوو، پاش سڵاوو ڕاموسان دانیشتینو من لەبارێکی سەرسامیدا بووم کە ئاخۆ دەبێ ئەمە کێ بێ چونکە هاوڕێ زەکی هەندێ جار لە ژوورەکە دەردەچوو لەگەڵ خاوەن ماڵ قسەی دەکردو ئێمەش هەردوکمان دەماینەوە، باسی خوێندنو دەرچونەکەمی لێدەپرسیمو ئاخۆ خێزانێکی گەورەم هەیە کە ئەرکی بەخێوکردنیانم لەئەستۆ بێو سەربەکام چینی کۆمەڵایەتیم.. زۆر بەکورتی وەڵامم دەدایەوە بێئەوەی بچمە ناو درێژەی باسەکانەوە. ئەوجا هاتەسەر باسی کورتەی بارودۆخەکە بەڵام زۆر بەرۆشنی. بەبایەخێکی زۆرەوە گوێم بۆ شل کردبوو هیچ بواری پرسیاری بۆ نەهێشتمەوەو ئەوجا بارودۆخی هەولێری بۆ باسکردم هەروەك تێیدا ژیابێ، بەتایبەتی لەبارەی چالاکی حزبی شیوعی کوردستانیو ڕزگارییەوە، هەروا بارودۆخی کوردستانی

ئێرانو کۆماری مەهابادو بەخۆشییەوە باسی پێکهاتنی ئەم کۆمارەو کۆماری دیموکراسی ئازەربایجانی دەکرد لەئێرانو گوتی پێویستە هەردوولایان هاوپەیمانییەکی بەهێزیان لەنێواندابێو، داخوازی بدەنە حکومەتی ئێران سەبارەت بەو بارودۆخە ئابورییە خراپەی هەردوو کۆمارەکە، چونکە هەردوولایان بەشێکن لە دەوڵەتی ئێران، ئەمە ئەگەر داوایان نەکرد لەئێران جیاببنەوە، ئێستا هەردوولایان ئۆتۆنۆمییان هەیەو، بەڵام حکومەت بەڕەسمی نەیناسیوونو، سوپای سوری سۆڤیەت هانی پێکهێنانی ئەم دوو کۆمارە ئۆتۆنۆمییەی داوەو، ڕایگەیاند کە حزبی شیوعی عێراقیش پشتگیری ئەم دوو کۆمارە دەکات، بەڵام دەشێ بارودۆخی نێودەوڵەتی بەڕەوتێکی سەلبیدا پەرەبستێنێو لەبەرژەوەندی ئەم دووکۆمارە نەبێت.

پاش ئەمە هاتەناو ئەوباسەوە کەلەپێناویدا بۆ ئەم دیدارە بانگکرابوومو، داوای کرد بگەڕێمەوە هەولێرو ببمە بەرپرسی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی لەوێ، زۆر سەرسام بووم بەمداوا لەناکاوەو، گوتم: هاوڕێ من لەو ئاستەدا نیم کە حزب ئەو ئەرکەم پێبسپێرێت، هێشتا لەسەرەتای ڕێگەدامو ڕۆشنبیریم لەو ئاستەدا نییەو تاقیکردنەوەم لەکاری سیاسیو حزبیدا کەمە. لەکاتێکدا ئەم باسانەم دەکرد هەموو لەشم نیشتبووە سەرئارەق، هەرچەند ڕاستیشم دەگوت، بەڵام ئاخۆ دەبێ ئەم هەڵوێستەم لەلایەن ئەم هاوڕێیەوە چۆن لێکبدرێتەوە، یاخود وەکوتر بڵێین لەلایەن حزبەوە چۆن لێکبدرێتەوە، هاوڕێیەکەش هەستی بەشڵەژانەکەم کرد. بۆیە بەهێمنی گوتی: لەسەر شیوعی پێویستە لەبەرپرسی نەترسێت چونکە لەخەباتیدا پلە حزبییەکەی هەرچییەکیش بێت، بەرپرسە لەئەنجامدانی کارەکەی، حزب قوتابخانەو پەیمانگەی بۆ دەرچوانی کادیر نییە بەڵکو قوتابخانەکەمان جەماوەرە کە لێوەی فێردەبین، شارەزاییش لەکارکردن لەناو ڕیزەکانی جەماوەرەوە پەیدا دەبێتو لەلات کۆمەڵ دەبێ، ئەرکی شیوعییە لەکەوتنە هەڵەوە نەترسێت، بەڵام کاتێك هەست بەهەڵە دەکات یاخود پێی دەگوترێ تۆ هەڵەت کردووە پێویستە بەپەلەو بەبێ دوودڵی هەڵەکە ڕاست بکاتەوە، بەڵام ڕۆشنبیری دەتوانرێ بەخوێندنەوەی ئەو سەرچاوە ماکسییانەی بەردەستو شتیتر

پەیدا بکرێ واتـە خۆبـەخۆت فێربیـتو ڕۆشـنبیری پەیـدا بکـەیتو، دەبـێ کاتێـك ئێوارە سەردەخەیتە سەرسەرین بەچالاکیی ڕۆژانەتدا لەگشت بوارەکاندا بچیتەوە، بەمجۆرە لە ژیانەوە فێردەبیت. بـەمجۆرە دەرسێکم لەگوتنەوەکـەی سـەرکردەی گـەورەی حزبمـان هـاوڕێی شـەهید فەهـدی نـەمر وەرگـرت کـە لەوەوپێـشتر نەمدەناسیو پێش ئەوە نـەخۆی نەوێنـەیم نـەدیبوو، سروشـتی کـاری نهێنیـشمان وابوو کە پرسی کەس نەکـەین. پاشـان پرسـی: کـەی سـەفەری هـەولێر دەکـەی؟ گوتم: کەفـەرمانی سـەفەرتان پێدام مـن ئامـادەم. ئینجـا بـەڵێنم لەگـەڵ هـاوڕێی شەهید زەکی بەسیم دانا کە نامەکەیم بۆ هاوڕێ (مەلا شەریف) بداتێ ئیتر هەردوو هاوڕێ لە پێش مندا لەماڵەکە دەرچوون.

ڕۆیـشتمە شـوێنی بەڵێنەکـەو نامەیـەکی (پێـچراوە)م وەرگـرت وێـڕای هەنـدێ ئامۆژگـاریی بـەدەم کەنامەکـە بدەمـە هاوڕێیـەك (کـە وابـزانم نـاوی سـاڵح بـوو) لەخەستەخانەی هەولێر کاری دەکرد، فەرمانبەرێکی بەڕێوەبەری یـان تەندروسـتی بوو. بەچاکی نامەکەم شاردەوەو هـاوڕێ زەکـی محەمـەد بەسیمو هاوڕێیەکـەیترم بەجێهێشتو ڕۆیشتم. ڕۆژی دوایی کاتی شەو بەشەمەندەفەر لەبەغداوە تاکـەرکوك بەرەو هەولێر دەرچووم. بەدێژایی ئەو ماوەیە بیرم دەکردەوە کە ئایا دەبـێ ئـەم هاوڕێیە کێ بێت؟ هاوڕێ زەکـی بەسـیمم بـاش دەناسـیو لەنووسینگەکەی سـالم عوبەید نوعمان قسەی لەگەڵ دەکردم بەڵام ئاخۆ بۆچی هەر ئەو خۆی لەسەر ئـەو ئەرکەی لەهەولێر پێم سپێردرا قسەی لەگەڵ نەکردم؟ کەوابوو دەبێ ئـەو هاوڕێیـە لەبارەی ئەرکەکەمەوە قسەی لەگـەڵ کـردم هـاوڕێ فەهـد خـۆی بێـت. لای کـەس باسی ئەم دیدارەم نەکردو کاتێك نامەکەی هاوڕێ بەسیمم دا بەهاوڕێ (ساڵح) هەر ئەو پاشان بەهاوڕێ عەزیز محەمەدو بەهاوڕێ فوئاد(مەلا شەریـف)ی ناساندم، مەلا شـەریف پێـی گـوتم: جگـە لـەهاوڕێ زەکـی کەسـی تـرت دیـو لەگـەڵ کـەس کۆبوویتەوە؟ گوتم: نەء، تەنیا لەگەڵ نووسەری نامەکە. مەلا شەریف پێکەنی!

کاتێـك ئـەم هاوڕێیانـەم لـە هـەولێر ناسیی، (مـەلا شـەریف، عـەزیز محەمـەد، جەوهەر حسێنو، هەردوو برایەکـەی ڕەقیـبو محەمـەد، ئـەنوەر محەمـەد ئـەمینو هەردوو لاو عەلیو ئەنوەر و مام ساڵحی باوکیان، مارف خەزنەدار، تۆمـای بـرینپێچ

لەعەینکاوە، ئۆاکیمو هاوڕێ یەحیا سەلیم)، هەریەکێك لەوانە پەیوەندیی حزبییـان هـەبوو، منـیش کەوتمـە گـەڕان بـەدوای ڕێوشـوێنێکدا کـە ڕێکخراوەکـانی حزبـی ڕزگاریی نیشتمانی پەیدا بکەم کە سەریەخۆبن لە ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی و هەردەبوو لەسەرەتاوە پشت بەئەندامانی حزبی شیوعی ببەستریّ بۆ پێکهێنـانی ڕێکخستنەکانی حزبـی ڕزگـاریی نیـشتمانی. بـەو مەبەسـتەش قسەم لەگـەڵ مـەلا شەریف کردکە ئەو یارمەتییە بـداتو، ئـەوە بـوو چـەند هاوڕێیـەکی لاوی ڕاسپارد کەبـەناوی حزبـی ڕزگـاریی نیـشتمانییەوە کاربکـەن ، بـەمجۆرە یەکـەمین تیپـی کارکردنی ڕێکوپێك لەلاوانی شیوعی لەهەولێر پێکهات کە ئەمانە بوون(عەلی ساڵحو ئەنوەر ساڵحو هاوڕێیەکیتر کەناوەکەیم لـەیاد نـەماوە چـونکە زۆر زوو هەرلەسـاڵی ١٩٤٦دا وازیهێنـا). مەزبەتەیـەکی جـەماوەریمان ڕێکخـست کـە ئیمـزای لەسـەر کۆبکەینەوەو داوای پێدانی مۆڵەت بۆ حزبی ڕزگـاریی نیـشتمانی بکـەین، ئـەوەبوو دەستمانکردە کۆکردنەوەی ئیمزاو سـەدان کەسـی زەحمـەتکێش ئیمزایـان کـردو، لەعەینکاوەش ژمارەیەکی زۆر ئیمزایان کرد لە پێشەوەیاندا قەشە پۆڵس عەجمایا کـە بەقەشـە سـورەکە ناویـان دەبـرد، ئـەم قەشـە تێکۆشـەرەی بەرنامـەی حزبـی ڕزگـاریی وەرگێڕابـووە سـەر زمـانی کلـدانیو، لەدانیـشتنەکانیدا بـۆ میوانـەکانی دەخوێنـدەوەو سـەفەری بەغداشـیکرد بـۆ گەیانـدنی ئـەو ئیمزایانـەی لەهـەولێر کۆکرابوونـەوەو نوسـخەی یەکەمیـدا بـەوەزارەتی نـاوخۆو نووسـخەکانی تریـشی گەیاندە حزبە مۆڵەتدراوەکانو ڕۆژنامەکانو لەڕۆژنامەی العصبةدا بلاّو کرایەوە.

لەئەنجامی ئەم چالاکییەدا و دابەشکردنی بەرنامەی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی و کارتێکردنی ڕۆژنامەی العصبة لەسەر ڕۆشنبیران، هاتوچـۆی کتێبخانـەی هـەولێرم دەکرد کەخاوەنەکەی هـاوڕێی کۆچکردوو(شـێخە شـەل) بـوو، کەوتمـە قـسەکردن لەگەڵیان کە هەڵیە بەناوی حزبـی شـیوعی کوردسـتانەوە بـەردەوام بـنو هەڵەیـە ڕۆژنامەی العصبة دابەش نەکەن، ئیتر داوایان لێکردم کەهاتوچۆی ئەو کتێبخانەیە نەکەم، منیش قایل نەبوومو مەسەلەکە گەیشتە شەڕە قسە لەنێوان من و ئەوانـداو لەپێشیانەوە هاورێی شەهید نافع یونس بوو.منیش هەردوو هاوڕێ مـەلا شـەریفو عـەزیز محەمـەدم لـەوە ئاگـادار کـردو ئـەوانیش ڕاوێـژیان کـردم کـە هاتوچـۆی

کتێبخانەکە نەکەمو خۆم لە ئالۆزبوونی پەیوەندیمان دوور بخەمەوە.

لەم ماوەیەشدا پەیوەندیم بەکەسێکی سەرکردایەتییانەوە دەکرد کە حەمید عوسمان بوو بیروڕامان دەربارەی بارودۆخی سیاسیو مەسەلەی کوردو مەسەلەی دیموکراسی و یەکبوونی حزبی شیوعی عێراق ئالوگۆڕ دەکردو دەمانگوت هەڵەیە دوو حزبی شیوعی لەیەکتر جیا هەبێت کەپێچەوانەی یەکبن، ناوبراو لەزۆری باسەکاندا لایەنگیریی دەکردمو لەهەندێکیشدا جیاوازیمان هەبوو بەگیانێکی ئالوگۆڕکردنی بیروڕامانەو لایەنگیری ئەو کارەی تاقمەکەیانی نەکرد کەرێگە نەدەن مـن سەردانی کتێبخانەکەیان بکەمو رۆژنامەی العصبة نەفرۆشرێت. بەمجۆرە رۆژنامەی العصبةم لەپۆست وەردەگرتو خۆم لەچاخانەو شەقامو بازاڕەکاندا دابەشم دەکرد، هەروەها بەرنامەی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی کە لەبەغداوە نێردراو کۆچکردوو فەهمی ئیبراهیم چیچۆ کەلەماڵیاندا دەژیام بۆی دەهێنام، لەگەڵ ناوبراو پێکەوە پەروەردە کراینو پێکەوە لە (کوشەری گەورە) چوینە قوتابخانە.

حزبی شیوعی لە کوردستانو حزبی ڕزگاریی کورد (بنکەی جەماوەریی حزبی شیوعی لەکوردستان بوون)و هەردوولایان لەرێکخراوی لقی حزبی شیوعی عێراق و لەحزبی رزگاریی نیشتمانی لەرۆژانی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا بەهێزتر بوون. بەلام دوای یەکەمین کۆنگرەی حزبی شیوعی عێراقو داواکاری مۆڵەتدانی حزبی رزگاریی نیشتمانی و دەرچوونی بەرنامەکەیو دامەزراندنی لقی کوردیی حزبی شیوعی عێراقو دەرچوونی رۆژنامەی (ئازادی) چالاکی شیوعییە کوردەکانو ڕووکردنە دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کورد لەلایەن نەتەوەپەروەرانی کوردەوە، کێشەو زۆرانبازی کەوتە ڕیزەکانی حزبی شیوعی کوردستانەوە، ئەوسەردەمە حەمید عوسمان ئاگاداری کردمو گوتی: ئێمە بەرەو پێکهێنانی کۆنگرە دەچینو ڕەوتی گشتی ئەوەیە بەبێ هیچ شەرتو مەرجێك بچینە ناو حزبی شیوعی عێراقەوەو کەمایەتییەك بەرەو دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کورد هەنگاو دەنێن.

لەم ماوەیەدا سەفەری شەقڵاوەو حەریرو باتاسم کردو لای برادەری خۆشەویستمو هاوڕێی خوێندنی سەرەتاییم لە قوتابخانەی دووەمی هەولێر کە خوێندنی بەزمانی عەرەبی بوو میوان بووم، کە ئەویش کۆچکردوو ڕەشید

عوسمان بو، برای خورشیدو حەمزە عوسمان، ئەودەم لەدایەرەی ئیستیهلاك فەلامانبەر بوو. لە حەریرو باتاس بەرنامەی حزبی ڕزگاریی نیشتمانیم دابەش کردو توانیم لایەنگیریی هەردوو کۆچکردوو بایەزید لەباتاس و بەکۆك لە شەقلاوە دەستبخەم. پەیوەندیشم لەگەڵ پۆستەبەری دایەرەی ئیستیهلاك کە لای ڕەشید عوسمانی کۆچکردوو فەرمانبەر بوو بەهێز کرد، ناوبراو خەڵکی ڕەواندوز بوو پێکەوە چووینە ڕەواندوزو لەوێش هەرکە گەیشتمەجێ بەرنامەی حزبی رزگاریی نیشتمانیم دابەشکردو پەیوەندیم کرد بەهاوڕێ (عەلی مەکتەبە)وە کە لەحزبی شیوعی کوردستان بو، گفتوگۆمان لەسەر بەرنامەی حزبی ڕزگاریی نیشتمانیو سیاسەتەکەی لەبارەی مەسەلەی کوردەوە کرد بەڵام ئەو لەسەر هەڵوێستەکەی سوور بوو. ئیتر گەڕامەوە بۆ باتاس و هاوڕێی کۆچکردوو یەحیا سەلیم هاتەلام و گوتی: مژدەت دەدەمێ، یەکەم: حزبی شیوعی کوردستان خۆی هەڵوەشاندەوەو زۆربەی سەرکردایەتیو ئەندامانی حزب هاتنە ناو حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق، دووەم: دەبێ هەرئێستا پێکەوە بگەڕێینەوە هەولێر. ماڵئاواییم لەبرادەری خۆشەویستم ڕەشید عوسمان کردو گەرامەوە بۆ هەولێر تابەپێی ئەم بارودۆخە نوێیە ڕەفتار بکەینو چۆن لەگەڵ هاوڕێیانی تازە بجوڵێینەوە، جا هەرچەندە ئەوان سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێرقیان لەبەغدا ئاگادار کردبوو کە خۆمان هەڵوەشانۆتەوەو بەبێ شەرتومەرج خۆیان دەدەنە حزبی شیوعی بەڵام ئەوەی لای ئێمە لەهەولێر گرنگ بوو ئەوە بوو چۆن سەرلەنوێ کار دابەش بکەینەوە، بەتایبەتی من خەریکی ئەوە بووم وەك مامۆستای وەرزش لەسەر میلاکی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی هەولێر دابمەزرێمو شوێنی کارەکەشم لەهەولێر نابێ بەڵکو لەناوچەو قەزاکان دەبێ.

بەمجۆرە دیسان کار لەنێوان هاوڕێ کۆنو تازەکانماندا چ لەڕێکخستنەکانی حزبی شیوعیو هەروا لە ڕێکخستنەکانی حزبی ڕزگاریی نیشتمانیدا، دابەشکرا.

ڕاپۆرتێکی درێژم لەبارەی ئەو چالاکییەوە ئامادەکرد کەلەپێناو دامەزراندنو بەهێزکردنی ڕێکخراوەکانی حزبی ڕزگاریی نیشتمانیدا لەو ماوەیەی ڕابردوودا ئەنجاممان دابوو، هەروا لەبارەی بارودۆخی نوێوە پاش هەڵوەشاندنەوەی

ڕێکخراوەکانی حزبی شیوعی لەکوردستان‌و هاتنە ناو حزبی شیوعی عێراقەوەو دامەزراندنی حزبی دیموکراتی کورد (پارتی)، لەراپۆرتەکەدا گوتم: ئێستا لەکوردستان، دوو حزب هەن، حزبی ئێمە حزبی شیوعی عێراق‌و حزبی ڕزگاریی نیشتمانی پێکەوەو حزبی دیموکراتی کورد (پارتی)و هیواداریین لەنێوان ئەم دوو حزبەدا لە کوردستان هاوکاری بکرێت.

راپۆرتەکەم دایە هاوڕێ مەلا شەریف، هەندێ برگەی لێ لابردو لەجێگەیان چەند برگەیەکی دیکەی نووسی، بەباشی‌و ئیجابی راپۆرتەکەی هەڵسەنگاند، ئەوجا نامەیەکی بۆ سەرکردایەتی حزب نووسی‌و دایە پاڵ راپۆرتەکەو ئیتر بۆ سەرلەبەیانی رۆژی دووەم چوومە بەغداو ڕوومکردە نووسینگەکەی سالم عوبەید ئەلنوعمان بەڵام لەوێ نە هاوڕێ زەکی بەسیم‌و نە هاوڕێ شەبیبم نەدیتەوە، ئیتر چی بکەم، لەیەکێك لەدانیشتوان هەواڵی هاوڕێ زەکی بەسیمم پرسی پێی گوتم: هاتوچۆی نووسینگە ناکات بەڵام هاوڕێ ئەبو عەلی گیراوە. رۆیشتمەلای بەرپرسەکەی پێشووم‌و راپۆرتەکەو نامەی هاوڕێ مەلا شەریفم پێدا. رۆیشت‌و گەیاندییە هاوڕێ زەکی بەسیم، بەڵێنی دیدارێکی پێدام بۆ ئێوارەی رۆژی دواتر لەشوێنێك، منیش لەوکات‌و شوێنە ئامادەبووم و تەماشام کرد هاوڕێ فەهدو هاوڕێ زەکی بەسیم ئامادەبوون. دیدارەکە کورت بوو هاوڕێ فەهد گوتی: راپۆرتەکە باشەو هاوڕێ فوئاد بەباشی هەڵی سەنگاندووەو ئێمەش هەروای دەبینین، پێم نەگوتیت کارکردن لەناوجەماوەردا قوتابخانەی سەرەکییە بۆ پەروەردەکردنی ئەندامان‌و کادیرانی حزب، تکام وایە بەئاگادارییەوە لەسەر چالاکییەکانت بەردەوام بیت چونکە تۆ دەبیە مامۆستا واتە فەرمانبەرێکی میری، بەڵام بەجۆرێك هۆشیاربیت کە چالاکیی حزبیت پەکنەخات. پاشان لەسەری زیادکردو گوتی: ئێمە خۆمان وەڵامی نامەکەی هاوڕێ فوئاد دەنێرینەوەو تۆش بۆ هەولێر بگەڕێوەو سڵاومان بۆ هاوڕێیان.

بەمجۆرە لەبەغدا گەڕامەوەو ئەوەی بوو بەهاوڕێ مەلا شەریفم ڕاگەیاند.

# مامۆستای وەرزش لەکۆیە

بەمامۆستای وەرزش لەقوتابخانەی دووەمی سەرەتایی کۆیە دانرامو پاشان بۆ قوتابخانەی ناوەندیی کۆیە تەنسیب کرامو کەوتمە خۆئامادەکردن بۆ شارە تازەکەم. پێش هەرچی وەك مامۆستا جلوبەرگی پێویست واتە دەستێك چاکەتو پانتۆڵم نەبوو، پێویستیشم بەجێگە هەبوو (لێفەو دۆشەكو سەرینو چرپایەك)و پێویستم بەبڕێ پارەی مۆڵ هەبوو کە ئەم پێویستییانەی پێ جێبەجێ بکەم، بۆیە بڕی هەشت دینارم لەدایکی هاوڕێ عەزیز قەرزکرد بۆ کرینی دەستێك جل، بۆ نوێنیش لە دادە غوربەتم وەرگرت کە خوشکی کاك ئیبراهیم چیچو بوو، سەیر ئەوەیە تا ئەمرۆ ئەو قەرزانەم نەداوەتەوە، چونکە لەیادم کردبوو کە قەرزم لەکەس وەرگرتبێتو خاوەن قەرزەکانیش بەدرێژایی ئەم ساڵانە بەسوپاسەوە داوای قەرزەکانیان نەکردۆتەوە.

لەگەڵ هاوڕێ جابر پیرداود کە هەر لەو ساڵەدا لەخانەی مامۆستایانی سەرەتایی دەرچوو کە منیش لە پەیمانگەی پەروەردەی وەرزش دەرچووم، ناوبراو لە قوتابخانەی سەرەتایی دووەمی کۆیە دامەزرا کە منیش هەرلەوێ دامەزرابووم، پێکەوە سەفەرمانکردو هەروا مەلا مەعسومو حەوێزی مام یەحیاش لەگەڵ ئێمە سواربوون و پێکەوە سەفەرمانکرد، ئێمە لەوەوبەر هەردوکیانمان نەدەناسی، هەردوکیان دانیشتووی کۆیە بوون و کەسایەتی ناسراوبوون، لە ئۆتۆمبیلەکەدا یەکترمان ناسی.

ڕێگاکە زۆر ناخۆشبوو، سەعات هەشتی بەیانی سواری ئۆتۆمبیل بووینو سەعات سێی دوای نیوەرۆ گەیشتینەجێ، لەڕێگا جگە لە گوندی (دێگەڵە) وێستگەی حەسانەوە نەبوو، لەچایخانەیەکی سەر ڕێگاکە دابەزینو لەتەپوتۆزدا نقوم بووبووینو سەرو سیمامان بەتەواوی گۆڕدرابوو، خاوەنی چایخانەکە بەخێرایی ئاو و سابوونی هێنا بەڵام بۆ ئێمە نا بەڵکو بۆ مەلا مەعسومو حەوێزی

مام یەحیاو ئێمەشیان لەگەڵ خۆیاندا لەخواردن‌و خواردنەوەی چادا بەشدار کرد.

پاش گەیشتنمانە کۆیە چووین لەماڵی کاك ئاسەفی براگەورەی هاوڕێ یونس رەئوفی پارێزەر (دڵدار)و مەجید رەئوف دابەزین تا بۆ ماوەیەکی کورت لەوێ بمێنینەوە، هاوڕێ یوسف رەئوفیش هەر لەو ماڵە دەژیا. خۆی بەرپرسی حزبی رزگاریی نیشتمانی بوولە کۆیە، بەلام بەرپرسی رێکخراوی حزبی شیوعی عێراق لە قەزای کۆیەو لەقەلادزەو رانیە، هاوڕێ عوسمان مستەفا خۆشناوبوو.

بۆ رۆژی دوایی من‌و هاوڕێ جابر پیرداود بەرێگەی هاوڕێیانی شار بۆ خانوێکی کرێ دەگەراین، بەلام هیچ خانوویەکمان بۆ نەدۆزرایەوە جگە لە ژوورێکی بچوکی کۆن کە بەبەردو قوڕ دروستکرابوو، مشکان‌و مێروو تەراتێنیان تێدا دەکردو نەئاودەست‌و نەئاوی تێدا بوو (ئەوکاتە لەکۆیەدا کارەبا نەبوو تاساڵی ١٩٥٠کەخانوویەکیان بۆ مەکینەی کارەبا دروست کردودایاننا) منیش لەو خانووەدا وەك کرێکاری بەنایی کارم دەکرد (بەرۆژانەی ٢٥٠فلس واتە چارەکە دینارێك) ئەمەش پاش دەرچوونم لە بەندیخانە (دەستشۆریشمان بەهۆی مەسینەیەکەوە بوو کەماڵی هاوڕێ عوسمان مستەفا خۆشناو بۆیان پڕ لەئاو دەکردین)، بۆ ئاودەستیش دەچووینە تەکیەی مام خەلیفە کە نزیکی ژوورەکەمان بوو. لەشەودا مێرووەکان تیپێکی مۆسیقایان دروست دەکردو دەجولانەوەو خشەخش‌و ویزە ویزیان دەست پێدەکردو کۆمەڵە دەنگێك یان بابڵێین تیپێکی مۆسیقای تەواو، بەلام زۆر ناخۆش‌و ناساز دەنگیان دەهات. هاوڕێ جابر بەلۆکە گوێی دەئاخنی‌و زۆریش لە دووپشك‌و مار دەترسا، دواجار توانی ژوورێکی سەرەوەی جیاواز لەخاوەنی ماڵەکە بەکرێ بگرێت‌و ئیتر خێزانەکەشی(دایك‌و خوشکەکەی) هاتن‌و بۆ ئەو مەسەلەی نیشتەجێبوون چارەسەرکرا.

# خێزانی عوسمان مستەفا خۆشناو

بارودۆخەکە بۆ من زۆرتر ئاڵۆزبوو، بۆ کەسێکی وەکو من کە تەنیابووم‌و خێزانم نەبوو"زگورتی" بووم زۆر زەحمەت بوو خانوویەك بدۆزمەوەو تێیدا بژیم. بەلام هاوڕێ عوسمان بەسوپاسەوە ڕێگەیدا لەماڵەکەیان بژیم: ئەوخۆی‌و من لەژوورێکداو کەسانی دیکەی خێزانەکە لەژوورەکەی تردا بژین، واتە دایکی‌و چوار خوشکەکەی کە دوویان منداڵ بوون و یەکێکیان لەتەمەنی "١٣"ساڵاندابوو، چوارەمیش گەورەترینیان بوو، بەلام باوکیان کە گەورەی خێزانەکە بوو لەژیاندا نەمابوو پێش چەند ساڵێك کۆچی دوایی کردبوو.

ئەم خێزانە بەرێزە وەك گوتم پێکهاتبوو لەدایکەکە بەناوی جەمیلە عەلی ساعی‌و چوار خوشك، بەهیەو حەمدیەو شوکریەو وەسفیەو، هاوڕێ عوسمان (کە تاقەکوڕی خێزانەکە بوو پاش مەرگی چەند برایەکی لەمنداڵیدا). لەسەرەتادا هەستم کرد کە خێزانەکە لە بوونی گەنجێکی تەنیا لەناوەندیاندا بێزارن دووریش نییە لەبەر قسەو قسەلۆکی خەڵکی بووبێت.. بەلام پاش تێپەڕبوونی ڕۆژان‌و شارەزابوونیان لە ڕەوشت‌و ئاکاری من لەگەڵیان‌و بەتینبوونی پەیوەندیم لەگەڵ دایکەکە لەسەر بنەمای ڕێزگرتن‌و باوەڕپێکردن‌و قسەشم بۆ دەکرد لەسەر ئامانجەکانی حزب‌و بارودۆخی سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌و هەڵوێستی حزب لەئافرەت..

ئیتر دایکەکە لێم تێدەگەیشت‌و دەیزانی چیماندەوێ ، هەستم کرد کە خۆشیان دەوێم و هەست بەهەلومەرجی ژیانم دەکەن‌و گۆشەنیگای باشیان بەرانبەرم زیاتربوو، منیش هەروا کەوتمە تێگەیشتنی خێزانەکە.. هێندەی نەبرد پرکێشیم کردو داخوازیی کچە ناوەندەکەیان حەمدیەم کرد (ئەوکات تەمەنی لە ١٤بەهار تێپەڕی نەکردبوو) داخوازیم لەهاوڕێ عوسمان‌و دایکەکە کرد، مۆڵەتی چەند ڕۆژێکیان پێدام کە تا لەناوخۆیان‌و خزمانیاندا بیرێکی لێبکەنەوە، خزمەکانیشیانم ناسی بوون‌و بووبوونە دۆست‌و لایەنگری حزب‌و، خزمەتی گەورەیان بە حزب

پێشکەش کرد، بەتایبەتی شەهید مەجید عەبدوڵلا کە بووە ئەندامی حزبی شیوعیو سەفەری بۆ کەرکوک کردو بووە کرێکار لە کۆمپانیای نەوتو تاساڵی ١٩٦٣لەسەر خەبات درێژەی دا ئیتر ئەوە بوو لە کودەتا شومەکەی شوباتدا دەستگیر کراو پاش ئازاردنی گۆشاوگۆش لەئاسایشی کەرکوک سەریان بڕی، چونکە زۆر ڕقیان لێی بوو، بەتایبەتی نێوەندە کۆنەپەرستەکانی تورکمان، ئەم شەهیدە یارمەتی زۆر بەخشندەی بەحزب پێشکەش دەکرد، بەتایبەتی بەدرێژایی ڕۆژانی لێقەومانی ساڵی ١٩٤٩تا ساڵی ١٩٥٤، ئەوکاتە سێ لەچواری مانگانەکەی بەحزب دەبەخشیو، شالاکیيەکی بەرپلاوی لەبزووتنەوەی نەقابەگەریدا، لەنەقابەی کرێکارانی نەوتی کەرکوک ئەنجام دەداو چەندان کرێکاری پێشڕەوی هێنایە ناو ڕیزەکانی حزبی شیوعی.

ئێوارەیەکیان لەکۆبوونەوەیەکی خێزانییدا خێزانەکە، واتە هاوڕێ عوسمانو دایکەکە داخوازییەکەمیان پەسەند کرد، منیش داوام کرد ڕای حەمدیەش کە لەگەڵمان دانیشتبوو وەربگرن، ئیتر ئەویش بڕیاری لەسەردا کە ببێتە هاوبەشی ژیانم، بەشیرینیو تاڵییەوە، بۆشم ڕوونکردەوە کە ئێمە دەرکردن لەفەرمانو گرتنو دوورکەوتنەوەو بەندیخانەو تەنانەت لەسێدارەدانیشمان لەپێشە چونکە ڕێگەکەمان سەختو لەمەترسییەو دوور نییە ناچاری خۆشاردنەوە ببم، جا ئاخۆ ئامادەیە هەموو ئەم بارودۆخە قورسو گرانەم لەگەڵ هەڵبگرێ، گوتی بەڵێ لەپێناوی حزبدا ئامادەی هەموو شتێکم. لەڕاستیشدا حەمدیەی هاوسەرمو دایکی منداڵەکانم ئەو بڕوا پێکردنەی گەیاندەجێو لەئاستی بەرگەگرتنی ئەو هەموو دەردو ناخۆشییەدا بوو، دڵنیاش بوو لەوەی بڕیاری لەسەردا.

لەسەرەتای ژیانی هاوسەریماندا حەمدیە قایلبوو کە پێکەوە لەماڵە حزبییەکانداو لەگەڵ خێزانەکانی ترداو لەگەڵ هاوڕێیانی دیکەدا بژین، تەنانەت لەدوای گرتنو بەندکردنم لەساڵی ١٩٤٩ داو هەروا لەساڵانی دواتریشدا لەنێوان شارە جۆربەجۆرەکانداو بەتەنیا یان لەگەڵ منداڵەکانیدا خۆی دەشاردەوەو سەفەری دەکردو وەك خێزانێك لەماڵە حزبییەکاندا دەژیاو تەنانەت لەچاپخانەی حزبدا لەگەڵ هاوڕێ شەهید سەبیح سیباهیو شەهید عەبەلی دەژیاو ئەرکی گەورەی بۆ

حــزب ڕادەپەڕانــدو لەراکێـشانی دەســتی یارمەتیــدا بــۆ هاوڕێیــان و ڕێکخــراوە حزبییەکانی بەغداو کەرکوك و شارەکانیترو لەهەلومەرجی زۆر ســەختو نەبوونیــدا دوانەدەکەوت.

لێـرەدا دەمــەوێ ئــەوە بڵـێم کــە کــچەکەمان (بــەناوی ژیــان) لەشــەش مانگیــدا لەســاڵی١٩٥٦دا لەبرســاندا مردبــوو چــونکە یارمەتییەکــەی حــزب بەشــی نــەدەکرد شیری بۆ بکرێـت، بۆیــە نــەخۆش کــەوتبوو مردبــوو، تەنانــەت پارەشــی نــەبوو بــۆ ناشــتنیو دەرودراوســێ یارمەتیانــداوە، باروبۆخەکــە بــەمجۆرە درێــژەی هــەبووە تاســاڵی ١٩٥٨ کــە شۆڕشــەکەی ١٤ی تــەموز بــەرپاکراو بــۆ کــاتێکی دیــاریکراو گەڕایەوە بۆ شارەکەی خــۆی، بــۆ کۆیــەو پاشــان بــۆ کــەرکوك، دوای ئــەوەو پــاش کودەتا شومەکەی شوبات لەساڵی ١٩٦٣دا لەگەڵ هەر شەش منداڵەکەی گەیشتنە چیاو دێ بەدێ کۆچی دەکرد، ئەمــەش دوای ئــەوەی حــزب هاتــەپاڵ شۆڕشــەکەی ئەیلولی کوردستان. پاش چەند ساڵو لە١٩٧٩دا هــەردوو کوڕەلاوەکــەمان بۆتــانو کاروانی گەیاندە پاڵ شۆڕشی کوردستانو ئەوە بوو بۆتانی کوڕمان لە چالاکییەکی جەنگاوەریدا لەحەریر هاوینی ساڵی ١٩٨١شەهید کرا، هــەروا حەمدیــەی هاوســەرم یەکــەمین ئــافرەتی شــیوعی بــوو کەلەگــەڵ منداڵەکانیــدا چــووە پــاڵ شۆڕشــی کوردســتان. ئــەم بــوو هــاوڕێمو هاوســەرو هاوبەشــی ژیــانم کــە هەمیــشە خــاوەنی جوانترین ڕەوشت بوو وەك مرۆڤێكو تێکۆشەرێك، لێرەشدا هەردەبێ ئەوەش بڵـێم کە لەساڵانی خۆشاردنەوەو لەکاری سەختو درێژخایەنی حزبیدا بەچاکترین شێوە دەجولایەوەو هەرزوو بۆنی مەترسی دەکرد لەپێش ئەوەی ڕوویدات، لەبەر ئەمەش بوو بەدرێژایی ژیانی نەگیرا.

# دایــکــە

بــەڵام دایکەکــە، ئــەوی بــەردەوام بــە وشــەی (دایــە) بــانگم دەکــرد لەراســتیدا دایکێکی راســتەقینەی تێکۆشــەربوو، لەســەرەتای ناســینی خێزانەکەیانــدا رۆمانــە بەرزەکەی (دایکەکە)ی رووسیی لەنووسینی (مەکسیم گۆرکی)م بۆ دەگێرایــەوەو زۆریشی بەدڵ بوو دواجاریش خۆی بووە قارەمانی چەندان هەڵوێــست کــە لەگــەڵ هیچ ئافرەتێکی تردا دووبارە نابێتەوەو، مەگەر ئافرەتێکی بــەهێزو دەروون بــەرزو دڵنیاو دلۆڤان نەبێ کەسی تــر بەرگــەی نــەدەگرت. لەســاڵی ١٩٤١داو لــە رۆژگــاری هێرشی کۆنەپەرستیدا بۆ سەرحزب ، کــە رۆژانــی مەینــەتی بەراســتیی حــزب بــوو، بەتایبەتی دوای ڕووخانی (مالیك ســەیفو یــەهودا)و ڕووخانــەکانی دواتــری چــەند کادیرێکی ناوەندی حزب ، دایکە لەگەڵ عوسمــانی کوریــدا لەکــەرکوك دەژیــاو، بــۆ گەیاندنی نامەیەکی حەمیــد عوسمــان هاتــە کۆیــە، ئــەودەم دوای ڕووخــانی جاســم ئەلتەعان (جاسم الطعان) حەمید بووە ناوەندی تازە حــزب. نامەکــەم خوێنــدەوە کەداوای لێکردبووم لە کۆیە دەربچمو بۆ کاری حزبیو خۆشاردنەوە بێمە کەرکوك. دایە تەماشایەکی کردمو گوتی: من دەزانم حزب پێویستی بەتۆیەو داوات لێدەکات بچیتە کەرکوك، دەشزانم بەهۆی داڕمان لــەریزی کــادیرانی ناوەنــدیی حزبــدا حــزب لەمەینەتدایە، ئەوانە زیانی گەورەیان بەرێکخراوەکانی حــزب گەیانــدووە، بەچــاکی بیر لەو ئانجامانە بکەرەوە کە چاوەڕوانت دەکات، ئایا ئامادەیــت بەرگــەی هــەموو ئەوە بگریت کە ئەرکی کارمەندی حزبەو لەم هەلومەرجە گرانەدا هەرچی ئەرکێکت پێ بسپێرن بەرگەی بگریتو دەستبەرداری فەرمانەکــەتببیتو خێزانەکــەت بــەجێ بهێڵیت؟ ئەوانە هەمووی لەپێشتدان، جا ئەگــەر ئامادەیــت گــشت ئــەم ئەنجامانــە بەرگە بگریت ئەوا ئازایانەو بێ دوودڵی وەرە پێشەوە بۆ خزمــەتی حــزب، ئەگــەرنا حزب برینــدارەو بەرگــەی لێدانی تــر نــاگرێ. ئینجــا تەماشــایەکی کــردمو، منــیش بەسەرسامییەکی پەســەندکارانەوە بــۆ هــەموو گفتارەکــانی زەردەخەنــەم لەســەر

لێوان بوو، ئینجا گوتی: گوێبگرە کوڕی خۆم، مرۆڤ هەریەکجار دەمرێ و هیچ کات لەمردن قورتار نابێ‌و بەلام مردن تامردن جیاوازە، پاشای کوێرەی ڕەواندوز فەرمانڕەوای سۆران بوو، عەلی بەگی(داسنی–ئێزدی) بانگهێشت کردو ئینجا داوای لێکرد کە دەستبەرداری ئاینەکەی خۆی بێت‌وموسڵمان بێت، عەلی بەگیش بەوە قایل نەبوو، ئەوجا پێی گووت ئەگەر نەبیتە موسڵمان دەتکوژم، عەلی بەگ قاقا پێکەنی‌و گوتی ئەی نەوەکانە ئایندە چیم پێدەلێن، دەلێن عەلی بەگی (داسنی–ئێزدی) لەپێناو دڵۆپێك خوێندا لە محەمەد پاشا پاڕایەوە کە نەیکوژێ‌و ژیانی رزگار بکات‌و دەستبەرداری ئاینی باب‌و باپیرانی بێت‌و ئەو بڕوایە بدۆڕێنێ کە ئێزدییەکان داوایانەتێ تا ببێتە موسڵمان، ئەوجا گوتی چیت لەدەستدێ بیکەو دەستبەرداری ئاین‌و باوەڕی خۆم نابم، پاشای کوێرە کوشتی، وێڕای ئەوەش بە ئازایەتی ئەم پیاوە سەسام بوو ئەو گەلییەی کەلەخەلیفانەوە تا باڵەکیان بەناوی ئەمەوە ناونا گەلی عەلی بەگ.

منیش هەستام‌و دەست‌و سەریم ماچ کردن‌و پێم گوت کوڕی خۆت پیاوی نیوە ناچڵ نییەو ئەو بڕوایە دەگەیەنمەجێ کە حزب پێی کردووم، بۆ باوەڕیشت بەهاوسەری کچەکەت دڵسۆز دەبم و پاراستنی ئەویش لەدەستی تۆدا دەبێت.ئیتر ماڵئاواییم لێکردو لەسەر داوایەکەی حزب بەرەو کەرکوك کەوتمەڕێ‌و گەیشتمەجێ‌و لەگەڵ هاوڕێ مەجید عەبدوڵلا لەماڵی (کاکەی حاجی مەحمود) بەڵێنی دیدارم هەبوو. ناوبراو کەسایەتییەکی دەوڵەمەندی کۆیە بوو، گشت منداڵەکانی لایەنگری حزب بوون‌و کوڕە گەورەکەشی مەجید کاکە ئەندامی حزبی شیوعی عێراق بوو. لەکات‌و شوێنی دیاریکراو مەجید عەبدوڵا ئامادە بوو منی لەگەڵ خۆی برد بۆ دیداری هاوڕێ عوسمان خۆشناو لەماڵی خۆیان، شوکریەی خوشکی لەو ماڵە دەژیا، لێمپرسی: خانووەکە لای ڕووخاوەکان ناسراوە؟ لەوەلامدا گوتی تاقە جارێك جاسم تەعان(جاسم الطعان) هاتووە بۆئەم ماڵە.

گوتم: دەبێ بگوێزرێتەوە بۆ ماڵێکی تر کەلای ئەوان نەناسرابێت.

عوسمان وەلامیدایەوە: بەدوای خانوویەکی تازەدا گەڕاین بەلام تائێستا سەرکەوتوو نەبوین. چەند رۆژێك مانەوەو هاورێیانی پچڕاومان دەگرتەوەو

پەیوەنـدیمان لەگـەڵ هـەردوو ڕێکخـراوی سـلێمانیو هـەولێر بەسـتەوە، حەمیـد عوسمان سەفەری بەغدای کـرد تابیبێتـە نێوەنـدی تـازەی حـزب (کاتێـك دەگەمـە باسی ساڵی شکستەکەی حزب لە ١٩٤٩دا بەدرێژی باسی ئەم قۆناغە دەکەم).

دایکـە لەسـەر کارەکـەی لەماڵـە حزبییەکانـدا وەك پەیامبـەری نێـوان ناوەنـدو ڕێکخراوی لقی حزب لە هـەرێمی کوردسـتانی عێـراق بـەردەوام بـوو، تـا جارێکیـان لەماڵێکی حزبیدا کەوتەبەر هێرشی پۆلیسو (نـضال-سـوعاد)ی کچیـشمی لەگـەڵ بوو ئەوکاتە نزیکەی پێنج ساڵان دەبوو، هەروا لەم ماڵـەدا بـەهادین نوریـو چـەند هاوڕێیـەکی سـەرکردایەتی دەژیـان، دایکـە لەگرتنەکەیـدا نـەناوی ڕاسـتی خۆیـو نەناوی (نضال)ی کچمی نەدابوو بەسوعاد ناوی بردبوو. کاتێك لێیـان پرسـی بـوو ئەم منداڵە کێیە. بەتەحقیقاتی جینـائی گوتبـو: بـاوکی ئـەم کـچە شـوانی مـەڕان بووە ڕۆژێکیان لەبەرزایی چیاوە هەڵدێراوەو مردووە هەروا دایکیـشی کەکیـژی مـن بوودوای باوکی منداڵەکە مردووەو ئەو منداڵە دوای مەرگی دایکیشی هەرمنی هەیـە بەخێوی بکەمو بەداوی کارێکدا دەگەڕێم کە پێی بژین بۆیە هاتمە ئەم ماڵـەو گـوتم کارەکـەرتان دەوێ؟ گوتیـان بـەڵێ ئـیتر چـوومە ژوورەوە تالەسـەر مانگانەکـەم لەگـــەڵیان ڕێکـــەوم ئـــیتر ئەوەتـــە پـــۆلیس پـــەلاماری ماڵەکەیـــداو ئێـــستا لەبەردەستتاندام.

نکۆڵی کرد لەهەرپەیوەندییەکی لەگەڵ ئەم کۆمەڵە خەڵکە، لەکاتێکدا بـەهادین نـوری ڕاسـتی گوتبـوو کـە پێویـستیان بـەخێزانێکی حزبـی بـووەو ڕێکخـراوی کوردستان ئەم خێزانەی بۆ نـاردوون. بەدایـەیان گوتبـوو: بـەهادین نـوری دەڵـێ ڕێکخراوی حـزب تـۆی نـاردووە تابیبیتـە خێزانـی ئـەم ماڵـە. بەبەرچـاوی بـەهادین نورییـەوە دەڵێـت ئـەم پیـاوە درۆدەکـاتو مـن پیرەژنێکـی نەخوێنـدەوارم و هـیچ پەیوەندیم بەمانەوە نییەو بەهیچ جۆرێك نایانناسم. لـەکاتی دادگایییـشدا هـەر ئـەم قسانەی دووبارە دەکاتەوەو فەرمانی بەندی بـۆ سـاڵێكو ساڵێکیـشی لەچـاودێریدا بەسەردا دەدرێ بەمەرجێك (نضال)یـش لەبەندیخانـەدا لەگەڵیـدا دەبێـت، بـەناوی فاتمەوە حوکمەکەی بەسەردا دراوە.

کـاتی بەندییەکـەی هێـرش براوەتـە سـەر بەندییـە شـیوعییەکانی بەندیخانـەی

ناوەنـــدیی بەغـــداو ژمارەیـــەك لەبەندییـــەکان شـــەهیدو بریـنـــدار بـــوون و یـــەکێك لەبرنـدارەکان عوسمـانی کـوڕە تاقانـەی بـوو، بەئافرەتـە بەندییـە سیاسـییەکانی گوتبوو بەناوی فاتمە بانگی بکەن نەك بەناوی خۆی، هـەروا ئامۆژگاریی کردبـوون باسی کـوڕە بریندارەکـەی نەکـەن، کاتێـك پۆلیـسی تـەحقیقاتی جینـائی دێـن بـۆ بەندیخانەی ئافرەتانو لێیدەپرسن عوسمان مـستەفا بریـنـدارە ئایـا ئـەوە کوڕتـە، ئەویش نەئی لێکردو گـوتی مـن لـەم دنیایـەدا کەسـم نییـە ئـەم منداڵـە نـەبێ کـە کچەزامەو دایکی چوار ساڵە مردووە.

پـــاش تـــەواو کردنـــی ســـاڵێك بەنـــدی لەبەندیخانــە. دەرچـــوو دیـــسان لەماڵـــە حزبییەکاندا خۆی شاردەوە، ماوەیـەك مایـەوەو پاشـان داوای کـرد دەسـت بـەکار بکاتەوە لەپەیامبەریدا بەڵام پۆلیسی تەحقیقاتی جینـائی وێنەکـەی لـە مەحەتـەی شەمەندوفەرو گەراجەکان دابەشکردبوو، ئەمجارە لـەناو شـەمەندوفەردا دەسـتگیر کراوئەدەبیاتو نامەی حزبیشی لـەلابوو، توانیبـووی لەنامـەکان رزگـار بێـت بـەڵام دانی نەنابوو بەوەدا کە ئەدەبیاتەکان هی ئەو بـن، کاتێـك بردیـان بـۆ تـەحقیقاتی جینائی گوتیان: تۆ فاتمە نیت کە بۆ ماوەی ساڵێك بەبەند کردن حوکم درابوویت؟ گوتبووی نەء من فاتیمە نیم ناوم جەمیلە عەلی ئەلساعیيە. ئەمجارە نـاوی ڕاسـتی خۆی گوتبوو بەڵام گوتبووی ئەو ئەدەبیاتە هی ئەو نین، لەکاتی دەسـتگیرکردنیدا پۆلیسی وێستگەی شەمەندوفەر لێیاندابوو لـەو هۆسـەو هەرایـەدا توانیبـووی نامـە حزبییـە بـچوکەکان قوتبـدات. بـەمجۆرە دیـسان جـارێکیتر حـوکمی سـاڵێك بەنـد کردنی بەسەردا درا، بەڵام ئەمجارە جەمیلـە بـوو نـەك فاتیمـە. لەبەندیخانـەدا زۆر شت فێر بوو بوو. دواجار سرودی زیندانییە سیاسییەکانی بۆ دەگوتین:

السجن ليس لنا نحن الأباة

السجن للمجرمين الطغاة

باسی ژیانی بەندیخانەو ئافرەتە سیاسییە بەندەکانو کێشەکانی نێوانیـانی بـۆ دەگێڕاینەوە، وەك چۆن کێـشە لـەناو هاوڕێیـانی پیـاودا لەبەندیخانـەکانی بەغـداو کوتو نوگرەسەلمانو بەعقوبەدا هەبوو.

کـاتێکیش عوسمـانی کـوڕی کـاتی حوکمەکـەی لەبەندیخانـەدا تـەواوکرد دوور

خێزانیەوە بۆ بەدرە بۆ ژێر چاودێریی پۆلیس دایەش چووە لای ئەو پێکەوەبوون، بۆیەکەمینجارو بەمشێوەیە واتە لەژێر چاودێریی پۆلیسدا هەموو ئەندامانی خێزانەکە پێکەوە کۆبوونەوەو، ئەوکاتە بەسێ منداڵەکەی ئەوکاتەمو بەچوار منداڵەکەی جەمال مارینن خێزانەکە گەورە بووبوو.

شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ساڵی١٩٥٨ بەرپاکراو، چاودێریی پۆلیس هەڵوەشێندرایەوەو هەموومان ڕوومان کردە گەیشتنەوە بەحزبو، دایە جەمیلە لەکۆمەڵەی مافی ئافرەتان کاری دەکردو ئەرکی لەماڵە حزبییە نهێنیەکانو لەپەیام برندا کۆتایی هاتو تەمەنیشی گەورە بوو ئیتر کاری حزبی پێنەدەکراو تووشی جەڵتەی دڵ بوو، کردمە کوڵمو بردمە ناو ئۆتۆمبیل بۆ گەیاندنی بەخەستەخانە بۆچارەسەرکردنی خێرای، بەمجۆرە چارەسەرکراو گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو هەموومان لەسەرپەرشتیو خزمەتیدا بووین، دەیگوت وەسیەتم بێ بۆ ئێوە ئەگەر مردمو کاتێك حزب هاتە دەسەڵات وەرنە سەرگۆڕەکەمو بانگم بکەنو بڵێن حزب گەیشتە ئامانجی خۆی، ئاڵای سوریش لەسەر گۆڕەکەم بەرز بکەنەوە، ئیتر من گوێم لێتان دەبێت بەڵام چاوەڕوانی وەڵامم مەکەن. بەمجۆرە ژیانی ئەم ژنە تێکۆشەر کۆتایی هات، ئەو ئافرەتەی لەبەندیخانەدا فێری خوێندنەوەو نووسین بوو، شیعرو هۆنراوەی شاعیرەکۆنو هەروا نوێیەکانی کوردی لەبەر دەکرد، وەك شیعرەکانی دڵزارو عوسمان خۆشناوو وردیو دڵدار...

بەهیە مستەفا خۆشناو کچەگەورەی جەمیلە عەلی ساعی بوو، خوشکی عوسمان مستەفا خۆشناو، شوی کردبوو بەکرێکارێکی نەوتی کەرکوك بەناوی سەید قادر کە خەڵکی هەڵەبجە بوو، کوڕێکی لێبوو بەناوی (پشکۆ) ئافرەتێکی خۆنەویست بوو، حزب ماڵەکەی کردبووە شوێنی دیدارو چاوپێکەوتنی هاوڕێیانی کرێکار، مێردەکەی مرۆڤێکی سادەو باش بوو، بەهیە دەیگوت ئەوانەی هاتوچۆی ماڵی دەکەن ئامۆزاو خاڵۆزاو خزمینو بۆ کاروباری بازرگانی لەدەرەوەی کەرکوکەوە دێنە ئێرە، هاوسەرەکەشی ڕێگەی لێنەدەگرت، بەڵام بێئەوەی قەناعەت بەقسەکانی بکات، بێدەنگی لێدەکرد تائەو کاتەی هێرشی تیرۆرو داپڵۆسین بۆسەر حزب دەستی پێکرد ئیتر بەرگەی ئەو بارودۆخەی نەدەگرتو بەژنەکەی گوت: من

لە دەمێکەوە تێگەیشتووم کە تۆ پەیوەنیی سیاسیت بەمانەوە هەیە من ئەم بارودۆخەم پێنابرێتەسەر، یان بۆمن بە یان بۆ حزب، ئەویش گوتی: من شیوعیم حزب بەتۆ ناگۆڕمەوە، چی دەکەی بیکە. ئیتر تەڵاقی داو لەوکاتەوە بوونە خێزانێك بۆ حزبو، شوی کرد بەهاوڕێ شەهید جەمال ماریین دوای ئەوەی بووە موسڵمان چونکە ئیسلام هاوسەرێتی موسڵمانی لە ناموسڵمان قەدەغە نەکردووە، حزب نقڵی کرد بۆ بەسرا وەك کادیرێکی فەرمانبەری حزب و بووە ئەندامی کۆمیتەی کرێکاران لەبەسرا.

هاوڕێ جەمال کادیرێکی چالاكو خۆشەویست بوو، جوڵانەوەی کرێکارانیش لەبەسرا بەهێزو چالاکییەکانی فراوان بوو، بۆ بەرگری لەمافەکانی نەقابیو گوزەرانی کرێکارانو بۆ باشکردنی هەلومەرجی کاری کرێکارانی بەندەرو نەوت بەتایبەتی. لەکۆڕی چالاکی کرێکاراندا جەمال ماریین و خێزانەکەی گیرانو ئەوکاتە بەهیەی هاوسەری دوگیانبوو، کوڕە بچکۆلەکەی (دڵشاد) لەگرتووخانەدا لەدایکبوو ، لێرەدا جێگەی خۆیەتی بڵێین سێ کوڕیان بوو بەناوەکانی (شێرکۆو ئازادو دڵشاد)و دواتریش کچێکیان بوو بەناوی (ناسك).

ئیتر دووریان خستەوە بۆ کۆیەو بەڕێوەبەرایەتی ئەوکاتە وەریان نەگرتو بۆئێرانیان دوور خستەوە، بەبێ رێوجێو بێ ئەوەی کەس بناسێتو لەگەڵ هەرچوار منداڵەکەیدا لە پۆلیسخانەکانی ئێراندا مانەوەو ئەندامێکی حزبی (تودە)ی ناسی ئەویش بۆ گەڕانەوە بۆ عێراق یارمەتیداو لەبارودۆخێکی زۆر نالەباری برسێتیو ڕووتی لەگەڵ منداڵەکانیدا، توانییان بگەڕێنەوە کەرکوكو پاش ئەم هەموو ئازارو دەردەسەرییە بگەنەوە حزبو ئینجا گەیشتنەوە خێزانەکەیان لەبەدرە تارۆژی سەرکەوتنی شۆڕشە نیشتمانییە نەمرەکەی ١٤ی تەموز کە دوورخراوەو بەندە سیاسییەکان ئازادکرانو ئەوانیش لەگەڵ جەمال ماریینی هاوسەرو باوك یەکیان گرتەوەو جارێکی تر گەیشتنەوە خێزانەکەیان.

لە کودەتا ڕەشەکەی ٨ی شوباتی١٩٦٣دا حەرەس قەومی توانییان جەمال ماریین بگرن، لەکاتێکدا لەسەر شەقام بەرگری کودەتاگێرانی دەکرد، لەتو پەتو شەهیدیان کرد، دوای خۆی پێنج منداڵی گچکەی جێهێشت کە کەسێکیان نەبوو

بەخێویان بکات بەڵام بەهیەی دایکیان توانی خاوەن کارێکی باش لەشەقامی شێخ عومەر لەبەغدا قایل بکات کە چوار کوڕەکەی لای ئەو کار بکەن تا فیتەریی چاکردنەوەی ئۆتۆمبیل فێربن. بەمجۆرە بایەخی بە بەخێوکردنی منداڵە بێ باوکەکانیداو خۆشەویستی حزبی لەدڵدا چاندن تا وەکو باوکیان بن، بەمجۆرە مانەوە تادوای ڕاپەرینەکەی گەلە قارەمانەکەمان لەساڵی ١٩٩١دا کۆچی دوایی کرد؟

# کارکردن لەکۆیە

پێشتر ئەم شارەو دانیشتوانیم نەدەناسی، بەڵام هەرلەیەکەم ڕۆژەوە کارێکی وایان کرد هەست بەنامۆیی نەکەم، بەڵکو هەروەك یەکێك لەخۆیان ڕەفتاریان لەگەڵ کردم، کۆیە شارێکی دێرینە بەوێنەی دێرینیی کورد لەم کوردستانەدا ، شاری گەورە شاعیری کورد حاجی قادرو مەلا محەمەدی گەورە زانای ئایینیو پێشکەوتنخوازی ناسراوە کە کیژەکەی خۆی ناردە قوتابخانەی سەرەتایی تالەگەڵ کوڕاندا بخوێنێت، لەکاتێکدا لەم شارەدا قوتابخانەیەکی کچیان نەبوو، بەمەش حکومەتی ناچار کرد قوتابخانەیەکی کچان بکاتەوە.

شاری شاعیران دڵزارو عوسمان عەونیو دڵدارو وردی و عوسمان مستەفا خۆشناو، شاری ڕۆشنبیرانو سیاسەتمەدارانی دیارو کەسایەتی کۆمەڵایەتی ناسراوی وەك حەمەئاغای غەفوری و جەمیل ئاغای حەوێزیو کاکە زیادو وەهاب ئاغاو، سەرکردە سیاسییەکانی وەك عەلی عەبدوڵڵاو عومەر مستەفا (دەبابە)و مام جەلال تاڵەبانی و فوئاد مەعسوم و زۆر کەسانی تریش. جگە لەوەش کۆیە شاری زەحمەتکێشانبوو کەزۆربەی زۆری شارەکەیان پێکدەهێنا، ئەم جەماوەرە فراوانەی پیاوچاکانی شارەکە کەلەسەرەتای ناسینتەوە لەگەڵیاندا واتلێدەکەن هەست بکەیت کە بەشێکی لەوانو غەریب نیت لەلایان، بۆیە خۆشمویستن و خۆشیانویستم. ئەم شارە دێرینە تێکۆشەرەی کە هەر لەدژی زۆرداریو چەوسانەوەبووە لەلایەن حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقەوە لەباری ئاوەدانیو ڕێگاوبانی هاتوچۆو خزمەتەکانی شارەوانی وەك ئاوو کارەباو خزمەتەکانی تەندروستیو فێرکردنو بوژانەوەی بزووتنەوەی بازرگانیو کردنەوەی پرۆژەی ئابوورییەوە پشتگوێ خراوە، تائەمساڵانەی کۆتایی سەدەی بیستەم کاڵاکانی بەرهەمی ناوخۆیی سادە لەگەڵ بەرهەمەکانی کشتوکاڵیو بەرهەمەکانی ئاژەڵ لەگەڵ دێهاتەکانیدا ئاڵوگۆڕیان پێدەکرا. کۆیە کە دەکەوێتە سەر

کێڵگەیەکی گەورەی نەوت بەڵام تائێستا بەرهەم نەهێنراوەو، شارەکە دووچاری هەژاری و تەنانەت گیرۆدەی برسێتیو بێکاری لەمێژینەی دەستی کار بووە. بەڵام بەڕێوەبەرایەتی هەرێم لەسلێمانی لەم پشتگوێ خستنە بەئارەزووی ئەم شارە تێکۆشەرە بەئاگاهات، ئەم شارەی چەندان ڕۆڵەی کردۆتە قوربانی لە کۆڕی خەباتی گەلی کوردستانماندا لەپێناو مافە نەتەوەیو دیموکراتییەکان و ژیانێکی بەختیاردا، ئەوەبوو زانکۆی تێدا پێکهێناو بوجەیەکی بەخشندەی بۆ ئاوەدانکردنەوەو بنیاتنانو بۆ دامەزراندنی هەندێ پرۆژەی بەرهەمهێنی پیشەسازیی پێستەو دروستکردنی قوتابخانەو کلینیكو خەستەخانە تەرخانکرد.

گوتم مانگی نۆی ساڵی ١٩٤٦ گەیشتمە ئەم شارەو پێش هەرچی کەوتمە ناسینی هاوڕێیانو لە پێشدا هاوڕێ عوسمان مستەفا خۆشناو و یونس ڕەئوفی پارێزەر (دڵدار)و سەعیدی مەلا ئەحمەدو محەمەد ئەمین قادرو دڵزارو شێخ ئەنوەرو فاتیح ڕەسوڵو کەسانی تر کە بۆ بەخێرهاتنمان هاتبوون. بۆ ڕۆژی سێیەم من و هاوڕێ جابیر پیرداود چووینە بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەی سەرەتایی دووەمو خۆمان ناساندو، کاری خۆمان لەگەڵیاندا ڕێکخست پاشان بۆ چوارەمین ڕۆژی گەیشتنەکەمان، وەك لەیادم بێت، چوومە ناوەندیی کۆیە.

پاش ئەوە داوام لە هاوڕێ عوسمان مستەفاکرد کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی شاری کۆیە ڕێکبخات تا بیانناسم و بزانم چ شێوازێکی ڕێکخستن پەیڕەو دەکەنو بۆ ئەوەی ڕێکخستنی حزبی شیوعی و حزبی ڕزگاریی نیشتمانی لێکجودا بکەینەوە، بۆیە کۆبوونەوەیەك ڕێکخرا بەئامادە بوونی هاوڕێ عوسمانو سەعیدی مەلا ئەحمەدو محەمەد ئەمین قادرو بورهان شێخ نوری و فاتح ڕەسوڵ، پاش بەخێرهاتنو یەکتر ناسین باسی بارودۆخی سیاسیو بارودۆخی شارەکە دەستمانکرد بەباسی بارودۆخی ڕێکخستنی حزبی شیوعی، ڕێکخراوەکەمان گچکە بوو بەڵام چالاك بوو، لەناو خەڵکدا دەسەڵاتێکی فراوانی هەبوو، هەروا سەرکردایەتی ڕێکخراوەکانی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی دەکرد کە ڕێکخراوێکی فراوان بوو، بەڵام لەسەر بنچینەی شارەکە هەموو پێکەوەبوو، بۆیە بڕیارماندا لەسەر بنچینەی ناوچەی نیشتەجێبوون بێت، هەروا بۆ ڕێکخراوەکانی حزبی

ڕزگاریی نیشتمانیش، لەهەندێ ڕێکخراو سەرنجماندا کە هیچ جیاوازییەك لەنێوانی دوو ڕێکخستنەکەدا نییەو، ئەم گیروگرفتانە لەپەیوەندیی هەردوو ڕێکخراوەکەدا چارەسەرکران.

بەمجۆرە لیژنەی شارەکەم وەرگرت چ لەڕووی ڕێکخستن یان ڕۆشنبیرکردنەوە، ئینجا ئەرکەکانمان لەنێوان ئەندامانی لیژنەکەدا دابەشکردو، هەروا لەگەڵ هاوڕێ عوسمان لەبارەی ڕێکخستنەکانی ڕانیەو قەڵادزە و تەقتەقەوە کارمان دابەشکردو، پێکەوە لە چلۆنایەتیو ئاستی ئەم ڕێکخستنانە کۆڵینەوە، داوام لە هاوڕێ عوسمان کرد بەرپرسانی ڕانیەو قەڵادزەو تەقتەق ئامادە بکات تا کۆبوونەوەیان لەگەڵ بکەین، وام بەپێویست زانی هەر بەرپرسێك بەتەنیا ئامادە بێت بۆ ئەوەی بەرنامەی حزبو پەیڕەوی ناوخۆو بەرنامەی حزبی ڕزگاریی نیشتمانییان تێبگەیەنینو بەوجۆرەشکرا، پاشان لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە ڕێکخراوەکانی ئەم شارانە ببنە ڕێکخراوی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی چونکە لەئاستی سیاسیو ڕۆشنبیریو ڕێکوپێکییان نزم بوو، دەبوو یەکەمجار بایەخ بدەین بە بەرزکردنەوەی ئاستی سیاسیو ڕێکخراوەیی ئەم ڕێکخراوانە تابتوانن کەسانی بەتوانان بپاڵێون بۆ ئەندامەتی حزبی شیوعی، هەروا لەئاستی ئەندامانو شانەکانی حزبی شیوعی لەکۆیە کۆڵینەوە، گەیشتینە ئەوەی دەبێ ئەو کادیرانە پەیدا بکرێن کە بکەونە کاری فێرکردن بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی شانەی حزبی، بەڵام ئەمجۆرە کادیرەمان لەڕیزی ڕێکخستنە حزبییەکاندا نەدیتەوە.

ئەو پرسیارەی سەرقاڵی کردبووم ئەمە بوو: ئایا دەتوانم هەموو ئەم ئەرکانە ئەنجام بدەم؟ خۆشم وەڵامم دایەوە: بێگومان ناتوانم گشت ئەم کارانە ئەنجام بدەم. ئینجا گەیشتمە بیرۆکەیەك کەلەهەندێ لەمامۆستایانی ناوەندی لە وانەی ڕۆشنبیری مارکسین داوای ئەنجامدانی ئەو ئەرکە بکەم. بەڵام ئاخۆ بڕیار دەدەن دەرس بەشانەی شیوعی نهێنی بڵێنەوەو لەماڵانی زەحمەتکێشانی شارەکەدا؟ ئەو مامۆستایانەو شارەزایی هەریەکەیانم دیاریکردبوو. کەوتمە پیاهەڵدانی ئەرکی تێگەیاندنی شیوعییەکان لەلایەن مامۆستایانەوە، ئەگەرچی شیوعی ڕێکخراویش نەبن، بەڵێنیشیان دەدەمێ کە نهێنی ئەم کارە بپارێزم. ئەو مامۆستایانەش

مامۆستا جەلال شەریف لەهەولێرەوە کە حزبی نەبوو بەڵام مارکسی بوو، کەریم شاکر لە ئەعزەمییەی بەغداوە کە ئەندامی حزب بوو بەڵام لەکۆیە ڕێکنەخرابوو، ساحیب حەداد لەبەغداوە کەلەحزبی گەل بوو بیروڕای مارکسی بوو. لەگەڵ هەندێك لەمانە بەجیا قسەم کردو، بڕیاریاندا کە ئەم ئەرکە ئەنجام بدەن، بێئەوەی کەسیان بەویتر بزانێ کە ئەو ئەرکەم پێسپاردوون. داوام لە مامۆستا جەلال شەریف کرد کە هەرهەفتەی جارێك بۆ ماوەی سەعاتێك مەحازەرەیەك لەشانەیەکی پێنج هاوڕێیدا پێشکەش بکات سەبارەت بەمەبدەئەکانی ئابوری سیاسی، هەروا مامۆستا کەریم شاکرم راسپارد کە مەحازەرەیەك لەسەر مەبدەئەکانی فەلسەفەی مارکسی بدات. مامۆستا ساحیب حەداد مەحازەرەیەکی هەفتانە بۆ ماوەی سەعاتێك لەشانەیەکی شەش هاوڕێیدا بڵێتەوە، ئەو شانانەشم هەڵبژارد کە لەئەندامانی رادەبینم فێربن هەروا لەوانەی رۆشنبیرو نیوە رۆشنبیرن، ئەوەشم لەبەرچاوگرت کە لەم شانانەدا قوتابیانی ناوەندی نەبن، تابەرێگەی زۆربڵێیی ئەرکی مامۆستاکان لەتێگەیاندنی شانە شیوعییەکان ئاشکرا نەبێت، ئەندامانی شانەکانیشم بەچاکی ئاگادار کردەوە کە نابێ هیچ کەس بەمکارە بزانێ جگە لەشانەکە، جاروبارێش لەمامۆستاکان پرسیاری پەرەسەندنی ئاستی ئەم شانە حزبییانەم دەپرسی‌و ئەوانیش راپۆرتی ئیجابییان لەسەر هەرکەسێکیان لەئەندامانی شانەکان دەدا. پاش سێ مانگ لەم کاری تێگەیاندنە ژمارەیەك لە کادیری رۆشنبیرکردنەوەمان بۆ پێگەیشت‌و ئەندامانی ئەم شانانە رۆڵی تێگەیاندنی شانەکانی تریان دەدی، سەرکەوتنی ئەم تاقیکردنەوەیە هانیداین کە هێرشێکی بەربڵاوی تێگەیاندن لە گشت رێکخستنەکانی ناوچەکەدا دەست پێبکەین بەڵام بەپشت بەستن بەرێکخستنەکانی حزب نەك بەتەمای مامۆستایان، چونکە ئەم توانایەمان لە جێگەکانیتر بۆ نەرەخسا. ئێستا ئیتر دەتوانم بڵێم رێکخراوێکی تێکۆشەرمان هەیە دەتوانێ سیاسەتی حزب بگەیەنێتە خەڵك، ئەندامانی واشمان بۆ پەیدا بوون کە شارەزایی رۆشنبیریی باشیان هەبێت‌و خەڵك گوێ لەقسەیان بگرن چونکە ئاستیان لەخەڵکە سادەکە بەرزتر بوو، دەیانتوانی بیروڕاو سیاسەت‌و هەڵوێستی حزبەکانیتر بدەنە بەرگفت‌وگۆو، بارودۆخی ئابوری‌و

کۆمەڵایەتی‌و سیاسی عێراق تێبگەن. هەروا لەبارودۆخی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان بەشێوەیەکی زانستیانەی بابەتی‌و لەسەر ڕۆشنایی مارکسیزم-لینینیزم تێبگەن.

لێرەدا هەروەك هاوڕێ عوسمان مستەفا بۆی ڕوونکردمەوە، شایانی باسە بگوترێ کە ڕێکخراوێکی بەهێزیان هەبووە. بەتایبەتی بۆ ناوچەی کۆیەو ڕانیەو قەڵادزە بووەو ئامانجەکانیشی لەناوڕۆکدا کۆمەڵایەتی بوون. ئەم ڕێکخراوە لە کۆتایە ١٩٤٥دا ، لەڕێگەی هاوڕێ مەلا شەریفی سکرتێری لقی کوردیی حزبی شیوعی عێراقەوە پەیوەندییان بەحزبەوە کردووە، بۆ ئەوەی بێنە ناو حزب لەسەر ئەمە حزبیش بڕیاریداوە کەڕێکخراوەکەیان بەتەواوی و بەبێ هیچ ئاڵوگۆڕێك بێتە ناو حزبەوە، هەروەك هاوڕێ عوسمان جەختی لەسەر کردووە، بۆیە تەماشامان کرد ئاستی سیاسی‌و ڕێکخراوەیی‌و ڕۆشنبیریی ئەندامانی زۆر نزمەو، پێویست بەبایەخدانێکی باش دەکات تا لەسەر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانی حزب ئاستیان بەرز بکرێتەوە.

لەکۆیە دوو ڕێکخراوی دوو حزب هەبوو: ڕێکخراوی حزبی شیوعی عێراق‌و هاوشانەکەی کە حزبە ڕزگاریی نیشتمانی بوو، ڕێکخراوی حزبی (پارتی) دیموکراتی کورد. ڕێکخراوەکەیان کتێبخانەیەکی هەبوو بەناوی کتێبخانەی حاجی قادر، بەڵام پەیوەندی هەردوو ڕێکخراوەکە باش نەبوو، لەم بارەیەوە لەگەڵ هاوڕێیان گفتوگۆمان کردو بڕیارماندا بەردەوام سەردانی کتێبخانەکەیان بکەین‌و ئەم بار ئاڵۆزییەی پەیوەندیمان نەهێڵین. ئامۆژگاریی هاوڕێیانم کرد کە دەبێ بەهێمنی‌و بەگیانی لێکتێگەیشتنەوە گفتوگۆیان لەگەڵ بکەین نەك بەو گیانەی بڵێ من ڕاستم‌و تۆ هەڵەیت، یان بەگیانی سەرکەوتوو و ژێرکەوتوو.

لەکۆیە دوو بنەماڵەی دەرەبەگ هەبوون، غەفورییەکان‌و حەوێزییەکان، یەکەمیان دەوڵەمەندو خاوەن دێهات‌و خانووبەرەو دووەمیان هەژارو وەك ئەوانی یەکەم دارانەبوون. غەفورییەکان بەرەو (پارتی) دایانشکاندەوەو حەوێزییەکان بەرەو حزبی شیوعی، سەرنجمان دەدا هەردوو لایان زۆر دوور بوون لە پێکەوە گونجان، لەگەڵ هاوڕێیان لەم بارودۆخە کۆڵینەوەو بڕیارماندا چارەسەری ئەم

دیاردەیە بکەین تا نەگوترێ حزبی شیوعی حزبی حەوێزییەکانەو پارتیش حزبی غەفورییەکانە، چونکە حزبی ئێمە بۆ گشت زەحمەتکێشانو خەڵکی نیشتمانپەروەری بەشەرەفەو ئەوەمان لاپەسەند نییە خەڵکی لەسەر بنچینەی خێڵەکی یان تایەفەو، یان خێزانو هەرشتێکی وادابەش بکەین کە خەڵکەکە لێکدوور بخاتەوەو دابەش بکات، ئێمە لەسەر بنچینەی زۆردارو زۆرلێکراو، لەسەر بنچینەی چینایەتی تێدەڕوانین، لەهەلومەرجی خۆشماندا داوا لەهەموان دەکەین بۆ هاوپەیمانیو هاوکاریی نیشتمانیو هێنانەدی بەرەیەکی نیشتمانی بەرفراوان لەدژی ئیستیعمارو لەپێناو سەربەخۆییو سەروەری نیشتمانیو رژێمی دیموکراسیو هێنانەدی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردماندا... بڕیارماندا هاورێیانمان لە حەوێزییەکان سەردانی کتێبخانەی حاجی قادر بکەن و ئێمەش دیداری کەسانی سەرکردایەتییان بکەین، بۆ ئەوەی بارودۆخێکی پێکەوە گونجانو هاوکاریو کاری هاوبەش پەیدا بکەین. بەڵام سەرنجماندا ئەوان خۆ لەنزیکبوونەوە دەدزنەوەو ئەگەر یەکتریش ببینن دەست بەهێرش کردنە سەر حزب دەکەنو ئەو هەڵوێستە نەدەنە بەرپلار کە پەیماننامەی نیشتمانی حزب لەسەر مەسەلەی کورد دایڕشتووە، ئێمەش بۆمان ڕوونکردنەوە کە حزب ئەم مەسەلەیەی لە بەرنامەی حزبی رزگاریی نیشتمانیداو لەوتارەکانی رۆژنامەی (القاعدە)دا کەهاوڕێ فەهد خۆی دەینووسین چارەسەر کردووەو هەروا لە وتارێکیدا داوای لەنیشتمانپەروەرانی کورد کردووە حزبێکی جەماوەریی دیموکراتی دامەزرێننو حزبی ئێمە پشتگیریی و یارمەتی ئەم حزبە دەدات کەلەپێناو مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورداو لەخەباتی هاوبەشدا دژی ئیستیعمارو لەپێناو سەربەخۆیی و دیموکراتی لەعێراقدا کارو خەبات دەکات.

بەڵام وێڕای ئەم هەموو ڕوونکردنەوانە لە خولیای ئەوەدابوون هاوکاری لەگەڵ حزبی گەل-الشعب- یەکێتی نیشتمانیو حزبی نیشتمانی دیموکراسی بکەن، هەرچەندە ئەم حزبانە مافی چارەنووسیان بۆ گەلی کورد بڕیار نەدابوو، هەڵوێستیان لەمافە نەتەوەییەکان ڕوون نەبوو، جگە لەبەرزکردنەوەی دروشمی "یەکسانی" کە ناتوانرێ بهێنرێتە دی، پێمان دەگوتن بەپێی باری سەرنجی

زانستیانەی مەسەلەی یەکسانی مانای ئەوەیە، گەلی عەرەب لەعێراق دەوڵەتی خۆی دامەزراندووەو قەوارەی خۆی پێکهێناوە، ئاخۆ ئەم حزبانە بەیەکسانی گەلی کورد لەگەڵ گەلی عەرەبو بەمافی چارەنووسو هێنانەدی دەوڵەتی کوردی قایل دەبن؟ ئەوەیە مانای یەکسانی وەك ئێمە تێیدەگەین، بەلام حزبە بۆرژوا لیبرالیە عێراقییەکان کاتێك دروشمی یەکسانی هەڵدەگرن مەبەستیان تەنیا یەکسانییە لەئەرکەکاندا بەبێ مافەکانو مافی بڕیاردانی چارەنووس لەناوەڕۆکی ڕاستەقینەی بەتاڵدەکەنەوە کە مانای مافی جیابوونەوەو هێنانەدی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆیە.

ئێمە وابەستەی سیاسەتی حزبو هەڵوێستەکانی بووین لەئاستی حزبە نیشتمانییە عێراقییەکانو حزبی دیموکراتی کوردی (پارتی) هەرچەند لێمان دووردەکەوتنەوەو هەوڵیان دەدا حزبی شیوعی پشتگوێ بخەنو لێوەی دووربن، چونکە ئەو قۆناغە مێژووییەی پێیدا تێپەڕ دەبین، واتە قۆناغی ڕزگاریی نیشتمانی، وا پێویست دەکات هاوپەیمانییەکی سیاسی بەرین پێکبهێنرێتو هێزە کۆمەلایەتی و سیاسییەکان کۆبکرێنەوەو لەبەرەیەکی نیشتمانیدا ڕێکخرێنو راپێچی خەبات بکرێن لەدژی ئیستیعمارو لەپێناو سەربەخۆییو سەروەریی نیشتمانیو دیموکراسیداو، ئەم ئەرکانەش تەنیا ئەرکی حزبی شیوعیو جەماوەری زەحمەتکێش نییە، بەڵکو هەروا ئەرکی گشت حزبو هێزە سیاسیو کۆمەلایەتییە نیشتمانپەروەرەکانیشە، واتە ئەم ئەرکانە کاکڵی ئەو بەرنامە هاوبەشەی گشت حزبە نیشتمانپەروەرو دیموکراسییەکان پێکدەهێنن. بۆ تێگەیشتنی تەواوی ئەم مەسەلەیە هۆشمەندییەکی سیاسیی بەرزو هەست بەبەرپرسی نیشتمانی و نەتەوەیی پێویستە، وێڕای دەستبەردان لەتاقمگەری و حزبایەتی تەسك و بەرژەوەندی خۆییو کاتیو، وابەستەبوون بەئامانجو بەرنامەی هاوبەشەوە دوای دەستنیشانکردنی هێزە سیاسیو کۆمەلایەتییەکان کە دەبێ هەوڵ بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانێتییان بدرێت، جا وێڕای جیاوازیی چینایەتیو هزری پێویستە پێکەوە ژیانیان لەگەڵ ئەنجام بدرێو لەماوەی قۆناغێکی مێژوویی تەواودا هاوکارییان لەگەڵ بکرێ، چونکە حزبە ئێمە قۆناغەکانی تر نابوێرێو بازیان بەسەردا بدات،

چونکە ئەو قۆناغـەی لێکمـان جوداد‌ەکاتـەوە هێشتا دوورە، هـەروا حـزب لەگـەڵ هاوپەیمانەکانی بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی ئەم قۆناغە کە پێکەوە کۆماندەکاتەوەو قۆناغی ڕزگاریی نیشتمانی دیموکراتییە کار دەکات.

هەروا لەیادمـە چۆن داوامـان لێدەکردن پێکـەوە هاوکاری بکـەین بـۆ بـەرگری لەداخوازییـەکانی جـەماوەرو ئاوەدانکردنـەوەی کۆیـە، بـەڵام ئـەوان ئەنجامـدانی ئـەمجۆرە چـالاکییەیان ڕەتـدەکردەوە، وەك داوای چـاکردنەوەی ڕێگـای کۆیـە– کـەرکوك و کۆیــە–هــەولێرو کارەبـاو ئـاوو کردنـەوەی شـەقامەکان لەناوشـارداو ئاوەدانکردنـەوەی شـارەکەو دۆزینـەوەی کـار بـۆ بێکـاران‌و دامەزرانـدنی پـرۆژەی بەرهـەمهێن وەك گـەچ‌و چـاکردنی بـەردی خـانوو بایەخـدان بـەتوتن‌و ڕێگەنـەدانی بردنی دانەوێڵـە بـۆ دەرەوەی قـەزاکـەو بەمەبەسـتی دابینکردنـی نـانی خـەڵك. بـۆ نمونە ئەوەبوو شارەکە مانگرتنی گشتی ڕاگەیاند لەدژی بردنی گەنم بـۆ دەرەوەی قەزاکەو کۆمیتەیەکی میللی لە نوێنەرانی گشت بەشەکانی گەل دامەزرا بـۆ هێنـانی گەنم بـۆ نـاو بـازاڕ و بەهـەزاران تـەن لـە مەخزەنـەکانی بازرگانـەکانی دانەوێڵـەداو لەماڵەکانیاندا دۆزرانەوەو، خەڵکی کەوتنە کڕینی گەنم بۆ ئـەوەی لـەوەرزی پـایزو زستان‌و بەهاردا بەشیان بکات، بۆ ئەوانـەش کـە توانـای کڕینیـان نـەبوو کۆمیتـە میللییەکان پیتاکیان بۆ یاریدەی ئەو هەژارانـە کـۆدەکردەوەو هەرچـی دانەوێڵـەی ئەو بازرگانانە هەبوو تۆمار دەکران‌و نرخی ئەوەندەی بفرۆشرایە پێیان دەدراو ئەو گەنمەشی بمایەوە بۆیاندەناردنەوە، دەسـەڵاتی حکومـەت لـەناوخۆدا هـەوڵی دەدا کۆسـپ بێنێتـە ڕێگـەی ئـەو کۆمیتانـە لەگـەڕان بـەدوای دانەوێڵـەداو لەڕێگـەگرتن لەئۆتۆمبیلە لۆرییەکان کە بەباری گەنمەوە لەشار دەرچن‌و یان بارەکانیان داگرن‌و بەخـەڵکی بفرۆشـن، بـەڵام جـەماوەر ڕێگـەی نـەدا پـۆلیس تـەنگ بەئەنـدامانی کۆمیتەکان هەڵچنن.

ئەوکاتە داوامان لەهەمووان کرد (بەپارتیشەوە) بۆ بەشداریی خۆپیشاندانەکانی نـان کـە پـێش ڕاپەڕینەکـەی کـانونی ١٩٤٨ ئـەنجام دەدران، بـەڵام ئـەوان لـەم چالاکییانەداو لەو داخوازییانەدا کە تایبـەت بـوون بـەباری ژیـان‌و بـژێوی ڕۆژانـەی خـەڵك بەشـدارییان نـەکرد. هـەروا داوامـان لێکـردن چـلاکی‌و ئاهـەنگی هاوبـەش

لەجەژنەکانی نەورۆزدا ئەنجام بدەین، بەڵام ئەوەشیان ڕەتکردەوە، وێڕای ئەوەش توانیمان قەناعەتیان پێبکەین کەلەخۆپیشاندانو هەڵسورانی هاوبەشدا لەڕاپەڕینی کانونی ١٩٤٨دا لەگەڵمان بەشدار بنو وەفدێکی هاوبەش بنێردرێ بۆ بەشداریی لەکۆنگرەی شیراندا –مؤتمر السباع– کەیەکەمین کۆنگرەی قوتابیان بوو لەدوای ڕاپەڕینەکەی کانون لەگۆڕەپانی –السباع– دا لەبەغدا پێکهات.

ئەو هەموو هەڵوێستە سەلبییانە لەسەر ڕەوتی سیاسی شیوعییەکان ڕەنگی نەدایەوەو هەربەپێویست دەزانرا دەستی هاوپەیمانیو هاوکاری لەنێوان حزبی شیوعیو حزبە نیشتمانپەروەرو نەتەوەپەروەرە دیموکراتەکاندا، عەرەب بن یان کورد درێژ بکرێت، حزب لەسەر داوای ئەوە بەردەوام بوو کە پێویستە هاوپەیمانییەکی سیاسی لەنێوان خۆیو ئەو حزبانەدا پێکبێت وەك ئەرکێکی نیشتمانیو مێژوویی و وەك ئەرکێك لەپێش گشت ئەرکەکانی تردا. مێژووی خەباتو هەڵوێستەکانی حزب لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە شایەتی ئەوە دەدەن.

لەرۆژانی یەکەمی گەیشتنمە کۆیە ویستم ئاگاداری چالاکییە وەرزشییەکانی هەردوو قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمو دووەم ببم بۆیە چوومە سەردانی مامۆستا کەمال مامۆستای وەرزش لەقوتابخانەی یەکەم، لەکاتێکدا کە لەپۆلی شەشەم لەدەرسدابوو، لەوێدا قوتابییەکی پێناساندم بەناوی جەلال شێخ حیسامەدین تاڵەبانی(دواتر ناوی بووبە مام جەلال). لەمامۆستا کەمالم پرسی: بۆچی لەناو هەموو قوتابییەکاندا بایەخ بەم قوتابییە دەدەی؟ وەڵامی دایەوە: چونکە ئەمە زیرەکترین قوتابییە لەم تەمەنەیدا کە (١٢ساڵانە) بایەخ بەسیاسەت دەدا، بەتایبەتی مەسەلەی کورد پتر لەبایەخدانی پیاوەکانو شیکردنەوەکانیشی پێگەیشتوون. ئینجا گوتی: من لەوەوە شت فێر دەبمو من مامۆستای ئەو نیم، رۆژانە کتێبو گۆڤارو رۆژنامە دەخوێنێتەوەو زۆر بەبایەخەوە سەرنجی هەواڵەکانی جیهان دەدات، بۆیە لەسیاسەتدا بەمامۆستای خۆمی دەزانم و تەنانەت لەدەرسەکانی تریشدا چونکە پێشەکی دەرسەکان لەکتێبەکانی قوتابخانەدا دەخوێنێتەوەو بەبێ مامۆستا بەچاکی تێیاندەگات، لەبەر ئەوە من زۆر پێی سەرسامم کەلەو تەمەنە بچوکەشدایەو وەك سەرکردەیەکی سیاسی لە پارتی

دیموكراتی كورددا دەجولێتەوە.

لەراستیشدا هەروابوو، ئاستی سیاسیو فێربوونی لەگەڵ تەمەنیدا نەدەگونجا. جارێكیان وەك لەیادم بێت پرسیاری بابەتێكی لەمێژوودا كردكە لەدوایی كتێبە بڕیاردراوەكەدا بوو، منداڵەكان هێشتا ئەم دەرسەیان نەخوێندبوو، چونكە بۆ دوایی ساڵی خوێندن بڕیاردرابوو، بەقوتابییەكانی گوت: ئێمە هێشتا لەرۆژانی یەكەمی خوێندنداین، وێڕای ئەوەش بەشێوەیەكی ڕاست وەڵامی پرسیارەكەی دایەوە ، قوتابییەكان سەرسام بوون چونكە چۆن دەتوانێ وەڵام بداتەوە بەبێ ئەوەی مامۆستا دەرسی پێگوتبێ، لەبەر ئەوە قوتابییەكان خۆشیان دەویستو ڕێزیان دەگرت هەروا مامۆستایانیش. من لەم دەرسەدا نەبێ كە مامۆستا كەمال بانگی كردەلای خۆیو وەك قوتابییەكی زیرەكو سیاسییەكی بەهێزو دەركەوتوو پێی ناساندم نەمناسیبوو. پاشان وارێكەوت لەسەردانێكمدا بۆ كتێبخانەی (حاجی قادر) لەوێ دیمو لێی پرسیم: مامۆستا كورد نەتەوەیە یان نا؟ منیش گوتم: بۆچی ئەم پرسیارە لەناكاوەت كرد؟ وەڵامی دایەوە: چونكە ئێمە لەگەڵ ڕزگارییەكاندا گفتوگۆ دەكەینو ئەوان دەڵێن هێشتا مەرجەكانی نەتەوەیان تەواو نەكردووە، ئێمەش دەڵێین كورد نەتەوەیە. دەمانەوێ بیروڕای تۆ لەمەدا بزانین. پێمگوت: لەباری سیاسییەوە بەڵێ كورد نەتەوەیە، ئەگەر بچیتە ئێرانو توركیاو عێراق و لەهەر كوردێك بپرسیت سەربەكام نەتەوەیە لەوەڵامدا پێت دەڵێت من كوردم و قەومییەتو نەتەوەم كوردە، كەوابوو خواستی كورد هەموویان هەریەكە، دەشیانەوێ قەوارەیەكی سیاسیی یەكگرتوویان هەبێتو ئەم قەوارە سیاسییەیە بنچینەی تەواو بوونی نەتەوە، نەتەوەی فەرەنسی لەدوای شۆڕشەكەی فەرەنسا پەیدا بوو لەئەنجامی لەناوبردنی دەرەبەگیدا و هاتنەكایەی ڕژێمێكی سیاسیی بۆرژوا، كە گشت چەپەرەكانی دەرەبەگیو ئابوری نەهێشتو فەرەنسییەكانی لەرژێمێكی كۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیی یەكگرتوودا ڕێكخست، گەلی كوردیش پێویستی بەپێكهێنانی ئەم قەوارە سیاسییە یەكگرتووە هەیە هەروا لەناوبردنی دابەشكاریو پەرتبوون لە ئیستیعمارییەكان بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیی ئابوری و سیاسییان.. لەكتێبخانەكە چەندان سەركردەی (پارتی) لەوێ بوون، وەڵامی

دامەوە کە ڕزگارییەکان مەسەلەکە بەمشێوەیە باسناکەن وەك تۆ باستکرد، پێم گوت ئەوەیە باری سەرنجدانی زانستانە لەپێکهاتەی نەتەوەکاندا.

بۆ ساڵی خوێندنی دوایی لەبرادەرەکانی پێشکەوتووتر بوو لەپۆلی شەشەمی سەرەتایی دەرچوو، بووە قوتابی لەناوەندیی کۆیە، حەزی لەیاری وەرزش نەدەکرد بەلاّم زۆر دەجولاّو حەزی لەدانیشتنو ئۆقرەگرتن نەدەکردو، لەناو پۆلەکەشدا لەسەر کورسییەکەی خۆی چەندان جار هەڵدەستاو لەگەڵ ئەمو ئەو قسەی دەکردوحەزی بەگفتوگۆو دەمەدەمی گەرم هەبوو.

لەناوەندی کۆیە مانگرتنی قوتابیان ڕوویداو، پێموایە ئەمە یەکەم مانگرتنی قوتابیان بوو بۆ داخوازی کەلەعێراقداو لەقوتابخانەیەکی ناوەندی ڕوویدات. هۆی مانگرتنەکە سەرمای زۆری ئەو ساڵە بوو، پارەش بۆ کرینی داری سوتاندن کەم تەرخانکرابوو، بەشی دارکرینی بۆ سۆپاکان نەدەکرد کە پۆلەکانی خوێندن گەرم بکەنەوە، قوتابییەکان مەزبەتەیەکیان بۆ زیادکردنی داری سوتاندن دایە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بەلاّم (شەوکەت ئەفەندیی) بەڕێوەبەر گوتی ئەو پارەیەی تەرخانکراوە بەش ناکات بۆیە قوتابیان مانیان لەخوێندن گرت. ئەم مانگرتنە لەگشت لایەکی عێراقدا دەنگی دایەوە. لەهەموو ناوەندیو دواناوەندییەکانو پەیمانگەکانەوە هەرلەفاو تا زاخۆ پشتگیریی مانگرتنەکە کرا. ڕۆژنامەکان هەواڵی مانگرتنەکەیان بلاّوکردەوە، (شەوکەت ئەفەندیی) بەڕێوەبەر سەرسام بوو چۆن هەواڵی مانگرتنەکە وا بلاّو بۆوەو قوتابیان لەهەموو لایەکەوە پشتگیرییان کردو، هەواڵی مانگرتنەکە چۆن گەیشتە فاو و بەسراو گشت لایەکی عێراق و گەیشتە ڕۆژنامەو حزبە سیاسییە مۆڵەتدراوەکان، لەمانگرتنەکەدا گشت قوتابیانی شیوعیو پارتیو سەربەخۆکان بەشدارییان کردو، پێموایە مانگرتنەکە دە ڕۆژی خایاند قوتابیان داخوازییەکانیان هێنایەدی بەلاّم بەڕێوەبەرە باشەکەیان (شەوکەت ئەفەندی) لەدەستداو لەجێگای ئەو بەڕێوەبەرێکی خۆپارێزی پیریان لەپاشماوەکانی سەردەمی عوسمانی لە موسڵەوە هێنا بەناوی (عەبدولڕەزاق ئەفەندی). شایانی باسە کەسوکاری قوتابیانیش پشتگیری مانگرتنەکەیان کردو سەرگەورەی قوتابییەکان هیچ زەبرێکیان نەخستە سەر ڕۆڵەکانیان.

(شەوکەت ئەفەندی) بەڕێوەبەر هەوڵی دا کاربکاتـە سـەر سـەرگەورەی خێزانـی قوتابییـەکان کـە بڕێکـی زۆر داری سـوتاندن بـۆ قوتابخانـە بنێـرن، بـەڵام لەمـەدا سەرنەکەوتو داوایان لێکردن کە دەبێ داوا لەبەڕێوەبەری مەعاریفی هەولێر بکـات کـە پـارەی تـەرخانکراو بـۆ سـوتەمەنی زۆرتـر بکـات چـونکە ئەمـە مـافێکی قوتابییانە... مانگرتنەکە چاکترین هاوکاریی قوتابیـان بـوو، دەرسـێکی زۆرباشـی خـەباتگێڕی بـوو، لەراسـتیدا ئامـانجو داخوازییـە هاوبەشـەکانی هێزەکـانی گـەل یەکدەخەن لـەکاری هاوبەشـداو کێشەی لابـەلای ناوخۆیـان نـاهێڵێ و بڕوابەیـەکتر کردنی هاوبەش لـەنێوان هێـزە کۆمەڵایـەتیو سیاسـییەکاندا پـیتر دەکـات. بـەڵام کاری هاوبەشی تر ئەوە بوو، هەردوو حزبەکە یـان بـابڵێین هـەردوو ڕێکخراوەکـەی حزبـی شـیوعی و (پـارتی) لـە کۆیـە بەشـداریی گشت چـالاکییە جەماوەرییـەکان دەکەن، وەك خۆپیشاندان، ناردنی وەفدی هاوبەش بۆ بەغداو، هانـدانی مزگـەوتو کەنیسـەو تـەورات کـە ناوبـەناو سـەردانی یـەکتری بکـەن بـۆ دۆزینـەوەی زمـانی لێکتێگەیشتنو بەتینکردنی خۆشەویستیو برایـەتی لـەنێوان ئایینەکانـداو پێکـەوە ژیان بەئاشتیو ئاسایش لەیەك وڵاتدا.

لەگەڵ برادەری خۆشەویستمو تێکۆشەری گەورە عـەلی عەبـدوڵا کۆدەبوومـەوەو پێکەوە بەخێرایی لیك تێدەگەیشتینو کارمـان پێکـەوە دەکـرد، دەبـوو وەفـدێکی هاوبەشـی قوتابیـان بنێـرین بـۆ بەغـدا بـۆ بەشـداریکردن لـەکۆنگرەی (سـباع)دا، ڕێکەوتین لەسەر نـاردنی وەفـدێکی چـوار کەسـی دوو قوتـابی لـەوانو دووقوتـابی لەئێمـە، بـۆ وەفدەکـەی پـارتی کێشـەیەك ڕوویـدابوو، مـام جـەلال داوای کردبـوو لەوەفدەکەدا بەشدار بێت لەکاتێکدا تەمەنی لە ١٣سـاڵ تێپـەڕی نـەکردبوو، بـەڵام زۆر چالاکترو لەباری سیاسییەوە لەئەندامێکی تری وەفدەکە بـەناوی حیـسامەدین تەیب پێگەیشتووتربوو، هەرچەندە ئەمیان پێنج ساڵێك لـەو گـەورەتر بـوو. ئـەوە بوو مام جەلال نێردرا بۆ کۆنگرەی سباع و لەکۆنگرەکـەدا بـچوکترین قوتـابی بـوو بەڵام چالاکترین قوتابی وەفدەکـەی کۆیـە بـوو. تـوانی ڕۆڵـی قوتابیـانی کۆیـە لـە بزووتنـەوەی قوتابیانـدا دەربخـاتو سـەرکردەکانی یـەکێتی قوتابیـان بناسـێو مەسەلەی کورد لەکۆنگرەکەدا دەربخات. کاتێـك وەفدەکـەی قوتابیـانی ناوەنـدیی کۆیە لەکۆنگرە گەڕانەوە دەستی کردە باسی کۆنگرەکەو جوڵانـەوەی قوتابیـان و

دەورگێڕانی وەفدەکە لە کۆنگرەکەدا، کە لەڕاستیدا دەورگێڕانی خۆی بوو، ئەم باسەی بۆ ئێمەو کۆمەڵە قوتابیو خەڵکی تر کە دەیبینین دەگێڕایەوە. لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە کۆنگرەی سباع ئەنجامێکی ڕاپەرینە نیشتمانییەکەی کانون بوو، نەتەوەپەروەرانی عەرەبیش بەتایبەتی تاقمەکەی حزبی ئیستیقلال- سەربەخۆیی دەورێکی تێکدەرانەیان هەبوو، وەك پۆلیس لەدژی بزاڤی دیموکراتی قوتابیان دەجولانەوە هەرچەندە ژمارەشیان کەمبوو، جولانەوەی نیشتمانیو دیموکراسیو، بەتایبەتی حزبی شیوعی کەوتەبەر هێرشێکی یەمینیو سیاسی حکومەت، وێرای جولانەوەی دیموکراسی قوتابیان و یەکێتییە تێکۆشەرەکەیان، لەبەر ئەمە یەکێتی نەیتوانی لەباروددۆخێکی تیرۆرو داپلۆسیندا و پاش دەستگیرکردنی سەرکردەکانیو درانیان بەدادگای عورفی لەسەر کارکردن بەردەوامبێ.

هەر لەساڵی ١٩٤٩لەیەك پچڕاین، من بۆ کاری نهێنی و خۆشاردنەوە لەچاوی پۆلیس و بۆ بەندیخانەکانو ئەویش نەمدەزانی لەچیدایەو زۆرجار دووربەدوور هەواڵی مام جەلالم پێدەگەیشت کە جارێك لەگەڵ فلان دەستەو فیسار تاقمە لەناو پارتیداو جارێکیان کەوەك نوێنەرێکی نهێنی نێردراوە بۆ فێستیڤاڵی لاوان و خوێندکارانی جیهان.

پاش ونبونێکی درێژخایەنو دوای شۆڕشەکەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨لەناو وەفدێکی پارتیدا دیتمەوە کە هاتبوون بۆ پەیوەندی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق، بۆ سازدانی گفتوگۆ لەگەڵ حزبی شیوعی لەسەر بارودۆخەکەو لەسەر مەسەلەی هاوکاریو چارەسەرکردنی بارودۆخی هەڵسوڕان لەگەڵ پارتی واتە لەگەڵ ئەو دەستە بەشەی بەرەنگاریی سەرکردایەتی هەمزە عەبدولاّ بوونەوە، ئەو سەرکردایەتییەی هاوپەیمانی کردو بەرەیەکی دوو قۆڵی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق پێکهێنا، ئەمەش دوای ئەوەی حزبەکانی بەرەی یەکێتی نیشتمانی قایل نەبوون پارتی وەك ئەندامی ئەو بەرەیە قبوڵ بکەن. مام جەلال هەرخۆی بەتەنیا بوو، ئێمەش سێ هاوڕێ بووین، سەلام عادلو هادی هاشمو من. مام جەلال لەپێشچاوخستنی هەڵوێستەکانی پارتیدا سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە نەگەیشتینە هیچ ئەنجامێکی پۆزەتیڤ.

# بزووتنەوەی جوتیاران

پاش ئەوەی بارودۆخی ڕێکخستنی حزبیمان لەشارەکانی کۆیەو ڕانیەو قەڵادزەو تەقتەق سەقامگیر بوو، ئەمەش لەسەر بنچینەی شوێنی نیشتەجێبوون(چونکە لەو شارانەدا هیچ کارگە نەبوون تا کرێکاران لە ڕێکخراوی نەقابیو حزبیدا ڕێکخرێن جگە لەکرێکارانی وەرزی لەبواری بیناسازییو گەچدا). پاش ئەوەی کۆمیتەی حزب لەبارودۆخی دێهاتی کۆیەی کۆڵیبەوەو، پاش ئەوەی هاوڕێ (دڵدار) یونس ڕەئوف ڕاپۆرتێکی لەسەر بارودۆخی جوتیاران وپەیوەندییە کۆمەڵایەتیو ئابورییەکانو پەیوەندییان بەدەرەبەگەکانەوە پێشکەشکرد، بڕیارماندا تەواوی ڕێکخراوەکە بخەینەکار بۆ دۆزینەوەی بنکە لە گوندە سەرەکییەکانو لە قۆناغی یەکەمدا، ئەمەش بەڕێگەی ئەو جوتیارانەی دێنە شار بۆ سەردانی دایەرەکانی میری یان بۆ بازارکردن و بۆ سەردانو هەندێ جاریش سود وەرگرتن لەپەیوەندییەکانی خزمایەتی یان پەیوەندییەکانە خێڵەکیو، هاوڕێ (دڵدار) ڕاسپێردرا کەلەکاتی سەردانی دایەرەکانی میریدا ئاسانکارییان بۆ بکات، لەماوەی سێ مانگی ئەو بەرنامەیەدا کە لەڕاستیدا بۆ شەش مانگ دامانابوو زۆر لەو بەرنامەیەمان تێپەڕاند، لەبەرئەوە لەسەرمان پێویست بووبەرنامەیەکی تر دابنێینو، بۆ ماوەیەکی کورتترو، ئیتر هەربەتەمای ڕێکخراوی شارنەبینو هەوڵبدەین کۆمیتەیەکی جوتیاران پێکبهێنین، ئەمەش پاش ئەوەی تەماشامانکرد لەناو ئەو جوتیارانەی پەیوەندییان لەگەڵ حزب پەیداکرد، کەسانی واهەبوون بتوانن سەرکردەیی بزووتنەوەی جوتیاران لەناوچەیەکی دیاریکراو بکەنو ناوبانگیشیان لەناو جوتیاراندا باش بێتو خوێندنو نووسین بزانن. جا بەگوێرەی ناوچە جوتیارییەکان کارمان دابەشکرد بۆ پێکهێنانی دامەزراندنی کۆمیتەکانی جوتیاران بەچوار بەشەوە:

خۆرهەڵاتو خۆرئاراو باشورو باکوری کۆیە، چالاکترین کۆمیتەش کۆمیتەی

خۆرئاوای کۆیە بوو ئەمەش بەهۆی کادیری جوتیاری هاوڕێی شەهید عەلی مەولود خەڵکی گوندی (داربەسەر)، لەقۆناغی یەکەمدا ئەندامانی هەرکۆمیتەیەکمان بانگ کرد بۆ کۆبوونەوە لەگەڵیان و بۆدوو ڕۆژ لەکۆیە دەمانهێشتنەوە بۆ گووتنەوەی مەحازەرەیەکی ڕۆشنبیری بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی سیاسیو ڕۆشنبیرییان و لێکۆڵینەوەی گیروگرفتو داخوازیی جوتیاران و بارودۆخی دەرەبەگو پەیوەندییان لەگەڵ جوتیاران و جۆری قەبارەی موڵکایەتییان و ئەو بەشەی لەجوتیارانی وەردەگرن و کاری سوخرەو باجی ژنهێنان و شووکردن و... شتیوا. زانیاری باشیشمان لەسەر بارودۆخی جوتیاران و بارودۆخی دەرەبەگو موڵکایەتی گچکەی جوتیاران دەستکەوت چونکە ئەو دەم حزب لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوان و بەرنامەیەکی کشتوکاڵی گشتگیرو وردی تائەوکاتە نەبوو، جگە لەوەی حزبی ڕزگاریی نیشتمانی لەبەرنامەکەیدا خستبوویە بەچاو کەئەمەش بۆ چارەسەری بنەڕەتیی مەسەلەی جوتیاران نەبوو بەڵکو بۆ چاری هەندێ گیروگرفت بوو وەك کەمکردنەوەی موڵکانەو زۆرترکردنی بەشی جوتیار لەبەرهەمهێنانداو دابەشکردنی زەوییەکانی میری بەسەر جوتیارە بێبەشکراوەکانداو ڕێگەنەدانی دەستدرێژیی بۆسەر جوتیاران و هەڵوەشانەوەی یاسای داوای خێڵەکی و یاسای ماف و ئەرکەکانی چێنەرەکان..هتد. ئەم بەرنامەیەی ئێستا کەلەناو بەرنامەکەی حزبی ڕزگاریی نیشتمانیدا ڕاوێژکارێکی بنەڕەتی بوو بۆ جولآندنی جوتیاران و داوای ئاستی کەمی مافەکانیان و، بۆ بارودۆخی جولآنەوەی جوتیاران لەعێراقدا.

ئێمە ڕاپۆرتمان بەسەرکردایەتی حزب پێشکەش دەکرد سەبارەت بە بزووتنەوەی جوتیاران و گیروگرفتەکانی کشتوکاڵ بەتایبەتی گیروگرفتی توتن و گیروگرفتی باخەکان و ئەو نەخۆشییانەی تووشی میوە دەبوون و پێویستی نەهێشتنیان و پیشەسازی لەقوتونانی میوە، داوامان لەحزب دەکرد بەرنامەیەکی کشتوکاڵی هەبێ لەبارەی موڵکایەتی زەوی و زارەوەو دەرهێنانیان لەدەست دەرەبەگەکان و خاوەن موڵکە گەورەکان و دابەشکردنیان بەسەر جوتیاراندا کە پارچەی بچوکیان بدرێتی بەجۆرێکی وا جوتیاری گچکە بتوانێ بەرهەمی بهێنێت ئەمەش دوای یارمەتی و پشتگیریی حکومەت و بەرێگەی پێکهێنانی کۆمەڵەی

هەرەوەزیی جوتیاران بۆ بەرهەمهێنان‌و بردنە بازاڕ. حزب نەیتوانی بایەخی خۆی بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان بکات بەشێوەیەك لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەیەکی چینایەتی ورد لەلادێدا بکرێت‌و بەرنامەیەکی دیاریکراو بۆ مەسەلەی جوتیاری دابنرێت، تادوای شۆڕشەکەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨کە چەند هەوڵێك درا بۆهێنانەدی ئەم پرۆژەیە کەئەمەش خۆی لەخۆیدا پرۆژەیەکی ریشەیی نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دروشم‌و داخوازییانەی لە بزووتنەوەی جوتیاریدا لەلایەن حزبەوە دارێژرابوون لەگەڵ کۆڕو کۆمەڵە جۆربەجۆرەکانی جوتیاراندا دەگونجان‌و بەپێی خواستی جوتیارە هەژارەکان‌و ناوەندەکان‌و دەوڵەمەندەکان بوون‌و ئەم سێ توێژەی جوتیاران دروشمێك یەکی دەخستن ئەویش دروشمی لەناوبردنی دەرەبەگ بوو لەلادێ.

# دەستگیرکردنی هاوڕێ فەهد لەساڵی ۱۹٤۷دا

دامودەزگایەکانی ئیستیعمارو نۆکەرانیان لەحکومەتە کۆنەپەرستەکانی وولاتو ناوچەکە خۆیان پێڕانەگیرا کە بزووتنەوەی نیشتمانی ڕزگاریخوازیی پەرەبسێنێو ئەو ئازادییە دیموکراتییە کەمەی دەسگیرکرا ببینێ، بۆیە هێرشی توندی بەراوەژووی لەئێران ئەنجامدا دژی هەردوو بزووتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوازی ئازەربایجانو کورد، کۆماری دیموکراسی ئازەربایجانو کۆماری دیموکراسی کوردی لەمەهاباد ڕووخاندو، سەرۆکی کۆماری مەهاباد قازی محەمەدی لەسێدارەداو، هێزەکانی بارزان بەسەرۆکایەتی بارزانی مستەفا ناچار بوون پەنابەرنە بەر یەکێتی سۆڤیەتو، چوار ئەفسەرەکەی کورد عیزەت عەبدولعەزیزو، مستەفا خۆشناو و محەمەد قودسیو خەیروڵا عەبدولکەریم گەڕانەوەو، لەرۆژی ۱۹ی حوزەیرانی۱۹٤۷دا لەسێدارەدرانو، هەر ئەو ساڵەش شێخ ئەحمەدی بارزانی فەرمانی لەسێدارەدانی درابەسەرداو خرایە ژووری ئیعدام بەڵام حوکمەکەی جێبەجێ نەکراو، هەر لەوساڵەدا حکومەتی عێراق هێرشی بردە سەر ئازادییە دیموکراتییە کەمەکانو، حزبی (شەعب)و (الاتحاد الوطني) هەڵوەشاندەوەو سەرکردەی حزبی شیوعی عێراق هاوڕێ یوسف سەلمان (فەهد)[1] لە۱۸ی کانونی دووەمی۱۹٤۷دا دەستگیرکراو هاوڕێ زەکی محەمەد بەسیم لەگەڵیدا بوو، من لەچایخانەی (تەمتەمان) لەکۆیە دانیشتبووم کە ئێستگەی رادیۆی بەغدا هەواڵی دەستگیرکردنی هاوڕێ فەهد سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی لەگەڵ هاوڕێ زەکی بەسیم بلاوکردەوە.

ئەم هەواڵە لەلای من یەکجار سەختو گران بوو، نەمتوانی لە چایخانەکە بمێنمەوەو دەرچووم، ئەوانەی لەچایخانەکە پێکەوە دانیشتبووین هەستیان کرد ئەوەی کە بلاوکرایەوە کاری تێکردم، ئەوانە کەسانی باش بوون، بەلام پەیوەندیی

---

(۱) هاوڕێی نووسەر باسی هەر هاوڕێیەك دەکا کە دواتر شەهید بوون، هەربەشەهید ناویان دەبا. جا لەبەرئەوەی کاتی باسەکەی هاوڕێ، شەهید نەبوون، بۆیە ئێمەش وشەی شەهیدمان لادا. هەروا بەنسبەت کەسایەتییەکانی تریشەوە -وەرگێر-.

ڕێکخراوەییـان لەگـەڵ حـزب نـەبوو، ڕۆیـشتمە ماڵـەوەو دایـەش (دایکـی هـاوڕێ عوسمان خۆشناو) هەستی پێکرد کە زۆر خەمبارمو پەشۆکاو دیاربووم و نەمتوانی بەشێوەیەکی ئاسایی بۆی باس بکـەم، بـەڵکو بـە ووشـەی پـچڕوله قوڕگا خنکاو پێمگوت پێموایە...هاو...ڕێ...فە..هد.. ئیتر خۆم فرێدایە سەرجێگەکەو دەستم کردە گریانو.. نازانم کەی هەستام.. بەڵێ بەڕاستی ڕۆژێکی ناخۆشو دڵگیر بوو نەك تەنیا بۆمنو بەس بەڵکو بۆ تەواوی نیشتمانپەروەرانو دیموکراتیخوازانو بۆ بزاڤی نیشتمانی رزگاریخوازی و دیموکراسی و بزاڤی رزگاریخوازیی کوردستان.

هاوڕێی شەهید فەهد تەنیا سەرکردەیەکی شیوعی حزبەکەی نەبوو وبەس بەڵکو سەرکردەیەکی سیاسیو گەلێری بێفیز بوو خۆشەویستی بـۆ نیشتمانو گەلەکـەی بێ سنوربوو، بۆیە لەمێژووی گەلەکەی و ڕۆشنبیریو خوونـەریتو بـاری دەروونـی وگیـانی شۆرشـگێرانەی دیموکراسـی گەلەکـەی کۆڵییـەوەو، بـەوردی چـینە کۆمەڵایەتییـەکانو قۆناغـە مێژووییەکـەی بزاڤـی رزگـاریخوازیی نیشتمانیو هێـزە کۆمەڵایەتییـە سیاسـییەکانی شـیکردەوەو لێیـان تێگەیـشتو جـێ‌و شـوێنی هەرچینێکی کۆمەڵایەتی لەم قۆناغەدا دیـاریکردو، سیاسـەتێکی ڕاسـتو دروسـتی نەخشەکێـشا بۆیەکخـستنی ئـەم هێزانـە لـە ڕێکخراوێکـی سیاسـی کاریگـەرو یـەکگرتوودا، کەئـەویش بەرەیـەکی نیـشتمانی دیموکراسـییە، کـە بخرێتـە کـاری هاوبەشەوە بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە هاوبەشانەی لەپەیماننامەی نیشتمانی حزبدا دیـاریکرابوون، نیـشتمانەکەی کـە عێراقبـوو خۆشەویـستو خاکەکـەی بەچـاکی دیراسەکردبوو، کەپڕ لەگەنجینەی بـەهادارە وەك نـەوت و گـازو کانزاکـانیتر ، وەك ئاسنو خەڵوزی بەردینو، ئاوو خاکی بەپیت ، داواشی دەکرد ئەم خاکـە بـۆ خێـرو خۆشیو بەختیاریی گەل بەرهەم بهێنرێتو، وڵات پیشەسازدار بکرێت، بەتایبـەتی پیـشەسازیی قـورس و دامەزرانـدنی وێـستگەی کـەهرۆئاو چـونکە ئـاوێکی زۆرمـان هەیـەو، بـۆ نەهێـشتنی دەرەبـەگیو دامەزرانـدنی کـشتوکاڵێکی هەمـەجۆرو پەرەسەندوو.

ئیـستیعمارگەرانی هەسـتیان کردبـوو بەمەترسـی ئـەم سـەرکردەی‌و بیریـو چـالاکییەکەی بـۆ سـەر بەرژەوەنـدەکانیان بۆیـە فـەرمانڕەوایانی کۆنەپەرسـتی

نۆکەرانی خۆیان هاندەدا بۆرزگاربوون لەم سەرکردەیەو لەسەرکردە دیارەکانی هاوڕێی وەك زەکی محەمەد بەسیم‌و حسین شەبیبی.

دەمەوێ هەموو رۆشنبیرو خوێنەرێکی عێراقی هانبدەم بۆ خوێندنەوەی دانراوەکانی هاوڕێی شەهید فەهدو بۆ رۆژنامەی (القاعدة) تا بزانن چەند گەل‌و نیشتمانەکەی خۆی خۆشدەویست‌و چەند بەچاکی لەئەرکەکانی قۆناغی رزگاریخوازیی نیشتمانی‌و دیموکراسی تێگەیشتبوو، بەرگریکارێکیش بوو لەمافی گەلی کورد لەهێنانەدی مافە نەتەوەییەکانی‌و، مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی.

بەرگری کردنەکەی لەدادگادا بەرگری کردن لەخۆی نەبوو، بەڵکو لەگەل‌و لەنیشتمان‌و لەحزب بوو، هەموو لافلێدانێکی دادگای بەدرۆ خستەوە کەلەسەر حزبی شیوعی گوتبووی کە ئامانجی رووخاندنی رژێمی پاشایەتییەو روونی کردەوە کە حزب داوای رزگاربوونی عێراق لەئیستیعمارگەرانی بەریتانیا دەکات‌و داوا دەکات پەیمانی۱۹۳۰ هەڵبوەشێندرێتەوەو هەردوو بنکەی سوپایی لە حەبانییەو شوعێبە هەلگیرێن‌و پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی لەسەر بنچینەی سودی یەکتر پێکبهێنرێن. هەروا روونی کردەوە کە حزب داوای جێبەجێکردنی دەستور دەکات‌و ئازادییە دیموکراسییەکان رێگە بدرێن‌و، یاسای بەربەرەکانێی شیوعیەت هەڵبوەشێندرێتەوە.. ئەمانە بوون ئەو ئامانجانەی حزبی شیوعی بۆ هێنانەدییان کاری دەکرد. بەلام وێڕای هەموو ئەمانەش فەرمانی لەسێدارەدرانی بەسەردادرا بەلام پرۆتێستی جیهانی و هەستکردنی ئیستیعمارگەران‌و حکومەتی عێراق بەوەی کە باری ناوخۆ لەدژی حکومەت دەکەوێتە شۆرش، ناچاربوو حوکمەکەی بگۆرێت بەبەندکردنی هەمیشەیی، بەلام هەربۆ هەلێك دەگەران کە لەو سەرکردانە رزگاربن، ئیتر هەلیان لەو پیلانەی ئیستیعمارو زایۆنیزم‌و کۆنەپەرستی بۆسەر فەلەستین وەرگرت، هەروا لەکالتەجارییەکەی راگەیاندنی دەولەتانی عەرەب کە جەنگ لەدژی ئیسرائیل بەرپا بکرێت بۆیە دادگایی هەرسێ سەرکردەکە لە١٤–١٥ی شوباتی ١٩٤٩دا دووبارە کرایەوەوحوکمی لەسێدارەدانیان جێبەجێ کرا. ئەمەش شکستییەکی گەورەبوو کە تووشی حزب‌و بزووتنەوەی رزگاریخوازی و دیموکراسی بوو.

# ڕاپەڕینەکەی کانونی ١٩٤٨

دوای هێرشبردنە سەر بزاڤی نیشتمانیو نەهێشتنی کاری ئاشکرای حزبەکان وئەو ڕێکخراوە نەقابییە کەمانەی کە هەبوونو زەوتکردنەوەی ئەو ئازادییە کەمە پەیوەندیی لەنێوان حزبە پێشکەوتنخوازەکاندا پەیدابوو دوای ئەوەش هەر لەسەر کاری سیاسی بەشێوەی نهێنی بەردەوام بوونو، چەندان پەیوەندی کرا لەنێوان حزبی شیوعی عێراق و حزبی هەڵوەشاوەی (الشعب)و لاباڵی پێشکەوتنخواز لە حزبی نیشتمانپەروەری دیموکراسی هەڵوەشاوەو حزبی دیموکراسی (پارتی)و گەیشتنە پێکهێنانی کۆمیتەیەکی هاوبەشی هاوکاری لەنێوانیاندا لە دژی دەسەلاتی ئەرمانڕەوا. دەسەلاتداری کۆنەپەرستو نۆکەر هەوڵی دەدا پەیمانی ١٩٣٠ هەڵوەشێنێتەوەو پەیمانێکی نوێ لەگەڵ بەریتانیا ببەستێ لەجێگەی ئەو پەیمانە، بۆ ئەمەش کارئامادەیی بەوەکرد کە پەیمانێکی لەگەڵ ئەردەن بەستو ئەرکێکی تر لەگەڵ تورکیا وەك سەرەتایەك بۆ پەیمانە نوێیەکە. دەستەیەکی نوێنەرایەتی حکومەت بەسەرۆکایەتی ساڵح جەبرو ئەندامەتی نوری سەعیدو فازڵ جەمالیو تەوفیق سویدی چوونە لەندەنو ڕۆژنامەکان ئەم بابەتەیان خستە بەرباسو لێکۆڵینەوەو بەندەکانی ئەو پەیمانەیان بلاوکردەوە، کە پەیمانی (پورتسموث) ناوبراو لە ١٥ی کانونی دووەمی ١٩٤٨دا مۆرکرا، بەندەکانی ئەم پەیمانە زۆر لەبەندەکانی پەیمانی ١٩٣٠ گرانتر بوو، لەکاتێکدا هەموو گەلی عێراق پێشتر پەیمانەکەی دابووە دواوە. لەبەر ئەمە حزبە نیشتمانپەروەرەکان میللەتیان بۆڕابوون بانگ کرد لەدژی ئەم پەیمانە نوێیە، ئیتر جەماوەری گەلو لەڕیزی پێشەوەیاندا خوێندکاران ڕابوونو لەدژی پەیمانەکە خۆپیشاندانێکی بەهێزیان سازکردو، حکومەتیش پەنای بردە بەر ڕاگرتنی خوێندن لەگشت قوتابخانەکانی عێراقدا، بەلام بەرپەرچی خوێندکاران بۆ ئەم کردارە ئەوە بوو لەسەر خۆپیشاندان بەردەوام بوونو شەقامیان چۆڵنەکرد، پاشان جەماوەری گەل هاتنە ناو گۆڕەپانی

جەنگەکەو خۆپیشاندانەکە بووە ڕاپەڕینێکی نیشتمانی کەگشت شارەکانی تری عێراق هەرلە (فاو تا زاخۆ) تێیدا بەشداربوون و دەستەی نوێنەرایەتی وتوویژکار لەلەندەنەوە گەڕانەوە بەغداو سەرۆکی وەزیران بەیاننامەیەکی بۆ گەلی عێراق بلاوکردەوەو هەروەك پیشەی خۆیان لەو بەیاننامەیەدا ڕایانگەیاند کە (هەندێ کەسانی تێکدەر لەشیوعییەکان و نازییەکانی پێشوو ئەو هەلەیان قۆستەوە کە سەرۆك لێرە نەبوو بۆیە پەشێوییان نایەوە) بەیاننامەکە هەڕەشەی (پاکردنەوەی سەری گێرەشێوێنەکان)ی کردو ڕایگەیاند کەهەرچۆنێك ڕووداوەکان پەرەبسێنێ پەیمانەکە هەر جێبەجێ دەکرێ، ئەمە لە ڕۆژی ٢٥ی کانونی دووەمی ١٩٤٨دابوو، لەئەنجامی ئەم بەیاننامەیەدا کە هەستی نیشتمانپەروەرانەی گەلی عێراقی گوێ پێنەدا، کۆمەلانی گەل لە گشت شارەکانی عێراقدا ڕژانە سەرشەقامەکانو، چەندان قوربانی تێیدا گلانو جەنگەکە کەوتە نێوان هێزەکانی حکومەتو جەماوەری بێ چەك کەتەنیا بەباوەڕیان بەنیشتمان چەکدار بوون بۆ بەرگری لەمەسەلەیەکی نیشتمانی ڕەوا، لە٢٧ی کانونی دووەمی ١٩٤٨داو پاش ئەوەی جەماوەر بەدەیان شەهیدیان بەخشی ڕاپەڕینەکە گەیشتە ئەوپەڕی، ئیتر وەزارەتی سالح جەبر ڕووخاو هەلات بۆ دەرەوەی عێراق، بۆیە (وەصی) تەختی پاشایی ناچاربوو بەیاننامەیەك دەربکاتو لەوێدا هەلوەشانەوەی پەیمانی (پرۆتسموث)ی ڕاگەیاندو وەزارەتەکەی سالح جەبری هەلوەشاندەوەو محەمەد سەدر (محمد الصدر)ی ڕاسپارد کە وەزارەتێکی نوێ دابمەزرێت.

لەگەرمەی ڕووداوەکاندا کۆمیتەیەکی هاوبەش لەنێوان ڕێکخراوی حزبی شیوعی عێراقو ڕێکخراوی حزبی دیموکراتی کورد(پارتی) لەکۆیە ڕۆژی ٢٥ی کانونی دووەمی ١٩٤٨ پێکهاتو داوای لەجەماوەری کۆیە کرد کە مانبگرنو بێنەسەر شەقامەکان لەدژی پەیمانەکەو لەدژی حکومەتی سالح جەبر، شارەکە مانگرتنی ڕاگەیاندو جەماوەرێکی زۆر بەشداریی خۆپیشاندانێکی گەورەی کردو وتاری هاوڕێیانی هەردوو ڕێکخراوەکەی تێدا خوێندرایەوەو چەند شاعیرێكو کەسایەتی کۆمەلایەتی شیعرو وتاریان خوێندەوەو لەخۆپیشاندانەکەدا پەیماندرا کە تاڕووخاندنی حکومەتو هەلوەشاندنەوەی پەیمانەکە لەسەر خۆپیشاندان

بەردەوام بن.

کۆمیتــە هاوبەشــەکە تەنانــەت دوای هەڵوەشــانەوەی پەیمانەکــە و داڕووخــانی وەزارەتی (جــەبر) لەســەر کاری خـۆی درێژەیدا و چـەندان چـالاکی کۆمەڵایـەتی ئەنجامدا بۆ پتەوکردنی برایەتی نێوان ئایینەکانی شارەکەو، زانایانی ئاینی ئیسلام چوونە سەردانی کلێسای دیانـەکانو تـەوراتی جووەکـان[٢] هـەروا پیـاوانی ئـاینی هـەردوو تایەفەکـە چـوونە سـەردانی مزگـەوتی گـەورەی کۆیـەو ئەمـەش یەکـەمین سـەردانی هاوبــەش بــوو بـۆ شـوێنی خواپەرسـتی هەرسـێ ئایینەکـە لەمێـژووی شارەکەدا، ئەمەش وەك نیشانەی برایەتی ڕۆڵەکانی گەل.

ڕاپەڕینەکـەی کـانونی ١٩٤٨جـەنگێکی ڕاسـتەقینە بـوو لـەنێوان گـەلی عێـراق و ئیـستیعمارِی بــەریتانیو لایــەنگرەکانی لــە فــەرمانڕەوا نۆکــەرەکانو بــووە ســەرکەوتنێکی ڕاســتەقینەی خواســتو ئــیرادەی گــەل کەشــەیدای بڕیــاردانی چارەنووســی خــۆی و دامەزرانــدنی دوارۆژی خــۆی بــوو، لــەم پێناوەشــدا لەقوربانیداندا، هەرچۆنێك بێت درێغی ناکات، دوای سەرکەوتنی گەل تەماشای کرد چۆن ڕۆژانی دوایی بوونە ڕۆژانی شادیو پێکەوە گونجانو برایەتی نێوان نەتـەوەو ئاینو تایەفەو خێڵەکان لەسەر ئالآکانیش ئەم دروشمە نووسرا:

لەســەر بــەردی یــەکێتی عــەرەب و کــورد ئیــستیعمارو نۆکــەرانی وردو خــاش دەکرێن.

ئیــستیعمارگەرانو دەســتەی فــەرمانڕەوای کۆنەپەرســتو نۆکــەر لــە ڕووی ڕاپەڕینەکەی گەلدا پاشەکشەیان کرد، بەڵام پاشەکشەیەکی کاتی بوو، ئـەوە بـوو بـۆ بێهۆشـکردنو هێورکردنـەوەی گـەل وەزارەتـی (الـصدر)یـان هێنایـە سـەرکار، بەمەبەستی هەوڵدان بۆ نەخشەکێشانی پیلانێکـی تـر بـۆ تێکدانی یـەکێتی هێـزە سیاسییەکان تاوای پیشان بدەن کە ئەوەی هاتۆتـەدی بـۆ مەبەستەکەیان باشـە، لەڕاستیـشدا ئیـستیعمارگەرانو کۆنەپەرسـتیی فـەرمانڕەوا کەلەبـەرێکیان خـستە نێوان یەکبوونی حزبە نیشتمانپەروەرەکانو کێشە لـەنێوان حزبـە ڕاسـترەوەکان و

(٢) پێدەچێ مەبەستی نووسەر کەنشتەی جوەکان بێت-وەرگێر-

حزبـی شـیوعیدا دەسـتی پێکـردو حزبـە دیموکراتییـە لیبراڵـەکانیش هەڵوێـستی بێلایەنی سەلبییان گرتەبەر، هێزەکانی کۆنەپەرستی‌و ڕاسـتڕەوە سیاسـییەکانیش کەوتنە هاوپەیمانی لەدژی هێـزە دیموکراسـییەکان‌و لـەڕیزی پێشەوەیاندا لـەدژی حزبـی شـیوعی عێـراق، دەسـتەوتاقمی نەتەوەپەرسـتی گـچکە گەیـشتنە سەرشەقامەکان‌و لەدژی هەڵوێستی حزبی شیوعی لەمەسەلەی فەلەستین قسەیان دەکرد، لەدژی ئەو هەڵوێستەی کە حزب وەك چارێکی بەکردەوە هێنایە ناوەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبی فەلەستینی‌و دەوڵەتی ئیسرائیل، بۆ بەرژەوەندی هەردوو گەلی عەرەب‌و جولەکەو بۆ ژیانی ئاشتییانە شانبەشانی یـەکتر. دەمـەوێ لێرەدا خوێنەر سەرنجی ئەوە بدا کە هاوڕێ عـەزیز سـیباهی لەکتێبەکەیدا (چـەند دەیەسـاڵ لەمێژووی حزبی شـیوعی عێـراق) لەبەشـی یەکەمـداو لەلاپـەرە٣٧٧دا لەسەر (حزبی شیوعی‌و مەسـەلەی فەلەسـتین) باسـی کـردووە. لەوێـدا نـاوەرۆکی مەسـەلەی فەلەسـتین‌و پیلانگێـڕی ئیـستیعمارو زایـۆنیزم بەرامبـەر فەلەسـتین ڕووندەکاتـەوەو زۆر لایـەنی نادیـاری ئـەم مەسـەلەیە بەشـێوەیەکی زانـستی‌و ورد شـیدەکاتەوەو پیـشانی دەدا کـە چـۆن هێـزە نەتـەوە پـەروەرە ڕاسـتڕەوەکانی عــەرەب یاریــدەی نەخــشەکانی ئیــستیعمارو زایۆنیزمیــان داوە بـۆ دامەزرانــدنی دەوڵەتی ئیسرائیل و بێبەشکردنی گەلی عەرەبی فەلەستین لەدامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆ، ئەمەش بـەڕێگای کۆچبەریی هـەموو جولەکـەکان لـەوڵاتانی خۆیان بۆ ئیسرائیل‌و بەرپاکردنی گاڵتەجاڕانەی شەڕی فەلەستین لەساڵی ١٩٤٨دا کە ئەوەبوو خاکی فەلەستین لەنێوان ئەردەن‌و میسردا دابەشکرا.

بەهەرحاڵ نامەوێ درێژە بـەم باسـەی مەسـەلەکە بدەم چـونکە هـاوڕێ عـەزیز سیباهی بەدرێژی باسی کردووە.تەنانەت لەباسی مەسـەلەکەدا ڕەخنـەی لەهەنـدێ لایـەنی هەڵوێـستی حـزب گرتـووە، بـەڵام بەرپرسـی سـەرەکی لایـەنی عـەرەبی دەکەوێتـە سـەر ئەسـتۆی کۆنەپەرسـتیی فـەرمانڕەوای وڵاتـانی عـەرەب و هێـزە نەتەوەییـە ڕاسـتڕەوەکان کـە دەسـتیان دابـووە جێبـەجێکردنی نەخـشەی ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزم کە لەڕاستیدا کینـەی ڕەشیان بەرامبـەر شـیوعیەت‌و هێـزە دیموکراسی‌و پێشکەوتنخوازەکان کوێری کردبوون‌و دوژمنی سـەرەکیان نـەدەدی

کــە ئیــستیعمارو زایۆنیزمــە، کۆنەپەرســتیی فــەرمانڕەوای عێــراقیش چــاوەڕوانی هەلێکی وابوو، هەلی گالّتــەجاڕی شــەڕی فەلەســتینی بــۆ هێــرش کردنــە ســەریزاقی نیشتمانیو هێزە نیشتمانپەروەرو دیموکراتخوازەکانیو، بەتایبەتی بۆ ســەر حزبــی شیوعی، حــوکمی عــورفی ڕاگەیــەنرا (بــۆ پاراســتنی پاشــکۆی ســوپای عێــراق کــە لەجەنگا بوو بۆ ڕزگارکردنی فەلەستین!) بەچەشنێکی دڕو دڕندانــە هێرشــی بــردە سەر شوێنەوارو ڕێکخراوەکانی حزبو ژمارەیەکی زۆری لەئەندامو لایەنگرانی حزب دەستگیر کــرد، پەلامارەکــە بەرپرســە پێشکەوتووەکانی حزبــی گرتــەوەو دارمــان دەستی پێکرد، هەر لەیەهودا سدیق تا مالیك سەیف.

لەسەرەتای پەلامارەکەدا منیش لەگەلّ مامۆستا جەلال شەریف دەستگیر کراین و بــراین بــۆ هــەولێرو لــەوێ نزیکــەی مانگێــك لەگرتووخانــە ماینــەوە، لــەریزی دەستگیرکراوەکاندا هاوڕێ جەمال حەیدەری و هاوڕێیانی دیکەی هەولێر هــەبوون، منو مامۆستا جەلال شەریف بەکەفالەت بەردراین و گەڕامەوە بۆ کۆیەو گەڕامــەوە بۆ سەر کاری فێرکردن تا شوباتی ١٩٤٩، لەم ماوەیەدا داڕووخان لەڕیزی کادیرانی سەرکردایەتیدا زۆر بوو ئەوانەی بەخــشکەیی دەگەیــشتنە ناوەنــدی ســەرکردایەتی بەچەشنێکی سەرپێییو لەخۆڕا بەبێ ئەوەی شایانی ئــەو شــوێنانە بــن، لەمەوبــەر باسی ئەو نامەیەم کرد کە دایکی هاوڕێ عوسمان خۆشناو (دایە جەمیلە) لەحەمید عوسمانەوە هێنابووی و لەوێدا داوای کردبوو بچمە کەرکوك بۆ کاری حزبی و خــۆم بــشارمەوە، بــۆ ڕۆژی دوای گەیــشتنی نامەکــە لەکۆیــە دەرچــووم بــۆ کــەرکوك و پەیوەندیم لەگەلّ هــاوڕێ عوســمان مــستەفا کــرد، لــەماڵێکی حزبیــدا بــوین، بــەلاّم وادیــاربوو ماڵەکــە لای (جاســم الطعــان) ناســرابێ، نــاوبراو هەرلــەکاتی گرتنیــدا ڕووخابوو ڕاستیی ماڵەکەو هەرشــتێکی زانیبــووی لــەبارەی ڕێکخــستنی حزبییــەوە لەکەرکوك درکاندبوو، بریە منیش و عوسمان مستەفایش گیراین هێنــدەی نــەمابوو عوسمان لەماڵەکە ڕابکات بەلاّم نەیتوانی چونکە ماڵەکە بەهێزی پۆلیس و پۆلیسی نهێنی گەمارۆ درابوو. لەکاتێکدا سەرقالّی هاوڕێ عوسمان بوون من تــوانیم لــە زۆر نامــەی ڕێکخراوەکــانی حــزب و هاوڕێیــانی کــەرکوك و قــەزاو ناحیــەکانیو هــەولێرو سلێمانی ڕزگار بم، کاتێك گەیشتینە گرتووخانە ژمارەیەکی تر هاوڕێمان لەوێ دیت

کۆچکردوو دارا تۆفیق یەکێکیان بوو. بۆرۆژی دوایی بۆ بەغدا گواستراینەوە بۆ سپاردنمان بە تەحقیقاتی جینائی. لێکۆڵینەوە لەگەڵمان لەلایەن پۆلیسی نهێنییەوە دەستپێکرا، ئەمانە واناسرابوون کە زۆر درندانە خەڵکیان ئازاد دەدا (جا ئەگەر ئەنجام بۆ ئەوان باشبوایە ئەو دەستگیرکراوە لەلایان دەمایەوە بۆ ئەوەی سودی لێوەربگرن ، خۆ ئەگەر ئەنجام خراپ بوایە ئەوا گیراوەکە ڕەوانەی ئەبوغرێب دەکرا). ئێمەیان گواستەوە بۆ سلوڵی تاقە کەسی لە ئەبوغرێب، دوای دوو مانگ دراینە دادگای عورفی و من بەساڵێك بەندی و ساڵێك لەژێر چاودێریی پۆلیسدا حوکم درام، چونکە شایەتەکان لەسەر من کەمبوون، وەك فوئاد بەهجەت کە تاقەجارێك لەماڵی عوسمان مستەفا منی دیبوو و ئەوە بوو بەکەفالەت لە هەولێرەوە بەردرام و هاتمەوە بۆ کەرکوك تا خێزانەکەم بەرمەوە بۆ کۆیە، هەروا مەجید ڕەئوف، بەڵام ئیعترافی هەردووکیان لەسەرم زۆر لاواز بوو بەلام حوکمی عوسمان بە دووساڵ درا. لەگرتووخانەی ئەبوغرێبەوە بۆ بەندیخانەی بەغدای ناوەندی گواستراینەوە، لەوێ بەهۆی بارودۆخی خراپی بەندیخانەوە مانگرتنمان لەخواردن ڕاگەیاند بۆیە عوسمان بۆ بەندیخانەی نوگرەسەلمان گواسترایەوەو من بۆ بەندیخانەی کوت گواسترامەوە.

لێرە دەبێ ئەوەش بڵێم کە لەبەندیخانەی بەغدای ناوەندی کەریمی سۆفیم دی کە ماوەی حوکمەکەی تەواوکردبوو، هەرلەو ماوەیەدا ڕێکخراوێکی کەرتکاری دامەزراندو بلاوکراوەیەکی بەناوی (النجمة)وە دەردەکردو سەرۆکی ئەم ڕێکخراوە ئەکرەم یامولکی بوو، بەکەریمی سۆفیم گوت بچێتەوە لای حزب و ئەکرەم یامولکی کەرتکارەو دەبێ بەربەرەکانی بکرێت و قایل بکرێت کە دەستبەرداری ئەم ڕەوتەبێ لەدژی یەکێتی حزب، بەتایبەتی لەم کاتە سەختانەدا کە حزبی پێدا تێپەڕ دەبێ، پەیمانیدا کە بەوجۆرە بێت، بەلام پاش ئەوەی گەیشتەوە سلێمانی و لەبارودۆخی حزب ئاگادار بوو هەروا لەو شکستییەی تووشی بووەو ناکۆکی شەخسیشی لەگەڵ بەهادین نوری هەبوو کەخەریکی دامەزراندنی ناوەندێکی تازە بوو بۆحزب، لەبەر ئەوە کەریمی سۆفی ڕێکخراوێکی تری دامەزراندن و هێرشی دەبردە سەر تاقمەکەی (النجمة) و داوای یەکگرتنی شیوعییەکانی دەکرد، پاش

ڕاونانی کەسانی ئەم ڕێکخراوە کەرتکارانە لەلایەن پۆلیسەوەو دەستگیرکردنی هەندێکیان، خۆی هەڵوەشاندەوەو هەندێ لەکەسەکانی "ئالاکەیان فڕێدا"و هیچ چالاکییەکی سیاسییان نەماو بەشێکی تریان گەڕانەوە بۆ حزب.

# بەندیخانەی کوت

چەند هیوادار بووم لەکاتی دەسگیرکردن‌و حوکمدانمدا بەبەند کردن، لەو کاتەدا کەهاوڕێ فەهد لەبەندیخانەی کوت بوو، منیش لەوێ بم، چونکە بەندییە شیوعییەکان لەبەندیخانەی کوت کاتێك هەرسێ هاوڕێیەکە لەوێ بوون، گەلێك دەستکەوتی جۆربەجۆریان هەبوو، ئەوەش دوای مانگرتنیان لەخواردن سالّی ١٩٤٨پاش ڕاپەرینەکەی کانونی دووەم، هەروا دەمانبیست کەبەندیخانەکە بۆتە قوتابخانەیەك بۆ تێگەیاندنی شیوعییەکان، بەلاّم دوای دەستگیرکردنم هاوڕێی شەهید فەهد ئیعدام کرابوو ئیتر ئەو سەرگەرمییەم نەمابوو چونکە ئەو شوێنەی بۆی دەنێردرێم ئەوەی لێنەمابوو کە خەوم پێوە دەبینی. وێرای ئەوەش ناچار بووم لەگەلّ هاوڕێ شیوعییە بەندەکانم بژیم‌و بێگومان هەردەبێ هاوڕێ فەهدی شەهید هەندێ خوونەریتی بەکەلّکی بەندیخانەی بۆمان جێهێشتبێ و،هەردەبێ هاوڕێیانی بەندکراو دەستبەرداری نەبووبن. لەراستیشدا وابوو کەگەیشتمە بەندیخانە ئەو کارتێکردنانەم دی کە هاوڕێ فەهد بەجێیهێشتبوون، ئەوبوو لەسیاسەت و ئابووریی سیاسی و مێژوودا دەرس دەگوترانەوەو، پۆلی سەرەتایی‌و پێشکەوتوو هەبوون، منیان خستە پۆلی پێشکەوتوو لەئابووریی سیاسیدا، مامۆستامان لەم وانەیەدا هاوڕێ عەبدولڕەزاق مەتەر بوو، من خۆم سەرەتای ئابووریی سیاسیم خوێندبوو پێداچوونەوەیەکم لەمادەی کالاّو ئالوگۆڕی کالاّو دەرکەوتنی کالاّدا پێشکەش کرد کە زۆری بەدلّ بوو گوتی پۆلێکی ترت بۆ دەکەینەوە تا تۆ دەرسیان پێ بلێیت چونکە لەم مادەیە بەچاکی تێگەیشتوویت.

هەموو خەمێکم هەر ئەوە بوو کە بخوێنمەوەو بخوێنمەوە چونکە هەلێکی دەگمەن بوو دەبێ سودی لێوەربگیرێت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی فیکری و رۆشنبیری. لەوێ لەبەندیخانەی کوت بەداخەوە هەستمکرد کە هەلی فێربوونی زمانی ئینگلیزیم لەدەستچووە چونکە ئەوەی بیەوێ پێشکەوێ و زانست و

ڕۆشـنبیرییەکەی فـراوان بکـات پێویـستە زمـانی ئینگلیـزی فێربێـت، تـا ئـەمڕۆش گیرۆدەی ئەوەم کە فێری ئەم زمانە زیندووە نەبووم.

ئەو ساڵەی بەندیخانەی کورت بەسەرم برد ساڵێکی هێدی بوو تەنگ پێهەڵـچنین لەبەڕێوەبەرایـەتی بەندیخانەکـەوە نـەبوو، بـەلأم بەندییـەکانی بەندیخانـەی نوگرەسەلمان لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانەکەوە تەنگیان پێهەڵچنرابوو لەبەر ئـەوە مانگرتنیـان لـەخواردن ڕاگەیانـد، بۆهاوکارییـان بەندییـەکانی بەندیخانـەی کوتیش مانگرتنیان لەخواردن ڕاگەیاند تا داخوازییەکانی ئـەوان جێبـەجێ بکـرێن، ئـەم مانگرتنـە ٢٥ڕۆژی خایانـد، بـەلأم هـیچ داخوازییـەك جێبـەجێ نـەکرا چـونکە هەلومەرجەکە گونجاو نەبوو.

# دەرچوونم لەبەندیخانە

پاش تەواوکردنی بەندییەکەم کە ساڵێك بوو، بەپاسەوانیی پۆلیس گواسترامەوە بۆ تەحقیقاتی جینائیو لەوێ گواستیانمەوە بۆ کۆیە بۆ ئەوەی ساڵێك لەژێر چاودێریی پۆلیسدابم، پاش هەندێ کاروبار بەرەلاکرام کە رۆژانە سەردانی مەرکەزی پۆلیس بکەم، رۆیشتمەوە بۆماڵ خێزانەکەم نەدیتەوەو دایە جەمیلەم دیتەوە گوتی خێزانەکە ئێستا لەماڵێکی حزبیدان چونکە حزب پێویستی پێیانە.

نامەیەکم بۆ ناوەندی حزب نووسی، نەمدەزانی کێن ئەوانەی ئەم ناوەندەیان پێکهێناوە، لەوێدا نوسیم، پاش دەرچوونم لەبەندیخانە ئامادەم هەر ئەرکێکم پێ بسپێرن، نامەکەم دابەدەست دایە چونکە ئەو ماڵە حزبییەکەی دەزانی کە خێزانەکەمی تێدا دەژیان، پاش هەفتەیەك دایە لەگەڵ خێزانەکەمدا گەڕانەوە.

بەلام ناوەند هیچ وەلامێکیان نەدامەوەو، گوێم نەدایە ئەم پشتگوێ خستنە. دوای دوو رۆژ قوتابییەك هات بۆلام کە لەوەو پێش دەرسم پێگوتبوو خۆی پێناساندم کەبەرپرسی کۆیەیە، بەخێرهاتنم کردو پێمگوت: ئایا حزب پێویستی پێم نییە بۆ کارکردن لەناوچەیەکی تر؟ گوتی بۆ حزب دەنووسم. گوتم من حزبم ئاگادار کردووە بەلام وەلامیان نەداومەوە، وێڕای ئەوە تۆش هەولبدە چونکە واهەست دەکەم حزب پێویستی بەکۆششی ئەو هاورێیانەیە کە گشت توانای خۆیان بۆ خزمەتی تەرخان کردووە بەتایبەتی دوای ئەو شکستییەی تووشی هات، وێڕای ئەوە من ئامادەم لێرەش لەکۆیە لەهەر ئەرکێکدا پێم بسپێرن کار بکەم.

جا هەرچەندە هاورێیەکە داوای لێبوردنی لێکردم و گوتی: تۆ بەرپرسی ئێمەیت و ئێمە هەموو قوتابی تۆین. بەلام من جەختم بۆ کردووە کە: بەپێی رێوشوێنی حزبی دەبێ بڕیار لەحزبەوە دەرچێ و لەبەر ئەوە تۆ لێرە لەکۆیە بەرپرسیت ئێمە دەبێ تۆڕاسپێرین و تۆش خۆت هەر لەبەرپرسیی رێکخراوەکەدا بمێنیتەوە، پاش نزیکەی هەفتەیەك بەرپرسی هەولێر بلال عەزیز هاتە کۆیەو پەیوەندیی بە

بەرپرسی کۆیە ئیسماعیل ڕەسوڵەوە کر دو هەردووکیان تێگەیاندنی ئەندامەکان و ژمارەیەك لە شانەکانی شاریان پێ سپاردم. وادیارە سەرکردایەتی حزب لەوکاتەدا بڕیاری دابوو ئەو هاوڕێیانەی لەبەندیخانە دەردەچن پەیوەندییان پێوەنەکرێت تابەچاکی لەهەڵوێستیان لەتەحقیقاتی جینائی ئاگادار نەبن و تا نەزانن تا چ ڕادەیەك بۆکاری حزبی ئامادەیی تێدایە. ئەم مەرجانە هەموو لەمندا هەبوون بەلام وێڕای ئەوەش هیچ بەدەنگەوە هاتنێکم لەسەرکردایەتی حزبەوە نەدی جگەلەوەی من بەختەوەر بووم بەپەیوەندیی حزبیم لەکۆیەو ئەرکێکی تایبەتی پێ سپاردنم.

# دەبێ بژێوی خێزانەکە پەیدا بکرێ

ڕۆژگارێکی گران لەبارەی بـژێوی خێزانەکـەوە ڕووبـەڕووم بـۆوەو بڕیارمـدا وەك کرێکاری بینا یان هـەرکارێکی تـر ئـیش بکـەم و خـۆم مانـدوو بکـەم چـونکە هـیچ پارەیەکم نییە بەرهەمی بێنم و بیخەمەکار بۆ پەیداکردنی داهاتێك کە خێزانەکەمی پـێ بـژێنم. قـسەم لەگـەڵ وەسـتا بـەناکان کـردو ئامـادەییم پیـشاندا کـە ببمـە کرێکارێکی چالاك لەلایان. بەم چەشنە هاتمە گۆڕەپانی ئیشکردنەوە. خـەڵك لـەم کارەم سەرسام بوون، هەندێکیان لایان پەسـەندو هەندێکیـشیان دڵیـان سـەبوریی دەهـات.. چـۆن دەبـێ مامۆسـتایەکی ڕۆشـنبیر (دابەزێتـە خـوارەوە) بـۆ ئاسـتی کرێکارێکی ئاسایی، چونکە لەمەوبەر شتیوایان نەدیبوو، من ئەم کارەم بۆیـە کـرد تابیسەلمێنم کـە ئێمـەی شـیوعی کارمـان لاپـەڕۆزەو حزبـی ئێمـە حزبـی کرێکـارو زەحمەتکێشانە، ئیتر بۆچـی سـەیرە مـن ببمـە کرێکـارو، کرێکـاران داهێنـەرێ دوا ڕۆژیانن بەڵکو داهێنەری دوارۆژی مرۆڤایەتین لەنەهێشتنی چەوسانەوەی‌چینایەتی و دامەزراندنی سۆسیالیزمدا، بۆمن کارێکی زۆر ئاسایی بوو. هەندێ لەکەسایەتییە کۆمەڵایەتییـەکان هەوڵیانـدا یارمـەتی خۆیـانم پێـشکەش بکـەن، بـەڵام مـن ئـەم یارمەتییـــەم قبـــوڵ نـــەکرد، یـــەك لەوانـــە کەســـایەتی کۆمەڵایـــەتی وسیاســـی نیشتمانپەروەر(کاکە زیاد) بوو کەیـەکێك بـوو لەسـەرکردەکانی حزبـی دیمـوکراتی کوردی (پارتی).

وەك کرێکاری بیناو کرێکاری گەچ و کرێکاری قوڕ کارمدەکرد، هەروا ئوتوچـی و ترشی فرۆش.. ڕۆژانەکەم لە۲۰۰ فلس تێپەڕی نەدەکردو لەماوەیەکی کورتدا بوومە چـاودێری کـار لەوکاتـەدابوو بڕیـاردرابوو شـەقامێکی نـوێ بـەناو شـاری کۆیـەدا بکرێتەوە. کرێی کرێکاران کەمبوو بۆیـە مانیـان گـرت و داوای زیـادکردنی کرێیـان دەکرد بەڵام نەیانتوانی داخوازییەکەیان بێننەدی‌و منیش لەچاودێری کار دەرکـرام ڕۆژانە ۲۵۰ فلسم هەبوو تەنیا بۆ ماوەی ۱۵ ڕۆژ کارم کرد. گرانترین کار کرێکـاریی

قوڕ بوو. ساڵانە سەربانەکان بەقوڕ سواغ دەدران تاباران‌و بەفر کار نەکەنەسەر خانووەکە و سەربانەکە دڵۆپە نەکات، ئێمە سندوقی گەورەمان لەسەر پشتی خۆمان دەبەست‌و کرێکارێکیش بەخاکەناز ئەو سندوقەی پڕ لەقوڕ دەکرد، دەبوو بەسەر پەیژەی داردا سەرکەوینە سەربان، بەمجۆرە لەبەیانی تا ئێوارە. کاتێ دەگەیشتمە ماڵەوە خۆم فرێدەدایە سەرجێگەکەم و تابەیانی لێیدەنووستم و دایە دەیگوت: تۆ هەتا بەیانی لەئازاردا دەناڵێنی بۆ ئەم کارە مەڕۆ. کارێکی تر کەماندوو بوونی کەمتر بوو دروسکردنی گەچ بوو لەچاڵێکی قوڵ بەردی گەچیان دەردێنا و ئێمەش دەبوو بەسندوقە تەختە بەکەمەرو سەرشان بیگوێزینەوەو بەرەوژوور سەری بخەینە سەر گومەزێکی گەورەو بەشێوەی جغزێك ریزی بکەین و ئیجا بەردەکە بەگڵ دادەپۆشن و کوورەکە ئاگردەدەن و بەردەکان دەبنە گەچ و پاشان بەردەکان جیادەکەنەوەو دەیانهاڕن تاببنە گەچی ورد. ئەو کارە سەختانە وەرزی خۆیان هەیە بۆ نمونە قوڕکاری لەپایزداو پێش بارانبارین دەست پێدەکات‌و کاری گەچ لەناوەڕاستی بەهارو دوایی پایزدا دەبێت. بێگومان زەحمەتکێشان دووچاری بێکاری دەبن و بەختەوەر ئەوەیە کاری دەستکەوێ، هەروا هەموو زەحمەتکێشان حەز لەوکارە سەختانە ناکەن، کاری بەنایی ئەوکاتە کەمبوو، وەستاکەش ناسیارو برادەری خۆی بۆ کاردەبرد، منیش بەختەوەر بووم چونکە خەڵکەکە خۆشیان دەویستم و ڕێزو پێزانینیان بۆ قوربانیدانەکانم هەبوو.. هەتا ئێستاش ئەو ڕووداوانە باس دەکەن وبەباشی هەڵیدەسەنگێنن وەك خاسیەتی تێکۆشەری سیاسی کە خۆی بۆ خزمەتی نیشتمان و گەل تەرخان کردبوو.

# گەڕانەوە بۆ بەندیخانەی کوت

وێـرای مانـدوو بـوونی جەسـتەییم لەدامەزراندنـەوەی ڕێکخراوەکـانی شـاردا بەشداریم کردو ئەندامەتی حزب بەرێژەی ١٠٠٪ پتر بوو ڕێکخراوەکانی حزب لەلادێ بەرین بوون ڕێکخراوی جوتیاریمان بۆ بزاقی نهێنی جوتیاران پێکهێناو، لەم کاتانەدا بیلال عەزیز دەستگیرکراو لەتەحقیقاتی جینائی ڕووخاو هەرچییەکی لەسەر ڕێکخراوەکانی حزب لیوای هەولێردا دەزانی درکاندیو ڕاستی لەسەر من و بەرپرسی ڕێکخراوی حزب لەکۆیە ئیسماعیل ڕەسول گوت بەلاّم ئیسماعیل ڕەسولّ هەلّوێستی باش بوو نکولی لەهەموو شتێك کرد تەنانەت لەوەی حزبی بێت، لەئەنجامدا حوکمی بەندی سالێك‌و سالێکیش لەژێر چاودێریدا بەسەردا درا.

گواستیانمەوە بۆ بەندیخانەی کوت لەوێ ڕووبەڕووی کێشەی ناوخۆیی بوومەوە لەنێوان حەمید عوسمان و لایەنگرانیدا لەلایەك و سالم عوبەید نوعمان (سالم عبید النعمان)و لایەنگرانی لەلایەکی ترەوە. حەمید عوسمان و دەستەیەك لەلایەنگرانی بۆ بەندیخانەی کوت گواسترابوونەوە، لەپێشیانەوە (عەزیزالحاج) کە قەڵەمەکەی خستبووەکارو چەند دەفتەرێکی نوسیبوو لەسەر هەموو ئەوانەی بەرەنگاری حەمید عوسمان بوو بوونەوەو بە لەڕێ لادەران تاوانباری کردبوون و،جۆرەها قسەو قسەلۆك و تەنانەت مەسەلەی شەخسی ناشیرینیشی دابوونەپالّ و، دەبوو بەندییە شیوعییەکان لەجیاتی کتێبی ماركسی ئەم دەفتەرانە بخوێننەوەو، حەمید عوسمانیان گەیاندبووە ڕیزی سەرکردە دیارەکان چونکە بە(ئازایەتی شیوعییانەوە) ئەم لەڕێ لادەرانەی خستبووە ڕوو تاحزب لێیان ڕزگار بێت.

# تونێلەکە

کاتێـک حەمیـد عوسمـان و دەسـتەیەك لەلایـەنگرانی بـۆ بەندیخانـەی کـوت گواسـترانەرە کەوتـە نەخـشەدانان بـۆ ڕاکردنـی خـۆی و کۆمـەڵێك لەلایـەنگرانی لەبەندیخانـە، شـەوێکیان پێکـەوە لـەگۆرەپانی بەندیخانەکـەدا پیاسـەمان دەکـرد مەسـەلەی ڕاکردنەکـەی لەگـەڵ باسـکردم، نـاوی منیـشی لەگـەڵ خۆیـان دانـابوو، پێمگوت: کاتی بەندییەکەم بەمزوانـە کۆتـایی دێـت و دەرچـوونم مـسۆگەرە، دوور نییـە نەخـشەکەتان ژێرکـەوێت بۆیـە هـیچ ژێـری تێـدا نییـە خـۆم بـەئێوەوە ببەستمەوە. گوتی: ڕاستە بـەڵام لەسـەرت پێویـستە لـەئامادەکردنی نەخشەکەدا بەشداربیت.

گـوتم: مـن ئامـادەم، درێـژەی بەقـسەکانیدا: نەخـشەکەمان ئەوەیـە تونێلێـك هەڵکەنین کە بەچاکی بگاتە دەرەوەی بەندیخانە. گوتم: دەبێ یەکێك لەئەندازیاران نەخشەی بۆ بکێشن. گـوتی: بـەڵێ هەروایـشە. نەخـشەکە دانـراوەو دەبـێ تـۆو ئاراخاچادوو جسم التـاجی هاوڕێیـەکی تـر (کـە ناوەکـەیم لەبیرچـۆتەوە) دەسـت بەکاربکەن.

بەمجۆرە بۆ شەوی دووەم دەسمانکرد بەهەڵکەندن، لەسوچی چەپی مـەخزەنی ئازووقـەوە دەسـتمان پێکـرد. گونییـەکانمان پـڕ لـە گڵـی هەڵکەنـدراو دەکـردو لەسەریەکمان ریز دەکردن گوایە گونییـە بـرنج و سـاوەرو ئـاردو ئازووقـەی تـرن. بەندییەوان کە دەهات بۆ ژماردنی بەندییەکان تەماشای مەخزەنەکەی کرد تابزانێ کەسی تێدایە یان نا بەڵام تەماشای گونییە ڕیزکراوەکانی نەدەکردو بەهیچ جۆرێ سەرنجی ڕانەکێشا.

کارەکە بەهۆی شێداریی زەوییەکەوە زۆر گران بوو ، هەروا هەوای تێدا ئـاڵوگۆڕ نەدەبوو بۆیە کەسمان نەیدەتوانی بۆ هەڵکەندنی ژێر زەمینەکە لە ٢٠-٢٥ خولەك زۆرتر بمێنێتەوە، دەبوو دەرچینە دەرەوەوپاش حەسانەوەیەکی کـەم سـەرلەنوێ

بچینە خوارەوە. بەمجۆرە بۆماوەی هەفتەیەك لەسەر هەڵکەندن بەردەوام بووین. لەکاتێکدا خەریکی هەڵکەندن بووم کاتێك مزانی ڕۆشنایی دەرەوە هاتە ناو تونێلەکە، سەرم لەکونەکەوە دەرهێناو تەماشام کرد دەمی کونەکەی تونێلەکە هێشتا لەناو بەندیخانەکەدایەو دیتم بەندییەوانەکە لەسەرسەریان دێت و دەچێ، هەوڵمدا گڵ کۆبکەمەوەو دەمی کونەکەی پێبگرمەوە، دەستەی کارکردنم لەمە ئاگادار کردەوە، ئەمەش ئەنجامی هەڵەی ئەندازیارەکە بوو، لەسەر هەڵکەندن بەقوڵیدا نەك بۆ سەرەوە بەردەوامبووین و هەڵکەندنمان بەقوڵی و بەئاستی چاڵەکەی یەکەمدا دەسپێکرد، پاشان هەڵکەندن بەهێڵێکی ڕاست بۆ ماوەی ٥-٦مەتر و ئینجا بەرەبەرە بەرەو ژوور بووینەوە، بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی کە دەبوو تونێلەکە کۆتایی بێتیەکێك لەدەستەی کارکردنمان ئاراخاچادور چووە حەوشەی بەندیخانەی ناوشوراکە بۆ هەڵکەندنی سەوزە کەپێشتر لەوێ چاندبوومان، چونکە بەندییەکان ڕۆژانە سەوزەیان دەچنی، ئارا بەباشی دەمی کونەکەی گرتبوو. دوای ئەوەی ئێمە لەژێرەوە لەناو تونێلەکەوە گونییەی پڕ لەگڵمان خستبووە بەرکونەکە.

بەمجۆرە بەشێوەیەکی چاك تونێلەکەمان ئامادە کرد بۆ دەرچوونی ئەو بەندییانەی پێشەکی ئاگادار کرابوون کەڕابکەن، لەوانەش زەکی خەیری و عەزیز الحاج و حەمید عوسمان و ئاراخاچادور و کەسانی تر.

سەیر لەوەدایە کە ناوەندی سەرکردایەتی حزب لەمە ئاگادار نەکرابووتا یارمەتی بدرێن و ئۆتۆمبیل و جل و بەرگ و چۆنێتی دەرچوون و پێشوازییان و دابەشکردنیان بۆ مسۆگەر بکەن، لەبەر ئەمە کارەکەیان ئاشکرا بوو، زیاتر بەهۆی جل و بەرگ و پێڵاوەکانیانەوەو جوڵانەوەی سەیریانەوە بۆیە هەموویان گیرانەوە جگە لەعەزیز الحاج کە گەیشتە بەغداو خاوەنی ئەو ماڵەی پەنای بۆ بردبوو خەبەری لێدابوو، گیرابۆوە، بەمجۆرە هەوڵی ڕاکردنەکە سەری نەگرت و ڕاکردوان درانە دادگاو حوکمی زیاتریان بەسەردا درا.

من دوای تەواوکردنی بەندییەکەم لەبەندیخانە دەرچووم و لەگرتووخانەکەی بەندیخانەی کوت زانیم کە گشت ڕاکردوەکان گیراونەتەوە. جارێکی تر

گواستمیانەوە بۆ کۆیە تاکاتی چاودێرییەکەمی تێدا بەسەر بەرم، هەرکە گەیشتمە ئەوێ دوای سێ ڕۆژ نامەیەکم بۆ سەرکردایەتی حزب نووسی لەبارەی دەرچوونمەوە لەبەندیخانەو ئامادەییم بۆ کارکردن وڕاکردن لەچاودێری، پاش ١٥ ڕۆژ وەلامی پۆزەتیڤم بۆ هاتەوە کە بۆ کەرکوك سەفەر بکەم و بەڵێنی دیدارم بۆ دیاریکراو بەرپرسی لقی کوردی حزب ئەوکاتە (کاکەی فەلاح)بوو.

لەگەڵ خێزانەکەم خێرا سەفەری کەرکوکم کردو ئەرکی ڕێکخستنم لەناو کەرکوك پێ سپێردراو، ئەرکی ئاراستەکردنی جوتیاری لەناو لقدا بزووتنەوەی جوتیاران لەساڵی ١٩٥٢دا چالاك بوو، بەتاییەتی لە بانیخێلان و هۆرێن و شێخان و دزەیی و کۆیە،پەیامم بۆ ڕێکخراوی سلێمانی و هەولێر لەبارەی جولانەوەی جوتیارنەوە دەناردو هەندێ بلاوکراوەی ئاراستەکردن وتێگەیاندنی جوتیارانم نووسی.

هەر بۆ یادەوەری دەڵێم بارودۆخی داراییمان خراپ بوو بۆ ماوەیەکی درێژ ڕۆژانەی خێزانەکەمان کە پێنج کەس بووین لەگەڵ هاوڕێ (تۆماشابە)کە لەگەڵمان دەژیا، واتە شەش سەر خێزان لە١٠٠ فلس ڕۆژانە تێپەڕی نەدەکرد، پاش چەند ساڵێك، وەك پێشان باسم کرد، کچێکمان بوو بەلام نەمانتوانی شیری بۆ بکرین و دایکیشی دووچاری کەمی خۆراك هاتبوو بۆیە نەیدەتوانی شیر بداتە منداڵەکەی کە نەخۆش کەوت و مرد ئەوەندەش پارەمان نەبوو بینێژین ئیتر دراوسێکان بۆ ناشتنی یارمەتییان داین. لەیادمە تەنانەت پارەی سەرتاشینی خۆم نەبوو، بۆیە بەگوێزان سەرم پاکتاشی و لە زۆریی برینەکانیدا خوێن بەسەرما دەهاتە خوارەوە هەروا هاوڕێ تۆماشابە کە من بەگوێزان سەریم بۆ تاشی و ئەویش خوێن بەسەریدا دەهاتە خوارەوە ناچار بەئاووخوێ سەریم شت، هاوڕێ تۆما لەئازاردا هاواری دەکردو منیش پێم دەگوت ئارام بگرە هاوڕێ ئەمە باشترین پاکردنەوەیە !

دوای دوو مانگ کارکردن لە کەرکوك بۆ بەغدا بانگ کرام و سەفەرم کرد لەوێ بۆ یەکەمین جار هاوڕێ بەهادین نوریم دی، پاش هەفتەیەك مانەوەم لەبەغدا ئەرکی گواستنەوەی هەندێ کەلوپەلی چاپخانەی بۆ کەرکوك بەشەمەندەفەر پێسپاردم، منیش ئامادەیی خۆم پیشانداو دوای دوو ڕۆژ پێی ڕاگەیاندم کە هاوڕێیەکی تر هەیە لەگەڵم دەبێ و گوتی: تۆ دەیناسیت بەلام قسەی لەگەڵ مەکە

هــەروەك نەیناسـیت. ئـەوە بـوو ئامرازەکانـە چـاپخانەم گەیانـدە ویـستگەی شەمەندەفەر کە چەند پارچە ئاسنێك بوو، کە لـەوێ پرسـیاریان کـرد ئەمـە چییە گـوتم: پارچـەی مەکینـەی ئاردهاڕینـەو لـەلای شـوێنێ دانیـشتم لـەفارگۆنی شەمەندەفەرەکەدا دامنان، بۆ بەیانی زوو گەیشتینە کـەرکوك، تەماشـام کـرد ئـەو کەسەی لەگەڵم سواری شەمەندەفەرەکە بووبوو دابەزیو ئەویش چەند پارچەیەکی چاپخانەکەی هەڵگرتبوو، ئەم پارچانەم لـە گونییەکـەدا دابەکۆڵمداو لەوێستگەکە دەرچـووم و تەماشـام کـرد ئـەو کەسـەی لەشـەمەندەفەرەکەدا پێکـەوە بـووین عەرەبانەیەکی بەکرێ گرتووەو چاوەڕوانی دەرچوونی من دەکات، لێم نزیك بـۆوەو سلاَوی کـردو باوەشمـانکرد بەیەکداو پارچـەکانم پێداو سـواری عەرەبانەکـە بـوو ڕۆیشت، بێ ئەوەی من لەگەڵی سواربم و بەپێ ڕۆیشتم بۆ گەڕەکی ئیمام قاسم کـە خێزانەکەمی لێبوو. ئەو کەسەی لەشەمەندەفەرەکەدا لەگەڵمدا هات (هـادی هاشـم الأعظمي) بووکە لەبەندیخانە ڕایکردبوو، لـەدڵی خۆمـدا گـوتم بۆچـی ناوەندەکـەی حزب (بەهادین نوری) کەسێکی وەك ئـەم هاوڕێیـە کـە کـادیرێکی سـەرکردایەتییە بەئەرکێکی وابچووك وەك گواستنەوەی ئەم پارچە ئاسنانە ڕادەسـپێرێ، لـەجیاتی ئەوەی لەبواری سیاسی و دامەزراندنەوەی ڕێکخراوی حزبـی سـوودی لێوەرگیرێـت هەروا لەبارەی خۆشمەوە، بەلاَم چار چییە (ئێمـە ناچـارین فەرمانـەکان جێبـەجێ بکەین و لەوانەیە بەهادین ویستبێتی تاقیمان بکاتەوە، ئیتر هەر خوا دەزانێ)!

بەمجۆرە بۆ ماوەی هەفتەیەك لەبەغدا مامەوەو لەگەڵ (کاکەی فەلاح) سەرقاڵی کارکردن بووین کە جارێکی تر ئاگاداری کردمـەوە سـەفەری بەغـدا بکـەم و لـەلام ناکاو بوو کە گوتی: تۆ ئێستاکە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبیت و دەڕۆیت بـۆ کارکردن لەناوەندی سـەرکردایەتی. سوپاسـم کـردو ئامـادەیی خـۆم بـۆ کـارکردن دەربـڕی و گـوتم بەلامـەوە پایـەی حزبـی گـرنگ نییـە هەرچـەندە کاتێـك بـوون بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پێ ڕاگەیاندم دەسـت بـەجێ هەستم بەگـەورەبوونی بەرپرسیم کرد کە دەبێ ئەو بڕوا پێکردنەی حزب بەرمەسەرو شان بدەمەبـەر هـەر ئەنجامێکی ئەم ئەرکە گەورەیە.

دوای گەیشتنە بەغدا لەگەڵ هاوڕێ بەهادین لەماڵێکدا پێکەوە نیشتەجێ بـووین

کە یەك مانگ پێش ڕاپەڕینەکەی تشرین بوو، بارودۆخی سیاسی بەخێرایی پەرەی دەسەند، لە حوزەیرانی ١٩٥٢دا مانگرتنەکانی کرێکاران دەست پێکران، کرێکارانی بنکەی بەریتانیا لە حەبانییە مانیان گرت،هەروا لە شوعەیبە لەبەسرا، ئەم مانگرتنانە درانە بەرگوللە، پاشان مانگرتنی کرێکارانی جگەرە لەکۆمپانیای جگەرە کە کۆمپانیایەکی ئەهلی بوو لەبەغدا دەستی پێکردو کۆمەلانی خەلکیش لە پشتگیری و یارمەتیدانیدا بەشدارییان کرد بەوەی خۆراکو جلوبەرگو نوێنیان بۆ کرێکارانی مانگرتوو هێنا، پێش ئەوەش مانگرتنێکی سیاسی گشتی لەدژی ڕێکەوتنەکەی نەوت لەشوباتی ١٩٥٢دا ڕاگەیەندراو خۆپیشادان و پێکدادان لەگەڵ پۆلیسدا قەوما.

هەر لەم ماوەیەدا ناکۆکی لەناوسەرگەورەکانی خێزانی پاشایەتیداو لایەنگرەکانیاندا کەوتە ڕوو، بەتایبەتی عەبدول ئیلا ونوری سەعید. وەسی (وصی) داوای لەهەندێ پیاوانی ناسراوی فەرمانڕەوایی و حزبە سیاسییەکان کرد ئامادەی کۆنگرەیەك بن کە لەوێدا ناکۆکی نێوان (وەصی)و هەندێ لەسیاسەتمەداران دەرکەوت و ئەم کۆنگرەیەکە لەتەختی پاشایەتی بەسترا ناونرا کۆنگرەی (بەلوعە)و هەندێ لەسیاسەتمەداران لەکۆنگرەکە دەرچوون وەك بێزاریو پرۆتیست بەرامبەر کردەوەی وەسی، کە وشەی ناشیرینی دژی هەندێ لەئامادەبوان پێکهێنا. پاشان لەلایەن حزبەکانەوە یادداشتێکی توند لەتشرینی دووەمی ١٩٥٢دا درایە وەسیو لەیادداشتەکەدا داواکرابوو پەیمانی ١٩٣٠ هەڵبوەشێنرێتەوەو ئازادییە سیاسی و نەقابییەکان بگێڕدرێنەوەو بەندە سیاسییەکان ئازاد بکرێن وهەر پرۆژەیەکی ئیستیعماری بۆ بەرگریی هاوبەش بدرێتە دواوە. بەئاشکرا دەرکەوت کە دەستەی فەرمانڕەوای تۆکەر ئامادەییان تێدا نییە داخوازییەکانی گەل جێبەجێ بکەن، ئیتر هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانیان ڕاگەیاند کەلەڕاستیدا بەڕێگەی تیرۆرو تەزویر لەساڵی ١٩٤٨دا دانرابوو، هەروا ڕایانگەیان کە هەڵبژاردنی تازەی ڕاستەوخۆ دەکەن نەك بە دووپلە، بەلام پاشان لەمەش پاشەکشەیان کرد.

جا لەم بارودۆخە ئالۆزەداو پاشەکشەنەکرنی دەستەی فەرمانڕەوا لەبەردەم

داخوازییەکانی گەڵدا حزبی ئێمە حزبی شیوعی عێراق داوای پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی کرد، بەڵام حزبی بەرەی میللی (حزبەکەی تەها هاشمی) حەزی نەکرد یان وەکوتر بڵێین دژی ئەوە بوو حزبی شیوعی بێتە ناو ئەم بەرەیەوە تەنانەت دژی هاتنی ئاشتیخوازان و یان هەر ڕێکخراوو نەقابەیەك بوو کە بۆنی پەیوەندی لەگەڵ حزبی شیوعی لێبێت بێتە ناو بەرەوە، بەڵام پاش پێداگرتنی حزبی نیشتمانی دیموکراتی قایل بوو بە بیرۆکەی بوونی ئاشتیخوازان لەو لیژنەیەی بۆ پەیوەندی پێشنیاز کرابوو، بەرەی میللی لەسەر ئەوەش قایل بووکە ئەوکاتەی پێکهێنانی کۆمیتەی پەیوەندی لە حزبەکانی نیشتمانی دیموکراتی و سەربەخۆیی و بەرەی میللی یان هەر ڕێکخراوێکی تر بۆ ڕێکخستنی کاروبارو ئامۆژگاری و پێشنیاز پێشکەش کردن لەبارەی پەرەسەندنی بارودۆخی وڵاتەوە دەدەنە سەرکردایەتی حزبەکان ناوی ئاشتیخوازان نەبرێت، دەشێ دوای ئەوە سەرکردایەتی حزبەکان کۆ ببنەوە بۆ قسەکردن لەسەر پێشنیازەکانی کۆمیتەی پەیوەندی و بڕیاردانی چارەنووسیان.

هەرلەو کاتەدا ڕاگری کۆلیژی دەرمانسازی و کیمیا بڕیاریاندا کە ئەو قوتابییەی لەدەرسێکدا دەرنەچێ لەسەرێتی تاقیکردنەوەی هەموو دەرسەکان بداتەوە، واتە تەنانەت لەو دەرسانەشدا کە تێیاندا دەرچووبوون، بۆیە خوێندکاران هەڵچوون و لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٢دا مانگرتنیان لە خوێندن ڕاگەیاند، مانگرتووەکان داوایان کرد ئەم دەستکارییە نەمێنێ و، ڕاگری کۆلیژەکەش لەسەر کارەکەی لابدرێ، بەمجۆرە داخوازیی خوێندکاران هێنرانەدی و گەڕانەوە بۆ خوێندن بەڵام دوای ئەمە تەحقیقاتی جینائی دەستی کردە شاڵاوی دەستگیرکردنی.خەڵك لە ریزەکانیانادا و ئەمەش پاڵپێوەنەریان بوو بۆ دەستکردنەوە بەمانگرتن ئەمەش بەرێپیشاندەری سەرکردایەتی یەکێتی قوتابیانی(نهێنی) بوو ئیتر توندی مانگرتنەکە زیاتر بوو دەستکرا بە کۆبوونەوەی فراوان و لەم قۆناغەشدا مانگرتنەکە بەرینترو ڕێکوپێکتر بوو لەداخوازیی قوتابییانە تێپەڕان و بووە مانگرتنێکی سیاسی بەو دروشمانەیەوە کە حزبی شیوعی دیاریکردبوو وەك: (ئاشتی و نەهێشتنی پەیمانی ١٩٣٠و بەرەلاکردنی ئازادییە دیموکراتییەکان و

ئازادکردنی بەندییە سیاسییەکان و هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆو کار بۆ بێکاران و پەیدا کردنی نان بۆ گەلی زەحمەتکێش). ئینجا مانگرتنەکە بووە مانگرتنێکی جەماوەریی سەرانسەری لەکۆلیژی ئادابەوە دەستی پێکرد بەرەو شەقامی غازی و لەگەڵ پۆلیس لەیەکیانداو بەرەو شەقامی ئەمین ڕۆیشت، ئینجا بۆ شەقامی مەئمون بەرەو پردی شەهیدان و پەڕییەوە بۆ بەری کەرخ بەلای باڵوێزخانەی بەریتانیدا لەشەوا کە هاواربە ڕووخاندنی ئیستیعماری بەریتانی دەکراو بەهەڵوەشانەوەی پەیمانی ١٩٣٠ فەرماندرا کە خوێندن لە گشت کۆلیژو پەیمانگەو قوتابخانەکانی بەغدا ڕابگیرێت و، وەزارەتی مستەفا عومەری دەستی لەکار کێشایەوەو ئەوجا وەسی (عبدالاله) حیکمەت سلێمانی ڕاسپارد کە وەزارەتی نوێ دابمەزرێنێ بەلأم قایلنەبوو داواکەی دایەدواوەو پاش ئەوە جەمیل مەدفەعی کە وەزارەت دابمەزرێنێ جەماوەر هاتنە سەر شەقامەکان و هاواری ڕووخاندنی ئەو وەزارەتەیان دەکرد بەمجۆرە تەنانەت ناوبراو نەیتوانی دەست بەرێکخستنی لیستی وەزارەتەکەشی بکات.

لەگەڵ بەهادین نوری کۆبوومەوەو باسمان لەبڵاوکردنەوەی لیستێك کرد بۆ دامەزراندنی وەزارەتی گەل و سەپاندنی لەلایەن خەڵکەوە بەسەر (وەسی)دا بەمەرجێك کامل چادرچی سەرۆکی بێت لیستەکە لەکاتی خۆپیشاندانداندا لەشەقامەوە ڕابگەیەندرێت. بەپەلە کەوتینە ئەو کارەو دەبوو پێشەکی بیخەینە پێش کامل چادرچی و پاشان بەردەم کۆبوونەوەی ئەو حزبانەی کۆمیتەی پەیوەندییان پێکهێنابوو هاوڕێ عامر عەبدولاّ وەك نوێنەری ئاشتیخوازان لەوێدا ئەندام بوو.

لە ڕۆژی تشرینی دووەمی ١٩٥٢دا جەماوەری خۆ پیشاندانەکە زۆر گەورە بوو منیش لەگەڵ هاوڕێ باسم (بەهادین نوری) بەیانی بەسواری پاسکیل لەماڵ دەرچووین ماڵەکەمان ئەوکاتە لە ئەعزەمییە بوو ئەو بۆ سوار بوونی پاسکیل لە من شارەزاتر بوو، تا گەیشتینە مەرکەزی فاروق لە ئەعزەمییەو لەناکاو بەهۆی خێرایی ڕۆیشتنەوە لەسەر پاسکیلەکە کەوتم و دەمو چاوم بریندارو پڕخوێن بوو، بڕیارمدا کە من بۆ ماڵەوە بگەڕێمەوەو ئەو لە ڕۆیشتن بۆ سەرپەرشتی

خۆپیشاندانەکە بەردەوام بێت، لەو مەرکەزەوە خۆپیشاندان بەرەشاش درایە بەرگوللەو چەند کەسێك بوونە قوربانی بۆیە لەوەلاّمدا خۆپیشاندانەکە مەرکەزی پۆلیسی قەنبەر عەلی سوتاند، ئینجا خۆپیشاندانەکە بە(باب الشیخ) رۆیشت و لەگەلّ بەرگریی پۆلیس بەیەکیانداداو چەند کەسێکی تر شەهید کران بۆیە خۆپیشاندەران ناچاربوون مەرکەزی پۆلیس لە باب الشیخ بسوتێنن و هەرلەوێدا ئەو پۆلیسەی بەرەو ڕەشاشەکەی دەستڕێژی لەجەماوەر دەکرد سووتا. دوای ئەو ژێرکەوتنانەی پۆلیس لە دوو رۆژی خۆپیشاندانەدا شەقامەکانی بەغدا لە پۆلیس چۆلّکران. بارودۆخەکە بەرەبەرە بۆ دەسەلاّتداری ئالۆزتر دەبوو بۆیە ناچاربوو وەزارەت بەوەکالەت بدرێتە سەرۆکی ئەرکانی سوپا ئەویش حوکمی عورفی ڕاگەیاندو زرێپۆش و تانکەکانیان هێنایە سەر شەقامەکان و مۆلّەتی حزبەکان هەلّوەشێندرانەوەو ١٧ رۆژنامە داخران و هەزاران کەس لەرەوتی هەمەجۆر دەستگیر کران. لەیادمە سوپا لەیەکەم رۆژی هاتنە خوارەوەیدا بێلایەن مایەوەو جەماوەر سەردەکەوتنە سەر زرێپۆش و تانکەکان و هاواری برایەتی گەل و سوپایان دەکردو دروشم و بەیاننامەکانی حزب بەسەر سەربازو ئەفسەرەکانیشدا دابەش دەکران و ئەوانیش خۆشحالّی‌و پشتگیرییان بۆ دەردەبڕین بەلاّم ئامادە نەبوون بێنە ناو ڕاپەڕینەکە، دەستەی فەرمانڕەواش دەیانزانی چەند پڕ مەترسییە سوپا بچێتە پالّ ڕاپەڕینەکە ئەگەر بارودۆخەکە بەو چەشنە بمێنێتەوە لەبەر ئەوە هەندێ یەکەی سوپایان گۆڕی و چەند یەکەی تریان هێناو لە رۆژی دووەمی هاتنی سوپادا بۆ سەر شەقامەکان فەرمانی تەقەکردنیان لەجەماوەر دەرکرد کە ڕێگەی دەرچوونی هیچ خۆپیشاندانێك نەدرێ.

هەلّوێستەکە بەتەواوی گۆڕدراو سوپا تەقەی لەخۆپیشاندەران کردو چەند کوژراوو بریندارێکی لێ خستن پاشەکشەو ڕاگرتنی خۆپیشاندانەکانی لەبەغدا داسەپاندو بەلاّم ورەی جەماوەر هێشتا بەرز بوو کە لەکاتێکی گونجاودا دیسان بێتەوە مەیدانی جەنگ لەدژی دەستەی کۆنەپەرستی فەرمانڕەوا. ئەرکی حزب بوو کە ئەم ڕووداوە هەلّسەنگێنێ کە واحزب بەتەنیا لەسەر شەقامەکان سەرکردەیی جەماوەری کردووە، بەلاّم ئەم هەلّسەنگاندنە لەلایەن کۆمیتەی

ناوەندییەوە نەکرا بەڵکو بەهادین نوری خۆی بەتـەنیا ئـەم هەڵسەنگاندنەی کـردو چەند بەئەنجام گەیشتنێکی چەپڕەوی سەرچڵانەی پوختەکردو هـەروا هـیچ گوێی نەدایە رۆڵی حزبە مۆڵەتدراوەکان و دەورگێڕانی کۆمیتەی پەیوەندی.

لەلایەکـەوە پێویـست بـوو کۆبوونەوەیـەکی کۆمیتـەی ناوەنـدی بکرێـت بـۆ لێکۆڵینـەوەی بـارودۆخی کـاتی مانگرتنەکـەی خوێنـدکاران و کۆبوونـەوەکانی، لەلایەکی تریشەوە دەبوو پەیوەندی بەحزبە مۆڵەتدراوەکانەوە بکرایەو مەسـەلەی هێنانەدی بەرەیەکی نیشتمانییان لەگەڵ باس بکرایە بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراو کـە لەسـەری ڕێکـەوتباین و کـاری هاوبـەش و وەرچـەرخانی خۆپیـشاندانەکان بـۆ کـارێکی سیاسـی نیـشتمانی هاوبـەش. سـێیەم شـت بزاوتنـی جـەماوەر بـوو لەشارەکانی تردا بەو شێوازەی لەبەغدا بەڕێوەچوو.

بـەلأم سـەرکردایەتی تـاکڕەوی سەرچـڵ بـووە ڕێگـری ئـەم کـارەو ڕاپەڕینەکـە نەیتوانی ئامانجەکانی بێنێتەدی، بەلأم پڕباوەڕیی دایە جـەماوەر کـە دەتـوانێ دوا ڕۆژی خـۆی دروسـت بکـات لەهەلومەرجێکـدا کـە لەئاینـدەدا بگـونجێو توانـای پێویـست هـەبێتو، لـەژێر سـایەی هێنانـەدی بەرەیـەکی نیـشتمانی و کـارێکی نیـشتمانی هاوبـەش بـەپێی ئامـانجی هاوبـەشو هێنانـەدی یـەکێتی نێـوان گـەلو سوپاو گۆڕینی بـەئامرازێکی چـەکداری تێـسرەوێنەر یـاخود وەرگێڕانـی سـوپا بـۆ هەڵوێـستێکی بێلایـەن و، ڕاپەڕانـدنی بزاڤـی جوتیـاری لـەلادێ دژی دەرەبـەگ و خاوەن مۆڵکە گەورەکان و لە پێناو هێنانەدی ئامانجی نیشتمانی و جوتیاریـدا تـا هەردوو بزووتنەوەکەی شارو لادێ لەبەرینترین هاوپـەیمانی هێـزە تێکۆشـەرەکانی گەلدا لەدژی ئیستیعمارو کۆنەپەرستیی فەرمانڕەوا پێکرا لکێن.

ئەو کۆمیتەی ناوەندییەی کە هاوڕێ بەهادین پێکی هێنابوو لە هاوڕێیـان: ناسـر عەبود و سادق جەعفەر فەلاحی و کاکەی فەلاح و محەمەد رازی شبر (محمد راضي الشبر) و سەلیم چەلەبی و خۆم (کەریم ئەحمەد) دەبوو کۆبێتـەوە نـەك تـەنیا بـۆ لێکۆڵینەوەی وەزعی سیاسیی وڵات لەپێش و لەکاتی ڕاپەڕینەکەداو بـەس، بـەڵکو زۆر پێویستیی تر ئەوەیان دەخواست، بەتایبەتی دوای دەرکەوتن و پەرەسـەندنی نـاکۆکی سیاسـیو هـزری کـە لـەکادیرە پێشکەوتووەکانی بەندیخانـەی بەغداوە

سـەریان هەڵـداو، پێویـستی ئـاڵوگۆڕی بەرنامـە کۆنەکـەو یـان بـابڵێین دانـانی بەرنامەیەکی نوێ. ئەو کاتە نزیکترین هـاوڕێی کۆمیتـەی ناوەنـدی بـووم لـەهاوڕێ بـەهادین،و زۆرجـاریش ئـەوەم خـستۆتە بەرچـاوی کـە پێویـستە کۆبوونەوەیـەکی کۆمیتەی ناوەندی پێکبێت بەڵام ئەو دەیگوت: من بەتەنیایی پەیوەندییان لەگـەڵ دەکەم و لەهەموو شتێکدا بیرو ڕایان وەردەگرم و تۆ بۆخـۆت دەزانیـت مەسـەلەی پارستن بـۆ حـزب چـەند گرنگـە. مـن و تـۆ پێکـەوە لەسـەر هەرشـتێکی پێویـست گفتوگۆ دەکەین و لەگەڵ هاوڕێیانی تریش هەر بەمجۆرەیە. پێمگوت: من بـیرورای ئەوانی تـر نـازانم و تەنانـەت گـەر بـشزانم چـۆن گفتوگۆیـان لەگـەڵ بکـەم و چـۆن دەتوانین بیرورا ئاڵوگۆڕ بکەین و بگەینە بیروڕایەکی گشتی؟ بـەڵام ئـەو هـەر سـور بوو لەسەر ئەوەی لەبەر هۆکاری ئاسـایش و پاراسـتنی سـەرکردایەتی کۆبوونـەوە پێویست نییە.!

لەگـەڵ بـەهادین لەماڵێکـدا دەژیـاین و، ماڵەکـە نزیکـی شـەقامی گـشتیبوو کـە زرێپۆشـەکانی سـوپا لەهەنـدێ خـاڵی دیـاریکراوی ڕادەوەسـتان و، خـاڵێکی ڕاوەستانی مەفرەزەیەکی زرێپۆش زۆر لەماڵەکە نزیکبوو کە لەپەنجا مەتر تێپەڕی نەدەکرد، ڕۆژێکیان گوێم لەتەقەی گوللەیەکی دەمانچە بوو، لەو کاتەدا تازە بـەها لـەماڵ دەرچـووبوو، پێمگـوت چـی ڕوویـداوە، دەرکـەوت تەقـەی لـە پـشیلەیەك کردووەو کوشتویەتی،و لەوێدا تەماشای دەکردو دەمانـچەکەشی بەدەسـتەوە بـوو بەدڵخۆشی،و پێکەنینەوە: کوشتم! پێمگوت ئەم کردەوە منداڵانەیە چییە هـاوڕێ ئەو خاڵەی ڕاوەستانی سـوپا لەبەردەمتـەوە نـابینی و ئالـەم ڕۆژە ئـاڵۆزەدا چـۆن دەبـێ تـۆ ئەمـە ڕەفتـارت بـێ و هـیچ هەسـت بەبەرپرسـی نەکـەیت ئـیتر کردمـە ژوورەوەو دەمانـچەکەم لێسەند. ئەمـە لـەو ڕۆژانـەدا ڕوویـدا کـە ڕاسـتەوخۆ دوای ئەوەبوو نورەدین مەحمود بووبووە سەرۆکی وەزیـران،و، شـاڵاوی فراوانـی گـرتن و پـەیرەوکردنی کاروبـاری تونـدی ئاسـایش لەسـەرەو خـواری ولاتـداو لەئـەنجامی ئەحکامی عورفی بەدناودا پەیڕەو دەکرا.

جارویـار لـەکردەوەی منداڵانـەی بـەها سەرسـام دەبـووم، وادیـاربوو زۆر ڕقـی لەپشیلە بـوو، زۆر دڵخـۆش دەبـوو کـە پـشیلەیەکی ئـازاردەدا. ئەگـەر پـشیلەیەك

بچوایە ژوورەکەی دەرگاکەی لەسەر دادەخست درزێکی دەهێشتەوە ئینجا شتێکی لەژوورەکەدا دەجولاندەوە تا پشیلەکە بازیدەداو بەمجۆرە دەیترساند تاڕایدەکردە لای دەرگاکــە بــۆ دەرچــوون هەرکــە ســەری دەخــستە درزی دەرگاکــەوە (کەمینەکەوە) خێرا دەرگاکەی جوت دەکردو بەمشێوەیە دەیخنکاند.

هاوڕێ بەها سەرکردەیەکی سەنگین و پەروەردەکاری هاوڕێیانی نـەبوو کـرداری زۆر سەیرو لەلایەن سـادەترین کەسـانەوە بێزراوبـوو. لێـرەدا نامـەوێ هـەموو ئـەو کردارانەی باس بکـەم بەتـەنیا یـەك نمونـەی دێنمـەوە کـە پەیوەنـدی بـەڕەفتاری حزبییەوە هەیەو ئەوە دەردەخات کە چۆن سووربوو لەسەر ڕای خـۆی هەرچـۆنێك بوایەو، ئیتر ئەبێ چۆن بێ کە ئەو لەسەرەوەی حزبدا بێت؟ کاتێـك ئەنـدامی ك.ن بـوو لەهـەموو کۆبوونەوەیەکـدا مەکتـەبی سیاسـی ڕاپـۆرتێکی پێـشکەش دەکـردو دەیخستە بەردەم کۆبوونەوەکەو هەموو جـارێکیش کۆبوونەوەکـە ئـەوەی ئـەوەی دەدایە دواوە کە هاوڕێ بەها پێشکەشی دەکردو هەرخۆی بەتەنیا لـە(مەیـدان) دا دەمایەوە. لەیادم نییە ئەگەر بۆ جارێکیش بێت هاوڕێ بەها چـاوی بـەم ڕەفتـارە تەنیا کەسەیدا گێڕابێتەوەو هیچ کاتێـك ملـی بـۆ ڕای بەکۆمـەڵ نـەدەدا وەك تـەنیا هەریۆ ئۆپۆزیسیۆن خولقابێت. لەبەر ئەمە لەمەترسـیدارترین بـارودۆخی سیاسـیدا –بۆ نمونـە لەڕاپەڕینـدا– ئـەو لەسـەر شـەقام هـەرخۆی چـۆنی بدیبایـە وابڕیـاری دەدا– بەهیچ شێوەیەکیش بەهیچ بیرورِا یان گفتوگۆیەك قایل نەدەبوو.

بـەلام سـەرەڕای ئـەم هـەموو دیـاردە چـەوتانە و بەتایبـەتی ڕەفتـاری بەتـەنیا لەســەرکردەیی حزبــدا هــەردەبێ مــەدحی بکــەم کــە ئــەو هەمووکێــشەو توانــا سـنوردارەی بـەخت کـرد لـەپێناو گێڕانـەوەی پرِیـاوەڕی لەحزبـداو ناوەنـدێتی ڕێکخستن و چالاکی کۆکردنـەوەی ڕێکخراوەکـانی بنکـە کەمابوونـەوەو گرتنـەوەی ئەو شیوعیيانەی لەڕێکخستنی حزبی پچڕابوون‌و سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی حـزب و پێکهێنـانی نـاوکی ڕێکخـراوە دیموکراسـی و نەقابییـە نهێنییـەکان‌و دەرکردنـی ڕۆژنامەگەریی حزب و بلاوکراوەکانی تر، ئەمانەش هەمووی بەڕاپەرینە نەمرەکـەی تشرینی سـالّی ١٩٥٢ گەیشت کەبەیـەکێك لـە شـانازییەکانی گـەل‌و حزبەکـەمان و برافی نیشتمانی عێراقی دادەنرێ.

هاوڕێ بەها جارێکیان ڕایسپاردم کە بڕۆمە بەسراو بەڵێنێکی دیداری لەگەڵ پەیامنێری بەسرا لەشەقامی ڕەشید و نزیك بازگەی (الأمانة) بۆدانام هاوسەرەکەی خۆیشی هاوڕێ مادلین (دایکی سەلام) لەگەڵ ناردم. (کراسو چاکەتو عەگاڵ)ی بۆ ئامادە کردم لەکاتێکدا هاوڕێ دایکی سەلام ژنێکی سفور بوو لەگەڵ ئەم عەگاڵ بەسەرە سەیرەدا دەڕۆیشت، گەیشتینە شوێنی دیاریکراو و ڕاوەستاین چاوەڕوانی دەرکەوتنی ئەو هاوڕێیەمان دەکردکە بۆ بەسرا لەگەڵماندا بێت، نزیکەی پێنج خولەك چاوەڕوانمان کردو پیاسەمان دەکرد بەڵام پەیامنێرەکە بەدیار نەکەوت، لەم کاتەشدا سەرنجماندا پۆلیسی نهێنی بەشێوەیەکی ڕوون چاودێریمان دەکەن بە هاوڕێ مادلینم گوت: سەرنجی شتێکی نائاسایی دەدەی؟ لەوەڵامدا گوتی: بەڵێ، پۆلیسی نهێنی چاودێریمان دەکەن، دەبێ لەم شوێنە نەمێنین. ئەوە بوو بەرەو شەقامی ئەمین کەوتینەڕێ بەڵام شوێنمان کەوتن ئینجا سواری تەکسییەك بووین یەکێکیان بەسواری ماتۆڕسکیلێك وەدوومان کەوت، شۆفێری تاکسییەکەش ئەمەی هەست پێکردو گوتی: ئێوە مرۆڤی باشنین؟ پێمگوت: ئێمە کەسانی نیشتمانپەروەرین بۆیە دەبینی پۆلیسی نهێنی چاودێرینمان دەکەن. شۆفێرەکە گوتی: ئێستا تێگەیشتم. ئیتر کەوتە ڕۆیشتنی پێچو پەناو بەناو کۆڵانەکاندا کە زۆر شارەزایان بوو ئێمەی برد تا دڵنیا بوو کە ماتۆڕسوارەکە ئێمەی ونکردووە ئینجا گوتی: دەتانەوێ بچنە کوێ؟ گوتم: بۆ ئەعزەمییەو فلانە گەڕەك لەوێ. گوتی: مەترسن ناهێڵم بکەونە دەست ئەو ناپیاوانە من لەخزمەتی هەموو نیشتمانپەروەرێکی شەریفدام. ئێمەی گەیاندە ئەو شوێنەی پێمانگوت. کاتێك گەیشتینە ماڵەوە بەها لەوێ زۆر لەدڵە ڕاوکێدا بوو، ئەوەی ڕوویدا بۆمگێڕایەوەوکە پەیامنێرەکە ئامادە نەبووە، ئینجا لێمپرسی: بەڵام ئاخۆ لەبەر چی ئەم شوێنەت بۆ یەکتر دیتن هەڵبژارد، شوێنێکە پڕ لەجاسوس. دانی نا بەهەڵەکەیدا. بەڵام من لەوباوەڕەدا بووم کە دەیویست تاقیم بکاتەوە چۆن لەچاودێریی جاسوسەکان دەرباز دەبم، ئەمەش سەرچڵییەك بوو ئەنجامەکەی مسۆگەر نەبوو.

پاش هەفتەیەك داوای لێکردمەوە کە بۆ بەسرا سەفەر بکەم پێمگوت: پێویستم بەپەیامنێر نییە، من ئەنجامی سەفەرەکەم لە ئەستۆ دەگرم. تەنیا پێویستم

بەئەدرەسێکە. ئەدرەسەکە لای ئێمە هەروا (وشەیەکی نهێنی)بوو. بەمجۆرەو بەشەمەندوفەر سەفەری بەسرام کردو بەرپرسی کۆمیتەی ناوچەی باشور ئەوکاتە هاوڕێ حەمید بەخش بوو. پاش ئەوەی گەیشتمە ئەدرەسەکە ئەویش منی گەیاندە هاوڕێ حەمید بەخش. داوای راپۆرتێکم لێکرد لەسەر رێکخراوەکانی باشور (بەسرەو ناسریەو عەمارە)و راپۆرتێکیش لەسەر بزووتنەوەی کرێکاری لەبەسرە. بۆ رۆژی سێیەم ئەم راپۆرتەی پێشکەش کردمو لەوێدا باسی کردبوو کەبزووتنەوە لەناوچەی باشور، لەمەش مەبەستی بزووتنەوەی رێکخراوەکانی حزب بوو، سەرلەنوێ چالاکییان دەست پێکردۆتەوەو باوەڕی جەماوەر بەتایبەتی کرێکاران و زەحمەتکێشان بەحزب گەڕاوەتەوەو پەیوەندی حزب لەگەڵ حزبە نیشتمانییە مۆڵەتدراوەکان پتەوبۆتەوە، بەتایبەتی لەگەڵ حزبی نیشتمانی دیموکراسی، لەعەمارەش نیشانەکانی راپەڕینێکی بزووتنەوەی جوتیاری بۆ داخوازییەکانیان لە(ئال ئزێرج) دەردەکەون. لەبەندەریش کرێکارانی هۆشمەند چالاکییان دەست پێکردووە بۆ مانگرتن لەپێناو زیادکردنی کرێ و هەندێ داخوازیی کرێکارانەی تر بەتایبەت مۆڵەتدانی نەقابەی کرێکارانی بیناسازی. لەناسریەش رێکخراوەکانی حزب لەفروان بووندان چالاکییان گەیشتۆتە ناو ریزەکانی جەماوەر. ئەم راپۆرتەم ئامادەکرد لەگەڵ نامەیەکی تایبەتی بۆ هاوڕێ بەها کە لەوێدا بارودۆخی جەماوەرم لەبەسرە روونکردەوەو پێشنیازم کردبوو کە لەوێ بمێنمەوە بۆ سەرپەرشتیی رێکخراوەکەو چاودێریی پەرەسەندنی بارودۆخەکە بەتایبەتی لەبارەی مانگرتنی کرێکارانی بەندەرەوە کە نیازیان وایە رەنگە بەم نزیکانە ئەنجامی بدەن.

لەهاوڕێ حەمید بەخشم پرسی لەبارەی رێکخراوی حزبەوە لەبەندەرو ئەو کەسایەتییە نەقابییانەی دەرکەوتوون کە ئاخۆ لەتوانای رێکخراوەکەدایە سەرکردەیی مانگرتن بکەن؟ ئێستا لەبەندەر سێ لایەنگری رێکخراوەکەمان هەیەو ئاستی سیاسییان نزمە بەڵام هۆشیاریی چینایەتییان باشە. گوتم: جا چۆن دەکرێ پشت بەو هاوڕێ ساویلکانە ببەسترێ بۆ سەرکردەیی مانگرتنێکی گەورەو فراوان کە لەفاو تا بەسرە بگرێتەوە؟ لەوەڵامدا گوتی: باری ژیان وگوزەرانیان رۆژ

لەدوای رۆژ خراپتر دەبێت و سورن لەسەر ئەوەی مانبگرن و ئێمە دەتوانین لە دەرەوە رێپیشاندەرییان بکەین.

بەمجۆرە دوای دوو رۆژ کرێکاران هەر لەفاو تا بەسرە مانیان لەکارگرت. کرێکارانی مانگرتوو یەکەمین کۆبوونەوەیان کرد منیش لەگەڵ هاوڕێ حەمید بەخش ئامادەی ئەم کۆبوونەوەیە بووم تا لەنزیکەوە چاودێریی وەزعی کرێکاران بکەین، لەکۆبوونەوەکەدا کرێکارێکی لایەنگری حزب قسەی کرد باسی باری گوزەران و نیشتەجێبوونی کرێکارانی بەوردی خستەڕوو کە زۆر ناخۆشن ، بەتایبەتی ژیان و نیشتەجێ بوونی کرێکارانی کەناری بەندەرو کەشتیەکان و مەکینەو کارەباو حەماڵەکان بەوردیو چاکی باسکردو داوای کرد باری گوزەرانیان باش بکرێت و هەروا مەرجەکانی کار کردن باش بکرێن و هۆی گواستنەوەیان لەشوێنی کارەوەو بۆ شوێنی کار بۆ دابین بکرێت.

هاوڕێ عەلی شەعبان کە ئەندامی کۆمیتەی ناوخۆیی حزب بوو لەبەسرە سەرپەرشتی بەرێوەچوونی مانگرتنەکەی دەکرد، هەروا هاوڕێ حەمید بەخش سەرپەرشتی دەکرد.

دوای دوو رۆژ وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی ماجد مستەفا گەیشتە بەسرە لەسەر داوای کرێکاران و بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کرێکارانی مانگرتوو. داوای لە کۆبوونەوەکە کرد وەفدێکی کرێکارانی مانگرتوو بنێرن، هاوڕێ حەمید بەخش هاتە لام وگوتی وەزیر داوای لە کۆبوونەوەکە کردووە وەفدێکی کرێکاران بنێرن ئەوانیش لەو ئاستەدا نین گفتوگۆ لەگەڵ وەزیر بکەن پێمگوت: ئەی رای تۆ چییە؟ گوتی: هاوڕێ عەلی شەعبان دەخەینە وەفدەکەوە تا سەرکردایەتی پرۆسەی گفتوگۆکە بکات. پێمگوت: جا چۆن دەکرێ یەکێك کرێکاری بەندەر نەبێو لەوەفدەکەدا بەشدار بێت، کەی ئەوە ڕاستەوئەگەر دەرکەوت لە کرێکارانی بەندەر نییە هەڵوێست چۆن دەبێ. لەوەڵامدا گوتی هاوڕێ عەلی بەردەوام لەناو کرێکارانی بەندەردایە و وادەزانن یەکێکە لەخۆیان. بەهەرحاڵ هاوڕێ عەلی لەوەفدەکەدا بەشدار بوو، پۆلیسی نهێنی چاودێریی وەفدەکەی دەکردو دەیناسینەوە، وەفدەکە هاتنە ژوورەوە بۆلای وەزیرو ئەویش دەوری سەرکردەیی

وەفدەکـەی گرتـە دەسـتو معـاونی پۆلیـسی تـەحقیقاتی جینـائی لـەناو ژووری گفتوگۆکردنـدا بـوو تەماشـای کـرد هـاوڕێ عـەلی هەلومـەرجی خراپـی کـارکردنی لەبەنـدەرو بـاری گـوزەران و ژیـانی سـەختی کرێکـاران بـاس دەکـات و هێنـدەی نەمابوو قەناعەت بەوەزیر بکات، لەوکاتەدا مەعاون لـە ژوورەکـە دەرچـوو، هـاوڕێ عەلی شەعبان سەرنجیدا بارودۆخەکە ئاسایی نییە ئـەویش بـەبیانوی (ئاودەسـت) لەژوورەکە دەرچوو بەناو جاسوسو پۆلیسەکاندا خۆی دزییەوەو لەناوچـەکە دوور کەوتەوەو ڕاستەوخۆ هاتەلام و نیشانەی شلەژانی پێوەدیاربوو، پێمگوت: ها..چـی ڕوویـداو بۆچـی شـلەژاویت؟ چـیرۆکەکەی لەسـەرەتاوە بـۆ گێڕامـەوەو، وەفـدی کرێکـارانی بەتـەنیا بەجێهێـشتوەو ئـەوانیش نـەیانتوانیوە لەسـەر وتوویـژ لەگـەڵ وەزیردا بەردەوام بن و وەزیریش گەڕاوەتەوە بـۆ بەغـدا بـێ ئـەوەی هـیچ بـەڵێنێك بەکرێکاران بدات. ئیتر هاوڕێ عەلی ناچار بوو خۆی بشارێتەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی کرێکـاران کۆبوونـەوە تاوەفدەکـەیان لەئـەنجامی گفتوگۆکـەیان لەگەڵ وەزیر پێڕابگەیەنن کە وەزیر گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا بێ ئەوەی هـیچ بـەڵێنێك بـدات، بۆیـە هـاوار بـەرز بـۆوە کـە پێویـستە لەسـەر مـانگرتن بـەردەوام بـن تـا داخوازییـەکانیان جێبـەجێ دەکـرێن ولـەم کاتەشـدا پۆلیـسی نهێنـی ئاسـایی کۆدەبوونـەوە تـا دەوری کۆبوونەوەکـەیان گـرت وکرێکارانیـان دایـە بەرگوللـەو، کرێکاران بلاوەیـان لێکـردو پـۆلیس بەدوایانـدا بـۆ نـاو باخـچەکانی خورمـا، چـەند کەسێکیان لێ شەهیدو بریندار بوون.

لـەکاتی هێرشـی دڕندانـەی پۆلیسدا بۆسـەر کرێکـاران هـاوڕێ حەمیـد بـەخش لەکۆبوونەوەکەدا بوو، منیش لەماڵـەوە چاوەڕوانیم دەکـرد تـا ڕاپـۆرتێکم لەسـەر مانگرتنەکە بداتێ، بۆ ئەوەی منیش ڕاپۆرتێك بۆ ناوەند بنووسـم لەکاتێکدا هاتـە ژوورەوە جلەکانی هەمووی خـوێن بـوو، هەسـتام و باوەشـم پێـداکردو پێمگـوت: ئەوە چییە بۆ برینداری.. چی ڕوویدا؟ گوتی:برینـدار نـیم بـەلام تـەرمی شـەهیدانم کۆکردۆتەوەو یاریدەی کرێکارە بریندارەکانم داوە چونکە پۆلیس هێرشیان هێنایـە سـەر کرێکـارە مانگرتووەکـان بـەبێ هـیچ بیانوویـەك ئـەوە نـەبێ کـە کرێکـاران بڕیاریاندا لەسەر مانگرتن بەردەوام بن.

دەستبەجێ بەیاننامەیەکمان بەناوی کۆمیتەی ناوخۆیی حزبی شیوعی لەبەسرە دەربارەی مانگرتنەکە ئامادە کردو پرۆتێست و بێزاریمان لەم هێرشە دڕندانەیە دەربڕی‌و داوای سزادانی ئەوانەمان کرد کە لەم هێرشە تاوانکارییە دڕندانەیە بۆ سەر کرێکارانی مانگرتووی بێچەك بەرپرسن‌و، حزبەکان‌و جەماوەریشمان بانگ کرد بۆ پرۆتێستۆی ئەم تاوانە گەورەیە. بەهاوڕێ حەمیدم گوت(پاش ئەوەی خۆی شت‌و جلەکانی گۆڕی): بچۆ بۆ بارەگای حزبی نیشتمانی دیموکراتی و ئەم بەیاننامەیە لەچاپخانەکەیان چاپ بکە. ئەوەبوو ئەو بەیاننامەیەمان لایان چاپکردو بەئاشکرا بلأوکرایەوە بەناو خەڵکداو وەفدێکمان پێکەوەنا بۆ سەردانی حزبەکانی (نیشتمانی دیموکراتی و سەربەخۆیی و بەرەی میللی) لەبەسرە ئەوانیش بەیاننامەیان دەرکردوئەم تاوانە بێزەوەرەیان تێدا پرۆتێستۆ کرد، کۆمیتەیەکی هاوبەش پێکهێندرا بۆ مانگرتنی جەماوەر کە مانگرتنی گشتی لەبەسرە جاڕ بدەن‌و رێپێوانێك لەدوای جەنازەی شەهیدانەوە سازبکەن، ئەوەبوو تەواوی جەماوەری بەسرە دەرچوون و پۆلیس لەبەرچاو نەمان و شەقامەکان کەوتنە ژێر دەسەلأتی جەماوەری توڕە.

بەخێرایی نامەیەکم بۆ ناوەندی حزب ناردو بزووتنەوەکەم وەك خۆی خستە ڕوو. بۆ رۆژی دوایی وەلأمم بۆهات کەبەخێرایی بگەڕێمەوە بۆ بەغدا، بارودۆخەکە لەشەقامەکانی بەسرە هەندێ هێور بۆوەو پۆلیس نەیاندەتوانی دەرچن و لەمەخفەرەکانیاندا مابوونەوەو بەهۆشیاری و ترس و دوودڵییەوە چاوەڕوانی فەرمان بوون، بەهاوڕێ حەمیدم گوت کە پەیوەندی لەگەڵ حزبەکان بپارێزن‌و رۆژنامەکانی ناوەندی‌و ناوخۆیی ئەو حزبانە دەرچوون و پڕبوون لەهەواڵی مانگرتنەکەی کرێکارانی بەندەرو باسی ئەو تاوانە گەورەیە لەدژی کرێکارانی مانگرتوو.

گەڕامەوە بۆ بەغداو پەیوەندیم لەگەڵ هاوڕێ بەها کردو بەدەمی ڕاپۆرتێکم لەبارەی بارودۆخی شۆڕشگێرانەی بەسرەوە وەك شایەتێك کە بەچاوی خۆم دیومە پێشکەش کرد.

بارودۆخەکەی وڵات بەرەو ئاڵۆز بوون دەچوو مانگرتنی کرێکاران لەبەغداو

بەسرەو ناوچەکانی تر پەرەی سەندبوو باری سیاسی بەگشتی لەتێکچووندا بوو ناکۆکی کەوتبووە نێوان تەختی پاشایی‌و حزبە مۆڵەتدراوەکانەوەو ئەمەش لە کۆنگرەکەی تەختی پاشاییدا بەدیارکەوت، باری گوزەرانی زۆربەی خەڵك خراپ بوو بێکاری لەزیادبووندا بوو حزبەکان تورەیی‌و بێزاریی خۆیان لەدژی تاوانی گوللە بارانکردنی مانگرتنەکەی کرێکارانی بەندەری بەسرە دەربڕی‌و هەموو نیشانەکانی ڕابوونی بارودۆخێکی شۆڕشگێڕانە لەدژی کۆنەپەرستی فەرمانڕەوا بەدەردەکەوتن. نامەیەکمان بەومانایە بۆ کۆمیتەی ناوخۆیی بەسرە نووسی‌و داوامان لێکردن چاودێریی پەرەسەندنی ڕووداوەکانی بەغدا بکەن و پێویستە پەیوەندییان لەگەڵ جەماوەرو حزبەکانی لای خۆیان درێژەی پێبدرێ، ئەوە بوو تەنانەت دوای گەڕانەوەی هەموو کرێکاران بۆسەرکارو، سەرەڕای جێبەجێ نەبوونی داخوازییەکانیان و ئەنجامدانی ئەم تاوانە بەرامبەریان هێشتا ورەیان بەرزبوو بەهۆی ئەو لایەنگری و هاوکارییە فراوانە گرنگەی لەلایەن جەماوەرو حزبە نیشتمانپەروەرەکانەوە هەستیان پێکرد. بارودۆخەکە وای پێویست دەکرد کە کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوەیەك بکات بەڵام بەها ئەمەی بڕیار نەداو، کاروبارەکان هەر بەورێبازەدا ڕۆیشت کە ئەو دەیویست، هەروەك لەمەوپێش باسمکرد.

# ناکۆکییەکان لەناوحزبدا

پاش ڕاپەڕینەکەی تشرینی دووەمی ١٩٥٢و نەهێنانەدی ئامانجەکانی، ناکۆکی سیاسی لەناوحزبدا بەدەرکەوتن، هەرلەسەرەتاوە لەناو کادیرانی پێشکەوتووی حزبەوە لەبەندیخانەی بەغداو هەندێ لەڕێکخستنە حزبییەکانی لیواکان، بەتایبەتی لە نەجەفو هەولێر، ناکۆکی لەبارەی سیاسەتی حزبەوە دەرکەوت و ئەم سیاسەتەیان بە(چەپڕەوی) دوورەپەرێزو سەرکردایەتی تاقەکەسی دەزانی. بەهادین لەبەندیخانەو لەهەندێ ڕێکخراوەوە نامەی بۆ دەهات و زۆربەیانی دەشاردەوەو هەندێکی پیشاندەدام. زۆر بەوردی دەمخوێندنەوەو لەسەریان گفتوگۆم لەگەڵ دەکردو پێمدەگوت: ئەم نامانە ئەگەرچی لەگەڵ هەڵوێست و سیاستی ئێستای حزب ناکۆکن بەلام نیشانەی تەندروستین لەژیانی ناوخۆیی حزبدا چونکە کەسانی واهەن ڕەخنە لەسیاسەتی حزب دەگرنو دەیانەوێ هەڵەکان ڕاست بکەنەوە ئەمەش مانای وایە ئاستی سیاسی و هزری هاوڕێیان باشەو پێویستە هانیان بدەینو داوا لەبنکەی حزبی بکەین ئەم مافە پەیڕەو بکەن. بەلام ئەمە نابێ ببێتە لادان لەزەبتوڕەبتی حزبی و ڕووکردنە بەشبەش بوون. من پێموایە ئەگەر ئێمە باوەڕی ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆگرتن پەیڕەو بکەین، هەر لەدەستە سەرکردایەتییەکانەوە تا بنکەی حزبی ئەمە دەبێتە هۆی بەتینکردنی ژیانی حزبیو لەناوبردنی هەرشێوەیەکی ئەلقەو دەستەبەش پێکەوەنان و ڕێگە دەگرێ لەهەر زیانگەیاندێك بەیەکێتی حزب.

ئێمە کە ئەوکاتە لەناو حزبدا ڕووبەڕووی ناکۆکی سیاسیو هزری دەبووینەوە، بەتایبەتی لە کادیرە پێشکەوتووەکانی حزبەوە کە ئاستێکی سیاسی باشیان هەبوو، ڕاست وابوو بەشێوازی ڕاستو دروست بەرەو ڕووی ئەم ناکۆکییە ناوخۆییانە ببینەوەو هەروا دەبوو پرۆژەیەکی سیاسی بۆ گفتوگۆ لەناو حزبدا بخرێتە بەردەست و، بابیروڕای خۆشیان بۆ سەرکردایەتی حزب بنووسن و پاش

کۆتـایی مـاوەی گفتوگـۆ ئـەم گفتوگۆیانـە پوختـە دەکـرێن ولـە کۆبوونەوەیـەکی کۆمیتەی ناوەندیدا باسیان لێوە دەکرێن. بەڵام بەها هـیچ گـوێی بـەم پێشنیازانە نەدەدا.

هەرلەم ماوەیەدابوو نامەیـەکی هـاوڕێ عـەزیز محەمـەد لەبەندیخانـەی بەغداوە گەیشتو لەوێدا گفتوگۆی لەسەر سیاسەتی حزب دەکرد، بەڵام بـەها نامەکـەی بـۆ وەڵامدانـەوەی هــەڵگرت و دوو ڕۆژ خــەریکی وەڵامدانــەوەی بــوو، پــاش ئــەوەی وەڵامەکەی نووسیو هەندێ تێبینیم لەسەری خستە ڕوو وامـدەزانی دەینێرێتـەوە بۆیان بۆ بەندیخانە، بەڵام وادەرکەوت کە ئەم وەڵامەی بۆ بڵاوکردنەوە نووسـیوە، پاشـان وەڵامەکـەی بەچـاپکراوی هاتـەوە، گـوتم ئـەوان نامەکـەی خۆیـان بـڵاو نەکردۆتـەوەو دابەشـیان نـەکردووە ئـیتر بۆچـی ئێمـە پەلـە لـە بڵاوکردنـەوەی وەڵامەکـە بکـەین؟ گـوتی: ئەمـە بۆنەیەکـە بـۆ تێگەیانـدنی ڕێکخراوەکـانی حـزب لەسیاسـەتی حـزب و وەڵامـە بـۆ ئـەو کەسانەی لەگـەڵ سیاسـەتی حـزب نـین!

کاتێکیش وەڵامە چاپکراوەکەیان گەیشت بەندییـەکان زۆر تووڕەبـوون دابەشـبوون بـەدوو بەشــەوە، بەشـێکیان لەگــەڵ سیاســەتی حــزب و بەشــەکەی تــریش دژی سیاســەتی حــزب، واتــە دوو دەســتەبەش لەبەندیخانــەی بەغـدا. لــەم کاتــەدا بارودۆخەکە ئاڵۆز بوو بەندییەکان کەوتنـە ناونـاتۆرە لێنـان، لایـەك ئـەوی دیکـەی بەهەلپەرستو ڕاستڕەوو نۆکەرانی کۆنگرەی بەلوعە (کـۆنگرەی تـەختی پاشـایی) کە وەسی عبدالاله ڕێکی خستبوو ناودەبردو لایەکەی تـریش بەچـەپڕەوی و دوورە پەرێزی و کاری تەنیاکەسی و منداڵکارانە ناودەبرا.

ئەوکاتــە هاوســەرەکەم (حەمدیــە)م نــارد بــۆ ســەردانی بەندیخانــەی بەغـداو نامەیـەکی گـچکەم پێـدا بـۆ هـاوڕێ عـەزیز نـارد داوام کردبـوو ڕادەیـەك بـۆ ئـەم گاڵتەبازارییـە دابنـرێ تـا یـەکێتی حـزب بپـارێزرێ و بـەئارام و ژیـری مەسـەلەکە چارەسەر بکرێ، ئەگەرنا بواری ئـەوە دەدەیـن دوژمنـان پێمـان خۆشـبن. هەرکـە هاوســەرەکەم گەیــشتبووە بەندیخانــە نامەیــەکی تــری بــەهایش گەیــشتبووە ڕێکخستنی حزب لەبەندیخانـەو دەرکردنـی ئـەو کەسـانەی تـری لـەحزب بـەناوبرن نووسیبوو. بەمجۆرە دابەشکردنی ڕێکخراوەکە بەدوو بەشـەوە چەسـپابوو، لەگـەڵ

حزب، لەدژی حزب.

پاش سێ ڕۆژ نێردرام بۆ بەسرە بۆسەرپەرشتی کۆبوونەوەی کۆمیتەی باشور. گەیشتمە بەسرەو هێشتا ڕێکخراوەکە بەوەی نەزانیبوو کە ڕوویداوە، بەڵام بڵاوکراوەی ناوخۆیی حزب بەناوی (الأنجان) هەروا ڕۆژنامەی حزب (القاعدە) گەیشتبوون و بڕیاری حزبیان بەدەرکردنی لەڕێ لادەرە ڕاستڕەوەکان بڵاوکردبۆوە. کەوتمە ڕوونکردنەوەی ئەوەی ڕوویداوەو شێوازی ڕاستم بۆ ڕوونکردنەوە کە چۆن کێشەی ناوخۆیی بەڕێوەدەبرێ و چۆن ناکۆکی لەناو حزبەکەدا نیشانەیەکی تەندروستییەو نیشانەی لاوازی نییەو بەبێ بوونی کێشەی هزری و سیاسی لەژیانی حزبدا ناتوانرێ پەرە بەحزب بدرێو سیاسەتەکەی دەوڵەمەندبکرێ، بەمەرجێ ئەم کێشەیە بەچەشنێکی مەبدەئی بەڕێوەببرێتو بەمەرجێ نەبێتە هۆی دەستەبەشو کەرتبوون وەك ئەم تاقمە کردوویانە. کۆمیتەی ناوچەی باشور لەگەڵ حزب بوو ئیدانەی کەرتبوونی کرد.

دوای کۆبوونەوەکەی ناوچەی باشور لەگەڵ بەرپرسی کۆمیتەی ناوخۆیی ناسریە سەفەرم کرد بۆ سەرپەرشتیکردنی کۆبوونەوەی کۆمیتەکە، چەند ڕۆژێك لەوێ مامەوەو پاشان چوومە عەمارە لە کۆبوونەوەی لیژنەکەیان ئامادە بووم و لەوێشەوە بۆ بەسرە گەڕامەوە. لەوێ مامەوە تا نیسانی ١٩٥٣و لە ڕۆژی٤ی نیسانی ١٩٥٣دا نامەیەکی هاوڕێ ڕەشید عارف گەیشت کەلەبەندیخانەوە ڕایکردبوو گەیشتبۆوە حزب، لەنامەکەدا نووسیویە پۆلیس داویە بەسەر هاوڕێ باسم (بەهادین) داو گوتوویەتی هاوڕێ سادق فەلاحی و هاوڕێیەکی تریشی لەگەڵ بووە ناوی نەزانیوەو باقر جەفعەر بووەو پیرەژنێكو منداڵێکی بچوکیشیان لەگەڵ بووە، لەنامەکەیدا داوای کردووە کە پێویستە دەستبەجێ بگەڕێمەوە بۆ بەغدا، ئەم نامەیە لەلایەن (أم عبلە)ی هاوسەری (حزام عیال)ەوە هێنرابوو، لەگەڕانەوەشدا بۆ بەغدا لەگەڵ خۆی و عبلەی کچیدا کە منداڵێکی گچکە بوو پێکەوە گەڕاینەوە.

لەکاتێی سواربوونی شەمەندەفەردا کەوتمە بەر پرسیاری پۆلیس بەڵام توانیم قەناعەتیان پێبکەم کە من کاسپی دەکەمو لەباب الشیخ دادەنیشمو هاتووم بۆ

ئێـره بـۆ كڕينـی لەنگـەو هەنـدێ ناويـشم بـرد كـه لـەبازاڕی لەنگـەی بەسـره دەگوترانەوە، ئیتر هیچیان نەپرسی و بەڵام خستیانمه ژێـر چـاودێریی و پۆلیـسی نهێنی لەو فارگۆنەدا دانیشت، من و أم عبلە بەوردی سەرنجمان دەدا كە ئەو كەسە بەدرێژایی ڕێگا چاودێریمان دەكات، تا گەیشتینه (مسيب)، لـەوێ لـه شـەمەنەفەر هاتینه خوارەوەو بەخێرایی چووینه گەراج وسواری ئۆتۆمبیلێكی تاكسی بووین و بەرەو بەغدا كەوتینەڕێ و توانیمان لەچاودێریی ئەم پۆلیسە ڕزگاربین و ڕاسـتەوخۆ چـووینه شـوێنی دیـدار لـەوێ هـاوڕێ ڕەشـید عارفمـان دیتـەوەو، ئـیتر أم عبلـه بەڕێگەی خۆیدا ڕۆیشت.

# ئەرکە بە پەلەکان کامانەن؟

بەرێگەوە لەگەڵ هاوڕێ ڕەشید عارف بارودۆخەکەمان باسکرد کە چۆن هاوڕێ باسم و هاوڕێیانی تر پێکەوە لەو ماڵەدا گیراون و، ئاخۆ ماڵەکانی ترو بەتایبەتی ماڵی چاپخانەکە گواستویانەتەوەو لەدوای گرتنیانەوە چی کاروبارێك جێبەجێ کراوە؟ وەڵامی ئەمەبوو: بەم پەلەیە هیچ شتێك نەگۆڕدراوە بەڵام پێویستە هەموو شتێك بگۆڕدرێ، گرنگ ئەوەیە هەواڵی گرتنەکەیان هەر لەرۆژی یەکەمدا بڵاوبۆوە.

ڕۆیشتم بۆ ماڵی چاپخانەکە تەماشام کرد چۆڵە(دراسێکان) گوتیان دوو ڕۆژە گواستویانەتەوەو نازانین بۆ کوێ چوون. هەستمکرد کە هاوڕێیانی چاپخانە دەستبەجێ بۆ گواستنەوەی چاپخانەکە بۆ ماڵێکی نوێ دەستپێشخەرییان کردووە. هەردوو هاوڕێ محەمەد عەبەلی‌و سەبیح سیباهی چاپخانەکەی حزبیان بەرێوە دەبرد، دوای پەیوەندە کردن لەگەڵیان رۆیشتم بۆ ماڵە تازەکەو، ئەم ماڵە زۆر باش‌و گونجاو بوو بۆ چاپکردن، ژوورێکی جیاواز لەخانووەکە هەبوو کەپشتی بەباخێکی گەورەوە بوو کەخانووەکە سەربەخۆ بوو تەنیا ڕاڕەوێکی درێژ ماڵەکەی دەگەیاندە ژوورەکە وەك بەتایبەتی بۆ ئەم مەبەستە دروستکرابێ. سوپاسی هەردووکیانم کرد کە دەستبەجێ ئەم دەستپێشخەرییەیان کردووەو پیرۆزبایی دۆزینەوەی خانووێکی ئاوا چاکم لێکردن و، ئەوە ماوە بزانین چۆن ئەم ماڵە دەپارێزین؟ کەم‌وکورتی یەکەم ئەوە بوو ماڵەکە خێزانێکی تێدا نەبوو، لەگەڵیان باسم کرد کەخێزانێك بدۆزینەوەو ئاخۆ خێزانێك دەناسن بتوانێ ئەم بەرپرسییە بگرێتە ئەستۆ... بەڵام بەشێوەیەکی خێرا. لەدڵی خۆمدا بیرم کردەوە کە دەبێ خێزانێکیان لەگەڵدا بێت، پاش گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە بڕیارمدا قسە لەگەڵ ژنەکەم بکەم کە بەشێوەیەکی کاتی بچێتە ئەو ماڵە ئەویش قایل بوو، خۆی‌و کوڕە گچکەکەم (پێشڕەو) برد بۆ ئەوێ‌و ناوی نهێنی لەوێ بووە (سەلیم)و بەمنیشیان دەگوت ئەبو سەلیم و تائێستاش هەروا ناوم دەبەن. پاش چەند ڕۆژێك

خێزانێکمان دیتەوە کە ژن‌و مێردێك بوون، پاشان خوشکی جەمال ماربین (وەردە)هات‌و هەر لەم ماڵەدا شوی کرد بەهاوڕێ عەبەلی، بەلأم هاوسەرێکمان بۆ هاوڕێ سباهی نەدیتەوە.

بەمجۆرە وەزعی چاخانەکە جێگیر بوو داوای ڕۆژنامەکە زیاتر بوو بیرمان لە زۆرکردن و باشکردنی چاپەکەی کردەوەو پیتی تازەمان بۆ کڕی (فۆنتی گەورەتر) کەئەمە پیتی فارسی بوو، بەشێوەیەکی تایبەتی پاسکیلێکمان دروست کرد کە سندقێکی گەورەی لەپێش بوو، ئەمجۆرە سەمونفرۆشە گەڕۆکەکان بەکاریان دێنان‌و هاوڕێیان سەمونیان لەفڕنەکان دەکڕی گوایە سەمونفرۆشن‌و ڕۆژنامەی (القاعدە)یان دەخستە ژێر سەمونەوەو بۆ هەندێ ماڵی دیاریکراویان دەگواستەوە، بەپێی ناوچەکان‌و پاشان دەبرانە مەڵبەندی دابەشکرادنی ناوچەکان‌و لەوێشەوە دەنێردران بۆ لقەکانی باشورو فوراتی ناوەڕاست‌و بەغداو باقوبەو کوت‌و ڕەمادی‌و موسڵ.

بابێینەوە سەر دیاریکردنی ئەرکەکان، پەیوەندیم کرد لەگەڵ هاوڕێیان: (ناسر عەبود و ڕەشید عارف‌و سەلیم چەلەبی و کاکەی فەلاح) کە ئەمانە ئەوکاتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوون. بڕیارماندا کۆبوونەوەیەکەی ناکاو بکەین بۆ دیاریکردنی ئەرکە بەپەلەکان. دوای ئەوە ماڵە حزبییەکان گۆڕدران و بڕیارماندا ئەم کارانە بکەین:

١. دەرکردنی بەیاننامەیەك لەبارەی دەستگیرکردنی هاوڕێیانەوە.
٢. پێشکەش کردنی یادداشتێك بەهەموو حزبە شیوعییەکان‌ویەکێتییەکانی کرێکاران و یەکێتی لاوانی جیهان و یەکێتی خوێندکارانی جیهان و یەکێتی ئافرەتانی جیهان و دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان‌و ئەنجومەنی ئاسایش داوایان لێ بکەین لەسەر گرتنی ئەو هاوڕێ تێکۆشەرانەی ئەندامانی حزبەکەمان پرۆتێستی خۆیان بۆ حکومەتی عێراق بنێرن‌و داوای ئازادکردنیان بکەن.
٣. هەروا بڕیاردرا لەپێناو بەردانیان خۆپیشاندانی ڕۆژانەیخێرا بکرێت. توانیمان یادداشتەکە بگەیەنینە سوریە، واتە بۆ حزبی شیوعی سوری–

لوبنانی‌و بۆ ئینگلتەرا بۆ حزبی شیوعی بەریتانی‌و ڕێکخراوی حزبی شیوعی عێراقی لەبەریتانیا، لەم ولآتانەشەوە یادداشتەکە بۆ ئەو ئەدرەسانە نێردرا کە تێیدا باسکرابوون، هەروا بەیاننامەکەی حزب لەگشت ناوچەکانی عێراقداو تەنانەت لەلادێکانیشدا دابەشکرا.

لەئەنجامی ئەم چالاکی و هەڵسوڕانانەدا پاڵەپەستۆی زۆرتر خرایە سەر حکومەتی عێراق، لەهەموو لایەکی جیهانەوە پرۆتیست دەگەیشت و داوای بەرەلاکردنیان دەکرا.

هەڵوێستی هاوڕێیانی گیراو پتەو بوو، بەتایبەتی هاوڕێ (باسم)و (دایە) دایکی عوسمان مستەفا خۆشناو کە ناوی ڕاستەقینەی خۆیشی‌و منداڵەکەیشی نەدابوو، شانبەشانی ئەو خۆپیشاندانانەی ڕۆژانە بەشێوەیەکی خێرا دەردەچوون و بەهیچ جۆرێك زیانیان تێدا پێشکەش نەکرا، هەموو ئەم چالاکی‌و هەڵسوڕانانەی ناوخۆو ناودەوڵەتان بووە هۆی ئەوەی کە حکومەت هاوڕێیانمان ئیعدام نەکات، بەلآم وێڕای ئەوەش حوکمی هەمیشەییان بەسەردا دراو دایکەکەش (کە منداڵەکەی لەگەڵدابوو) بەدووساڵ بەندی و دووساڵ چاودێری حوکم درا.

لەجەرگەی ئەم هەڵسوڕانانەدا، قورسایی گەورەی کەوتبووە سەر ڕێکخراوی بەغدا کە ئەو سەردەمە هاوڕێ ڕەشید عارف سەرکردەیی دەکردو، هەرخۆیشی سەرپەرشتی ئەو خۆپیشاندانانەی دەکرد، ڕۆژانە یەکترمان دەدی‌و ڕاپۆرتی لەسەر خۆپیشاندانەکە دەدامێ کە تاچ ڕادەیەك کاریان کردۆتە سەر جەماوەرو خەڵکەکەو ناچەند لەگەڵ خۆپیشاندانەکان‌و دروشمەکانی بوون. ڕۆژانی یەکەمی خۆپیشاندانەکە وەك ڕۆژانی دواتر نەبوون، لەسەرەتادا خەڵکەکە بەوریاییەوە تەماشایان دەکردو چەند پێشدەکەوت هێندە سۆزی جەماوەر زیاتر دەبوو خەڵکەکە دەرگای ماڵەکانیان دەکردەوە بۆ شاردنەوەی خۆپیشاندەران و پۆلیس دەترسان بچنە ناو کۆڵانە باریکەکان‌و لقی جادەکانەوە، لەڕۆژانی دواییدا ئافرەتان دەردەچوونە سەرشەقام تا بەهەلهەلەکێشان پێشوازیی لە خۆپیشاندەران بکەن و خەڵکەکە لەسەر شۆستەی شەقامەکان کۆدەبوونەوەو کاتێك پۆلیس بەدیار دەکەوتن دەیانکردە هاتو هاوار(ها...هو...ها)، پۆلیسەکانیش پرکێشییان

نەدەکرد توخنی ئەو خەڵکە بکەون کەلەسەر شەقامەکان ڕادەوەستان.

لەدوا ڕۆژی دادگایی کردنەکەیاندا بڕیار وابوو خۆپیشاندانێکی گەورە دەرچێ کە پەلەنەبێ، لەم ڕۆژە سەختانەدا نزیکی شوێنی دەرچوونی خۆپیشاندان دەبووم‌و هاوڕێی پەیامنێری نێوان من و ڕەشید عارف بۆ ماوەی دەخولەك دواكەوت پاش ئەوە هاتەلام و گوتی خۆپیشادانەکە دەرنەچوو هیچ گردەوەبونێك نەکراو هاوڕێ تا ئەم کاتژمێرە دەرنەچووە. کەواتە هەڵوێستەکە گۆڕدراوەو دەبێ بەدوای هاوڕێ ڕەشیددا بگەڕێن‌و بزانین چی بەسەرهاتووە ئایا نەخۆشە یان دەستگیر کراوە...؟ پەیوەندیم بەهاوڕێ ناسر عەبودەوە کرد بارودۆخەکەم بۆ باسکرد، ئەویش ڕۆیشت بۆ ئەو ماڵەی هاوڕێ ڕەشید تێیدا دەژیا، بەلاّم ئەمە بەچەند قۆناغ‌و زۆر بەوریایی کرا، پاش سەعاتێك هاتەلام و گوتی ماڵەکە ئاساییەو لەدوێنێوە بۆ ماڵ نەگەڕاوەتەوە، کەواتە دەبێ لە تەحقیقاتی جینائی‌و مەڵبەندەکانی پۆلیس بەدوایدا بگەڕێین، هەروا لەگشت ئەو جێگەو ماڵانەی هاتوچۆیان دەکات‌و بۆماوەی پێنج ڕۆژ بەدوایدا گەڕاین بەلاّم نەماندیتەوە تەنانەت خەستەخانەکانیش گەڕاین.

لەم ماودیەشدا ماڵە سەرەکییەکان‌و وێستگەکانی پەیامنێریمان گواستەوە.. گەیشتبووینە ئەو ئەنجامەی کە لەترسی دەسگیرکردن هەلاّتووە بەتایبەتی کە ئەو بەرپرسی ڕێکخراوی بەغدایەو سەرپەرشتی خۆپیشاندانەکانیش دەکات‌و ئەم بۆچوونەمان بەڕاست دەرچوو، لەسلێمانییەوە زانیاریمان بۆهات کە کەسێك هەیە لەناوچەی قەرەداغ لای خزمەکانی خۆی شاردۆتەوەو دەڵێن شیوعییەکی پێشکەوتووەو لەبەندیخانە هەلاّتووەو، عەسکەریشە. کەوابوو دیتمانەوە نەترسی لەسەر هەیەو نەترس لەسەر ئێمەش هەیە، پێش ئەمە هەوڵماندا پەیوەندیی لەگەڵ بکەین هیچ ئامادەیی پیشاننەدا و بیستمان یەکێك لە خزمەکانی خۆی مارەکردووەو تا ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ وامایەوەو ئینجا پەیوەندیی بەحزبەوە کردو بووە فەمانبەرو بۆ بەسرە گواسترایەوەو لەوێ کۆچی دوایی کرد.

حزب ئەم جەنگەشی لەپێناو ڕزگارکردنی ژیانی هاوڕێیاندا بردەوەو، ئەمەش بەچاکی کاری کردەسەر حزب‌و ورەی هاوڕێیان بەرز بۆوەو چالاکیی جەماوەرییان

زیـادی کـردو ناوبـانگی حـزب لـەناو جـەماوەرو جولانـەوەی نیـشتمانیو حزبـە سیاسییەکاندا بەرینبوو، هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندیم بۆ کۆبوونەوەیەکی بەپەلـە بانگکرد بـۆ لێکۆڵینـەوەی وەزعەکە پـاش ئـەوەی ئـەرکی ڕزگـارکردنی هاوڕێیـان کۆتـایی هـات، لـەپێناو دارشـتنی نەخـشەیەکی تـازەی کارکردنـداو چـاوگێڕانەوە بەسیاسەتی پێشووی حزبداو، گەیشتینە ئەم خالانەی باسکردن:

١. لـەبواری سیاسـیدا،پەیوەندی لەگـەڵ هێـزو حزبـە نیـشتمانییەکانو، پەیوەندی لەگەڵ حزبە شیوعییەکاندا.

٢. لەژیانی ناوخۆیی حزبدا، دەبێ هەیئەتە حزبییەکان دەسـەلاتی خۆیـان پەیڕەو بکەن، ڕێکخستنی لایەنگیری ڕێکخراو هەڵوەشێننەوەو، ژیـانی دیموکراسی ناوخۆیی لە حزبدا دابین بکـەن و پـەیڕەوی نـاوخۆ پـەیڕەو بکەن.

٣. چاوگێڕانەوە بەسیاسەتی پێشووی حزبداو، وەرگرتنـی ئەنـدامی نـوێ لەکۆمیتەی ناوەندیدا.

کۆبوونەوەکـــە ئـــەم خالانـــەی بەدرێـــژی باســـکردو بڕیـــاردرا کۆمیتـــەی پەیوەندییەکانی نیشتمانی پێکبێتو لەگـەڵ حزبـە نیـشتمانپەروەرەکان بـەحزبی سەربەخۆیـشەوە(حـزب الاسـتقلال)و لەگـەڵ کەسـانی حزبـە هەڵوەشـێندراوەکان پەیوەنـدی بکرێـت و بیرۆکـەی بـەرەی نیـشتمانییان بخرێتـەپێش. بـەلام بـۆ پەیوەندییەکانی دەرەوە سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی ڕاسپێردرا کە نامە بۆ حزبـە شیوعییە براکان بنووسێت بۆ پێکهێنانەوەی پەیوەندی لەگەڵیاندا دوای پـچڕاندنی ئەو پەیوەندییانە لەساڵی ١٩٤٧ بەدواوە.

هەرچی پەیوەندی بەخاڵی دووەمـەوە هەیـە لـەژیانی نـاوخۆیی حزبـدا بڕیـاردرا کۆمیتەی ناوەندی پێویستە لەهەر کۆبوونەوەیەکدا ڕاپۆرتێك پێشکەش بکـات کـە لـەنێوانی هـەردوو کۆبوونەوەکـەدا چـی کـردووە. هـەروا بڕیـاردرا ژمارەیـەك لـە هاوڕێیانی ڕۆشنبیر لەوانـەی توانـای نووسـینیان هەیـە ڕاسـپێردرێن بـۆ ڕۆژنامـەی حـزب (القاعـدە) بنووسـن کـە پێـشان لەلایـەن سـکرتێری کۆمیتـەی ناوەندییـەوە دەنووسـرا. لەنووسینیـشدا سـەرنجی ئـەوە بـدەن کـە بـۆ (ڕۆژنامـەی نهێنـی)

دەنووسنو قەبارەی ڕۆژنامەکەیان لەبەرچاوبێ، نەك وەك نووسین بۆ ڕۆژنامەی ئاشکرا، زۆرجاریش لەسەر سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی پێویستە سەروتارەکان بنووسێت یان بەیەکێك لەهاوڕێیان ئەو ئەرکە بسپێردرێ و خۆیشی لێی ورد بێتەوەو ڕێگای بلاوکردنەوەی بدات. هەروا بڕیاردرا ڕێکخراوی(لایەنگیرانی ڕێکخراو) هەڵوەشێندرێتەوەو ئەوانە هەموویان بکرێنە شانەی پالێوراوان. چونکە لایەنگیری ڕێکخراو هەموو ئەو ئەرکانە بەجێ دەگەیەنن کەئەندامانی حزب بەجێیان دەگەیەنن، بەلام هیچ مافێکیان نییە. هەروا ئەمە پێچەوانەی پەیڕەوی ناوخۆیە، ئەمە بوار ئاوەڵە دەکاتەوە بۆ فراوانبوونی ئەندامەتی حزبو دەسکەوتنی جۆری نوێی لاوان لەنێوان کرێکاران و جوتیاران وخوێندکاران و ڕۆشنبیران ی زەحمەتکێشاندا. بڕیاردرا نامەیەکی ناوخۆیی بنووسرێ کە جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە هەموو کۆمیتە حزبییەکان دەسەلاتی خۆیان پەیڕەوبکەنو کۆبوونە بەکەنو بەرنامەی وەرزی بۆ کارکردن لەگشت بوارەکاندا دابنێن، ئەمە هەروا بەسەر شانەحزبییەکانیشدا پەیڕەو دەکرێ کە دەبێ ڕاپۆرتی وەرزی بدەنە دەستە حزبییە سەرکردەکانو پێویستە تواناو هەلومەرجی پێویست بخولقێندرێ بۆ پەیڕەوکردنی ژیانێکی دیموکراسی لەگفتوگۆکردندا لەسەر سیاسەتی حزب لەکۆبوونەوەکانداو پێشنیازەکان بدرێنە سەرکردایەتی حزبو ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆگرتن پەیڕەو بکرێو پێویستە سکرتێری شانە بەگونجاندن لەگەڵ هەلومەرجی کاری نهێنیدا هەڵبژێردرێ.

بەلام لەبارەی چاوگێرانەوە بەسیاسەتی پێشووی حزبدا سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی ڕاسپێردرا کە ڕەشنووسێك ئامادە بکات و لەوێدا لەگشت لایەنەکانە سیاسەتی حزب بدوێو باسی شێوازی کارکردن و مەسەلەی بەرەی نیشتمانی تێدا بکرێ.. ئەو ئەرکەم پێ سپێردرا کە ئامادەی بکەمو بیخەمە بەردەم کۆبوونەوەی ئایندە وەك سکرتێری ک.ن. بەمجۆرە کۆبوونەوەی لەناکاو کۆتایی هاتو کەوتینە کارکردن، پاش ئەوەی هەر لەو کۆبوونەوەیەدا هاوڕێ (حسین الرضي) بۆ ئەندامەتی کۆمیتەی ناوەندی پێشبخرێ و سەرکردەیی کۆمیتەی ناوچەی باشووری پێ سپێردرا. کاریش لەنێوان ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیدا دابەشکراو کرایە

ئەرکی سەلیم چەلەبی کەپەیوەندی بەکۆمەڵەکەی (ئاڵای ڕەنجدەرانەوە) بکات بۆ کۆتایی هێنانی بارودۆخی دابەشبوون، وەڵامیان ئەوە بوو وتارێکی سەلبی لە ڕۆژنامەکەیاندا (راية الشغيلة) بنووسن بەناونیشانی (ئێوە بەرێگای خۆتاندا بڕۆن و ئێمەش بەرێگای خۆماندا دەڕۆین) ئەمەش مانای وایە کە پێکناگەین، وتەی من لەسەر ئەم وتارە ئەوە بوو کەئەمانە تووشی لوتبەرزی بوون (واتە مەغروربن) بەڵام ئاخۆ ئەگەر ئەوانیش لەسەر ڕێبازی مارکسی-لینینی بڕۆن بۆچی پێکناگەین، بەڵام ئەگەر دەستبەرداری ئەم ڕێبازە بوون ئەمە مەسەلەیەکی ترە.لەسەریانە چاو بگێڕنەوە بەم هەڵوێستە سەلبییەداو، جابا گفتوگۆ لەسەر ئەو بارودۆخە بکەین، کە بووە هۆی جیابوونەوەیان لەحزب و لە هەردوولامانەوە هەڵەکان ڕاست بکەینەوەو بکەینە یەکگرتنەوەی حزب. سەلیم چەلەبیم ڕاسپارد کە دیسان پەیوەندییان پێوەبکات و نامەیەکیشم نارد بۆ حەمید عوسمان لەبەندیخانەی باقوبەو داوام لێکرد پەیوەندی بەهاوڕێ عەزیز محەمەدەوە بکات مەسەلەکەی بەوجۆرە لەگەڵ باس بکات کە ببێتە هۆی یەکێتی حزب، لەوەڵامی نامەکەدا لە حەمید عوسمانەوە نامەیەکم بۆهات تێیدا دەڵێ دیدارێکی تایبەتی لەگەڵ هاوڕێ عەزیز محەمەد کردووەو هەڵوێستی باش بووە بۆ گفتوگۆکردن لەنێوان حزب و ئەواندا، بەڵام ڕایگەیاندووە کە دەرەوە (مەبەست دەرەوەی بەندیخانە) ئەم مەسەلەیە بڕیاردەدا. ئەویش خۆی ئاگاداری برادەرانی دەکات کە لەم دەستپێشخەرییەی حزبی شیوعی عێراق بکۆڵنەوە.

پەیوەندی کردنەوەی سەرلەنوێی سەلیم چەلەبیش بەوانەوە تاڕادەیەك باش بوو ئەمجارە پێشنیازیان کردبوو کە لایەنێکی سێیەم لەحزبە شیوعیە براکان وەك بۆ نمونە حزبی شیوعی سوری لەنێوانماندابێ. تا ئەم ئاستە ئیتر دیدارمان ڕاگرت تا کۆمیتەی ناوەندی حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق لەپێشنیازەکەمان دەکۆڵێتەوە، بەڵام کاتێك هاوڕێ حسین ڕەزی-م سپارد کە لەکۆنگرەی حزبی شیوعی بەریتانیدا ئامادە بێت ئامۆژگاریم کردکە پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێیانی حزبی شیوعی سوری بکات بۆ لێکۆڵینەوەی پێشنیازی کۆمەڵەی (رایەالشغیلە) کە کۆبوونەوەیەکی هاوبەشە لەلای ئەوان و بەبەشداریی نوێنەری حزبی برامان

لەگفتوگۆی نێوان ئێمەو (راية الشغيلة)، ئێمە پێمانوابوو کەهەردوولامان مەسەلەی جیابوونەوەکە چارەسەربکەین نەك بەئامادەبوونی لایەنی سێیەم، دوای گەڕانەوەی هاوڕێ حسين الرضي کە پرسیاری ئەم مەسەلەیەم لێکرد گوتی: پەیوەندیم لەگەڵ هاوڕێ خالد بەگداش کرد مەسەلەکەم بۆ باس کرد ئەویش پشتگیریی پێشنیازەکەی ئێمەی کردو، هاوڕێ خالد بەگداش گوتی: ئەگەر هاتن‌و پێشنیازەکەیان لەگەڵ باسکردین لەوەڵامدا پێیان دەڵێین ئەمە مەسەلەی حزبی شیوعی عێراق خۆیەتی‌و دەبێ ئەوان رەخنە لەهەڵوێستی خۆیان بگرن‌و دان بەهەڵەی دابەشبووندا بنێن‌و رێکخراوەکەیان هەڵوەشێننەوەو بەبێ هیچ قەیدو شەرتێك خۆیان بدەنە دەست حزب، ئائەمەیە هەڵوێستی مەبدەئی.

# ئامادەکاری بۆ کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی

لەماوەی دوای کۆبوونەوەی لەناکاوی کۆمیتەی ناوەندیو پێسپاردنم کە ڕەشنووسی ڕاپۆرتی (بەرەی خەبات لەدژی ئیستیعمارو شەڕ) ئامادە بکەم، هەموو کۆششی خۆم بۆ ئامادەکردنی ئەم ڕاپۆرتە تەرخان کردو، تووشی قورساییەکی زۆر بووم لەباسی بابەتەکانیدا، چونکە من پێشتر ئەم چەشنە کارەم نەکردبوو. لەماوەی بیست ڕۆژدا ئامادەم کردو دانەیەکم نارد بۆ بەندیخانەو داوام کرد گفتوگۆی لەسەر بکەنو هەولّی دەولّەمەندکردنی بدەنو لەگەلّ بیروڕای خۆیاندا بۆمان بنێرنەوە، هەروا دانەیەکیشم ناردبۆ ئەو هاوڕێیانەی کۆمیتەی ناوەندیی کە لەبەغدا بوونوو تا سەرەتایەك بێت بۆ ئەوەی لە کۆبوونەوەکەدا گفتوگۆی لەسەر بکەینو هاوڕێ حسین الرضي (سەلام عادل)م بانگ کرد بۆ بەغدا تابۆ یەکەمینجار لەکۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا ئامادەبێ. نامەیەکیشم نارد بۆ بەندیخانەی باقوبە لەوێدا داوای بیروڕایانم کردبوو لەسەر ڕەشنووسی ڕاپۆرتەکەو بۆمان بنێرن چونکە ئێمە کۆبوونەوەیەکی تایبەتیمان دەبێ بۆ گفتوگۆ لەسەر ڕەشنووسی ڕاپۆرتەکە، هەروا حەمید عوسمانم ئاگادار کردکە ئێمە بڕیارمانداوە هاوڕێ حسین الرضي وەك ئەندامێکی تەواو بێنینە کۆمیتەی ناوەندی، لەوەلاّمیاندا ڕای خۆیان ناردبوو کە لایەنگیری بڕیاردان لەسەر پرۆژەکە دەکەن وەك ڕاپۆرتێکی تەواوی سیاسی حزب، لەگەلّ هەندێ پێشنیازو دارشتن بۆ باشکردنی، بەلاّم لەبارەی ئەو بڕیارەی کەدابوومان بۆ هێنانی هاوڕێ حسین الرضي بۆ کۆمیتەی ناوەندی داوایان لێکردبووین چاو بەوەدا بگێڕینەوەو بڕیاریان لەسەر نەدابوو، بەلاّم من بیروڕاو دارشتنەکانیانم لەسەر ڕەشنووسی ڕاپۆرتەکە خستە پێش چاوی کۆبوونەوەکە بەلاّم ڕایانم لەسەر هاوڕێ سەلام عادل باس نەکرد چونکە خۆم لەبەندیخانەدا ژیابوومو ئاگاداربووم لەکێشەکانی نێوان کەسەکان و ئاستی کاریگەرییان لەکاتی هەلّسەنگاندنی هاوڕێیاندا.

دەستیان کردە گفتوگۆی ورد و بەگیانێکی بەرپرسی پرۆژەی ڕاپۆرتەکە لەبارەی هزرو بابەت ودارشتنەکانییەوەو ڕەخنە لەخۆگرتنمان بۆ یەکەمینجار بەگیانی دەست خستنە سەر هەڵەکانمان و چارەسەر کردنیان چونکە ئێمە دەکەوینە بەردەم جێبەجێ کردنەوە وەك بەرنامەیەکی کارو سیاسەتێکی تەکتیکی حزب و لەسەر بابەتی چارکردنی سەرکردەیی تاقە کەسی هەڵوێستەمان کرد کەپێویستە بەرگری بکەینو دەبێ کۆمیتەی ناوەندی دەسەڵاتەکانی سەرکردایەتی خۆی پەیرەو بکات. بیروڕاو پێشنیازو دارشتنەکانی هاوڕێیانی بەندیخانەمان زۆر بەجدی دایە بەرباسو لێکۆڵینەوەو لایەنی نەرمو نۆڵیمان لەئیشوکارداو لەمامەڵە کردن لەگەڵ حزبە نیشتمانپەروەرەکاندا گرتو لایەنە توندو تیژەکانمان دایە دواوە کەدوورە پەرێزی لەجەماوەری گەلو بزووتنەوەی نیشتمانی دەچەسپێنن. هاوڕێ سەلام عادل لەبیروڕاو بابەت و دارشتنو دەوڵەمەند کردنی ڕەشنووسەکەدا بەشدارییەکی باشی کرد. ڕاپۆرتەکە بەکۆششێکی بەکۆمەڵ دەرکرا تا سیاسەتی حزب لەو قۆناغە مێژووەدا نەخشە بکێشێ کە ڕووبەڕووی بزافی نیشتمانیو ڕزگاریخوازیی دیموکراسی بۆتەوە.
ڕاپۆرتەکە بەپێخۆشحاڵییەکی زۆرەوە لەلایەن ڕێکخراوەکانی حزبەوەو لەلایەن بزافی نیشتمانیو حزبەکانییەوە پێشوازیی لێکرا. ئەم ڕاپۆرتە کارتێکردنی هەبوو لەپێکهێنانی بەرەی نیشتمانیداو لەبەشداریی حزب لەهەڵبژاردنەکانی پەرلەمانداو لەژیانی ناوخۆیی حزبداو لەپەیوەندی لەگەڵ حزبە شیوعیە براکانداو لەلایەن حزبە شیوعییە براکانیشەوە سیاسەتی حزب بەچەشنێکی باشو ئیجابی هەڵسەنگێندرا.

# بەستنەوەی پەیوەندی لەگەڵ بزاڤی کۆمونیستی

کۆبوونەوەی لەناکاوی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراق لە حوزەیرانی ١٩٥٣دا بڕیاریدا هەوڵبدرێ بۆ بەستنەوەی پەیوەندی لەگەڵ حزبە شیوعییە براکان و هەنگاوی یەکەم بەستنەوەی پەیوەندی بوو لەگەڵ هەردوو حزبی شیوعی سوری و بەریتانی لەڕێگەی ڕێکخراوی خوێنکارانی حزبیی حزبی شیوعی عێراقەوە لەبەریتانیا، لە ٢١ی نیسانی ١٩٥٤دا بڕیاردرابوو کۆنگرەی حزبە شیوعییەکانی ولآتانی کومنوێلسی بەریتانی پێکبێت، حزبمان بۆ ئامادەبوونی ئەم کۆنگرەیە بانگهێشت کرابوو. بانگکردنەکە بۆ کەسی سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی حزبمان نێردرابوو. ئەمەش هەلێکی باش بوو بۆ بەستنەوەی پەیوەندی لەگەڵ بزاڤی شیوعی، بەلآم من پەساپۆرتم نەبوو زۆر زەحمەتیش بوو بەو خێراییە دەستکەوێت، لەهاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندیم پرسی، بەتایبەتی هاوڕێ سەلیم چەلەبی ئەویش پەساپۆرتی نەبوو. بەخێرایی نامەیەکی پەلەم بۆ هاوڕێ (عەمار) حسین الرجي نارد کە بێت بۆ بەغدا، لەو کاتەدا سەرکردایەتی کۆمیتەی ناوچەی باشوری حزبی دەکرد. بۆ ڕۆژی دووەم لەگەیشتنی نامەکە هەر لەگەڵ ئەو پەیامبەرەی نامەکەی بۆ بردبوو گەیشتە بەغداو لەماڵی ئێمە دابەزی، ئەو شەوە لەسەر بارودۆخی بەسرەو باری سیاسیی گشتی قسەم لەگەڵ کردو، ئینجا مەسەلەی ئامادەبوونیم لە کۆنگرەی حزبە شیوعییەکانی کۆمنوێڵسی بەریتانیدا لەگەڵ باسکرد، ئەویش بەگەرمی ئامادەیی خۆی بۆئەم ئەرکە پیشانداو، بەتایبەتی ئێمە تازە لەکۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی دەرچووبووین، لەو کۆبوونەوەیەی کە گفتوگۆی لەسەر ڕاپۆرتی (بەرەی تێکۆشان دژ بەئیستیعمارو شەڕ) کردبوو بڕیاری لەسەر دابوو. گوتم پێویستە بیروڕای حزبە شیوعییە براکان لەسەر ئەم ڕاپۆرتە وەربگری‌و وتارێکیش پێشکەش بکەیت کە ناوەڕۆکەکەی دەرخستنی سیاسەتی حزب بێت، ئینجا داوام لێکرد کە دوای کۆنگرەکە سەفەری

یەکێتی سۆڤیەت بکات بەمەبەستی بەستنەوەی پەیوەندی لەگەڵ حزبی شیوعی سۆڤیەت.

نامەیەکیشم ئامادە کردبوو بۆ حزبی شیوعی سوری–لوبنانی لەبارەی مەسەلەی فەلەستینەوە، لەوێدا داوام کردبوو دیداری حزبە شیوعییەکانی سوریەو لوبنان و ئەردەن و میسر ساز بکرێت بۆ باسی مەسەلەی پێکهێنانی دەوڵەتی فەلەستین دوای ئەوەی ئیسرائیل دەوڵەتی خۆی دامەزراندووە، بۆ ئەوەی داوا لەهەیئەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بکرێ بڕیارەکەی خۆیان لەبارەی پێکهێنانی دەوڵەتی فەلەستینەوە پیادە بکەن بەو سنورەوە کە لەلایەن هەیئەتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بڕیاری لەسەردراوە، نامەیەکیشم پێدا کە بیخوێنێتەوەو بیروڕای خۆی لەسەر دەربڕێ، پاش ئەوەی نامەکەی خوێندەوە بەجۆرێکی باش و ئیجابی هەڵیسەنگاند بەتایبەتی کاتێك خوێندییەوە کە ئیسرائیل دەوڵەتی خۆی دامەزراندووەو لەفراوانبووندایە بەرێگەی دەسەلاتگرتن بەسەر خاکی فەلەستینداو هەروا دەوڵەتە عەرەبییەکانیشدا کە چوونە کۆڕی شەڕەوە لەدژی ئیسرائیل و، ئەویش خاکی فەلەستینیو ئەردەنیش کەناری خۆرئاواو میسریش کەرتی غەزەی داگیرکرد، ئیتر کامەتە قەوارەی دەوڵەتی فەلەستینی؟ ئیسرائیل بەبیانووی شەڕ لەدژی عەرەب لەخاکی فەلەستیندا خۆی فراوانتر دەکات. هەروا دەبێ ئیسرائیل بۆ ئەو سنورەی لەلایەن هەیئەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە نەخشەی بۆکێشراوە پاشەکشە بکات.

بەمجۆرە هاوڕێ سەلام عادل کاروباری خۆی رێکخستو رۆژی سێیەمی گەیشتنە بەغدای بەرێگەیەکی تایبەتیدا بۆ سوریەو لوبنان سەفەری کردو لەوێشەوە گەیشتە لەندەن، لەوێش کەوتەبەر تەنگ پێهەڵچنینی پۆلیس و زۆری نەمابوو بۆ لوبنانی بنێرنەوە بەڵام خۆی وەك بازرگان ناونووس کردو ئەدرەسی یەکێك لە هاوڕێیانی پێدا کە گوایە وەکیلی بازرگانیی ئەوە کە لەلەندەنەو، لەفرۆکەخانە هێشتیانەوە تا ئەو وەکیلە هات و کاتێك هاوڕێیەکە ئامادەبوو تێگەیشت کە ئەو لەلایەن پۆلیسەوە ئاگادار کراوەکە وەکیلە بازرگانییەکەی لە فرۆکەخانەیە، ئیتر باوەشیان کرد بەیەکداو بەخێرایی زانیاریی پێدا، بەمجۆرە

توانی پۆلیس هەڵخەڵەتێنیو بچێتە ناو لەندەن و لە کۆنگرەکەدا ئامادە بێت، لە کۆنگرەکەدا ووتارێکی خوێندەوەو بەکورتی سیاسەتی حزبی تێدا باسکرد وەك ئەوەی لەراپۆرتی (بەرەی تێکۆشان لە دژی ئیستیعمارو شەڕ)دا باسکرابوو، وتارەکەی لەکۆنگرەدا بەچەپڵەڕێزان و هەستانە سەرپێ پێشوازی لێکرا بەتایبەتی کاتێك گوتی حزبمان پێنج هەزاردانە لە رۆژنامەی نهێنی (القاعدە) چاپو بڵاو دەکاتەوەو بەردەوام داواشی لەسەرە کە زۆرتر بکرێت.

کۆنگرەکە بەچاکی سیاسەتی حزبی هەڵسەنگاند وەك ئەوەی کەلەراپۆرتی (بەرەی تێکۆشان دژبە ئیستیعمارو شەڕ)دا خرابووە ڕوو، ئەمەش لەو پێشنیازەوە دەردەکەوێ کە هاورێ پالمدات جێگری سەرۆکی حزبی شیوعی بەریتانی پێشکەشی کردو گوتی:

(پاش گوێگرتن لە راپۆرتەکەی حزبی شیوعی عێراق لەم کۆنگرەیەدا، ئەو راپۆرتەی هەستو نەستی هەموو ئەوانەی لەرزاندەوە کە گوێیان لێبوو، من پێشنیاز دەکەم کە کۆنگرەکەمان نامەیەکی وەڵام و سلاوێکی برایانەی گەرم بۆ حزبی شیوعی عێراقی قارەمان بنێرێتو، پەیمان بدەینە خۆمان کە بەجۆرێکی فراوان پروپاگەندە بلاوبکەینەوە لەسەر ئەو بارودۆخ و خەباتەی لە راپۆرتەکەدا ئاشکرا کرانو، چەند لەتوانامانداية کاربکەین بۆ پشتگیریی هاوڕێیانمان لەحزبی شیوعی عێراقو برالی نیشتمانیی رزگاریخوازیی گەلی عێراق).

کۆنگرەگە ئەو پێشنیازەی هاورێ پالم دات-ی پەسەند کردو سلاوێکیان نارد کە تێیدا گوتراوە:

**هاورێیانی خۆشەویست.!**

...هەموو نوێنەرانی حزبە براکانو گشت ئامادەبوان زۆر بەقوڵی سەرسام بوون دەرهەق بەو پێگەیشتنە سیاسییە پەرەسەندووەی حزبی شیوعی عێراق... ئەو بارودۆخە قەشەنگەی پڕلە ئازادییو قوربانیدانی حزب لەسەرکردەیی جەنگە مەزنەکانی کرێکاران و جوتیاران و خوێندکاران و رۆشنبیران و هەموو ئەوانەی

مەقاوەمـەتی دەسـەڵاتی ئیـستیعماری بێگانـەو قـەرەقۆزە کۆنەپەرسـتەکانیان لەعێراقدا دەکەن هەستو نەستی هەموومانی هێنایە لەرزە..

ئێمە پڕ باوەڕێن کە دیتنی ڕاپۆرتەکەتان (بەرەی تێکۆشان لـەدژی ئیـستیعمارو شەڕ) نەخشەی بۆ کێشاوە خزمـەتی پەرەسـەندنی تێکۆشـانی یـەکگرتووی گـەلی عێراق دەکات بەگەلی کوردیشەوە کـە دووچـاری چەوسـانەوەی نەتـەوەیی بـووە، ئێمە چاومان بڕیوەتە ئەو سەرکەوتنە مەزنانەتان لەکارەکەتانداو ئـەو پێگەیـشتنە خێراییەو بەهێزبوونی حزبەکەتان.

کۆنگرەکـەمان لەلەنـدەن، بـووە هـۆی پتـەوکردنی زۆرتـری پەیوەنـدیی دۆسـتایەتیو هاوکـاری لـەنێوان حزبـە براکانمانـداو شـانازی دەکـات کـە تۆمـاری خەباتی بەرزی حزبە براکـەمان لـەعێراق هۆکـارێکی گـەورە بووبـۆ جەختکردنـەوە لەسـەر بایـەخی تێکۆشـانی هاوبـەش لـەدژی دوژمنـی هاوبـەش، کـە هاوپـەیمانیی کۆنەپەرستانەی ئیستیعماری بەریتانی و ئەمریکییـە. ئێمـە پڕبـاوەڕین کـە حزبـی شـیوعی عێـراق لەبـەرێزترین بەشـداری هاوپـەیمانی هـەموو گـەلانی بـەرەنگاری ئیـستیعماری بـەریتانی دەبـێو، هەربـەرەوپێش دەڕۆن شانبەشـان بـۆ گەیـشتنە ئاشتیو ڕزگاریی نیشتمانیی و دیموکراسیو سۆسیالیزم.

بژی حزبی شیوعی عێراق... لەگەڵ گەرمترین سڵاوی لایەنگریمان.

**هاوڕێیانتان:**

**ج-مایلەر (ئەندامی کۆمیتەی سیاسی حزبی شیوعی ئوستراليا)**

**هاری پۆلێت (سکرتێری گشتی حزبی شیوعی بەریتانیا)**

**ر-پ-دات(جێگری سەرۆکی حزبی شیوعی بەریتانی)**

**تیم باك (سکرتێری گشتی حزبی کرێکارانی پێشکەوتنخوازی کەنەدا)**

**میشیل ئوکندو(سکرتێری گشتی کۆمەڵەی کاری ئیرلەندی-باشوری ئیرلەندا)**

**پیتی سنکلیر (ئەندامی کۆمیتەی سیاسی حزبی شیوعی ئیرلەندی-باکوری ئیرلەندا**

**ئـ.بابیونو (سکرتێری گشتی حزبی کرێکارانی قوبرس)**

ئـەم هەڵسەنگاندنە شـوێنی حزبـی لـەبزاڤی نیـشتمانیدا پتـەوکردو یاریـدەی کۆمەڵەکەی (راية الشغيلة)یدا لەهەنگاوە کەرتکارییەکەیان بکۆڵنەوەو هەوڵبدەن بۆ چارەسـەرکردنی هەڵەکـەیان بـەگیانی گەڕانـەوەیان بـۆ حـزبو هەڵوەشـاندنەوەی ڕێکخراوە کەرتکارییەکـەیان بـەبێ قەیدو شـەرت، هـەروا یارمـەتی ئێمەیـدا کـەوا بەڕاسـتی ڕێگـەی خۆمـان بنیوەتـەوە ڕووەو کۆکردنـەوەی هێـزە سیاسـییە نیـشتمانییە دیموکراسـییەکان لەهاوپەیمانییـەکی سیاسـیدا بـەپێی بەرنامەیەکـە نیـشتمانی کـە ڕێکـەوتنی لەسـەر پێکبێـتو کـاری هاوبـەش بـۆ هێنانـەدیی ئـەو بەرنامەیە ئەنجام بدرێت.

بەمجۆرە حـزب ڕووی کـردە پەیوەنـدی لەگـەڵ حزبـی نیـشتمانی دیموکراسـیو بـەرەی میللـی و حزبـی سـەربەخۆیی، ئەمـەش دوای ڕاگەیانـدنی حکومەتەکـەی ئەرشەد عومەری لە٤ی ئاياری ١٩٥٤دا کە بـەنیازە هەڵبـژاردنی پەرلـەمان ئـەنجام بدات‌و ئەنجومەنێك بێنێتە سەرکار پرۆژە جەنگییـەکان لـە ناوچـەکەدا بڕیاربـداتو پـەیمانی١٩٣٠ لەگـەڵ بـەریتانیا نـوێ بکاتـەوە، ئـەوە بـوو حـزب بەياننامەيـەكی دەرکرد لەبارەی پێویستی بەشداریکردن لەم هەڵبژاردنەداو ئەم گۆڕەپانەی خەبات دژی ئیـستیعمارو پـرۆژە جەنگییـەکانی چـۆڵ نـەکات. ئـەم حزبانـە داوایـانکرد بەرەیـەکی نیـشتمانی بـۆ چـوونە کـۆڕی جـەنگی هەڵبژاردنـەوەپێکبێت. حزبـە نیشتمانییەکان بەمەرجێك ئەمەیان پەسەند کردکە ناوی حزبی شیوعی عێراق (کـە شەرعی نییـە) لـەم بەرەیـەدا بـاس نـەکرێت بـەڵام ئـەوەیان پەسـەندکردکە نـاوی ئاشتیخوازان و ڕێکخراوی لاوان وقوتابیان ببرێت. ئەنجامەکانی بـەرەی هەڵبـژاردن بۆ نیشتمانی ئەوەبوو کـە ١١نوێنـەریان هـەبوو، وێـڕای هـەموو کۆسـپو تەگـەرەو ڕێگرو تیرۆرو دەستگیرکردنو تەزویرکردن، ئەمەش سەرکەوتنێکی گـەورە بـوو بـۆ بزاڤی نیشتمانی کە ئەم دەستەیە لەناو پەرلەمانی عێراقدا هەبێ کـە پەرلـەمانێکی ساختەو کۆنەپەرستە.

دەستەی فەرمانڕەوای کۆنەپەرسـت ئەمـەی بەدەرچـوون لـە هێڵـی سـور دانـاو پەرلـەمان لـە ٢٦ی تـەموزی ١٩٥٤دا کۆبـۆوەو دوای ئـەوەش وەزارەتـی عومـەری دەستی لەکار کێشایەوەو نوری سەعید ڕاسپێردرا وەزارەتێکی نـوێ دامـەزرێنێ و

پەرلەمانی هەڵبژێردراو هەڵوەشێنێتەوەو هەڵبژاردنێکی تازە بکرێت بۆ سەپاندنی پەرلەمانێك هیچ بەرهەڵستکاری تێدا نەبێت. لەکەشوهەوایەکی داپڵۆسێنەرانەدا گرتنو بڕین دەست پێبکاتو حزبەکان هەڵوەشێندرێنەوەو جنسیەکان بەتاڵ بکرێنەوە.

جێگەی داخە، کەپاش کۆتایی هەڵبژاردن حزبی نیشتمانی دیموکراسی ڕایگەیاند کە ئەرکی بەرە کۆتایی هاتووە، چونکە تەنیا بۆچوونە کۆڕی هەڵبژاردنەوە پێکهاتبوو، بەلاّم حزب داوای بەردەوامبونی بەرەی کرد چونکە ئەرکەکەی تەاو نەبووەو هەر ئەوەندە نییە کە خەبات لەناوخۆی پەرلەماندا بکرێت بۆ هێنانەدی ئەو بەرنامەیەی لەسەری ڕێکەوتووینو بەس بەڵکوبۆ کارکردنو خەباتی هاوبەش لەدەرەوەی پەرلەمانیش و لەسەر گۆڕەپانی جەماوەری و، بەزۆر شێوەی خەباتی سیاسی جۆربەجۆر، بۆ پشتگیری و هاوکاریی پەرلەمانتارانی بەرە.

دوای هاتنی نوری سەعیدو هەڵوەشانەوەی پەرلەمان و حزبەکان حزبی ئێمە سەرلەنوێ داوای کرد بەرە بەردەوام بێت، بەلاّم حزبە نیشتمانییەکانی دیکە بەتەنگ ئەمەوە نەهاتنو، ڕۆژگارێکی سەخت بەسەر بزووتنەوەی نیشتمانیدا تێپەڕیبوو پڕۆژە جەنگییەکانی ئیستیعماری دەستپێکرانو بارودۆخێکی پڕ لەتیرۆری ڕەش وڵاتی گرتەوەو وێڕای ئەوەش حزب لەسەر چالاکیو خەبات و پەیوەندی لەگەڵ حزبە نیشتمانییەکان درێژەیداو هەرلەهەوڵدا بووبۆ چالاك کردنەوەی بزووتنەوەکەو کاری جەماوەری لە پێناو کۆکۆدنەوەوەی هێزەکان و پێکهێنانی هاوپەیمانی سیاسی بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی کۆنەپەرستو نۆکەرو دامەزراندنی ڕژێمێکی نیشتمانی و دیموکراسی و هێنانەدی سەربەخۆیی و سەروەری نیشتمانی.

# ڕاکردنی حەمید عوسمان لەبەندیخانە

حزب زۆر پێویستی بوو کادیرە سەرکردەییەکانی حزب گردکاتەوە، بۆ کۆمەڵکردنی تواناو بەهرەدارییەکانی سەرکردەیی بەمەبەستی سەرکردەیی کردنی چالاکی و ڕێکخستنەکانی حزبو دواجار بەشداری لەسەرکردەیی بزاڤی نیشتمانیدا، بەتایبەتی لەم ڕۆژگارە سەختو گرانەدا کە ڕووبەڕووی حزب و گشت بزووتنەوەی نیشتمانی بوونەتەوە. قسەمان لەگەڵ حەمید عوسمان کرد تا چ ڕادەیەك ئامادەیە بۆڕاکردن لە بەندیخانە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا، پاش چەند ڕۆژێك وەڵامیدایەوە کە باشەو ئامادەیە، ئیتر نەخشەیەکی توندو تۆڵمان ئامادەکرد بۆڕاکردنیان لەبەندیخانەی باقوبە، جێبەجێ کردنی بەوردی دەست پێکراو هیچ کەسیش هەستی پێنەکردو لەدەرگای بەندیخانەوەو بەبەرچاوی بەڕێوەبەرێتی بەندیخانەوە دەرچوون بێ ئەوەی هیچ هەست بەکەمبوونەوە لەژماردنی بەندییەکانی ناو بەندیخانەکەدا بکرێت، چونکە بەڕێوەبەرێتی بەندیخانە پێش دەرچوونی ئەوانەی بۆ سەردان هاتبوون هەموو بەندییەکانیان دەژمارد، ئەم نەخشەیە نەدۆزرایەوە تا دوای هەفتەیەك لەسەردانی هەفتانە بۆلای بەندییەکان، ڕاکردنەکە ڕۆژی ١٩٥٤/٦/١٦ ئەنجامدراو، لەگەڵ حەمید عوسمان ئەمانە دەرچوون: هادی هاشم و فەرحان تەعمە. ئەمەمان بەسەرکەوتنێکی گەورە بۆ حزب داناو ئەو دووەش واتە هادی هاشمو فەرحان تەعمە بەبڕیارێکی تەنیا کەسی حەمید عوسمان خۆی کرانە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی نەکرا تا بڕیاری هێنانیان بدات.

هاوڕێ سەلام عادل وەك لەپێشەوە باسمانکرد بەنوێنەرایەتی حزب نێردرا بۆ کۆنگرەی حزبە شیوعییەکان لەپەیوەستگای بەریتانی (کومنولپ)و هێشتا نەگەڕابۆوە عێراقو کاتێکیش گەڕایەوە دیتمو سڵاوو خۆشحاڵی خۆم بەگەڕانەوەی بەسەلامەتی پێشکەش کردو، داوام لێکرد ڕاپۆرتێکی درێژ لەسەر کۆنگرەکە

ئامادە بکات کە ئامادەی بووەو باسی چالاکییەکانی بکات بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی حزب لەگەڵ حزبە شیوعییە براکان چونکە منیش پێشنیازێك پێشکەش دەکەم بۆ کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی تاڕاپۆرتەکە ببینن و چالاکی وەفدەکەمان لەم کۆنگرەیەدا بڕیار بدرێو، لەبارو دۆخی سیاسی بکۆڵنەوەو چی پێویست بێ بکرێ. هاوڕێ سەلام گوتی: لەماوەی ڕۆژێکدا ڕاپۆرتەکە ئامادە دەکەم بەڵام بۆچی پێشنیاز دەکەیت، ئەی تۆ سکرتێرنیت، خۆ دەتوانی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆبوونەوە بانگ بکەیت؟ پێمگوت: سەرکردەیی کۆمیتەی ناوەندیم داوەتە حەمید عوسمانو ئیتر من سکرتێر نیم. گوتی: ئەو ئیستە لەلامانە. گوتم: بەڵێ... ڕاکردنیمان ڕێکخستو لەگەڵ هادی هاشمو فەرحان تەعمە دەرباز بوون.

پرسی: ئایا کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوەی کرد تا ئەم کارە بڕیاربدات؟ لەوەڵامدا گوتم: نەء چونکە من مەسەلەکەم بەئاسایی دانا چونکە هاوڕێیانی بەندکراو کادیری سەرکردەیین لەبەندیخانەداو وایان دانابوو کە حەمید عوسمان خۆی سەرکردەی بێمونافیسی حزبە، کاتێکیش لەباوەشی حزبدا دەبێ دەورگێڕانی سەرکردایەتی لەحزبدا دەبینێ. گوتی: من ناقایلم لەم کارەو بەکارێکی تەنیا کەسی تۆی دادەنێم دەبوو مەسەلەکە بخرێتە بەردەم کۆمیتەی ناوەندی کە خۆی لەوەدا خاوەن مافە، پاشان حەمید بێمونافیس نییە بەڵکو کەسێکی بیرۆکراسی فەردییە لەسەر کێشەی نێوان هاوڕێیان دەژی، ناتوانێ کۆکەرەوەی یەکێتی سەرکردایەتی حزب بێتو، تەنانەت ئاستی سیاسیشی نەگەیشتۆتە پلەی سەرکردەیی حزب.

ئەودەم ئەم قسانەم بەبەشێك لە زۆرانبازییەکانو کێشەی ناو بەندیخانە دەزانی کە پێویستە بەربەرەکانییان بکرێو لەژیانی حزبیماندا لەناو ببرێن، پێشەکی دەشمزانی باری سەرنجی هاوڕێیانی بەندیخانە لەسەر هاوڕێ سەلام عادل چۆنە کە ئەوەبوو دژی هێنانی بوون بۆ ئەندامێتی کۆمیتەی ناوەندی، وەك لەمەوبەریش باسمکرد، هەروا دژی ناردنی بوون وەك نوێنەری حزب بۆ کۆنگرەی نێودەوڵەتی، لەبەر ئەوە کاتێك لای حەمید عوسمان باسمکرد کەوا هاوڕێ حسێن گەڕاوەتەوە بۆ عێراقو ئیستە لەلامانە هیچ بایەخی بەم مەسەلەیەنەداو پێشنیازێکم خستە

بەردەستی کە بۆ کۆمیتـەی ناوەنـدی بکرێـت بـۆ گـوێگرتن لەراپۆرتەکـەی هـاوڕێ حسێن و باسـی بـارودۆخی سیاسـیو چـی پێویـستە بکـرێ قایـل نـەبوو کۆمیتـەی ناوەندی بۆ کۆبوونەوە بانگ بکات، ئەمەش بەوبیانووەی کە بـاری ئاسـایش لـەبار نییە، ئیتر کۆمیتەی ناوەندی تاحوزەیرانی ١٩٥٥ کۆبوونەوەی نـەکردو لـەورۆژەدا کۆبوونــەوە کــرا بــۆ لێپرســینەوەی حەمیــد عوســمــانو دەرکردنــی لــە کۆمیتــەی ناوەندی.

# ویستمان یارمەتیمان بدات..
# کەچی دەرکەوت فیرعەونێکە[٣]

ئێمە دەمانویست کادیرەکانی سەرکردایەتی کۆبکەینەوە، بەتایبەتی ئەوانەی لەبەندیخانەکاندا بوون تا بارودۆخی سەرکردایەتی لەژیانی حزبدا پەرەبسێنێ، بەتایبەتی پتەوکردنی سەرکردایەوتی بەکۆمەڵو جێبەجێکردنی هەرچی تازەبوو لەو ئەرکە نیشتمانیو کۆمەڵایەتیو حزبیو نێونەتەوەییانەی هاتبوونە پێشمان، ئێمە لەبەردەم دەروازەی سەرکەوتن و شادییەکی نوێدا بووین، بەڕاکردنی ژمارەیەکی تر لەکادیرانی سەرکردایەتی لەبەندیخانەی باقوبەوە، بەرێگەی ئەو تونێلەی بەزەحمەتێکی دەگمەن هەڵکەندرا، بەڵام بەداخەوە هەوڵدانەکە ژێرکەوت، هاوڕێ سەلام عادل سەرپەرشتیی وەرگرتنو گەیاندنیان بوو بەحزب، بەڵام هەڵەی هاوڕێیانی بەندیی خۆیان بوو، ئەوەبوو پەیڕەوی شوێنو جێگەی بڕیاردراویان نەکردو بەشێوەیەکی شپرزەو شەپرێو هاتنە دەرەوەو ڕاکردنەکەیان ئاشکرا بوو، گیرانەوەو دیسان ڕەوانەی بەندیخانە کرانەوە، بەمجۆرە ئێمە دەمانویست کادیرانی سەرکردایەتی گردبکەینەوە، پاش ئەوەی کە دوژمن (ئیستیعمارو کۆنەپەرستی فەرمانڕەوا) لەبەندیخانەکاندا پەکی خستبوون، ئێمە دەمانویست هێزو توانای هزریو سیاسی و ڕێکخراوەییان بدەینە پاڵ کۆششو تواناکانی هاوڕێیانیان لەگۆڕەپانی خەباتی ڕاستەقینەدا لەناو جەماوەری گەلە تێکۆشەرەکەماندا، واتە گێڕانەوەیان بۆحزب تا لەگەڵ هاوڕێیانیان بەشداری بکەن لەبەهێزکردنی بنیاتنانی حزبو پتەوکردنی بزاڤی نیشتمانی و یەکگرتنی، ئالەم بارودۆخەدا لە کۆڕی کارکردنو هیواداریدا، حەمید عوسمان دەستیدایە هاندانی کێشەو ناکۆکی شەخسی لەگەڵ هاوڕێ سەلام عادل دا، لەکاتێکدا هاوڕێ سەلام سەرکردایەتی ڕێکخراوی بەغدای دەکردو سەرپەرشتیی پەیوەندییە نیشتمانییەکان

---

(٣) ناونیشانی ئەم بەشە بەعەرەبی ئەمەیە: (ردناعون...طلع فيرعون) کەپەندێکی عەرەبییە-وەرگێڕ-

بوو، ئەم ئەرکەی لێسەندەوەو منی ڕاسپارد کە سەرکردایەتی ڕێکخراوی بەغدا بکەم، پاشان دووری خستەوە بۆ سەرکردایەتی ڕێکخراوی فوراتی ناوەڕاست، بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ کۆمیتەی ناوەندی، لەجیاتی ئەوەی سەرکردایەتی بەکۆمەڵ لەژیانی حزبدا پتەوبکەین گەڕاینەوە بۆدواوە، واتە بۆسەرکردایەتی کردن بەشێوازی تاقەکەسیو بیرۆکراسی، بەمجۆرە کەوتینە گێژاوی زۆرانبازیی ناوخۆیی کە هیچ پاکانەیەکی بۆنەدەکرا لەکاتێکدا وڵاتو بزووتنەوەی نیشتمانی لەبەردەم مەترسیترین پرۆژەکانی شەڕی ئیستیعماریدا بوون، دەبوو باری سەرکردایەتی خۆمان چارەسەر بکەین و ڕووی دەم بکەینە حزبە سیاسییە نیشتمانپەروەرەکان بۆ خۆ کۆکردنەوەو هێنانەدیی هاوپەیمانییەتییەکی سیاسی لەدژی دوژمنی هاوبەشمانو لەپێناوی ئامانجە هاوبەشەکانماندا.

هاوڕێ سەلام عادل پەیوەندیی لەگەڵ کردمو بۆی ڕوونکردمەوە کە لەگەڵ ئەم پیاوە بێسودەو هەردەبێ کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆبوونەوە بانگ بکەین ، پێمگوت هەردەبێ ئارام بگرینو مەسەلەکە بەهێمنی و سنگ فراوانی چارەسەر بکەین تۆ برۆ بۆفوراتی ناوەڕاستو بەردەوام پەیوەندیت لەگەڵ من هەبێ تا لەسەر شێوازی چارەسەرکردن لێك تێبگەین.

ڕێکخراوی بەغدام لێوەرگرت و لەسەرمان بوو شەقام چۆڵ نەکەین کە دژی نوری سەعیدو پەیمانە ئیستیعمارییەکانی شەڕ بوو، ڕێکخستنەکەی بەغدا بەرنامەیەکی کاری دانا بوو بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ خەڵك لەماڵەکانیان و هەڵسوڕانو چالاکی لەچاپخانەو بازاڕو کۆمەڵە جەماوەرییەکاندا، لە قوتابخانەو پەیمانگەو سینەماکاندا، لەکاتێکدا حزبە سیاسییەکان لەباری پاشە کشەدابوون و هەندێ یاداشتیان دەداو هەندێ گوتاریان لەدژی نوری سەعیدو پەیمانە ئیستیعمارییەکان دەردەبڕی، بەڵام ئامادەی پێکهێنانی هاوپەیمانێتی سیاسیی بەرەیی نەبوون.

لە١٩٥٥/١/٣١دا لەماڵی چاپخانە لە گەڕەکی کەڕادەخارج لەگەڵ حەمید عوسمان کۆبوومەوەو، ئەو کاتە (أم نضال) خێزانی هاوڕێ جەبار عەبودو منداڵەکانی لەو ماڵەدا دەژیان، لەگەڵ حەمید عوسمان دەربارەی وەزعەکەو

چالاکییەکانی ڕێکخراوی بەغداو هەڵوێستی ووریایی جەماوەر لەم چالاکییانەو ئامادە نەبوونی بۆ هاتنە سەر شەقامو، هەروا هەڵوێستی وریایی حزبە سیاسییەکانو هەڵوێستی سەلبییان لەهێنانەدی هاوپەیمانی سیاسیی بەرەیی لەگەڵ ئێمەدا، پێمگوت زۆر پێویستە پاشەکشە بکەینو بەوردی لەبارو دۆخەکە بکۆڵینەوەو کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆبوونەوە بانگ بکەینو بگەینە بڕیاری ڕاستو دروست بۆ کارو هەڵسوڕانی حزبیو سیاسیمان، لەسەر مەسەلەی ناکۆکی لەگەڵ هاوڕێ حسین الرضي هەڵوێستەم کرد، پێمڕاگەیاند: پێویستە چارەسەرێك بدۆزرێتەوە بۆ ناکۆکییەکانتانو ئەگەر لەبارەی سیاسەتی گشتی حزبەوەبێ باشترە لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا باس بکرێت. گوتی: ئەو کابرایەکی میزاجییە وەك هەر هونەرمەندو ڕۆشنبیرێكو ئەمە کەڵکی سیاسەتی حزب ناگرێت. گوتم: هاوڕێ ئەبو خەسرەو ئەمە ناکۆکی و هەڵسەنگاندنی بەندیخانەیە، من لەمەدا لەگەڵت نیم. ئیتر لێرەدا گفتوگۆمان کۆتایی هێناو لەماڵەکەی چاپخانە دەرچووم بەرەو دیدار لەگەڵ هەندێ لەهاوڕێیانی کۆمیتەی ناوخۆیی بەغدا.

# چۆن دەسگیر کرام؟

لەماڵی چاپخانەکە دەرچووم کە حەمید عوسمانی تێدا دەژیاو سواری پاسێکی ئامانە بووم بۆ دووریانی کەرادە داخل لەوێش سواری پاسێکی تر بووم بۆ شەقامی شێخ عومەر، لەم پاسەدا جاسوسێك بەناوی حەسەنی شێخ سەعید خەڵکی سلێمانی هەبوو، ئەم کابرایە پێشتر پەیامنێری حزب بوو، جلی عەسکەری ئیجباری لەبەردا بوو، من هیچ سەرنجیم نەداو تەماشای دەوروپشتی خۆم نەکرد چونکە سەرقاڵی گفتوگۆیەکەو ئەو باسە بووم کەلەمیانەی من و حەمیددا کرا، دەبێ لەبەرچی بەدەم پێشنیازەکانمەوە نەهات، بەتایبەتی بانگکردنی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆبوونەوە بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی بارودۆخی سیاسی نوێ، پاش ئەوەی نوری سەعید وەزارەتو پرۆژەکان و پەیمانە ئیستیعمارییەکانی ڕاگەیاند کە خراونەتە بەرباس‌و حزبە نیشتمانییەکان لەگەڵ هەڵوێستەکانی حزب هاودەنگ نەبوون‌و نەیانویست هاوپەیمانیی سیاسی لەنێوان حزبی شیوعی عێراق‌و ئەو حزبانەدا پێکبێت‌و جەماوەریش ئامادە نەبوو بەگوێی بانگەوازەکانی حزب بکات کە حەمید عوسمان بەبێ پرسی کەس‌و بەناوی خۆی و بەناوی کۆمیتەی ناوەندییەوە دەریکردن‌و، هەروا مەسەلەی کێشەی ناوخۆیی لەناو سەرکردایەتی حزبدا. من بیرم لەوە دەکردەوە چۆن لەگەڵ ئەم وەزعەدا هەڵسوڕێین، لەئۆتۆمبیلەکە دابەزیم‌و تەماشای ڕاست‌و چەپی خۆم‌و دواوەم نەکرد لەگەڕەکی (تاتران) کەشوێنی دیدارەکە بوو ماڵی هاوڕێ عەبدوڵا علك لەو شوێنە بوو کە یەکەوڕاست چوومە ژوورەوە، پێدەچێ حەسەنی شێخ سەعیدی جاسوس تا ئەوماڵە بەدوام کەوتبێ‌و بەخێرایی هەواڵەکەی گەیاندبێتە تەحقیقاتی جینائی، ئالەم کاتەشدا هاوڕێ مەهدی عەبدولکەریم کە ئەندامی کۆمیتەی بەغدا بوو گەیشتە ماڵەکە، پاش دە دەقیقە (غەریبە)ی خێزانی هاوڕێ عەبدوڵا علك هاواری کرد ئێوە کێن‌و چۆن دێنە ژوورەوە بۆ ناوماڵەکە. من‌و هاوڕێ مەهدی لەژوورێکی

بەشی سەرەوە بوین، هەستاینە سەرپێو بازماندایە سەر سەربانی ماڵەکەی دراوسێکانمان لەپەیژەکە هاتینە خوارەوەو ڕاستبوینەوەو لەدەرگاکە چووینە دەرەوە، بەڵام کۆڵانەکە گەمارۆ درابوو ئیتر ئێمە هەردکمانیان گرت، واپێدەچێ هاوڕێیەك بەڵێنی دیداریان لەم ماڵەدا لەگەڵ هاوڕێ مەهدی عەبدولکەریم هەبووبێت، لەوانە عەبد عەلوانو سامی سەیدهەمو جەبار عوض کە لەهێڵی ئاسنین ئەندازیاربوو، هەموویان هەرکە گەیشتنە ماڵەکە کەمینیان بۆ دانرابوو دەسگیر کران.

سەیر ئەوەیە دەروێشێك لەگەڵ ژنەکەی هاتبوونە کۆڵانەکە لەوانەیە هاتبن بۆ سەردانی ناسیاوەکانیان بەڵام خانووەکەی نەزانیبوو، چووبوو لەدەرگای ماڵی هاوڕێ عەبدولا علك-ی دابوو، بۆیە خۆیو ژنەکەیان دەسگیر کردبوو، لەکاتی پشکنینی ماڵەکەیدا چەند شمشێرو زرگو دەفیان دیتەوەو هێنایانن بۆ تەحقیقاتی جینائی، ئێمەیان بەزنجیر بەپەنجەرەکانی ژێرزەمینەکەوە هەڵواسیبوو، داردەستەکانی تەحقیقاتی جینائی دەروێشیان لەپێش ژنەکەیدا ئازار دەداو دەیانگوت: (گەواد ماڵەکەت کردۆتە مەخزەنی شمشێرو زرگ بۆ شیوعییەکانو لەخۆپیشاندانەدا دژی پۆلیس بەکاریان دێنن) ژنەکەشی هاواری دەکردو دەیگوت: لەخوا ناترسنو ئەم پیاوە ئاینپەروەرە ئازار دەدەن، خواتان لێڕازی نابێ، ئەم هەژارە چی کردووە تالێیبدەن. دەروێش بەسەر ژنەکەیدا قیژاندی (کچێ بێدەنگ بە، ئەمە مافو مافەکانە) لەکاتێکدا لەئەنجامی ئەو لێدانە زۆرەدا ناڵەو ئاخی دەست پێکردبوو، دەروێش لەگرتووخانەی گشتی هاوڕێیانی دەسگیرکراوی دیو، بەهەموو ژیانی شتێکی لەسەر حزبی شیوعی عێراق نەبیستبوو، هاوڕێیان ئامانجەکانی حزبیان بۆ ڕووندەکردەوەو باسیان دەکرد بۆچی فەرمانڕەواکان بەربەرەکانیی حزب دەکەن.. ئەویش لەوکاتەوە لەگەڵ ژنەکەی بوونە دۆستی حزبو لەو هاوڕێیانەی لەگرتووخانەی گشتی چاویان پێیکەوتبوو بیستم کە دوای شۆڕشەکەی ١٤ی تەموز لەماڵەوە سەریانداوەو بۆتە پڕوپاگەندەکارێکی چالاك بۆ حزب.

هاوڕێیان وکەسانیتر بەدووساڵ بەندی و دووساڵ چاودێریی حوکمیان بەسەردا

دراو، ئێمەیان ڕەوانەی بەندیخانەی تاقە کەسیی باقوبەکرد کەتازە کردبویانەوە، لەوێ تۆفیق منیرو عەبدولاَ گۆرانم دیت کە گۆرانیان زۆر ئازاردابوو، زەردەواڵەیان تێبەدابوو هەموو لەشی ئاوسا بوو، بەجۆرێك وای لێهاتبوو نەدەناسرایەوە، هەروا پارێزەر عەبدو ستار ناجی.

لەهەواڵی حزب پچڕام، بەشێوەیەکی تایبەتی بارودۆخی سەرکردایەتی سەرقاڵی کردبووم کە دەبێ هاوڕێ سەلام عادل بتوانێ ڕەفتار لەگەڵ حەمید عوسمان بکات لەکاتێکدا ئەمیان لە بیرۆکراسی و تەنیا کەسیدا(فەردیەت) بەهادین نوری بۆڕدابوو. بیرم لەناردنی نامەیەك کردەوە، بەلاَم بۆ کێ؟ لەڕاستیدا بڕوام بەحەمید عوسمان زۆر لاواز بووبوو، چاوەڕوانم کرد بەلکو (سەرکردایەتی) دوای کۆبوونەوەکەی حوزەیرانی ١٩٥٥ دەستپێشخەری نامە نووسینم بۆبکات، کۆبوونەوەی ناوبراو بۆ لێپرسینەوەی حەمید عوسمان بوو دوای ئەوەی بەناوی خۆیەوە بەیاننامەیەکی دەرکردبوو بەناونیشانی (تەقەکانی ئایار).

بەلاَم هاوڕێ (عەمار) نامەیەکی تایبەتی بۆ نووسیبووم‌و لەوێدا باسی بارودۆخی خراپی سەرکردایەتی بۆ نووسیبووم و فەردیەت‌و بیرۆکراسی و منداڵبازاریی حەمید عوسمانی باسکردبوو، کە چۆن لەکۆبوونەوەکەی کۆمیتەی ناوەندیدا لێپرسینەوەی لەگەڵ کرابوو، ئەندامێتییەکەی لە کۆمیتەی ناوەندی ڕاگیرابوو.

نامەیەکی وەلاَمم ناردەوە بۆ هاوڕێ عەمارو پشتگیریی هەموو ئەو کاروبارانەم کرد کەلەدژی حەمید عوسمان کردوویانەو دەیکەن چونکە هەروەك پێشبینیم کردبوو ناوبراو هەردەبێتە دوژمنی حزب، جەختیشم لەسەر ئەوە کردەوە کە پێویستە ڕێکخراوەکانی حزب لەگشت کردارەکانی ئاگادار بکەنەوە، خۆ ئەگەر بیەوێ ئەندامەتی خۆی لەحزبدا بپارێزێ و لەگەڵ حزب ڕاستگۆ بێت پێویستە ڕەخنە لەخۆگرتنێکی شیوعییانە پەیڕەو بکات‌و ئەمەش بەسەر ڕێکخراوەکانی حزبدا دابەش بکرێ، پێشنیازیشم کرد بەخێراترین کات کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوەیەکی تر بکات بۆ هەڵبژاردنی سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی و پێشنیازم کرد کە هاوڕێ سەلام عادل بێت، لەبارەی گفتوگۆشەوە لەگەڵ رایة الشغیلة ، پشتگیریم کردو هەرچییان لەوەوبەر کردبوو بیری هاوڕێیانم خستەوە بۆئەوەی ئەم

کــــەرتکاری و دابەشـــــبوونە نـــــەمێنێ بــــەوەی ڕێکخــــراوە کەرتکارییەکـــــەیان هەڵوەشێننەوەو بێ قەیدوشەرت خۆیان بدەنەوە دەست حزب.

دوای ئــەوەی حەمیـد عوسمــان بــووە ئەنـدامی (پــارتی) لــەحزب دەرکــراو، ڕێکخراوی (رایةالشغیلة) هەڵوەشێنرایەوەو دانیان بەهەڵەی خۆیانـدا نـاو گەڕانـەوە بۆ ناوحزب.دوای پێکهێنانی کۆنفرانسی دووەمی حزب لەئەیلولی ١٩٥٦دا نامەیەکی تـرم لـەهاورێ سـەلام عـادل-ەوە پێگەیـشت کەڕوونکردنەوەیـەکی دووروودرێـژی تێدابوو لەبارەی بڕیارەکانی کۆنفرانسەوە، ئەم دەسکەوتە گەورەیەی کە لەسایەی یــەکێتی شــیوعییەکان لــەحزبی شــیوعی عێراقــدا هێنرایــەدی و، ئــەو ڕەوتــە ڕاستودروستەی حزب لـەبارەی هێنانـەدی هاوپـەیمانێتی سیاسـی نیشتمانییەوە لەبــارەی یــەکێتی نیــشتمانیدا، ئــەو هاوپەیمانێتییــەی کەلەگــەڵ ڕێکخــراوە عەسکەرییە نیـشتمانییەکانی نـاو سـوپای عێـراق هاریکـاری کـردو، بەشێوەیەکی ســەرەکی لەگــەڵ ڕێکخــراوی ئەفــسەرە ئازادەکــان هاوپــەیمانێتییان لــەکارێکی مێـژوویی گـەورەدا ئەنجامـداو شۆڕشـە نیـشتمانییە مێژووییەکـەی ١٤ی تـەموز بەرپاکراو بۆیەکـەمینجار لەمێـژووی دەوڵـەتی عێراقـدا سـەربەخۆیی و سـەروەریی نیشتمانی هێنرایەدی.

چــەند هاوڕێیـــەك لەبەندیخانـــەی نوگرەســـلمانەوە بـــۆ بەندیخانـــەی باقوبـــە گواسترانەوە، دەمەویست دیداریان لەگەڵ بکـەم تـا لـەو پـەرەسـەندنانەی لەحزبـدا ڕوویانداوە ئاگاداریان بکەمەوەو خـۆم لەپێکـدادان لەگـەڵ بەڕێوەبـەری فاشیـستی بەندیخانەکە (زین العابدین) دوور خستەوەو داوام لە نوێنەرمان لای بەڕێوەبەرێتی بەندیخانە کرد کە بەڕێوەبەری بەندیخانە ڕێگەم بدات چاوم بەهاوڕێیان بکەوێت تـا لـەگیروگرفت لەگـەڵ بەڕێوەبـەرێتی بەندیخانـە دووربکەوینـەوە. بەڕێوەبـەر لەسـەر داواکە بڕیاریـدا چـونکە ئـەویش وادەردەکـەوت کـە حـەزبکات لەپێکدادان لەگـەڵ هاوڕێیــان دوور بکەوێتــەوە، ڕۆیــشتمە لایــانو بــەکورتی ئاڵوگۆڕەکــانی نــاو سەرکردایەتی حزبم بۆ باسکردن و ئاگادارم کردن کە حەمیـد عوسمـان دەرکـراوەو هاوڕێ (عەمار) بەسکرتێری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوەو دووەمین کۆنفرانسی حزب بەستراوەو لەگشت بوارەکاندا سیاسەتێکی تازە بۆ حزب نەخشە کێشراوە.

داواشـم لێکـردن لەپێکـداداان لەگـەڵ بەڕێوەبـەرێتی بەندیخانـە دووربکەونـەوە تـا پارێزگاریی هاوڕێیان لەکەوتنە ژێر ئازار یان فریـودان بکـەین. هاوڕێیـان لەگەڵمـدا هاوبیربوون لەسەر ئەو ئاڵوگۆڕەی لەسـەرکردایەتی حزبـدا کـراوەو لەئەنجامـەکانی کۆنفرانسی دووەم‌و پیـشاندانی نـەرم‌ونۆڵی لەگـەڵ بەڕێوەبـەرێتی بەندیخانـە وەك بۆم ڕوونکردنـەوە. بـەڵام هـاوڕێ زەکـی خـەیری زۆر بەتونـدی لـەدژی سیاسـەتی حزب‌و ئـەو کاروبارانـە بـوو کـە ئـەنجام دراون وەك دەرکردنـی حەمیـد عوسمـان‌و هەڵبژاردنی هاوڕێ (عەمار) بەسکرتێری کۆمیتەی ناوەندی. لێرەدا بەجێم هێشتن تـاگفتوگۆ لەسـەر ئـەو مەسـەلە جۆربەجۆرانـە بکـەن کـە بـۆم باسـکردن‌و، لـەو ماوەیەشدا تا لەبەندیخانەی باقوبە بووم هەرچی ئـەدەبیاتی حزبـی و هەنـدێ لـەو نامانەی بۆم دەهاتن دەمدانێ.

# دوورخستنەوە بۆ بەدرە

دوای تەواوبوونی حوکمەکەم لەبەندیخانەی باقوبە دەرچووم بەرەو بەدرە کە تەحقیقاتی جینائی بڕیاری دابوو تادووساڵ لەوێ لەژێر چاودێریی پۆلیسدا بم.

چەند خانوویەکی حکومی لەدەرەوەی شاری بەدرە دروستکرابوون، هەروا چەند خانوویەکی حکومی تر بۆ بەڕێوەبەرێتی پۆلیسو خانوو بۆ نیشتەجێ بوونیان، ئەو خانوانەی بۆ ئێمە تەرخانکرابوون بەتەنیشت مەرکەزی پۆلیسەوە بوونو چەند خاڵێکی چاودێری لەسەر هەموو ڕێگەکانی بەرەو ناوشار دروستکرابوونو ڕێگامان نەدەدرا لەدەرەوەی سنوری ئەو شوێنە هاتوچۆ بکەین، دانیشتوانی شارەکەش توانای پەیوەندییان لەگەڵماندا نەبوو، دەبوو هەرڕۆژەی سێجار لەدەفتەری پۆلیسدا ئیمزابکەین، ژمارەشمان یەکجار زۆر بوو، بەهەزار حاڵ لەم خانووەدا جێگەمان دەبۆوە. بیرم لەڕاکردن کردەوەو داوام لەسەرکردایەتی حزب کردو دووجار ئۆتۆمبیلی تایبەتییان بۆ ناردم (کەبەناوێکی نەزانراوەوە تۆمارکرابوو) هاوڕێیەك کە برای هاوڕێ مەهدی عەبدولکەریم بوو لێی دەخوڕی، بەڵام هەردووجارەکە نەمتوانی بگەمە ئەو شوێنەی ئۆتۆمبیلەکەی لێ ڕادەوەستێ، دوای هەرجارێکیش نامەیەکم بۆ دەناردنو ئەو هەلومەرجەم ڕوون دەکردەوە کەئێمەی تێدا بووینو هەردووجارەکە هەوڵدانەکەمان ژێرکەوتووبوو. !

لەو ئۆردوگەی چاودێرییە کاروباری خۆمان بەشێوەیەکی هاوبەش ڕێکخستبوو، ئەم ئۆردوگەیە تەنیا بۆ شیوعییەکان نەبوو، بەڵکو هەروا کەسانی پارتی و سەرسەرییەکان و کەسانی رایـة الـشغیلة لەوانـەی قەناعـەتیان نـەکردبوو ڕێکخراوەکەیان هەڵوەشێننەوەو بچنە ناو حزبی شیوعی کەسانی وەك هاوڕێ عادل سەلیمو کەسانی ترلەو ئۆردوگەیەدا بوون. دەبوو لەهەمووشتێکدا خۆمان خزمەتی خۆمان بکەین تەنانەت پاکردنەوەی ئاوەڕۆ (پاکردنەوەی توالێتەکان) کەبەداخەوە دەڵێم هاوڕێ (جەرجیس) کە خەڵکی موسڵ بوو کەوتە چاڵی ئاودەستەکەوەو

بەگازی میسان خنکاو هاوڕێ (تۆماشـابا_أبـوسمخی) ویـستی ڕزگـاری بکـاتو بـۆ سەرەوە ڕایبکێشێت ئەویش بورایەوە زۆری نەمابوو بمرێـت، بـەڵام لـەکاتی خۆیـدا ڕزگارکرا، تەرمەکەی هاوڕێ (جەرجیس) بۆ گۆڕستان بەڕێکرا بـەڵام دوور لـەگۆڕی موسڵمانان نێژراو ڕێگە نەدرا لەو گۆڕستانە بنێـژرێو برایـە لایـەکی گۆڕسـتانەکەو لەسـەر شـوێنێکی بڵنـد نێـژرا. ئێمـە یاداشـتێکی بێزاریمـان بـە بەڕێوەبـەرێتیو حکومەتـدا لەسـەر خراپـی خزمەتـە کۆمەڵایەتییـەکانو یارمـەتی نـەدانمان بـەهیچ جۆرێك. بەڵام بۆ شت کـڕین نوێنـەرمان ڕۆژانـە لەگـەڵ پۆلیـسدا دەچـووە بـازاڕی شـارەکە بـۆ کڕینـی شـتومەکی پێویـست، ڕێگەشـی بەمنداڵـەکانی ئـەو خەڵکـەی لەژێرچـاودێریدا بـوون درابـوو بـچنە قوتابخانـەی ئـەو ناوچـەیە لەگـەڵ منـداڵانی فەرمانبەرو پۆلیسەکاندا.

دوو ڕێکنستن هەبوو، یەکەمیان گشتی بـوو بـۆ هـەموو دوورخراوەکـان، لەسـەر بنەمای ژیانی هاوبەشو لەسەر بنچینەی هێزە نیشتمانییە جۆربەجۆرەکان بوو کە ڕووبەڕووی گیروگرفتی هاوبـەش دەبووینـەوە. هەردەسـتەیەکیش لەسیاسـییەکان ڕێکخستنی تایبەتی خۆیـان هـەبوو، لەوانـەش شـیوعییەکان کـە لەفرقـەی حزبیـدا خۆیان ڕێکخستبوو، کۆبوونەوەیان دەکرد کە لەبنەڕەتدا بۆ فێربـوونو تێگەیانـدن بوو. کۆبوونەوەی گشتیش بۆ شـیوعییەکان هـەبوو کەلەسـەر مەسـەلەی هـزری و سیاسی و ڕێکخستنەکان و شتی تر گوتاریان تێدا دەگوترا. هـەروا کۆبوونـەوە بـۆ گشت دوورخراوەکان دەکرا،جگـە لەوانـەی گومانمـان هـەبوو بەرامبـەریان، لەسـەر بـارودۆخی سیاسـیی گـشتی و بزاڤـی نیـشتمانی و هاوپـەیمانی سیاسـی هێـزە نیـشتمانییەکان و بەرنامـەی هاوبـەشو کاروچـالاکی هاوبـەش، هەرماڵـەش تایبەتمەنـدیی خـۆی هـەبوو لەدابەشـکردنی ژوورەکانـداو لـەخواردنی هاوبەشـداو پاکردنەوە، هەموو دوور خراوەکانیش بەشداریی ئەم هەڵسوڕانانەیان دەکرد، دوور تیپی فوتبۆڵو تۆپی بالەمان پێکەوەنانو پێکەوە بەهاوبەشی مەشقی وەرزشمـان دەکرد.

کۆبوونەوەیـەکی گـشتیمان ڕێکخـست بـۆ گفتوگـۆکردن لەسـەر دەرکردنـی بڵاوکراوێکی دیواری ناوخۆ، بەهەردوو زمانی عەرەبیو کوردی و لەوێدا پێشنیازم

کرد بڵاوکراوە کوردییەکە ناوبنرێ (ڕێگای کوردستان)و بڕیاری لەسەر درا، لەم بڵاو کراوەیەدا وتارێکی سەرەکیم نووسی لەبارەی مەسەلەی کوردەوەو هەڵوێستی حزبمان لەم مەسەلەیە، جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە حزبمان حزبی شیوعی عێراق هەڵوێستی لەم مەسەلەیە لەو گۆشەنیگایەوەیە کە مەسەلەی گەلێکی چەوساوەیە لەلایەن ئیستیعمارو نەتەوەی عەرەبەوە وەك نەتەوەیەکی فەرمانڕەوا، ئەم نەتەوەیە مافی بڕیاردانی چارەنووسی هەیە بەمافی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی سەربەخۆوە، بەڵام هەلومەرجی عێراق کە لەدوو نەتەوەی عەرەبو کورد پێکهاتووەو مافی یەکسانیان هەیەو چەند نەتەوەیەکی بچوك کە مافی بەڕێوەبردنو ڕۆشنبیرییان هەیە، هەردەبێ ئەم نەتەوە جۆربەجۆرانە پێکەوە بژینو هەریەکەیان مافەکانی خۆیان هەبێ، بەتایبەتی نەتەوەی کورد کە دەبێ مافە نەتەوەییەکانی هەبن لەوانەش مافی یەکگرتنی ئارەزوومەندانە لەگەڵ گەلی عەرەب. بەم هۆیەوە پۆلیس هەڵیان کوتایە سەرماڵەکانی دوورخراوەکان و دەستیان بەسەر بڵاوکراوەکەدا گرتو منیشیان بۆ مانگێك بەندی و ١٠٠دینار جەزا حوکمدا، بەمجۆرە گێڕامیانەوە بۆ بەندیخانەی باقوبە تادەرۆژی ماوەی بەندییەکەم لەماوەی حوکمەکەم لەگرتووخانەدا بەرمە سەرو، پاش ئەوە گەڕانمیانەوە بۆ بەدرە.

لەناو جەرگەی ڕووداوە شۆڕشگێڕییەکانی میسرو دەورگێڕانی جەمال عەبدولناسر لەبزواندنی شەقامی عەرەبیدا لەدژی ئیستیعمار، ئێمەی دوور خراوەکان لەبەدواداچوونی ئەم ڕووداوەدا بووینو، لەو باوەڕەشدابووین هەروا کاریکاتە سەر بزافی نیشتمانی عێراق ، بەتایبەتی کە لەوکاتەدا بەرەی یەکێتی نیشتمانی لەگشت حزبە نیشتمان پەروەرەکانی عێراق دامەزرابوو، وەك: حزبی نیشتمانی دیموکراسیو حزبی سەربەخۆیی(الاستقلال)و حزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستو حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق و بەرنامەیەکی هاوبەشیش بڵاوکرایەوە، بەڵام ئەم بەرەیە بە بەشداریی پارتی قایل نەبوو، ئەمەش لەبەر هۆکاری هزری نەتەوەیی شۆفێنی لەئاست مەسەلەی کورد لەبەر ئەوە بوو حزبی شیوعی عێراق دەستپێشخەری کرد بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی دوو قۆڵی لەگەڵ

پارتیدا، بەو هیوایەی مەسەلەی وەرگرتنی پارتی لەبەرەی یەکێتی نیشتمانیدا چارەسەربکرێت دوای ئەوەی حزبەکانی تر بەپێویستیی هاتنی پارتی قەناعەت دەکەن. هەروا حزبی شیوعی عێراق دەسکەوتێکی گەورەی بەدیهێنا بەگەیشتنە یەککگرتنی شیوعییەکان لەحزبی شیوعی عێراقدا، واتە هەڵوەشاندنەوەی هەردوو ڕێکخراوی رایەالشغیلە–ئالاّی کارگەرانو پەیوەستگای شیوعییەکان–رابطة الشیوعیین کە هەردوو لایان بەبێ قەیدو شەرت چوونە ناوحزب.

# شـــۆڕش

لەرۆژی ١٢ای تەموزی ١٩٥٨دا نامەیەکی تایبـەتیم بـۆ هـات لەگـەڵ ئامۆژگـاریی گشتی لەحزبەوە بۆ هەموو ڕێکخراوەکانی لەوێدا گوترابوو:

بـەهۆی بـارودۆخی سیاسـی ئاڵۆزکـاوی نـاوخۆو نـاو عەرەبـەوە، کـە لەوانەیـە لەهەرکاتێکـدا پەرەبـسێنێ... جـا بـۆ زامنبـوونی یـەکێتی چـالاکی سیاسـی ڕێکخراوەکانمان لەم هەلومەرجە ناکاوو ئـاڵۆزەدا ئێمـە بەپێویـستی دەزانـین لـەم ڕۆژگارەدا جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە. دروشمە سەرەکییەکانمان ئەمانەن:

١. دەرچوون لە پەیماننامەی بەغدا (پەیمانی سـەنتۆ)، هەڵوەشـاندنەوەی ڕێکەوتنی دووقۆڵی لەگەڵ بـەریتانیاو ڕاوەسـتان لـەدژی مەبدەئـەکانی ئایزنهاوەر.
٢. بـەرەلاکردنی ئازادییـە دیموکراسییەکان بـۆ جـەماوەری گـەل (ئـازادی ڕێکخستنی حزبی و نەقابی و ئازادی بڵاوکردنەوەو کۆبوونەوەو...تاد) ڕاگەیانـــدنی لێبـــوردنی گـــشتی لـــە حوکمـــدراوە سیاســـییەکانو ئازادکردنیـان، هەڵوەشـانەوەی ئـەو مەرسـومو یاسـا دەسـتوورییانەی کەبەمەبەستی لێدانی بزووتنەوەی نیشتمانییە.
٣. بەجێگەیاندنی کاروباری پێویست بۆ پارێزگاری سامانی نیشتمانیمانو هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی بژێوی کۆمەڵانی گەل.
٤. دامەزراندنی حکومەتێك کەسیاسەتێکی نیشتمانیو عەرەبی سـەربەخۆ ڕێبازی بێتو پشتگیری خەباتی گەلی لوبنـانو گـشت گـەلانی عـەرەبو خزمـەتی ئاشـتی بکـات.. (یـەکێتی عـەرەبی) بکاتـە یەکێتییـەکی ڕاستەقینەی نێـوان عێـراق و ئـەردەن کەبەرژەوەنـدەکانی گەلەکـەمان دابـین بکـاتو لەخزمـەتی خەباتـدابێت لـەدژی ئیـستیعمارو زایـۆنیزم لـەپێناو بەیـەکبوونی عەرەبداو دامەزرانـدنی یـەکێتی فیـدراڵی لەگـەڵ

کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا.

بەپێویستی دەزانین جەخت لەسەر ئەمانەش بکەین:

١. پێویستی خۆ دوورخستنەوە لەدەرخستنی دروشمی نادیار یان سەرچڵ یاخود ئەوانەی ئەم زەعیم یان ئەویتر لەسەرکردەکانی بزووتنەوەی نیشتمانی یان عەرەبی بەرز دەگرن لەسەر حیسابی داپۆشینی دروشمە بنچینەییەکانمان‌و کەمکردنەوەی شان‌وشکۆی خەباتی جەماوەری گەل‌و بەرەی نیشتمانی.

٢. پێویستی دەرخستنی هۆشیارییەکی سیاسی بەرز لەئاست گشت مانۆڕو پیلانەکان‌و، لەئاست چالاکییەکانی نۆکەرانی ئیستیعمارو، کارکردن بەهۆشیاری و بەوپەڕی دڵسۆزی بۆ سیاسەتی حزب‌و، وادابنرێ کە ئەرکی سەرەکیمان لەهەموو بارودۆخێکدا کۆکردنەوەی فراوانترین جەماوەری گەلە لە دەوری دروشمە ڕاستەکان لەکاتێکی دیاریکراوداو، لەدەوری دروشمە گەورەکانی بزووتنەوەی نیشتمانی و دیموکراتیمان.

# ۱۲ی تەموزی ۱۹۵۸

لەنامە تایبەتییەکەشدا بۆمن کە لەم هەلومەرجەدا خۆم ئامادە بکەم، بۆ گەیشتنە حزب (هەرکاتێك گوێتان لەهەواڵی خۆش بوو ئۆتۆمبیلێکی تایبەتیتان بۆدێت کە بتگەیەنێتە لای ئێمە). ئیتر من هەر ڕادیۆ بچکۆلەکەم لەلابوو، کاتێك ڕادیۆی بەغدا لەسەعات شەشی بەرەبەیانی١٤ی تەموزی ١٩٥٨دا کرایەوەو بەبلاوکردنەوەی بەیاننامەی یەکەمی شۆڕش دەستی پێکردو عەبدولسەلام محەمەد عارف خوێندیەوەو ڕایگەیاند کە حوکمی پاشایەتی کۆتایی هاتو کۆماری عێراق دامەزرا.. بەخێرایی هاوڕێکانم لەخەو هەستانو بەهەموو دەنگەم هاوارم کرد:

لەخەو هەستن هاوڕێیان شۆڕشە، کۆمارییە. هەموان لەخەو هەستانو گوێیان بۆ ڕادیۆی بەغدا ڕاگرت، بۆیەکەمین بەیاننامەو سرودو بانگکردنی جەماوەر بۆڕابوون لەدژی پاشماوەکانی سەرانی ڕژێمو بۆ کەوتنی کۆشکی ڕیحابو ڕاکێشانی (وصی عبدالاله).. بەڕێوەبەرایەتی و پۆلیس سەرسام بوون باوەڕیکەن یان نەکەن. بەلام ئێمە بەپێی ئامۆژگارییە گشتییەکە ئامادە بووین، دەستبەجێ ڕوومانکردە شار کەلەدیداری بێبەش بووین لەپەیوەندی لەگەڵ جەماوەرەکەی بێبەش بووین، خۆپیشاندانی دوورخراوەکان بوو داوای کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی فراوانمان کرد، لەوێدا منو هاوڕێ نافع یونس لەکۆبوونەوەکەدا قسەمان کردو داوامان لەجەماوەر کرد پشتگیری شۆڕش بکەنو، گەڕاینەوە بۆ ماڵەکانمان، بەلام یەکەم ڕۆژ ئەو ئۆتۆمبیلە نەهات کە بەلێنمان پێدرابوو، یادداشتێکمان بۆ پارێزگاری کوت(ئەوکاتە موتەسەریف) پێشکەش کردو داوامان لێکرد دەستبەجێ بەرەلا بکرێین. بۆ ڕۆژی دووەم لەسەعات هەشتی بەیانیداو لەکاتی گەیشتنی ئۆتۆمبیلەکەدا بڕیارێك دەرچوو کە هەموو دوورخراوەکان بەربدرێن.

دەوروبەری سەعات دوانزەی نیوەڕۆ گەیشتینە بەغداو چاوم بە هاوڕێ (سەلام عادل)کەوت یادداشتێکی بۆ پشتگیریی شۆڕش ئامادە کردبوو کە چەند داخوازی

نیشتمانیو دیموکراتی تێدا بوون، وێرای شانازی بەو کارەی عەبدولکەریم قاسمو پێدا هەڵگوتنی ئازادییو گیانفیدایی لەپێناو هێنانەدی ئامانجە نیشتمانییەکانداو، حزبی شیوعی عێراق هەموو توانای خۆی دەخاتە ژێر دەستی سەرکردایەتی شۆرش بۆ پاراستنی کۆماری عێراق، ئیمزاکردنی بروسکەکە بەمێژووی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨بوو بەناوی سەلام عادلەوە، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حزب، ئەم بروسکەیە بەتەلەفۆن نێردرا بۆ ئەنجومەنی سەروەریی کۆماری عێراقو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران عەبدولکەریم قاسم. نامەیەکی ناوخۆیش بۆ رێکخراوەکانی حزب نێردرا کە ئامۆژگاریی بەپەلەی بەناوی مەکتەبی سیاسی حزبەوە تێدا بوو کە ئەمانە بوون:

–پشتگیری جەمهوریەت بکەن بەرێگەی ناردنی بروسکە، لەوێدا جەخت لەسەر بەرەو یەکێتی فیدراڵی لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بکەنەوە.

– خۆپیشاندان رێکخەن.

– کۆمیتەکانی بەرگری لە جەمهوریەتو پشتگیری شۆرش دامەزرێنن.

– هۆشیار بنو هاورێیانی کادیرو شاراوەکان مەخەنەکار.

– پەیوەندیتان لەگەڵماندا رێکخەن؟

– لەئامۆژگارییەکانو هێلی سیاسی حزب دەرمەچن.

– جەماوەری کرێکارانو جوتیاران رێکخەن.

بۆ رۆژی دوایی رێکەوتی ١٥یتەموزی ١٩٥٨یادداشتێکی سیاسی بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران زەعیم عەبدولکەریم قاسم نێردرا کە تێیدا هاتبوو:

**سلاوێکی گەرم...**

١–بزووتنەوەکە سەرکەوتنێکی خێراو بریاردەری تۆمارکرد، ئاشکرایە سەرکەوتن زۆر ئاسانترە لەپاراستنو بەهێزکردنی و ئەوەشی بانگمان دەکات بۆ دووبارەکردنەوەی ئەم راستییە ئاشکرایە ئەوەیە ئێمە زۆر لەسیاسییەکانمان تاقی کردۆتەوەو، ئێستاش کاتێك بەجەنگەکەماندا گوزەردەکەین گەلێك تاقیکردنەوەی تاڵی مێژووی تێکۆشانی گەلەکەمان و گەلانی تر لەیادەو هەندێك هەن هەمیشە

بەرەو سڕبوونی هۆشیاری و باوەڕمان دەبەن ئەوەش بەناوی پاراستنی هێمنیو بێدەنگی و بەناوی ڕێگە بڕینەوە لە(پەشێوی)و ئەوانە هەست بکەن یان هەست نەکەن، بیانەوێ یان نەیانەوێ بزووتنەوەکەمان بۆ هەڵدێرێك دەبەن کە دوژمن لێی سودمەند دەبێ بۆ خۆدزینە ناو ڕیزەکانمانو هەوڵدان بۆ تێکدانی و گەیشتنە شوێنەوارەکانمانو هەوڵدەدەن ناچارمان بکەن دەست بەرداریان بین، دەبا وەزارەتی محەمەد ئەلسەدر لەساڵی ١٩٤٨دا بێنینەوە یادمان کە بووەمایەی هێرشێکی تۆڵەسێنانەی بەربلاو لەلایەن نۆکەرانی ئیستیعمارەوە بۆ سەر بزووتنەوەی نیشتمانیمانو، تەنانەت ئەوانەش بوونە قوربانیی ئەم هێرشە کە داوای هێمنیو بێدەنگییان دەکرد، دەبا حکومەتەکەی موسەدەقو حکومەتەکەی نابولسی بێنینەوەیاد، باشو بەکەڵکە ئێستا ئەم نمونانە باس بکەین لەم کاتەدا کە ئێمە لەسەرخۆشیی سەرکەوتنداین.

پێویستە ئەو سەرنجانەی لێرەدان بخرێنە بەرچاو لە پێناو پاراستنی کۆمارە ساواکەماندا کەدەبێ:

یەکەم: سیاسەتێکی نیشتمانی ڕوون و توندو تۆڵ بگرێتەبەر، ئەمەش لەم ڕۆژگارەدا واپێویست دەکات دەستبەجێ کشانەوەی عێراق لەپەیمانی بەغدا ئاشکرابکرێتو ڕێکەوتنی دووقۆڵی لەگەڵ بەریتانیا هەڵوەشێندرێتەوەو، یەکێتی فیدراڵی لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو یەمەن ئاشکرا بکرێتو، چاوبگێردرێتەوە بەپەیوەندییەکانی دەرەوەی عێراقدا لەسەر بنچینەیەکی سەربەخۆو، گۆڕینەوەی نوێنەرایەتی سیاسی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتو وڵاتە سۆسیالیستەکانی دۆستو بەوەفای کاتی تەنگانە.

دووەم: پەیڕەوکردنی سیاسەتێك پشت بەبڕوابوون بەگەل ببەستیو بەهۆشیاریو هۆشمەندیو توانای دروستکارانەی، بۆ ئەمەش پێویستە بەندە سیاسییەکان بەرەلا بکرێنو دامەزراندنی کۆمیتە گەلییەکان هانبدرێن بۆ بەرگری کردن لەکۆمارو دامەزراندنی هێزی بەرگری میللی و دەستبەجێ چەکدارکردنیان. تاقیکردنەوەی دوو هەرێمەکەی کۆماری یەکگرتووی عەرەبمان لەمیسرو سوریەو لوبنان و..تاد. هەیە کەباشترین بەڵگەیە بۆ یاخیبوونی ئەمجۆرە تیپانەو

چەکدارکردنیان.

سێیەم: سەپاندنی چاودێرییەکی خێراو توندوتۆڵ بەسەر دامەزراوەکانی کۆمپانیاکانی نەوتو بانکەکانو بەندەرەکانو مەخزەنەکانو دامەزراوە ئابورییە گەورەکان بەمەبەستی پاراستنی سامانەکەمانو ئابوورییە نیشتمانییەکەمانو ڕێگابڕینەوە لەو پیلانگێڕییانەی چاوەڕوان دەکرێن.

چوارەم: تاقیکردنەوەی یەکەمین ڕۆژی دامەزراندنی کۆماریی دووپاتی دەکاتەوە کە پێویستە زۆر بەخێرایی هەرچی کارێك پێویست بێ ئەنجام بدرێ لەبواری ئاراستەو ئیستگەدا بەشێوەیەك زامنی دەربڕینی ڕاستودروست بێ لەئامانجەکانی بزووتنەوەکەو ناوەڕۆکە نیشتمانیو دیموکراسییەکەی و، دوورکەوتنەوە لەهەرچی ببێتە هۆی کردنەوەی کونو کەلەبەر لەریزەکانی گەلدا، لەرۆژی یەکەمدا سەرنجماندا بەئاشکرا گەلی کورد پشتگوێ خراو، هەڵوێستێکی زۆردارانە لەدەیانو سەدان بروسکەی لایەنگیری گیرایەبەر ئەمەش تەنیا لەبەر سروشتی نیشتمانیو دیموکراسیمان.

ئێمە لەوباوەڕەداین بایەخێکی گەورە لەوەدایە دەزگای پڕۆپاگەندەو ئیستگە بدرێنە دەستی نیشتمانپەروەرو دیموکراسی کە بزانن چۆن خواستو ئیرادەی بزووتنەوە پیرۆزەکەتان دەردەبڕنو ڕووی گەشاوەی گەلی عێراقو وڵاتانی عەرەبی و هەموودنیا پیشاندەدەن، تابەکردار دەتوانین ڕووبکەینە ئەوەی دەستەبەری یەکێتی و هاوکاری وبەرزکردنەوەی هۆشیاری گەلەکەمانی تێدایە بۆ ڕاوەستان وەك یەك پیاو ڕووبەڕووی پیلانەکانی ئیستیعمارو داروەستەکانی ئیستیعمار.

دواجار ئەوە دووبارە دەکەینەوە کە لەبروسکەی پشتگیریماندا گوتمان هەموو هێزو توانای حزبەکەمان تەرخان دەکەین بۆ پشتگیریتانو بەرگری لەکۆمارە پاڵەوانەکەمان.

**ئیتر لەناخی دڵەوە سڵاوو هیواداریمان بۆ سەرکەوتنت قەبوڵ بفەرموو**

**کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی عێراق**

**بەغدا١٥ای تەموزی ١٩٥٨**

حکومـەتی شـۆڕش دەسـتبەجێ هەرچـی کاروبارێـك پێویـست بـوو کـردی بـۆ جێبەجێ کردنی ئـەوەی لەیاداشـتەکەی حزبدا هـاتبوو، یـاخود بـابڵێین زۆربـەی جێبەجێ کرا، چونکە لەقازانجی بەهێزکردن و چەسپاندنی دەسەڵاتی حکومەت بوو بەسـەر باروبۆخەکـەدا و بـۆ پاراسـتنی جەمهوریـەت، ئـەوەبوو بـەکردەوە هەنـدێ کۆشـشی کودەتـاگێڕی دۆزرانـەوە کەلەلایـەن نەتـەوە پـەروەران و بەعـسییەکان و ناسـریەکان و هێـزە کۆنەپەرسـتەکانی دەرەبەگـەکان و لەلایـەن هـەموو ئەوانـەی بەرژەوەندییان زیانی پێگەیشتبوو ئامادەکرابوون، دیارترینیان پیلانەکەی شەواف بوو لەموسڵ و هەوڵدان بـۆ کوشـتنی قاسـم دواتریـان کودەتاپەشـەکەی ١٩٦٣ کـە حکومەتی عەبدولکەریم قاسمی لەناوبرد و عێراقی خستەناو گێژاوی کودەتـاگێری و نەبوونی سەقامگیریی ئابوری و سیاسی تا داگیرکردنی عێراق لەلایـەن ئـەمریکاوە و ڕاماڵینی حکومەتی دیکتاتۆری و شۆڤێنیی سەدام.

# هەڵویستی کامل چادرچی
# لەشۆڕشەکەی ١٤ی تەموز

پاش دامەزراندنی بەرەی یەکێتی نیشتمانی لەساڵی ١٩٥٧دا لەحزبی نیشتمانی دیموکراسیو حزبی ئیستیقلالو حزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستی و حزبی شیوعی عێراق، سەرنجەکان بەرەو کامل چادرچی ئاراستەبوون کە سەرۆکایەتی حکومەتی شۆڕش بکاتو، بەرەی یەکێتی نیشتمانی هاوپەیمانێتیی لەگەڵ ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازاد بەستبوو، پێش ئەنجامدانی پرۆسە عەسکەرییەکە بۆ ڕامالینی ڕژێمی پاشایەتی قسە لەگەڵ کامل چادرچی کرا کە پێویستە ئەو سەرۆکایەتی حکومەتی شۆڕش بکات کە چەند یەکەیەکی سوپای عێراقی ئەنجامی دەدەن بەلام بەرێز چادرچی ئەم داوایەی ڕەتکردەوەو گوتی من: لەحکومەتێکی سەربازیدا بەشداریی ناکەم، چونکە سەربازەکان دیموکراسی نابنو بۆ بەرێوەبردنی حوکم بیر لەشێوازی فەرماندەیی و دیکتاتۆری عەسکەری دەکەنەوە، ئەوەشی تاقی کردبۆوە کەلەگەڵ کودەتا عەسکەرییەکەی بەکر سدیقی ساڵی ١٩٣٦دا هاوکاریی کردو، قایل نەبوو حسین جەمیلو محەمەد حەدید لە حکومەتی شۆرشدا بەشداریی بکەن لەبەر ئەوەی حکومەت بەدەست عەسکەرییەکانەوە بوو.

بەلام عەبدولکەریم قاسم دوای ئەو هەموو هەوڵدانی کودەتاگێرییەو، هەوڵدانی کوشتنی، لەکاروبارە توندو تۆڵەکانی بۆ پاراستنی کۆماری و پاراستنی حکومەتەکەی پاشەکشەی کردو، ئالەم پاشەکشە ڕاستڕەوییەیدا کەوتە هێرشبردنە سەر حزبمانو تەنانەت هێرشی بۆ سەر ژیانی حزبی و ئازادییە دیموکراسییەکانو نەقابەکانو ڕێکخراوە دیموکراتییەکانو بۆسەر کۆمەڵەکانی جوتیاران دەست پێکردو لەو باوەڕەدابوو هێرشبردنە سەر حزبی شیوعی و ئازادییە دیموکراتییەکان لەپیلانەکانی ئیستیعمارو هێزە نەتەوەپەروەرە ڕاستڕەوەکان ڕزگاری دەکات، بەلام هێزە نەتەوەپەروەرە ڕاستڕەوەکان لەپاڵ چارشێوی ئەم پاشەکشە

ڕاستڕەوییەی عەبدولکەریم قاسم دا خۆیان شاردەوە بۆ هێرشکردنە سەر حزبی شیوعی عێراق‌و شێواندنی هەڵوێستە سیاسییەکانی و بە درۆودەلەسە تاوانبارکردنی، جا هەرچەندە حزب بەرگری لەسیاسەت‌و هەڵوێستەکانی خۆی کردو بەرپەرچی درۆودەلەسەکانی دایەوە کەبەمەبەستی شێواندنی ناوبانگی حزب بوو ڕەهەندەکانی ئەم سیاسەتە ڕاستڕەوەی قاسم‌و هێزە کۆنەپەرستە پیلانگێڕەکانی ئاشکراو ڕیسواکرد بەلاّم ناوەندێك لەناو سەرکردایەتی حزبدا لەڕاستڕەوەکان سواری ئەو شەپۆلەبوون بەرەو ئیدانەکردنی سیاسەتی حزب‌و بەشێوەی تایبەتی هەڵوێستەکانی هاوڕێ سەلام عادل کە بەرگریکردن بوو لەحزب، ئەوانە بەرگرییان لە عەبدولکەریم قاسم دەکردو ئەنجامەکانی ئەم پاشەکشە ڕاستڕەوەی سیاسەتی قاسمیان خستە سەر ئەستۆی سیاسەتی حزب یان وەکو تر بڵێین سەر ئەستۆی سەلام عادل، ئەمەش لەو ڕاپۆرتەدا دەرکەت کە لەکۆبوونەوەکەی کۆمیتەی ناوەندی لە١٥ی تەموزی ١٩٥٩دا بڕیاردراو بلاّوکرایەوە، ئەم ڕاپۆرتە بەرەخنە لەخۆگرتنێکی سیاسەتی حزب دانرا لەئاست هەڵوێستەکانی حکومەتی قاسم دا، بەلاّم حزب دوای بەرەو خراپترچوونی بارودۆخەکە ڕاپۆرتەکەی کۆمیتەی ناوەندیی ١٥ی تەموزی ١٩٥٩ی هەڵسەنگاندوەو وایداناکە (جەڵدە لەخۆدانە).

پاش داتەپینی ڕاستڕەوانەی ئاشکرای سیاسەتی عەبدولکەریم قاسم‌و گەیشتنی ئەم داتەپینە بەهەڵوێستێکی شۆڤێنی گرتنەبەر لەنەتەوەی کوردو بەرگری کردنی گەلی کورد لەمانەوەی خۆی و، بەرگریکردنی حزبی شیوعی لەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردو بێزاری و پرۆتێست دەربڕین لەسیاسەتی شۆڤێنی‌و داپلۆسێنەرانەی حکومەت، حزبمان لەگەڵ حزبی نیشتمانی دیموکراتی باسی کرد کەپێویستە لەم داتەپینە بکۆڵینەوەو هێزە دیموکراتەکان هاوپەیمانییەکی سیاسی پێکبێنن تاڕادەیەك بۆ ئەم بارودۆخی داتەپینە دابنرێ و قاسم ناچار بکرێ کە سیاسەتێکی نیشتمانی دیموکراسی بگرێتەبەر، بەلاّم حزبی نیشتمانی دیموکراتی قایل نەبوو بەتەنیا لەگەڵ حزبی شیوعی و هێزە دیموکراتییەکانی تر هاوپەیمانی بکات ئەگەر هێزە نەتەوە پەروەرەکانی وەك هەردوو حزبی (ئیستیقلال‌و بەعس) نەیەنە ئەم

هاوپەیمانییەوە، ئەم داخوازییەی حزبی نیشتمانی دیموکراتی لەتوانادا نەبوو، ناماقوڵ و نازانستی بوو، چونکە زۆرباش دەیزانی هێزە نەتەوەپەروەرەکان خۆیان بنچینەی ئەم داتەپینەن و هەر خۆشیان بوونەتە مەترسی بۆسەر وڵاتەکەو تاقیکردنەوەکانی ساڵانی ڕابردووش وان لەپێش چاوماندا کەگشت پیلانە کودەتاگێرییەکان دژی شۆڕشە نیشتمانییەکەی١٤ی تەموز لەهێزە نەتەوەپەروەرە ڕاسترەوەکانەوە بوو ئەوانە لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق هاوپەیمان نابن، لەگەڵ ئەو حزبەی هێزی سەرەکی بوو بۆ بەرگرییکردن لەسەربەخۆیی و پێشکەوتنی عێراقو لەدیموکراسی، بەڵام وێرای ئەوەش بڕیاریدا لەگەڵ حزبی بەعسو ئیستیقلال باس بکات لەبارەی پێکهێنانی بەرەی نیشتمانییەوە بەڵام بەعسو ئیستیقلال قایل نەبوون لەگەڵ حزبی شیوعی دیدار بکەنو حزبی نیشتمانی دیموکراتی لەم هەڵوێستەیان ئاگاداریان کردین، چونکە هێزە نەتەوەییە ڕاسترەوەکان خەریکی سازدانی کودەتایەکی سەربازی بوون بۆ لەناوبردنی حکومەتی قاسم، چونکە لەهێزە پێشکەوتنخوازە دیموکراتییەکانو لەبزافی ڕزگاریخوازیی گەلی کوردستان دوورەپەرێزو لاکەوتبوو، ئەم هەلە زێڕینەیان قۆستەوە بۆ ئەنجامدانی کودەتاکەو ڕووخاندنی حکومەتی قاسمو تێسرەواندنی هێزە پێشکەوتنخوازو دیموکراتەکان، بەمجۆرە هێزە نەتەوەییە ڕاسترەوەکانو کۆنەپەرستی و دەرەبەگی لەسەر بنەمای نەخشەکێشانی ئیستیعماری هاوپەیمانییان پێکەوەنا بۆ سازدانی کودەتای ڕەشی شوباتی ١٩٦٣.

# فراوانکردنی کۆمیتەی ناوەندی

دوای شۆڕشـەکەی١٤ی تـەموز زۆر پێویـست بـوو کـادیرانی حزبـی بخرێنـەکار، بەتایبەتی دوای ئازادکردنی دوورخراوەو بەندییە سیاسییەکان، لەو ڕۆژانـەدا حـزب ئەرکی سەرکردەیی کاری حزبی لە هـەرێمی کوردستاندا خستە ئەستۆم، لەمـەدا هـاوڕێ جـۆرج تـەلو یـاوەرم بـوو بـۆ سـەردانی ڕێکخراوەکـانی لقـی کوردسـتان، سەردانی ڕێکخراوەکانی حزبمانکرد لەناوچەو قـەزاو ناوەنـدی شـارەکانی هـەرێمی کوردستاندا ئەمەش دوای ئەوەی نزیکەی دە ڕۆژێك لەبەغدا مامـەوە، لەوماوەیـەدا لەنزیکەوە ئاگـاداری بارودۆخەکـە بـووم و لەگـەڵ هاوڕێیـانی سـەرکردایەتی حـزب بەشداری هەڵوێستە سیاسییەکانی ڕۆژانەم کردکـە بـۆ ڕۆژانـی یەکـەمی شۆڕشـەکە پێویست بوو.

دوای تەواو بوونی گەڕانەوەمان بەسەر ڕێکخراوەکـانی لقـی کوردسـتاندا لەگـەڵ هاوڕێ جۆرج تەلو گەڕاینەوەبەغـدا، هاوڕێیـانی بەنـدکراو هێـشتا لەبەندیخانەکانـدا مابوونـەوەو هێـشتا بڕیـاری ئازادکردنیـان نـەدرابوو، لەگـەڵ هـاوڕێ سـەلام عـادل ئەوباسەم کردەوە کە چۆن دوای ئازاد کردنیان ڕەفتاریان لەگەڵ بکەین، لەوەڵامدا گوتی: حزب یەکجار زۆر پێویستی بـەفراوانکردنی دەسـتەی سـەرکردایەتی هەیـەو دەبێ کۆششیان بخەینە پاڵ کۆششی خۆمان بۆ سـەرکردەیی کـارو چـالاکییەکانی حزبو بزووتنەوەی سیاسی لە وڵاتدا، پێمگوت: تۆ زۆرچاك ئاگاداری هەلومـەرج و کێشە شەخـسییەکانی نـاو بەندیخانـەیت کـە لەناویانـدا بـەربڵاوبوون، ئەوانـە لـە بزووتنەوەو کاری جەماوەری، بەدرێژایی ئەم ساڵانە دوورەپەرێز بوونو، هـەردەبێ پێشەکی بیانخەینـە ناوکـاری حزبـی، لـە هـەموو بوارەکانـدا، لـەبوارەکانی کـاری جەماوەریـدا، تـا سیاسـەتی حـزب تێبگـەنو بتـوانن بیگەیەننـە جەماوەرەکـەو، لەبارەی تیئوریی ڕێکخراوەکانی حزبەوە ڕۆڵی خۆیان ببیـنن، ڕێکخراوەکانمـان زۆر فراوانبوونو، پێویستیانە ژیانێکی ئاسایی حزبی بژینو بەرنامـەی کـار بـۆ خۆیـان دابڕێژنو لـەبارەی چـالاکییانو ئـەو گیروگرفتانـەی لەکارەکانیانـدا دێنـە ڕێگـەیان ڕاپۆرت بدەنە سەرکردایەتی حزب..تاد. پێشنیازم بۆ کرد پەلـە نـەکرێ لـەهێنانی

کەسیان بۆ کۆمیتەی ناوەندی، چونکە بەمجۆرە لەقازانجی حزبو لەبەرژەوەندی خۆشیانە، بەڵام ئەو بەچەشنێکی تر بیری دەکردەوە، دەیویست لەباری سیاسییەوە توانای سەرکردایەتی پتەوبکاتو ئاستی هزری بەرزبکاتەوەو چەندان کەسایەتی ناسراو لەناوەندەکانی نیشتمانی و عەرەبی و نێودەوڵەتیدا بێنێتە سەرکردایەتی، بەمەش شوێنو پایەو ناوبانگی سیاسیی حزب بەرزدەبێتەوە، ئەمە یەکەم.

دووەمیش، دەیویست لەهێنانیان وابەخێرایی بۆ کۆمیتەی ناوەندی لەبیری ئەو هاوڕێیانە هەرچی پاشماوەکانی کێشەی شەخسی بوون، نامەبدەئی بوون، لەوکاتەی لەبەندیخانە بوون وایان تەماشای سەلام عادل دەکرد کە شایانی کۆمیتەی ناوەندیی نییە، هەموو ئەو پاشماوانە بسرێتەوە، وەکو لەپێشەوە گوتم ئەوانە دژی هێنانی سەلام عادل بوون بۆ کۆمیتەی ناوەندی لەساڵی ١٩٥٣دا، وایان تێدەڕوانی کە (ڕۆشنبیرو هونەرمەندێکی بۆرژوازی بچووکە) ئیتر ئەبێ چۆن سەرکردایەتی حزب بکاتو سەرکردەی کۆمیتەی ناوەندی بێت.

ئەم هۆکارانە وای کرد کە ناوەکانیان بخاتە بەرچاو بۆ ئەوەی بهێنرێنە کۆمیتەی ناوەندی، دواکەسێك کەناوی هێنان هاوڕێ عەزیز محەمەدو نافع یونس بوون، هەردوو هاوڕێ لەکۆمیتەی لقی کوردی حزب لەکوردستانی عێراق کاریان دەکرد، لەکۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی لەتەموزی ١٩٥٩دا هاوڕێ عەزیز محەمەد هێنرایە مەکتەبی سیاسیی کۆمیتەی ناوەندی. دەبێ بەم بۆنەیەوە ئەوەش بڵێین دوای دەرچوونی لەبەندیخانەو هاتنی بۆ کارکردن لەلق ئەرکی سەرکردەیی شانەیەکی کرێکاری لە خەتی ئاسنین پێسپێردراو بەبێ فیزی پەرەی پێداو ئاستی شانەکەی بەرزکردەوە لەکاتێکدا ئەوکاتە ئەندامی کۆمیتەی لق بوو.

ئەنجامەکانی ئەم پەلەکردنە لەو کێشانەدا دەرکەوتن کە پاشان لەسەرکردایەتی حزبدا ڕوویانداو هەر لەو کاتەوە بوونە ئەندامی سەرکردایەتی ئەم کێشەو زۆرانبازییانە بووە مایەی دەرکەوتنی خولیاو خواستی شەخسی لەدژی سکرتێری حزب (سەلام عادل)و ئەمەش بووە دەستەبەرێکی ئاشکرا بەم ڕەوتەدا. ئەم بابەتە لەشوێنێکی تردا باس دەکەم.

# فراوانبوونی بنکەی حزب

دوای شۆڕشەکەی ١٤ی تەموز زۆر بەخێرایی بنکەی حزب فراوانبوو، هۆکاری ئەم فراوانبوونە ئەمانە بوون:

١-دەورگێڕانی حزب لەسەرەتای دامەزراندنییەوە، لەخەباتی نیشتمانیدا لەدژی ئیستیعمارو حکومەتە کۆنەپەرستەکان کە کەوتبوونە دوای پاراستنی بەرژەوەندەکانی ئیستیعمارو کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکانی، حزب بەرگریکارێکی ڕاستەقینە بوو لەبەرژەوەندی و مافەکانی کرێکاران و جوتیاران‌و ڕۆشنبیران‌و سەرجەم زەحمەتکێشان‌و، ئازادییە دیموکراتیەکان، بەچەشنێکی بەردەوام‌و مەبدەئی بەرگریی لەمافەکانی گەلی کورد دەکرد لەبڕیاردانی چارەنووسی خۆیدا وەك هەرگەلێکی ئەم جیهانەو لەدژی سیاسەتی شۆڤێنیی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق ڕاوەستا، ئەو سیاسەتەی دژی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان‌و مافی نەتەوەکان پەیڕەویان دەکرد. حزب لەسەر ئەو ڕێبازەی جێگیر بوو بەبێ خولیاو دوودڵیی‌و، بەردەوام لەخەباتدا بوو، لەهەموو بارودۆخێکدا، بەنهێنی و بەئاشکرا، لەناوەندی باری گران‌و تیرۆرو قوربانیدانی سەخت کە لەکۆڕی خەباتی لەپێناو سەربەخۆیی و سەروەریی نیشتمان‌و دیموکراسیدا پێشکەشی کرد.

٢-دەورگێڕانی حزب لەیەکخستنی هێزە نیشتمانپەروەرکاندا لەبەرەی یەکێتی نیشتمانیداو، یەکخستنی کۆششی ڕێکخراوە سەربازییەکان‌و کارئامادە کردن بۆ شۆڕش‌و ئەنجامدانی و، دەورگێڕانی لەپاراستنی جەمهوریەتداو دامەزراندنی تیپەکانی هێزی بەرگری میللی بۆ بەرگری کردن لە جەمهوریەت‌و دەورگێڕانی حزب لەهێنانە پێشەوەی بەرنامەیەکی نیشتمانی و پێشکەوتنخوازی دیموکراسی بۆ حکومەت‌و شێوازی کارکردن لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا...تاد.

هەموو ئەمانە لای خەڵکی سەربەچینە جۆربەجۆرەکان‌و پلەو توێژە کۆمەڵایەتییە نیشتمانییەکان قەناعەتێکی وای خولقاند کە حزب سەرکردەیی

شۆرشی کردووەو دەسەلأت بەرێوەدەبات یان لەمەولا سەرکردایەتی دەکات، توێژاڵێکی فراوانیش هەبوون لەفەرمانبەرانو رۆشنبیران، بەتایبەتی لە توێژی بۆرژوای بچووك، بەنیازی وەرگرتنی کاروفەرمان، لەحزب نزیك بوونەوەو بنکەی حزبی لەسەر ئەم بنچینەیە فراونبوو.

ئەم فراوانبوونە لەسەر حیسابی چلۆنایەتی لەحزبدا بوو، چونکە حزب وەك ئاشکرایە بەرزترین ڕێکخستنی کۆمەلأیەتییەو جگە لە کەسانی هۆشمەندو لەو جۆرانەی ئیلتیزامی حزبییان هەیە کەسانی تر لەریزەکانیدا وەرناگرێ. ئەندامی حزب دەستبەرداری بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دەبێ و دەیکاتە قوربانی لەپێناو بەرژەوەندیی چینی کرێکارو جوتیارو رۆشنبیرانو تەواوی زەحمەتکێشانی شارەکانداو، خۆنەویست دەبێو، ملکەچی زەبتو رەبتو ئیلتیزاماتی حزبی ئاسایی دەبێو، ئامادە دەبێ بۆ کارکردن لەهەموو جۆرە بارودۆخێکداو ئامادە دەبێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی ئەندامی حزبی و خۆی دەکاتە قوربانیی پێناوی ئامانجە بەرزەکانی حزبو رزگارکردنی کۆمەلٚ لەچەوسانەوەی چینایەتی و لەپێناو دادپەروەریی کۆمەلأیەتیدا، ئەم خاسیەتانە ئەبێ لەئەندامی شیوعیدا هەبن، لەوانەدا کە ئامانجیان گۆرینی کۆمەلگایە لە کۆیلەیی رژێمی سەرمایەدارییەوە بۆ کۆمەلگای دادپەروەریی کۆمەلأیەتی(کۆمەلگای سۆسیالیستی).

ئالێرەوە سەرنجم دەدا ئاستی ئەندامی حزب جیاوازی نەبوو لەگەلٚ ئاستی خەلکیدا، ئەگەر دەربڕین هکەمان ڕاست بێ بابلێین حەماسەتو سۆزێکی زۆرتری دەردەبری.

ئەم تێبینییە گرنگانەم خستە بەرچاوی سەلام عادلو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و گوتم ئەم ژمارە زۆرە لەبەر وەرچەرخانی ڕووداوەکاندا خۆراگر نابنو ناتوانن ڕووبەرووی هەر ئالوگۆرێکی باشو خراپ ببنەوە، وای دەبینم ئەو ژمارەیەی هەن ناتوانن خەلکی ڕێکخەنو سەرکردایەتییان بکەن، ژمارەیەکە بۆ هەلبژاردنو پەرلەمان، لەبەر ئەوە داوامکرد دەرگای بوون بەئەندام بۆ ماوەی سالێك دابخرێتو بەرنامەیەکی فێرکردنو تێگەیاندنو کارکردن دابنرێ بۆ

بەرزکردنەوەی هۆشمەندیی کۆمەڵایەتیو ئاستی سیاسی و ڕێکخستن و هـزری و ڕۆشنبیریی گشتی ئەندامانو، پێویستیشە بەهۆی ئەم پرۆسەیەوە ریزەکانی حزب لەکەسانی خۆپەرستو هەلپەرستو دوودڵ و تەمبەڵ پاك بکرێنەوە تا ئەوجۆرە کەسانە هەڵبـژێردرێن کـە سـەرکردایەتی پرۆسـەی شۆرشـگێڕی لەوڵاتەکەمانـدا دەکەوێتە ئەستۆیان.

ئێمە دەبێ پشت ببەستین بەچەندایەتی نەك لـەناو حزبدا بـەڵکو بـەهێزکردنی ڕێکخراوەکـانی نەقابییـەکانو لاوانو خوێنـدکارانو جوتیـارانو پیـشەییەکانو ڕێکخستنی خـەڵکێکی زۆر لـەو ڕێکخراوانـەدا، ئەمەیـە دەبێتـە شـورایەکی بـەهێز لەڕێکخستنی جەماوەری. لەپاڵ ئـەم پێشنیازەمدا نامەیەکیشم نووسی، بەڵام بەداخەوە ئەم پێشنیازە پشتگوێ خرا چونکە کێشەی نـاوخۆیی لەسـەرکردایەتیدا بووە ڕێگری بایەخدان بەژیانی ناوخۆیی حزب.

# پێویستی پێکهێنانی
# دووەمین کۆنگرەی نیشتمانیی حزب

شۆرشەکەی ١٤ی تەموز ڕووداوێکی تاکتیکی ڕاگوزەر نەبوو، بەڵکو شۆرشێکی نیشتمانی رزگاریخوازیی بوو، قۆناغێکی مێژوویی تەواوی لەخەباتی گەلەکەمان و قوربانیدانیدا دەست پێکرد لەپێناو سەربەخۆیی و سەروەریی نیشتمانی و ئالوگۆڕی دیموکراسیدا، حزبی ئێمە دەورگێڕانی دیارو شەرەفمەندانەی لە رێکخستن‌و کۆکردنەوەو جولاندندا ئەنجامدا، لەباری سیاسیشەوە کاری کردە سەر ڕەوتەکەی بە ڕێبازێکی ڕاستدا تاماوەیەکی کاتی دیاریکراو، چونکە سەرکردەیی شۆرشەکە بەدەست حزبەوە نەبوو، لەقۆناغی یەکەمی سەرکەوتنی شۆرشدا بەڕاست‌و دروستی سروشتی نیشتمانی و کۆمەلایەتی لەهێنانەدی ئیسلاحی زەراعی و بەرەلاکردنی ئازادییە دیموکراتییەکاندا دیاریکرا. بەلام لەپاشاندا لێیان پاشگەزبۆوەو بووە دژی هێزە پێشکەوتنخوازو دیموکراسییەکان.

هەموو ئەمانە وایان دەکردە پێویست کە کۆمیتەی ناوەندی گشت پێداویستەکانی بەستنی دووەمین کۆنگرەی حزب جێبەجێ بکات، یاخود بەلایەنی کەمەوە کۆنفرانسی سێیەمی حزب ببەسترێ، بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی پەرەگرتنی بارودۆخەکەو لێوردبوونەوەیەکی وردو مەوزوعیی پەرەسەندنەکانی ڕێڕەوی شۆرشەکەو هەڵسەنگاندنی سیاسەتی حزب و چارەسەرکردنی گیروگرفت‌و ئەو هەلانەی تێیان کەوتبوو. چەند جارێك پێشنیازم پێشکەشکرد کە پێویستە کۆنگرەیەکی وابەسترێ، بەلام هاوڕێ سەلام عادل و هاوڕێیانی دیکەی مەکتەبی سیاسی‌و سکرتاریەت دەیانگوت هەلومەرجی حزب لەبار نییە، چونکە کێشەی سیاسی لەسکرتایەت‌و مەکتەبی سیاسیدا توندەو، ترسی دابەشبوون هەبوو، قاسمیش بەم ڕەوتەدا هەولی دەدا، هەنگاوی یەکەمی بەوەبوو مۆلەتی داودالصایغ—ی دابەدامەزراندنی حزبێك بەناوی (حزبی شیوعی عێراق) لەبەر ئەوە

کۆنگرە دەبێ کارەکانی بەیەکێتیو پێشکەوتنی حزب بەرەوپێش کۆتایی پێ بهێنێت، من مشتومڕم لەسەر مەسەلەکە لە گۆشەیەکی دیکەوە بوو کە کۆنگرە دەتوانێ سنورێك بۆ ئەو کێشەیەی ناو سەرکردایەتی حزب دابنێو، ڕەوتە سیاسیو هزرییەکان یەکبگرنو تەواوی حزب لەبڕینەوەی کێشەی ناوخۆییدا بەشدار بێت بگاتە یەکێتی هەڵوێستو سیاسەتو هزر، بەمجۆرە بیروڕاو ڕەوتی سیاسیی چەوت دەبەزێو حزب لەکارکردندا یەکدەگرێ، ئەمەش سەرکەوتنە بۆ حزب. هەروا کۆنگرە دەگاتە نەخشەکێشانی سیاسەتێکی یەکگرتوو لەچۆنیەتی هەڵسوڕاندا لەگەڵ بارودۆخی سیاسی و دەسەڵاتی قاسمو یەکخستنی هێزە سیاسی و دیموکراتەکان لەهاوپەیمانێتی سیاسیی نوێدا. هەموو ئەمانەو پێشنیازەکەم جار لەدوایجار بەهەند وەرنەگیراو جاروبارباسیان دەکرد کە حزبی شیوعی سۆڤیەت ئامۆژگاریی کردووین ئەم ئەکە جێبەجێ نەکەین چونکە ئەنجامی باشو پۆزەتیڤی نابێت. وێڕای ئەمەو هەموو بڕوبیانووەکانیان کە هاوڕێیان پشتیان پێدەبەست هێشتا لەسەر ئەو باوەڕەم کە بەستنی کۆنگرە پێویست بوو بۆ نەخشەکێشانی سیاسەتی حزب لەو بارودۆخە ئاڵۆزەداو بۆ هەڵبژاردنی کۆمیتەیەکی ناوەندیی نوێ کە شەرعیيەتی دەستوریی حزبی هەبێتو ڕەوتە ناواقیعییەکان ببەزێندرێن کەلەگەڵ قۆناغی مێژوویی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی و دیموکراتیدا نەدەگونجانو، لەگەڵ هاوپەیمانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا نەدەگونجان کە حزب وەك پێداویستییەکی مێژوویی قۆناغەکە هەوڵی هێنانەدی دەدا، هەروا لەگەڵ تواناکانی خودی حزبدا نەدەگونجان، چ جای هەلومەرجی ئەو سەردەمەی عێراقو بارودۆخی دەوڵەتان بەگشتی.

# کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی لەتەموزی ١٩٥٨دا

مشتومڕی سیاسی لەناوحزبدا لەبارەی شۆرشی١٤ی تەموزو لەبارەی سەرکردایەتی قاسمو لەبارەی دەسەلاتەوە زۆر بەفراوانی دەکرا، پرسیار ئەوە بوو ئایا حزبی شیوعی دەتوانێ بەزۆر شێوازی جیاواز خۆی بەسەر ئەم دەسەلاتەدا بسەپێنێ، لەکاتێکدا ئەم حزبە میللییەتێکی فراوانی هەیەو ڕێکخستنی حزبی و نەقابی و جوتیاری و لاوان و ئافرەتان و پیشەیی فراوانی هەیەو هێزو ڕێکخستنی بەهێزیشی لەناو سوپای عێراقدا هەیە، هەروا مشتومڕ لەسەر سروشتی قۆناغی نیشتمانی و هێزە کۆمەلایەتی و سیاسییەکانی و ئامانجە نیشتمانی و دیموکراتی و کۆمەلایەتییەکان دەکراو، حزب لەشیکردنەوەو بەئەنجام گەیشتنیشدا یەکگرتوو نەبوو، مشتومڕەکە بەجۆرێکی ئاراستەکراوو ناوەندی نەبوو لەسەر بنچینەی ئەو تێزو بابەتە سەرەتاییانەی لەسەرکردایەتی حزبەوە هێنرابێتن، بەڵکو لەخۆڕاو سەرپێیی ولیبرالی بوون چونکە بارودۆخەکە پێویستی بەچارەسەرکردنی ئەو مەسەلانەی باسدەکران هەبوو تاوەلامی پرسیارەکانی ئەوکاتە لەبواری هزری و سیاسیدا بدرێتەوە ئەمەش بۆ هێنانەدی یەکێتیی گوتاری سیاسی و یەکێتیی کارکردن.

ئەم بارودۆخە لەناو سەرکردایەتی حزبیشدا هەروابوو لەلایەن هەندێ لەئەندامانی مەکتەبی سیاسی و بەشێوەیەکی ئەلقەیی و بەرەلایی دەرفەتی لێوەرگیرابوو باری سەرنجەکانیشیان دزەیان کردبوو بۆ ناو حزبە نیشتمانییەکان و گەیشتبوونە قاسم، بەشێوەی جۆربەجۆر، کە ئەوانە لەگەڵ سیاسەت و هەڵوێستەکانی (سەلام عادل)ی سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی ناکۆکن و، لەگەڵ سیاسەتی قاسمدا کۆکن، هەرئەمەش بوو قاسمی هاندا هەوڵی کەرتکردنی یەکێتی حزب بدا بەمۆڵەت پێدانی حزبەکەی داودسائغ.

ڕەوتە جۆربەجۆرەکان لە کۆبوونەوەی تەموزی ١٩٥٩دا دەرکەوتن، وێڕای

دیاردەی دەستەبەش لەمەکتەبی سیاسیدا، لەخستنە پێشچاوی سیاسەتێکی ڕاستڕەوی سازشکاری لەگەڵ قاسمداو هەوڵدان بۆ لادانی سەلام عادل لە سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندی، لەکاتێکدا توانییان ڕەخنەلەخۆگرتنی سیاسەتی حزب داسەپێنن بەڵام لەلادانی سەلام عادل دا سەرنەکەوتن‌و لەکۆمیتەی ناوەندیدا زۆربەی دەنگی وەرگرت، وێڕای ئەوەش هەر بەئەندامانی مەکتەبی سیاسی مانەوەو زۆربە بوون‌و، ڕەوتی حزبیش کۆسپی هاتەرێ.

بەپێویستی دەزانم ڕەخنە لەخۆم بگرم چونگە دوای بینینی ڕەفتاری ناحزبییانە لە چالاکی ئەو دەستەبەشانەو سەرکەوتنیان لەداسەپاندنی ڕەخنە لەخۆگرتن لەتەواوی سیاسەت‌و چالاکی حزبداو ڕەوتی سازشکارانەیان لەگەڵ عەبدلکەریم قاسمداو، مانەوەشیان لە مەکتەبی سیاسی زۆر توڕە بووم مەڵچووم‌و دەستکێشانەوەم لە کۆمیتەی ناوەندیی ڕاگەیاند، بەڵام دوای پەیوەندی هاوڕێ سەلام عادل بەمنەوە قەناعەتی پێکردم کە هەڵەم کردووەو پێویستە لەو دەستکێشانەوەیە پاشگەز ببمەوەو ڕەخنە لەخۆم بگرم، زۆر بەخێرایی لە دەستکێشانەوەکەم پاشگەزبوومەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش سزادرام و ئەندامەتیم لە کۆمیتەی ناوەندی بۆ ماوەی دوو مانگ ڕاگیراو ڕاسپێردرام کە بڕۆمە موسڵ بۆ سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ڕێکخراوی موسڵ، ئیتر بۆ ئەوێ سەفەرم کردو لەکارەکەمدا حەمدی ئەیوب‌و فاخیر مێرگەسوری و عەبدوڕەحمان قەساب‌و عجیل زاخۆیی دارتاش(باوکی شەهید ڕێبەر) لەگەڵمدا بوون‌و ئەمانە هاوڕێی چالاک‌و یەکجار باشبوون، حزب زۆربەی کادیرانی موسڵی بۆ شوێنی تر ناردبوون بەهۆی ئەوەی ڕووکرابووە کاری نهێنی و دەسەڵات بەدوایاندا دەگەڕا، لەبەر ئەوە دەبوو سەرلەنوێ لەسەر بنچینەی کاری نهێنی ڕێکخراوەکە ڕێکخەینەوە، ئەمەش دوای خراپبوونی بارودۆخی سیاسی و پەیڕەوکردنەوەی سیاسەتی بەرەبەرەکانی شیوعییەکان، بەڵام بەشێوازێکی تر.

لەگەڵ هاوڕێیان کۆبوومەوەو لەسەر بارودۆخی موسڵ‌و چالاکی ئاشکرای هێزە کۆنەپەرست‌و نەتەوەپەروەرکان ڕاپۆرتێکی چڕوپڕیان پێشکەشکردم‌و، بڕیاردرا بەشێوەیەکی نهێنی‌و لەسەر بنەمای شوێنی (نیشتەجێبوون)و کارو خوێندن،

ڕێکخستن دامەزرێنینــەوەو ڕێکخراوەکـە لاواز بــوو زۆربـەیان کلـدانی و ئاشـوری و کورد بوونو لەبەری خۆرهەلاتی شارەکە بـوون. کاربەسـەر هاوڕێیانـدا ۱۰ابەشـکراو بڕیاردرا سـەردانی زاخـۆو دهـۆکو ئـاکرێ و ئامێـدیش بکـەین بـۆ دامەزراندنـەوەی ڕێکخستن لەسەر شێوازی موسڵ.

لـەرۆژی ۷ی تـشرینی یەکـەمی ۱۹۵۹دا هـەوڵی کوشـتنی عەبدولکـەریم قاسـم لەبەغدا دراو، کۆبوونەوەیەکی تریش لەبارەی بارودۆخی تازەوە کراو، دوای هەوڵی تیرۆر کردنەکە بۆهاوڕێیانم دووپاتکردەوە کە قاسـم ئـەمجارە ڕزگـاری بـوو، بـەلاّم ئەگەر لەسەر سیاسەتی هەوڵدان بۆ دەستخستنی لایەنگیریی کۆنەپەرستی و هێزە ناسیۆنالیـستە ڕاسـتڕەوەکان بـەردەوام بـێ و حـزبو هێـزە دیموکراتییـەکان بچەوسێنێتـەوە، ئەوا لەجارەکانی ئاییندەدا ڕزگاری نابێت، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێمـە ناچارین بـەرگری لـە جەمهوریـەتو دەسـتکەوتەکانی شـۆڕشو بـەرگری لـە حـوکم بکەین بەلاّم پێویستە زەبری جـەماوەری بخەینـە سـەر قاسـم تاپـشت بەجـەماوەر ببەستێ بۆ پاراستنی شۆڕشو گۆڕینی سیاسەتی سازشکاری لەگەڵ کۆنەپەرستی و هێزە ناسیۆنالیسە ڕاستڕەوەکانو، دەبێ هەوڵبدرێ بۆ پێکهێنـانی هاوپـەیمانیی سیاسیی نوێ لەگەڵ هێزە دیموکراسییەکاندا

هەوڵدانی هێزەکانی ئیمپریـالیزم بـۆ هێزەکـانی کۆنەپەرسـتی و ناسیۆنالیـستی ڕاســتڕەو بەتــەنیا ئامــانجی ڕووخانــدنی حکومەتەکــەی قاســمو لــەناوبردنی دەسـتکەوتەکانی شۆڕشـەکەی ١٤ی تـەموز نـەبوو، بـەڵکو هـەروا لـەپێش هـەموو شتێکدا بەئامانجی لێدانی حزبـی شـیوعی و هێـزە دیموکراتخوازەکـان بـوو، بـەلاّم دەمــەوێ پــێش ڕووداوەکــان بکــەومو بڵــێم عەبدولکــەریم قاســم لەبــەر زەبــری کۆنەپەرستی و ناسیۆنالیـستەکاندا پاشەکشەی کـردو پێشبینی ئەوەشـم دەکـرد کـەپاش هــەوڵی کوشـتنەکەی زیـاتر پاشەکـشە بکـات، هــەروا کاتێـك هاوڕێیـان لەخەستەخانە سەردانیان کرد و گوتی کاروباری توند لەدژی ئەو هێزانـە جێبـەجێ دەکات و واو وادەکات من بـاوەڕم پێنـەکرد. بەهــەرحاڵ دەبـوو چـاوەڕوان بکـەین بزانین دوای دەرچوونی لەخەستەخانە چی دەکات.! لەسەر کاروبـاری خۆمـان بـۆ بـەهێزکردنی شـوێنەوارەکانی حزبمـان بـەردەوام بـین ڕێکخراوەکانمـان بـەهێمنی

دامەزرێنین‌و پەیوەندیمان لەگەڵ جەماوەر بەتین بکەین و هەوڵی پێکهێنانی هاوپەیمانییەکی سیاسی لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازو دیموکرسەکاندا پێکبهێنین. ئامۆژگارییەکانی حزبمان بۆ هات دەربارەی نەخشەمان بۆ کاتی ناکاو کارکردنی هێمنانە بۆ بەهێزکردنی ڕێکخراوەکانی نەقابی‌و جوتیاران‌و دیموکراسی‌و ئافرەتان‌و پێشەیی‌و، لەسەر ئەم بنچینەیە بۆ قەزاکانی سەر بەموسڵ سەفەرمانکردو ژماردنێکی ڕێکخراوەکانی حزبمان تێدا کردن‌و چەندان کۆبوونەوەی سیاسی و ڕێکخستنمان بۆ کۆمیتەکانی قەزاکان ڕێکخست‌و پێمان وابوو بەنهێنی و بەبێ هەراو هوریا کاربکەین بۆ چەسپاندنی باروزدۆخی نهێنی ڕێکخستن و بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ (پارتی).

دیاردەی یەکەم کە قاسم لەدژی حزب کردی ئەوە بوو یاسای کۆمەڵەکانی لە ڕۆژی ١٩٦١/١/١دا دەرکردو ڕێگەی گێرانەوەی ژیانی حزبایەتی داو لە٩ی ئەو مانگەدا حزبی ئێمە داوایەکی بۆ مۆڵەتپێدانی پێشکەش کردو، بەپێی ڕێوشوێنی یاسایی داوایەکە بەئیمزای ٨ لەئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی‌و چەند کادیرێکی حزب کەلەنەقابەکانی کرێکاران‌و کۆمەڵەکانی جوتیاران و کۆمەڵە دیموکراتی‌و پیشەییەکاندا کاریان دەکرد، لەگەڵ بەرنامەو پێڕەوی ناوخۆی حزب داوایەکیان پێشکەش کرد، بەلاّم قاسم فەرمانی بەوەزیری ناوخۆ گەیاند کە دان بەداوایەکەی مۆڵەتدانی حزبی شیوعی عێراقدا نەنرێ و، داوای لە داودسایغ کرد داوایەکی دیکە بەناوی (حزبی شیوعی عێراقەوە) واتە هەر بەوناوەوە پێشکەش بکات.

بەهانەکەی وەزیری ناوخۆ ئەوە بوو کە داوایەکی تر بەناوی حزبی شیوعی کراوەو ناشکرێ مۆڵەتی دوو حزب بەیەك ناو بدرێ، بۆیە حزب بڕیاریدا ناوی حزبی شیوعی بگۆڕێ بەناوی (حزبی یەکێتی گەل) وێڕای ئەوەش قاسم سور بوو لەسەر ئەوەی بەم ناوەشەوە مۆڵەت بەحزبی شیوعی عێراق نەدات.

داود سایغ ئامرازێك بوو بەدەستی قاسمەوەو نەیتوانی ناوەکانی دەستەی دامەزرێنەری حزبەکەی پێشکەش بکات بەلاّم قاسم وەزیری ناوخۆی ڕاسپارد کە پێویستە هەرچۆن بێ مۆڵەتی حزبەکەی داود سایغ بدات، قاسم خۆی داوای لە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد (سکرتێری ئەوکاتەی پارتی)کرد کە چەند ئەندامێکی

پارتی بۆ حزبەکەی داود سایغ بنێرێت بەڵام ئەو قایل نەبوو، حزب ویستی سود لەم ڕووکەشە وەربگرێت بۆیە هەندێ لەهاوڕێیانی خۆی نارد بۆ حزبەکەی (سایغ- قاسم)و ناچار بوو ڕۆژنامەکە بداتەدەست ئەو هاوڕێیانە تا کاروباری ئەم حزبە بۆ بەرژەوەندیی حزبی شیوعی عێراق "تەگبیر" بکەنو بەڕێوەی ببەن.

لەئاداری ١٩٦٠دا نامەیەکمان لەهاوڕێ سەلام عادلەوە پێگەیشت لەوێدا بەچاکی ئەو کارو چالاکییەمانی هەڵسەنگاندوە کە بۆ دامەزراندنەوەی ڕێکخستنەکانی حزب لەموسڵ ئەنجاممان دابوو هەروا سڵاو بۆ ئەو هاوڕێیانە دەنێرێت کە لەگەڵمدا بوون، ئەمەش لەسەر ڕۆشنایی ئەو ڕاپۆرتەی کە بۆ سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندیمان ناردبوو، باسی ئەو تەقەلایانە کرابوو کە بۆ بژاردنی ڕێکخراوەکەو گۆڕینی بەرێکخراوێکی نهێنی بەختکردبوون، هەروا ڕاپۆرتەکە جەختی لەسەر ئەوە کردبۆوە کە ئەمە سەرەتای ڕێگەیەو دەستکراوە بەجێبەجێکردنی بەرنامەکەمان بۆ چەسپاندنی ڕێکخراوەکە، دوای ئەوە داوای لە من کردبوو بۆ سەرکردەیی لق بچمە کەرکوك،

بەمجۆرە لەموسڵ دەرچووم بەرەو کەرکوك تا ڕووبەڕووی چالاکیی هێزە شۆڤێنییەکان و کۆنەپەرستە تورانییەکان و عەرەبییەکان ببمەوە کە هێرشی تیرۆرو سیاسیی خۆیان لە دژی بوونی گەلی کورد دەست پێکردبوو کە لافی ئەوەیان لێدەدا گوایە کوردان لە بنەچەی (عەرەبن. !)و لەخێڵ و هۆزەکانی... مەردو سەعساعن... هتد هەروا لەدژی حزبی شیوعی بەپێدالکاندنی ئەو تاوانانەی لەدژی کەسانی تورکمان کرابوونو لەبنەڕەتدا هاوپەیمانیی نۆکەرانی کۆمپانیای نەوت و ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکان و تورکمانە تورانییەکان خۆیان ئەنجامیان دابوو. ئەوە بوو باشترین کادیرانی حزبی شیوعی لە کەرکوك گیرانو حوکمی ئیعدامیان بەسەردا دراو دوای کودەتا ڕەشەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ئیعدام کران، هاوڕێیانی شەهید وەك شێخ مارفو شیخ حسین بەرزنجەیی‌و جەبار پیرۆزخانو مەجید حەسەنو هاوڕێی تورکمانی عەتا جەمیل و فاتیح داود جەباری کە ئەفسەرێکی ئازای خانەنشین بوو.

بارودۆخی کوردستان ئاڵۆز بوو، ناوبانگی جەماوەریی قاسم نزمبۆوەو خەڵکی

کەوتنە باسی بەرپرسیی قاسم لەو هێرشە شۆڤێنییەی لەدژی گەلی کورد بەرپا کراو، جلّەو بۆ هێزە کۆنەپەرستو قەومەچییەکان شۆڕکرا کەگاڵتە بکەن بەچارەنووسی جەمهوریەتو دەستکەوتەکانی شۆرشو چارەنووسی، یەکێتی هەردوو گەلی عەرەبو کوردو خەباتی هاوبەشیان بۆ بنیاتنانی یەکێتی پێشکەوتنخوازانەی دیموکراسی کە گەلی کوردستانمان لەسایەیدا مافە نەتەوەییە رەواکانی پەیرەو بکاتو چارەنووسی خۆی لەسێبەری ئەم یەکێتییەدا هەبێو نەتەوەکانی تریش مافە رۆشنبیریو ئیدارییەکانیان پەیرەو بکەنو، هەموو خەڵك لەسایەی برایی نەتەوەییو لەعێراقێکی پێشکەوتوو گەشاوەدا بژین. لەراستیدا کەلاخستنی قاسمو دوور خستنەوەی لەگەڵ ئامانجی سەرەکی هێزە کۆنەپەرستەکانی هاوپەیمانی هێزە ناسیۆنالیستە راسترەوەکان بوو، بەمەبەستی ئاسانکاری لەتێپەرکردنی نەخشەی پیلانگێریی کودەتاکەیان بۆ تێ‌ەرەواندنی دەستکەوتەکانی شۆرشو گۆرینی عێراق بە تاریکستانێك جگە لەتیرۆرو داپڵۆسین و چەوساندنەوەی نەتەویی شۆڤێنی و هەژاری و برسێتی و خوێن هیچی دیکەی تێدا نەبینرێت.

لەم هەلومەرجە پڕ لەحەماسەتی نەتەوەییەی کوردستاندا بۆ بەرگری کردن لە بوون و مانەوەی قەوارەی نەتەوەیی کوردو لەدژی هێرشی شۆڤێنی عەرەب، هێزەکانی دەرەبەگی کە لەچاکردنی کشتوکاڵ (ئیسلاحی زەراعی) زیانمەند بوون کەوتنە چالاکی بۆ جۆشپێدانی زیاتری هەستی نەتەوایەتی جەماوەری کورد، وەفدێکیان لەئاغاکان و هەندێ لەسەرۆك خێڵەکان پێکهێناو هاتنە بەغدا بۆ دیداری مەلا مستەفا بارزانی کە لەجێگەی نیشتەجێبوونی خۆی پێشوازی لێکردن، وەفدەکە ئامادەیی خۆیان بۆ دەرخستن کە لەدژی حکومەتی قاسم شۆرش بکەن، بەلام بارزانی قایل نەبوو باسی ئەم مەسەلەیە بکرێتو پێی گوتن: ئەگەر کارێکی وابکەن من خۆم بەرگریتان دەکەم. بارزانی دەیویست باسی ئەم دیدارەو قسەکانی بگاتەوە قاسم بۆ ئەوەی بزانێت ئەگەر هێرشی شۆڤێنی درێژە بکێشێت ئەوا گەلی کورد بەرگری لە بوون و قەوارەی نەتەوەیی خۆی دەکات. لەم ماوەیەدا بارزانی سەفەری کرد تا لەلایەکەوە خۆی لەم وەفدانە دووربخاتەوەو لەلایەکی

تریشەوە لە پێکدادان لەگەڵ قاسم دووربکەوێتەوە لەبارودۆخێکی وا ئاڵۆزدا، بەتایبەتی کە ئەم وەفدانە زەبریان دەخستە سەر، وێڕای وەلامدانەوەو هۆشیارکردنەوەیان هەلومەرجەکە یارمەتیدەر بوو کە قاسم بڕیارێکی نادروست لەدژی بارزانی بدات، لەبەر ئەوە ناوچەی پارێزراو بۆ ئەو ناوچەی بارزانە.

# یەکەمین دیدارم لەگەڵ بارزانی مستەفا

نازانم لەکامساڵی سییەکاندا بوو، وابزانم لەتەمەنی چواردە ساڵیدا بووم، هەروا بەسەرپێوە لەخەڵکی باسی یاخی بوونی بارزانییەکانم دەبیست لەوناوەدا ناوی شێخ ئەحمەدی بارزانی و برایە ئازایەکەی مەلا مستەفا بارزانی دەبران، کە ئەوان دەیانەوێ باری گوزەرانیان باشبکرێتو بایەخ بەناوچەکانیان بدرێت بەڵام حکومەت داخوازییەکانیان جێبەجێ ناکات.

لە تاقە شەقامی گشتی هەولێر بووم، چوار لاو بەبەرگی بادینییەوە لەیانەی فەرمانبەران دەرچوون و لاوێکی بەهێزی باڵا ناوەند لەپێشیانەوە دەرۆیشتو خەڵکەکە لەسەر هەردوو شۆستەی شەقامەکەوە بەبایەخەوە تەماشایان دەکردن، لەلاوێکم پرسی کە لەوێدا ڕاوەستابوو: ئەمانە کێن؟ لەوەڵامدا گوتی ئەوە مەلا مستەفای بارزانییە، ئیتر زۆر بەسەرنجێکی وردەوە تەماشامکرد، دوو هەنگاو لەپێشیانەوە دەرۆیشت وام هەستدەکرد کە دەڕواتو قاچ لەسەر زەوی دادەنێ زەوی دەلەرزێتەوەو بەهەنگاوی ڕێکوپێکی لەسەرخۆ دەرۆیشت، (جامەدانییەکی ڕەشی) لەسەرنابوو، کە وەك ئێستا بۆتە نەریت سوور نەبوو، کاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە بە کەسوکارم گوت من ئەمرۆ مەلا مستەفای بارزانیم دیوە باوەڕیان پێنەکردم، پاش ئەوە چۆن بوو ئاوا بۆم گێڕانەوە کە چۆن بەسەر شەقامەکەدا دەرۆیشتو سێ گەنجی بەهێزی لەگەڵدا بوو بەڵام چەکیان هەڵنەگرتبوو.

ئەم دیمەنە لەیادگارمدا مابۆوە، ڕۆژان و ساڵان تێپەڕبوونو بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەم چوومە بەغداو لەوێ بیستم کە بارزانییەکان شۆڕشێکی تازەیان بەرپا کردووە، ئەمەش دوای ڕاکردنی بارزانی کۆچکردو لەسلێمانییەوە بەناو ئێراندا گەڕاوەتەوە بۆ ناوچەی بارزان، لەپۆلیسێکی لاو کە لەجەنگێکدا دژی بارزانییەکان بەشداریی کردبوو پرسیم: شەڕەکان چۆن بوون ئایا هێزێکی گەورە بوون و ئاخۆ بەزیندوویی یان بەکوژراوی کەستان لێدیوون؟ پۆلیسە لاوەکە لە وەڵامدا گوتی:

ئەوانە شەڕکەری ئازان و هەروەك ئاسك بەکێوەکاندا سەردەکەون لەکاتێکدا ئێمە چەند هەنگاوێك دەڕۆین و ئارەق دەڕێژین و هەناسە بڕکێمان پێدەکەوێ و ماندوو دەبین، ئەوان لەسەر لوتکەی شاخەکان و قەدپاڵەکان سەنگەر دەگرن و حەزناکەن بێنەخوارەوە بۆ دۆڵو پێدەشتەکان مەگەر کاتێك سەرکەوتن بەدەست بهێنن و ژێرکەوتوان ڕاوبنێن، لەپشت گاشە بەردەکانەوە شەڕ دەکەن‌و لەپاڵیاندا سەنگەر دەگرن و نایانبینی تا لەناکاوێکدا نازانین لەکوێوە گوللەت بۆدێت، لەکاتێکدا ئێمە بەدەرەوەوەین، ڕاکشیّ، هەستە،.. ئابەمجۆرە ئەو پۆلیسە دۆستە کە لەگۆڕەپانی شەڕەوە لەگەڵ بارزانییەکاندا هاتبوو ئاوای بۆ باس دەکردم. زۆر بەو گێڕانەوەو باسە سەرسام بووم کە ئەو دۆستە بۆی گێڕامەوە، بەتایبەتی ئەوان زۆر بەدەگمەن نەبێ زیان نادەن و، تەنیا لەریزەکانی هێزەکانی حکومەتدا زیان دەکەوێت.

جارێکی تریش هەواڵی بارزانییەکان بڕا، تاساڵی١٩٤٣ کە دیسان شۆرش بەرپاکراو تا ساڵی١٩٤٥درێژەی خایاند. هێزەکانی بارزانی پەنایان بردە بەر کوردستانی ئێران کە لەو کاتەدا سوپای شۆرەوی بەپێی ڕێکەوتنی شورەوی و ئێران هاتبووە ئەوێ، لەوێش کۆماری دیموکراسی کورد لەپاڵ کۆماری دیموکراسی ئازەربایجانی ئێراندا دامەزرا، چەندە دڵشادیمان گەورە بوو بە پێکهێنانی ئەم کۆمارە کوردییەو پەنابردنی هێزەکانی بارزانییەکان بۆ ئەوێ و بەشدارییان لەگەڵ براکانیاندا لەچەسپاندنی قەوارەی ئەم کۆمارە کوردییە ساوایە لەکوردستانی ئێراندا، ژمارەیەکیش لەهاوڕێیانمان ئەندامانی حزبی شیوعی عێراق لقی کوردستان گەیشتنە ئەوێ بۆ خزمەتی ڕۆڵەکانی گەلی کوردیان، بەتایبەتی لەبەڕێوەبردن‌و فێرکردندا، بەڵام کۆنەپەرستی لەڕژێمی شاهەنشاهی دیکتاتۆری‌و ئیستیعماری ئینگلیزی‌و ئەمریکی، زەبریان دەخستە سەر یەکێتی شۆرەوی بۆ کشانەوەی هێزەکانی سوپای سور لە ئێران تابتوانن هێرشێکی سەپایی بە هۆی فرۆکەو تانکەکانی ئەمریکاوە بەرنە سەر ئەو دوو کۆمارە نەتەوەییە دیموکراسییەی کوردو ئازەربایجانی کە ئۆتۆنۆمییان لە ئێراندا لەساڵی ١٩٤٦دا هەبوو، دوای ڕووخانی کۆماری مەهابادیش ئیتر شوێنێکی وانەما ئاسایشی تێدا بێت و داڵدەی

بارزانییەکان بدات، یان دەبوو لەئێران لەبەر ڕەحمەتی شادا بمێننەوەو یان دووریان دەخەنەوە بۆ شوێنێکی دوورە دەست لەئێرانداو ئەوکاتە چارەنووسیان نادیاردەبێ یان گەڕانەوەیان بۆ عێراق بەبێ شەرتو مەرج تا لەوێش خۆیان بدەنەوە بەدەست حکومەتی کۆنەپەرستی و نۆکەری عێراقەوە تا دادگایی بکرێن و سەرکردەکانیان لەناوببرێنو ئەوانی تریش ڕەوانەی قولآیی بەندیخانەکان بکەن و خێزانەکانیشیان بەبێ کەسێکی بەخێوکار لەتاراوگە بمێننەوەو ئەوەبوو خێزانەکانیان و هەندێ لەپیاوەکان گەڕانەوەو لەپێشەوەیاندا شێخ ئەحمەدی بارزانی و چوار ئەفسەرەکە مستەفا خۆشناوو محەمەد قودسی و عیزەت عەبدولعەزیز و خەیروڵا عەبدولکەریم، کە حوکمدران و ئیعدام کران، بارزانیش ڕووی کردە یەکێتی شۆرەویو لەناوەندی برسیەتیو شەڕو ڕاوەدوونانی هێزەکانی ئێرانو عێراقو تەنانەت تورکیاشداو، لەبەردەم هەڵوێستی نادۆستانەی (باقروف)ی سکرتێری ئەوکاتەی حزبی شیوعی ئازەربایجاندا کە بەتاوانی خیانەتی گەورە لەگەڵ (بیریا)ی جاسوس، کە ئەوکاتە وەزیری ناوخۆی شۆرەوی بوو حوکمی ئیعدامکردنی بەسەردا درا، دەڵێن ئەو هەڵوێستە نادۆستانەیەی بەرامبەر بارزانیو بارزانییەکان گرتبیەبەر. ئەوە بوو دوای تێپەڕبوونی سیانزە ساڵ بەسەر پەنابەریی[٤] بارزانیدا لە یەکێتی شۆرەوی، کەشۆڕشەکەی ١٤ی تەموز بەرپاکرا، قاسم فەرمانیدا بارزانیو بارزانییەکان بگەڕێنەوە بۆ عێراق کەلەمانگە دە، واتە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٨دا گەڕانەوەو لەلایەن جەماوەری گەل بەعەرەبو کوردو نەتەوەکانی ترەوە پێشوازیی وەك قارەمانیان لێکردن. من شتێك لەسەر ئەوە زیاد ناکەم کە کاك مەسعود نووسیویەتیو باسی شێوازی پێشوازیی بارزانیی کۆچکردو دەکات لەو کاتەدا کە بۆ عێراق گەڕاوەتەوەو لە کتێبەکەیدا بەناوی (بارزانی و بزافی ڕزگاریخوازیی کورد (لەبەشی) کوردو شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨) کە هیوادارم ئەم باسە لەو کتێبەدا تەماشا بکەن. جاوێڕای ئەو پێشوازییەی بارزانی و هاوڕێیانی گەڕاوەی کە لەباسکردن نایەت، ئەم پێشوازییە

---

(٤) دەکاتە کەمتر لە ١٢ساڵ -وەرگێر-

هەروا بووە خۆشی و شادی خەڵك لەشەقام و گۆڕەپانەکانی بەغدادا، کە ئەوەبوو وەفـدەکانی پارێزگـەکان هـەر لـەفاو تـا لـەزاخۆ، دەهاتنـە بەغـدا بـۆ پیرۆزبـایی بەخێرهاتنـەوەی بـارزانی بـۆ عێراقـی شـۆڕش و چەسـپاندنی برایـەتی تێکۆشـانی عـەرەب و کـورد بـۆ بنیاتنـانی عێراقێکـی دیموکراسـی کـە گـەلی کوردمـان مافـە نەتەوەییەکانی پەیڕەو بکـات تـا گەیشتنە هێنانـەدی مـافی چـارنووس و کۆتـایی هێنانی سیاسەتی شۆڤێنی کە ئەو دەستە فەرمانڕەوایانەی کۆنەپەرست و تۆکـەر بەرامبەر گەلی کوردمـان پـەیڕەویان کـردووە. تـا بـەمجۆرە جـەماوەر دیواداری و ئاواتی خۆی بەهۆی ئەو وەفدانەوە دەردەبڕی کـە بـۆ سـەردانی بـارزانی دەهـاتن. کاتێکیش گەیشتنە کـەرکوك لـەوێ بەدیـداری بـارزانی شـاد بـووم تـا بـەناوی لقـی کوردستانی حزبـی شـیوعی عێراقـەوە پیرۆزبـایی و بەخێرهاتنـەوەی بکـەم و لـەم دیدارە کورتەدا نەمتوانی باسی هیچ شتێکی لەگەڵدا بکەم.

# یاخی بوونەکەی شێخ ڕەشیدی لۆلان

لەئایاری ساڵی ١٩٥٩دا هەواڵەکان گەیشتن کە شێخ ڕەشیدی لۆلان (شێخی برادۆستییەکان) یاخی بووەو، ئەم یاخی بوونەشی بەدەستگیر کردنی لەناکاوی تیپی بەرگری میللی لەناوچەی (سیدەکان) دەست پێکردووە، ئەم ناوچەیە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی ڕەواندوز و دیانە، گوتراش کە دەستی گرتووە بەسەر بەرزایی سەری بەردی دا لەنێوان دیانەو سیدەکاندا، ئیتر تیپەکانی هێزی بەرگری میللی لە هەولێرو ڕەواندوز دەستبەجێ بەرێکەوتن بۆ لەناوبردنی ئەم یاخی بوونەو بەردانی برا گیراوەکانیان لەبەرگری میللی کە لەسیدەکان دەستگیر کرابون، ئەمەش بەسەرکردەیی وسو سەبزەچی و بەبەشداری فاخیری حەمەد ئاغای مێرگەسوری‌و بەسەرپەرشتی هاوڕێ عەزیز محەمەد، هەروا زانیاری گەیشت کە هێزێکی بارزانییەکان بەسەرکردەیی بارزانی کۆچکردوو بەرەو ناوچەی یاخیبوونەکە کەوتنە ڕێ، لەسەرەتاوە باوەڕمان نەدەکرد بارزانی خۆی سەرکردەیی هێزێك بکات بۆ لەناوبردنی ئەم (یاخیبوونە) کە لەئاستی بەشداری بارزانییەکان ولەئاستی بەشداریی سەرکردەکەیاندا بۆ ڕیشەکێشکردنی نەبوو، بەڵام دەرکەوت مەسەکە ڕاستە، هەندێ هەواڵی سەلبیمان پێگەیشت لەبارەی پەیوەندیی بارزانی لەگەڵ بەرگری میللی و بەتایبەتی لەگەڵ فاخیر حەمەد ئاغای مێرگەسووری، ئەو پێی وابوو کە نابێ هیچ هێزێك دەست بخاتە ناوچەکەوەو نابێ هیچ سەرۆکایەتییەکی سوپایی تر پێشبڕکێی بارزانییەکان بکات، نەشماندەزانی کە عەبدولکەریم قاسم نەك کەسێکی تر ئەم ئەرکەی پێ سپاردووە، لەبەر ئەمە هەردوو حزبی پارتی و شیوعی عێراق بڕیاریاندا بەخێرایی مەسەلەکە چارەسەر بکەن، بۆیە بڕیاردرا، وەفدێکی هاوبەش بۆ دیداری بارزانی ڕێکخەن‌و وەفدەکە لە شەهیدی تێکۆشەر کاکی کاکان (عومەر دەبابە) و لەخۆم (کەریم ئەحمەد) پێکهاتبوو. بەڵام هەردوکمان پێمان وابوو ئەرکەکە گرانە، بەتایبەتی کاك عومەر

کە میزاجی بارزانی دەزانیو شارەزای بوو کە ئەگەر قەناعەتی بەشتێك هێنا ئیتر هەرچی بێت دەستبەرداری نابێت بەڵام چارچییە دەبیٚ بڕیارەکە جێبەجیٚ بکرێت.

لە کەرکوکەوە بۆ دیانە کەوتینەڕیٚ و ئێوارە گەیشتینەجیٚو شەو لەویٚ ماینەوەو پرسیاری شوێنی بارزانیمان کرد گوتیان ئەوەتا لە لۆلانە لەماڵی شێخ ڕەشید، شێخ لەلۆلان ڕایکردبوو لەسنور تێپەڕی کردبوو بۆ ئێران چونکە بیستبووی کە بارزانی سەرکردەیی جوڵانەوەی لەناوبردنی یاخیبوونەکەی کردبوو بۆیە دەستبەجیٚ لەگەڵ خێڵەکەی (برادۆست) پەنایان بردبووە ئێرانو ناوچەکەی بەتاڵ لەخەڵك جێهێشتبوو. لەوکاتەشدا هەندیٚ پێکدادان لەگەڵ چەند دەستەیەکیان و بەرگریی میللیدا ڕووی دابوو بەڵام ئەمە بۆ پاراستنی پاشەکشەیان بووە بۆ ئێران.

بۆ بەیانی ڕۆژی دووەمی گەیشتنمانە دیانە دوو(ئێستر)ی بەهێزیان بۆ هێناینوو کەوتینەڕیٚ بۆ ئێوارە گەیشتینە (سیدەکان) کە دانیشتوانی (برا دۆستییەکان)ی تێدا نەمابوون جگە لەبەرگری میللی، هاوڕیٚ عەزیز محەمەد لەپێش گەیشتنی ئێمەدا لەویٚ بوو. شەو لە (سیدەکان) ماینەوەو کاتێك تاریك بوو هەندیٚ تەقە کراو دوایی بووبەتەقەی لابەلا بەگشت لایەکداو تەنانەت بەئاسماندا، هۆکاری ئەم تەقەکردنەش تێنەگەیشتم تەنیا ئەوە نەبیٚ سەرنجم دا هەندیٚ کەسانی بەرگریی میللی بەشدارییان لەو تەقەکردنە لابەلایەدا کردو تەقەیان بەئاسماندا دەکرد بەبیٚ هیچ نیشانەیەك، دەشیٚ هەموو ئەمە بۆ دەرخستنی هێز یان هەردوو هێزەکەبوو کە لەناوچەکەدا بوونو بۆ هەمان ئەرك بەبیٚ کارڕێکخستن یان دیاریکردنی کاتێك.

بەیانی زوو سواری ئێستر بووینو بەرەو(لۆلان)ی پایتەختی شێخ ڕەشید کە بارزانی لەویٚ بوو کەوتینەڕیٚ. پێش نیوەڕۆ گەیشتینەجیٚو یەکەوڕاست چووینە دیداری بارزانی، شێخ سادق و هەردوو کوڕەکەی خۆی لوقمانو عوبەیدوڵای لەلابوون، لەمزگەوتەکە دانیشتبوو، چووینە ژوورەوە بۆلای، دەستەیەکی گچکەی چەکدارانی لەژوورەوە لەلای بوون،دوای تەوقەکردنو بەخێرهاتن لەدەوری دانیشتن، لەبارەی ئەرکەکەمانەوە لێیپرسین، کە بۆچی هاتووین بۆ ئێرە، بۆم ڕوونکردنەوە کە ئێمە یەکەم بۆ سەردانت هاتووینو دووەم بۆ سەرکەوتن بەسەر

یاخیبووەکـانی دوژمنـانی شۆڕشـی١٤ی تـەموزداو، بیـستوشمانە کـە سـاردییەك لەنێوان ئێوەو بەرگریی میللیدا هەیەو بەتایبەتی هێزێك هەیە هاتووە بۆ بەشداریی لەژێر سەرکردایەتی ئێوەدا لە لەناوبردنی یاخیبوونەکەدا دەشمانەوێ هۆکاری ئـەو ساردییەتان بزانین. دەستبەجێ لێیپرسین: لەپێش شۆڕشی تەموزدا ئێـوە لـەکوێ بـوون؟ گـوتم: لەگۆڕەپانـەکانی ئیعـدام و لەبەندیخانـەکانی عێـراق و زیندانـەکانی ئەشکەنجەو لەتاراوگەو سەندنەوەی جنسیە لێمان، بەڵام گۆڕەپانـەکانی ڕاپـەڕینی میللـیو مانگرتنـــەکانی کرائیکـارنو ڕاپەڕینـــەکانی جوتیارنمـان بەجێنەهێـشت، لەڕیزەکانی پێشەوەدا بـووینو قوربـانی زۆرمـان بـەختکردو بـەدوای دەنگوباسـی ئێـوەدا دەچـووینو بـۆ پـشتیوانی و پـشتگیریتان لـەدژی ئیـستیعمارو حکومەتـە کۆنەپەرستە نۆکەرەکان خەباتمان دەکرد.بارزانی زۆر بەئاگاوە گوێی بۆ ڕاگرتبووم و هیچ لەوەی گوتم بێزار نەبوو، دوای ئەوەی قسەکانم تەواو کـرد کـەمێك بێـدەنگ بوو، چاوەڕوانی وەڵامیم دەکرد، پاشان گوتی: ئێمـە هـەمووومان قـەرزداربارین بـۆ شۆڕشـەکەی ١٤ی تـەموزو سـەرکردەکانیان کـە عێراقیـان گەیانـدە ئـەوەی گـەلی عێـراق ئـازاد بێـت، بۆیـە پێویـستە بـەرگری لێ بکـەین. منـیش گـوتم: ئەگـەر ڕاپەڕینـــەکانی گـــەلی عێـــراق نەبوونایـــەو ئەگـــەر شۆڕشـــەکانی گـــەلی کـــورد بەسەرکردایەتی ئێوە نەبونایە ١٤ی تـەموزیش نـەدەبوو. دوای ئـەوە چـووینە نـاو بابەتەکـەوە، سـاردبوونی پەیوەندییەکـەی لەگەڵمانـدا، گـوتی: بۆچـی بـەرگریی نیشتمانیتان بۆ ئێرە نارد، وەڵامم دایەوە: نەماندەزانی ئێـوە لـەدژی یاخیبوەکـان دێن بۆ ئێرە، ئەگەر بمزانیبایە ئێوە ئەم ئەرکە جێبەجێ دەکەن ئەوا ئەم هێزەمان نەدەنارد، یـاخود داوامـان لـە ئێـوە دەکـرد کـە ئـەم هێـزە لـەژێر سـەرکردایەتیو فەرمانی ئێوەدا دەبێت. گوتی: نەو ئێوە ئەم هێزەتان لـەدژی مـنو عەبدولکـەریم قاسـم نـاردووە. بـەمجۆرە مـشتومڕ لەنێوانمانـدا بـەردەوام بـوو زۆر دڵگـران بـوو لـەوەی هەنـدێ لـە کەسـانی بـارزانی لەناومانـدا بـوون، چـونکە داوای لێکـردین بیاندەینەوە بەدەست ئەوەوە، بەدرێژایی ئەو کاتـە(عومـەر دەبابـە) بێـدەنگ بـوو بەشداریی قـسەو باسـی نـەدەکرد، لەکۆتاییـداو پـێش ئـەوەی ماڵئـاوایی لێبکـەین گوتم: ئێمە بە هاوپەیمانیمان لەگەڵ قاسمو لەگـەڵ ئێـوەدا بەهاوپـەیمانی هـەردوو

حزبــی شــیوعی عێــراق‌و پــارتی‌و هێــزە دیموکراســییەکان دەتــوانین کۆمارەکــە بپارێزین‌و دیموکراسی‌و مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بێنینەدی.

گەڕاینەوە بۆ کـەرکوك و راپـۆرتێکم لەسـەر ئـەو ئەرکـەی بـۆ جێبـەجێ کردنـی ڕۆیشتووین پێشکەش کردو جەختم لەسەر دوو مەسەلە کردەوە:

١. دەبوو مەسەلەکە بۆ بارزانی بەجێبهێڵین چونکە وادەرکەوت کە بارزانی لەلایەن عەبدولکەریم قاسمەوە ئەو ئەرکەی پێ سپێردراوە.

٢. دوور کەوتنەوە لە بەشداریی کۆمەڵەکەی(فاخیر) لەم هێزەدا چونکە بە تووڕەکردنی بارزانی دادەنرێت.

هـەروا بـارزانیش بـۆ بەغـدا گەڕایـەوە، بـەڵام وادەرکـەوت کـە شـێخ ئەحمـەدی بارزانی ئەوەی بیستووە کە لە نێوان حزبی شیوعی و بارزانی مستەفادا بارئـاڵۆزی ڕوویداوە. بۆیە نێردراوێکی نارد کە حزبی شیوعی ئاگادار بکات کە شـێخ ئەحمـەد دێـت‌و دەبێتـە میـوانی حزبـی شـیوعی عێـراق لـەم هاتنەیـدا بـۆ بەغـدا بـۆ داوای لێبوردن‌و نەهێشتنی ناکۆکی لەنێوان مـەلا مستەفاو حزبـی شـیوعیدا، داوایەکـەی شیخ ئەحمەد بۆحزبی شیوعی گرانبوو، چونکە چۆن شێخ ئەحمەد دەبێتە میوانی حزبی شیوعی لەکاتێکدا مستەفا بارزانی ماڵی لەبەغدایە، ئاخۆ ئەمە دەبێتە چاری ناکۆکی یان ئاڵۆز کردنی زیاتری پەیوەندی بارزانی و حزبی شـیوعی. لەبـەر ئـەوە ئێمـە وابـەباش دەزانـین کـە لـەلای مـەلا مـستەفا بمێنێتـەوە چـونکە ئەمـە زیـاتر یارمەتیدەر دەبێ بۆچاری ناکۆکییەکان و باشکردنی پەیوەندی لەنێوانمانـدا. ئـیتر شێخ ئەحمەد ئـەم پێشنیازەی حزبـی شـیوعی پەسـەند کـردو هاتـە بەغـداو لای بـارزانی مابـەوە. ئـەوجا حـزب وەفـدێکی دووکەسـی لـە جـەمال حەیـدەری ومـن پێکهێناو کاتێکی دیاریکراومان دانا کە بـچینە دیـداری شـێخ ئەحمـەدی بـارزانی و چووینە خانووەکەی نوری سەعید کـە کرابـووە بارەگـای بـارزانی، شـێخ ئەحمـەد بەگەرمی و برایانە پێشوازیی لێکـردین وبـارزانی لـە دەرگـای ئـەو سـاڵۆنەی شـێخ ئەحمــەدی بــارزانی تێیــدا دادەنیــشت و پێــشوازیی میوانــەکانی تێـدا دەکــرد ڕاوەستابوو، چاکەت‌و پانتۆڵێکی لەبەردابوو جامەدانییـەکی لەسـەریەوە پێچابوو،

داوای دانیشتنی لێکردین‌و هەروا داواشی لەمەلا مستەفا کرد کە دانیشێت، پاش سلاوو هەواڵپرسینی شێخ ئەحمەد پرسی ناکۆکی ئێوەو مەلا مستەفا چییە، جەمال حەیدەری قسەی کردو هەندێ مەسەلەی باسکرد کە لەشێوازی باسکردنیدا سەرکەوتوو نەبوو، وێڕای ئەوەی ئەو کاتە پەیوەندیی جەمال حەیدەری و بارزانی ئاسایی نەبوو، هەندێ مەسەلەی بە توندی‌و توڕەیی باسدەکرد. ئینجا شێخ ئەحمەد لەمنی پرسی: چی دەڵێی لەسەر ئەوەی جەمال حەیدەری باسی کرد؟ وەلامی پرسیارەکەیم نەدایەوەو گوتم: ئێمە نەماندەزانی مەلا مستەفا هێرشی لەدژی یاخیبوونەکەی شێخ ڕەشیدی لۆلان سەرکردایەتی دەکات ئەگەر ئەوەمان زانیبایە ئەو هێزەمان دەخستە ژێر سەرکردایەتی ئەو ئەگەر پێویستی بوایە، ئەوەشی بارزانی سکالای لێ دەکات ئێمە ئامادەین چارەسەری بکەین هیچ شتێکی ئالۆزی وانییە چارەسەر کردنی گران بێ‌و بەڵکو هەموو مەسەلەکان ئاسانن.

شێخ ئەحمەد لەبەر بەتەنگەوە هاتنی پەیوەندیی هاوکاری نێوان حزبی شیوعی‌و بارزانی و بزاڤی ڕزگاریخوازیی کورد نەبوایە ئەو هەموو ڕێگەیەی نەدەبڕی. بارزانی لەقسەکانی من خۆشحاڵ بوو، بەلام سەرنجمدا لەقسەکانی جەمال حەیدەری خۆشحاڵ نەبوو. لەڕێگەی گەڕانەوەماندا بۆ بارەگای حزب بەهاوڕێ جەمال حەیدەریم گوت باسکردنی مەسەلەکان لەگەڵ نموونەی ئەمجۆرە ڕابەرانەدا لەجێگای خۆی نەبوو، هەندێ شتی ورووژاندبوو. کاتێك گەیشتینە بارەگا هاوڕێ سەلام عادل چاوەڕوانی دەکردین. هاوڕێ جەمال ڕاپۆرتێکی لەسەر دیدارەکە پێشکەش کردو بەدەستپاکی هەرچی ئەو گوتبووی و هەرچی من گوتبووم خستیە ڕوو، ئەویش قسەکانی هاوڕێ جەمالی پشتگیریی نەکردو لایەنگیری ئەوە بوو کە من گوتبووم. بەمجۆرە وەفدەکە لەچاری ناکۆکییە سادەکانی نێوان حزب و بارزانیدا سەرکەوتنی دەست نەهێناو وەفدەکە ئاسانکاری بۆ ئەرکەکەی شێخ ئەحمەدی بارزانی نەکرد کە لەپێناویدا هاتبوو. دوای ئەوە بیستم کە هاوڕێ سەلام عادل‌و هاوڕێیانی دیکەی سەرکردایەتی چووبوونە سەردانی شێخ ئەحمەدی بارزانی‌و باروودۆخەکەی نێوان حزب‌و بارزانی هێدی بۆوەو بەلام ئەو مەسەلانە چارەسەرنەکران کە ئەو دەیویست.

# پەرەسەندنی سیاسەتی حزب لە مەسەلەی کورد

بۆ تێگەیشتنی مەسەلەی کورد، بەشێوەیەکی مەبدەئی و ڕاستو دروست دەبێ ئەو بنچینانە بزانرێت کە بۆ دیاریکردنی هەڵوێستی سیاسی بەمەبەستی چارەسەرکردنی دەبێ پشتیان پێ ببەسترێت.

١-لەبارەی مێژووییەوە ئەم گەلە هەزاران ساڵە لەسەر خاکی خۆی دەژی کە کوردستانە، کوردستانیش دەکەوێتە ناوچەی ناکۆکیی نێوان ئیمپراتۆرییە کۆنەکانی ئاشوریو ئەرمەنیو یۆنانیو ئێرانیو عوسمانیو، دواجار نێوان بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتە سەرمایەدارە ئیستیعمارییەکان.

٢-کوردستان کەوتۆتە بەر بەش بەش و دابەشکردن لەنێوان ئەم ئیمپراتۆرییانەدا، دواجار لەپاش شەڕی یەکەمی جیهان و لەکاتی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی بازاڕەکان ئەو بەشەی کوردستان کە لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو خرایە سەر سێ دەوڵەتی (تورکیا، عێراق، سوریا)، بەڵام بەشەکەی ڕۆژهەلاتی هەروا لەژێر دەسەلاتی فارسدا مایەوە، واتە کوردستان دابەشکراو بەچوار دەوڵەتی ئەم ناوچەیەوە نوسێندرا.

٣-لەئەنجامی کێشەی نێودەوڵەتیی نێوان ئیمپراتۆرییە کۆنەکانو ئیمپراتۆرییە تازە ئیستیعمارییەکاندا کوردستان نەیتوانی یەکبگرێتەوەو نەیتوانی قەوارەیەکی سیاسی نەتەوەیی یەکگرتوو(دەوڵەتی یەکگرتووی کوردستان) پێکبهێنێت، جا بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ناوخۆی چەند قەوارەی میرنشینی خێڵەکی و دەرەبەگی پێکهێنان کە وابەستەی دەوڵەتە ناوەندییە ئیستیعمار کراوەکان بوون ئەمەش لەسەروبەندی ئیمپراتۆرییە دەرەبەگە زۆردارەکاندا.

٤-لەسەردەمی ئیمپریالیزمدا کە هەرێمەکانی کوردستان خرابوونە سەر دەوڵەتانی ژێر دەسەلات و نفوزی ئیمپریالیزم، گەلی کورد لە گشت هەرێمەکانیدا لەسادەترین مافی نەتەوەیی بێبەشکراو سیاسەتی شۆڤێنیو داپڵۆسینی سوپایی

ڕاپەرین‌و شۆڕشەکانی کە داوای مافە نەتەوەییەکانیان دەکرد لەدژی پەیڕەوکران.

٥-ئەم پێوەلکاندنە بووە هۆی ئەوەی لەهەر هەرێمێکدا خاسیەتی سیاسی پێکبێت‌و سەرکردایەتی‌و ڕێکخستنی نەتەوەیی سیاسیی هەرێمەکە پەیدابن کەبەرپرس‌و سەربەخۆبن لەنەخشەکێشانی سیاسەتەکەیانداو لەسەرکردایەتی بزاڤی نیشتمانی شۆڕشگێڕیی کوردستان لەهەر هەرێمێکداو دیاریکردنی تاکتیك و ستراتیژیی بزاڤەکە لەهەر یەکێك لەو هەرێمانەدا.

٦-لەکاتێکدا گەلی کورد لەهەر هەرێمێکدا لەپێناو دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی فەرمانڕەوای هەرێمەکەدا، وەك ئۆتۆنۆمی‌و فیدراڵی‌و کۆنفیدراڵی لەناو ئەو دەوڵەتەی بەشێکی کوردستانی پێوە لکێندراوە خەبات دەکات هەرلەو کاتەشدا ئەوە لەبیرناکات کە هێنانەدی ئەم ئامانجە نەتەوەی کورد نزیك دەکاتەوە لەیەکخستنی هەموو بەشەکانی کوردستان لەقەوارەیەکی سیاسی یەکگرتوودا ئەگەر هەلومەرجی ناوخۆی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان و بارودۆخی نێودەوڵەتی گونجاوبن بۆ هێنانەدی کۆمارێکی کوردستانی پێشکەوتنخوازی دیموکراسی یەکگرتوو، دیارە ئەمەش مەسەلەیەکی ستراتیژیی دوورە چونکە چاری مەسەلەی نەتەوەیی یەکێکە لە ئاڵۆزترینی ئەو مەسەلانەی ڕووبەڕووی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی کوردستانی دابەشکراو بوونەتەوە، بەتایبەتی لە هەلومەرجی باڵادەستی ئیمپریالیزمدا وەك ڕژێمێکی ئابوری و سیاسی و سوپایی بەسەر دنیادا.

پێموایە ئەو جۆرە لێکۆڵینەوەیەی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستانی ئەوکاتە لای سەرکردایەتی حزب نەبوو کە پەیماننامەی نیشتمانی لە کۆنفرانسی یەکەمی حزب لەساڵی١٩٤٤دا بڕیاردراو ئەو پەیماننامەیە لەمادەی دەیەمینیدا ئەمەی دووپات کردۆتەوە:

(ئێمە خەبات دەکەین لە پێناو هێنانەدی یەکسانییەکی ڕاستەقینە لە مافەکاندا بۆ کەمە نەتەوەیی کورد لەگەڵ سەرپەرشتی مافەکانی کۆمەڵە نەتەوەیی‌و ڕەگەزییە گچکەکانی وەك تورکمان‌و ئێزدییەکان).

ئەم داشننە گشتییە بواری بۆ نەتەوەپەروەرە کوردەکان ڕەخساند کە لەدژی

قسە بکەن چونکە مەسەلەی کورد لە گۆشـەی ژمـارەی کـوردان و ڕێـژەیان لەچـاو نەتەوەی دەسەڵاتداردا تەماشا نـاکرێن بـەڵکو پێویـستە لـەبارێکی واوە تـەماشـای بکرێت کە نەتەوەیەکەو مافی بڕیاردانی چارەنووسـی هەیـە، هـەروا دەبـێ سـەرنج بدرێ کە لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەم گەلە وربینانە نییـەو ئێزدییـەکان لەنەتـەوەی کوردن‌و کەمایەتی نەتەوەیی نین، بەڵکو یەکێکن لە کۆمەڵە ئاینییـەکان لەعێراقـدا شانبەشـانی ئیـسلام‌و کریـستیان‌و سـابئەو کاکەییـەکان، سـەرکردایەتی حـزب سەرنجی ئەم ناتەواوییەیداو، دەستپێشخەریی کرد بۆ چارسەرکردنی بەشێوەیەکی زۆر وردبیـنتر لـەو داڕشـتنەی لەپەیماننامـەی نیـشتمانیدا هـاتبوو، لەکاتێکدا کـە پێشتر حزب هەڵوێستێکی مەبدەئی لەمەسەلەی کورد لەساڵی ١٩٣٥دا گرتبووەبەر ئەوە بوو دروشمی مافی چارەنووسی لە ڕۆژنامەی (كفاح الشعب)دا بـەرزکردبۆوەو ڕۆژنامەی ناوەندی حزب (القاعده) ساڵی ١٩٤٥ وتارێکی بڵاوکردبۆوە داوای لەگەلی کورد کردبوو کە هەوڵبدات بۆ دامەزرانـدنی حزبێکـی دیموکراسـی نەتەوەپـەروەری جەماوەری بـۆ سـەرکردایەتی کردنـی گـەلی کـورد بەگشت چـین و توێژدکانییـەوە لەخەباتـدا لـە پێنـاو هێنانـەدی (..یـەکێتی ئارەزوومەندانـە یـان جیابوونـەوە لەهەرکاتێکدا عێراق لەکۆتی ئیستیعمار ڕزگاری بـوو یـان لەهەلومەرجێکـدا کـە بـۆ گەلی کورد گونجاو بێت‌و لەبەرژەوەندیی جەماوەرە زەحمەتکێشەکەی بێت).

بـەمجۆرە دەبیـنین حـزب هەسـتی کردبـوو کـە ئەوداڕشـتنەی پەیماننامـەی نیشتمانیی حزب داڕشتنێك نەبوو کە مافی بڕیاردانی چارەنووس دەربـبڕێت لەبـەر ئەوە بەو شێوەیەی چارەسەرکرد کە لەسەرەوە دیتان.

حـزب لەگـەڵ پەرەسـەندنی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازیی کوردسـتاندا چـاودێری دەکردو بەردەوام لە پەرپێدانیدا بەشدار بوو، لەبەرنامەکەیدا سـاڵی ١٩٥٢جـەختی لەسەر مافی چارەنووس کردەوە، هەروا لەڕاپۆرتەکەی کۆمیتەی ناوەندیدا (بەرەی تێکۆشان لەدژی ئیستیعمارو شەڕ)کۆنفرانـسی دووەمـی حـزبیش بـەوردی‌و ڕوونـی هەڵوێستی لەمەسـەلەی کـورد داڕشـت‌و دانپێـدانانی مـافی چارەنووسـی یـەکتری‌و ڕەوایەتی خواستی هەردوو گەلی عەرەب‌و کورد لەرزگاریی و یەکبوونی نەتەوەییـدا ناساند، وێڕای هەستکردن بەو ڕاستییە کـە ئیـستیعمار کۆسـپی ڕێگـەی گەیـشتنی

عـــەرەب و کــوردە بەئامانجـــە نەتەوەییـــەکانو هەرئەمەشـــە بنـــچینەی پتـــەوی دامەزراندنر پـەرەپێدانی برایەتی عـەرەب و کـورد لەتێکۆشـانی هاوبەشـدا لـەدژی ئیستیعمار.

حزبـی شـیوعی عێـراق خـەبات لـەپێناو چـارەی مەسـەلەی کـورد بەیـەکێك لـە گرنگترین ئەرکـە نیـشتمانی و نێونەتەوەییـەکانی خـۆی دادەنـێ و ئـەم مەسـەلەیە بەشێکی گەورەو گرنگی لە سیاسەتەکەیدا داگیرکردووەو، یەکەمین حزبیشە ئەگەر نـەڵێم تاقـە حزبـە کـە مەسـەلەی کـوردی لەسـەر بنەمایـەکی مەبدەئی و جـێگیر پەسەند کردووە وەك گەلێك مافی بڕیاردانی چارەنووسـی خـۆی هەیـە، بەدەسـتی خۆی و، بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی و یـەکێتی نەتـەوەیی و نیـشتمانی.
حزب هەر بەهێندەی بەس نەکرد کە ستراتیژیی ئەم گەلە دیاری بکات بەڵکو هەروا تاکتیکەکانیـشی باسـکرد، واتـە چارەسـەرەکانی ئێـستا لـەم هەلومەرجـەدا کـە دەتوانرێ بهێنرێنەدی و لەهێنانەدیی خواستە نیـشتمانی و نەتەوەییـە دوورەکـانی نزیك دەکاتەوە.

ئـــەو ئەزموونـــە دووروودرێـــژەی نەتـــەوەی کـــوردی تێـــدادەژی وای بەســـەردا سـەپاندووە کـە ڕەوتـی تێکۆشـانەکەی بـەپێی ئـەم بارودۆخـە بێـت، گـەلی کـورد لەعێراقدا سـەرکردایەتییەکی سیاسـیی سـەربەخۆی لـە سـەرکردایەتییەکانی گـەلی کـورد لـە تورکیـاو ئێـران و سـوریە لادروسـت بـووە. مەسـەلەی کـوردیش لـەناو قـەوارەی دەوڵـەتی عێراقـدا چارەسـەر دەکرێـت، هـەرواش لـە هەرێمـەکانیتر.
چارەسەرکردنی مەسەلەکە بەستراوە بەخەباتەوە لەپێناو سەربەخۆیی نیشتمانیو ڕژێمی دیموکراسیدا، چـونکە نـاکرێ مافـە نەتەوەییـەکان لەسـێبەری حکومـەت و ڕژێمە کۆنەپەرستە دیکتاتۆرە شۆڤێنییەکاندا بهێنرێنەدی، هەروا کاتێك مەسـەلەی هێنانەدی مافە نەتەوەییەکان دەهێنرێنە پێشەوە، مەسەلەی دیموکراسیش دێتـە پێشەوە، چونکە ڕژێمە دیموکراسییەکان زامنن بۆ هێنانـەدی مافـە نەتەوەییـەکان لە دەوڵەتێکی فرە نەتەوەدا. لەبەر ئەوە دەبێ جەخت لەسـەر خـەباتی هاوبەشـی نێـوان نەتـەوەی فـەرمانڕەواو نێـوان نەتـەوە ژێردەسـتەکان بکرێتـەوە لـە پێنـاو دیموکراسـیو مافـە نەتەوەییـەکانی نەتـەوە(یـان نەتـەوەکانی) ژێردەستە. ئـیتر

لەمافە نەتەوەییەکانەوە بۆ ئۆتۆنۆمیو ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینەو بۆ فیدراڵی، بەپێی پەرەسەندنی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستانی، حزب ئەم مافانەی دەهێنایە پێشو دەستپێشخەری دەرکرد بۆ بڵاوکردنەوەیانو داوای هێنانەدییان، کە لەجەنگە سیاسییە چەکدارەکاندا بەشداربن و لەپێناوی هێنانەدییاندا قوربانی بەخت بکەن.

مافی بڕیاردانی چارەنووس مانای دامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆیە بەڵام هەروا مانای دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتووە، بەپێی خواستی نەتەوەی ژێردەستە، کاتێك دەبینێ جیابوونەوە لەنەتەوەی گەروە لەبەرژەوەندی خۆی نییە، لەکاتێکدا ئەو نەتەوە گەورەیە بەچاوێکی یەکسانی لەمافەکاندا دەڕوانێتە نەتەوەی گچکەو توانای ئابوری و ڕۆشنبیری هەیە بیداتە ئەم نەتەوەیەو ئاستی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ڕاپەڕێنێت، دامەزراندنی کۆمارێکی یەکگرتووی بەئارەزووی نێوان عەرەب و کورد، واتە هێنانەدی یەکێتییەکی فیدراڵی لەجێگەی خۆیدایەو لەبەرژەوەندی عەرەب و کورد ونەتەوەکانی ترە، کە عێراقی یەکگرتووی دیموکراتییان لێ پێکهێناوە.

# هەڵوێست لە شۆڕشەکەی ئەیلولی ١٩٦١

لەمەوبەر ئەو بابەتەمان باسکرد کە هێزە ناسیۆنالیستە شۆڤێنییەکان جموجوڵیان دەست پێکردو کەوتنە ورووژاندن لەدژی بوونی گەلی کوردمان و قەوارە نەتەوەییەکەی، هەروا دەسیسەو پیلانی ئیستیعماری سازکرا بۆ هەڵگیرساندنی بارئالۆزی لەنێوان هەردوو نەتەوەی عەرەب و کورداو بۆ تێپەڕکردنی نەخشەی پیلانگێڕییان بۆ ڕووخاندنی حکومەتی قاسملەناوبردنی دەستکەوتەکانی شۆڕشەکەی ١٤ی تەموز. بەمجۆرە کەوتنە جولاندنی کەسانی دەرەبەگ کە لەچاکردنی کشتوکاڵ زیانیان لێکەوت و پشتگیرییان لە ئێرانی (شا)وە پێدەگەیشت و زۆر وەفدیشیان نارد بۆ پاڵپێوەنانی مستەفا بارزانی بە ناو ئەم نەخشەیە بەڵام خەموو جارێك بەرپەرچی دەدانەوەو دواجار نەیویست چاوی پێیان بکەوێت، ڕۆیشت بۆ بارزان تا لەزەبری ئەوانەو هەروا ڕەنگە بۆ ئەوەی لەهەڵەشەیی قاسم دوور بکەوێتەوە.

حزب بەیاننامەیەکی دەرکردو لەوێدا حکومەتی هۆشیار کردەوە لەپەرەسەندنی چالاکی هێزە ناسیۆنالیستو کۆنەپەرستەکان و چالاکی نۆکەرانی ئیستیعمار بۆ گرژکردنی بارودۆخەکەو باری ئاسایش لەولاتداو ورووژاندنی دەمارگیریی شۆڤێنی لەنێوان عەرەب و کورداو بۆ پاڵپێوەنانی کاروبار بەرەو پێکدادانی چەکداریی نێوان حکومەت و هێزەکانی دەرەبەگی و کۆنەپەرستی لەکوردستاندا بۆ تێپەڕاندنی نەخشەی پیلانگێڕیی لەدژی حکومەتی قاسمو دەستکەوتەکانی شۆڕش بەڵام حکومەتی قاسم لەجیاتی بەدەنگەوە هاتنی بانگەوازە نیشتمانییە دڵسۆزییەکانی حزبی شیوعی عێراق دەستی دایە توندوتیژی بەرامبەر هێزە دیموکراسییەکانو بواریشی دەدا بەچالاکی نەتەوەیی شۆڤێنی و، ڕاوەدونانی هێزە نەتەوەپەروەرەکانی کورد، کۆمیتەی لقی حزبی شیوعی بەیاننامەیەکی دەرکردو مەترسی بارودۆخەکەی دەرخست کە حکومەتی قاسم لەجیاتی ئەوەی هاوپەیمانی

و هاوکاری لەگەڵ هێزە دیموکراتییەکانو هێزە کوردییەکاندا بکات بۆ ڕێگەگرتن لەئاڵۆزبوونی بارودۆخەکەو، دانانی ڕادەیەك بۆ کارو کردەوەی ووروژێنەرانەی شۆڤێنی عەرەبی، لەجیاتی ئەوە خۆیشی بزانێ یان نەزانێ، ئاسانکاری زۆری کردووە بۆ تێپەڕبوونی نەخشەی پیلانگێڕی نەك تەنیا لەدژی شۆڕشەکەی١٤ی تەموزو بەس بەڵکو بۆ لەگۆڕنانی ئەو شۆڕشەوەو دەستکەوتە نیشتمانیو پێشکەوتنخوازەکانی. لەم ماوەیەدا هەندێ زانیاریمان بۆدەهات لەسەر جموجوڵی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا لەئێران و بەشداریی هەواڵگری ئێرانو ئاغاکان کە پاش دەرکردنی یاسای چاکردنی کشتوکاڵ پەنایان بردە بەر ئێران، بۆ ئەنجامدانی یاخیبوونی چەکداریی لەناوچەکانی پشدەرو سلێمانیو لەهەرکوێیەك کە بتوانن.

بەڵام بارزانیو سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لایەنگری هیچ بزووتنەوەیەکی چەکدارییان لە دژی حکومەتی قاسم نەکرد، لە١١ی ئەیلولی١٩٦١دا هێزی ئاغاکان لە دەربەندی بازیان کەمینێکیان دانایەوە بۆ هێزێکی سوپاکە لە کەرکوکەوە بۆ سلێمانی دەچوونو، هێزە سوپاییەکەی حکومەت زیانێکی گەورەی لێکەوت، ئیتر قاسم فەرمانیدا بەهێزی هەوایی کە فڕۆکە بنێرێت بۆ بۆردومانکردنی یاخیبوەکانو، ئەوەبوو فڕۆکەکانی عێراق بۆمبۆردومانی یاخیبوەکانیان کردو هێزەکانیان پەرشو بڵاوکردنەوە، حکومەتی قاسم بەمەندە بەسی نەکردو فڕۆکەکان کەوتنە بۆمبۆردومان کردنی گوندەکانی بارزان کە لەناوچەی یاخیبوەکانەوە دوور بوون.

لەسەرەتادا مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان مام جەلال تاڵەبانی نارد بۆ ئاگادار بوونی ئەم یاخیبوونەو پاشان کاك عومەر دەبابەی نارد بۆ هەمان مەبەست، چونکە ئاگایان لەبەرپابوونی ئەم یاخیبوونە نەبوو،حزبی شیوعی عێراق سەرلەنوێ داوایکرد خۆ لەم بارودۆخە لادەن و دیداری بارزانی بکەن بۆدانانی ڕادیەك بۆ ئەم چالاکییە گومانلێکراوانە، ئەوە بوو قاسم (عەقید حەسەن عەبود)ی نارد بۆ دیداری بارزانی و، بۆ ئەم دیدارەش شوێنێك لەناوچەکە دیاریکرا، بەڵام بارزانی پێش ئەوەی وەفدەکە بگات جێگای دیدارەکەی گۆڕی و وەفدەکەشیان بردە جێگایەك کە ئەو دیاریی کردبوو، هەرکە وەفدەکە گەیشتە دیداری بارزانی

فرۆکەیـەك بـەدیار کـەوت و ئـەو شـوێنەی بۆمبۆردومـان کـرد کـە حکومـەت بـۆی دیـاریکردبوو، بـارزانی بەعەقیـد حەسـەن عـەبودی گـوت حکومـەت تـۆی نـارد بـۆ ئەوەی تۆش و منیش لەناوبەرێت، بەڵام بۆ ئـەوەی نەکەوینـە داوەکـەوە مـن ئـەم شوێنەم دیاریکرد کە لێرە بەیەکتر بگەین.

لەم کاتەدا محەمەد حسێن ئـەبولعیس گەیـشتە کـەرکوك وەك سەرپەرشـتیارێك لەسەر بارودۆخی کوردستان، ئەوکاتە من بەرپرسی یەکەم بووم لەکۆمیتەی لـق و، هاوڕێ (أبوالعیس) خەریك بوو بەو زوانە ژن بهێنێت، هەر بۆگاڵتـە دەیگـوت: (ئـەم مەنگورییەم لە کوێوە بۆ هات ئالەم کاتەدا)، دیارە مەبەستی عەلی حەسەن ئاغـای مەنگوری بوو. نزیکەی پێنج ڕۆژێك لـە کـەرکوك مایـەوە، وای هەسـت دەکـرد کـە بزووتنەوەکـە کۆتـایی هـات، بەتایبـەتی دوای لێدانـە هەواییەکـەو پەرشـوبلاو بوونـەوەی هێزەکـانی یـاخیبوو. بـەڵام مـن بەپێـچەوانەی ئـەوەوە وامـدەبینی بزووتنەوەکـە پەرەدەسـێنێ ئەگـەر حکومـەت مەسـەلەکە بەڕێگەیـەکی ئاشـتی چارەسەرنەکات و ئەگەر بـەکردەوە برابەشـیی نێـوان عـەرەب و کـورد بەرجەستە نەکات لە دیداری نێوان حکومەت و بارزانیدا بە بەشداریی حزبی شـیوعی و پـارتی دیموکراسی کوردستان کە حکومەت داوای لێبوردن لە بارزانییـەکان بکـات لـەوەی دێهاتی بێوەیی بارزانییەکانی بۆمبۆردومان کردو، بەندو گیراوەکانیش ئازاد بکات.

ڕاپۆرتێکم بەدرێژی لەسەر ئەم مەسەلەیە نووسیو حکومەتی قاسمو سیاسـەتە ڕاستڕەوەکەیم تاوانبارکردو دووپـاتم کـردەوە کـە پێویـستە لەگـەڵ بـارزانی دیـدار بکرێـت، چـونکە بزووتنەوەکـە ئەگـەر بـارزانی تێیـدا بجولێـت پەرەدەسـێنێ و ڕەوتێکی نەتەوەیی دەگرێتەبەرو درێژە دەکێشێو جکومەت ناتوانێ بەزەبری هێـز بەسـەریدا زاڵ بێـت، چـونکە هێـز بـەکارهێنان دەبێتـە هـۆی ڕاکێشانی فـراوانترین کۆمەڵانی خەڵکی کورد بۆ ناو گۆڕەپانی خەباتی نەتەوەیی. ئەمەش وەك حزبێکی شـیوعی وامـان لێدەکاتـە پێویـست کـە هەڵوێـستمان پـشتگیری کردنـی بێـت و هەڵوێستی حکومەت تاوانبار بکەین.

هـاوڕێ أبـوالعیس گەڕایـەوەو تۆژینـەوەو بەئـەنجام گەیـشتنی خـۆی و هـەروا ڕاپۆرتەکەی منیش کە بۆ مەکتەبی سیاسی حزبم نووسیبوو لەگەڵ خۆی بردەوەو،

لەم کاتەدا هەندێ زانیاریمان پێگەیشت کەوا بارزانی شۆڕشی چەکداریی لەبەرمبەر دەسەلأت وسیاسەتەکەیدا کە دژ بەگەلی کوردە ڕاگەیاندووە، منیش سەر لەنوێ دەستم بە نووسینەوەی ڕاپۆرتێکی نوێ کرد، نووسیم کە بارودۆخی کوردستان زۆر جیاوازە لە چەند ڕۆژێك لەمەوبەرو ئێمە ئێستا ڕووبەڕووی شۆرشێکی نەتەوەیی ڕزگاریخوازیی دەبینەوەو لەبەرمبەردا بەرەوڕووی سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەیی لەلایەن حکومەتەکەی قاسمەوە دەبینەوە، بۆیە پێویستە لەگەلّ گەلی کورد ڕاوەستین لەخەباتیدا کە بەرگری لەقەوارەی نەتەوەیی خۆی دەکات دژی سیاسەتو ڕەوتە شۆڤێنییەکان ، لەکاتێکدا داوای چاری ئاشتی و دیموکراسی مەسەلەکە دەکەین سیاسەتی داپلۆسین وچاری سوپایی ئیدانە دەکەین و هەلّوێستی پشتگیریی ولایەنگیریی شۆرشەکەی کورد دەگرینەبەر.

ئالەو ڕۆژنەدا کۆششی حکومەت بۆ دیداری بارزانی سەرنەکەوت، دوای ئەوەی پیلانی تیرۆرکردنی بارزانی و نێردراوی حکومەت عەقید حەسەن عەبود ئاشکرابوو، دەرکەوت کە دیدارەکە بۆ ڕێکەوتن و چاری ناکۆکییەکان نەبوو، بەلّکو دیداری غەدرو تاوانکاری بووە، ئیتر بارودۆخەکە زۆرتر ئالۆز بوو، زیان لەبرایەتی خەباتگێرانەی هاوبەشی عەرەب و کورد لەپێناو دیموکراسی و هێنانەدی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد درا، لە ڕاپۆرتەکەمدا باسی ئەم مەسەلەیەشم کردبوو.

پاش چەند ڕۆژێك لەگەیشتنی ڕاپۆرتەکە بە مەکتەبی سیاسی حزب بۆ بەغدا بانگ کرامو، پێمگوترا کە لەم کاتەدا بۆ کوردستان نەگەڕێمەوە، ئەوکاتە هاوڕێ زەکی خەیری بەرپرسی مەکتەبی سیاسی بوو چونکە هاوڕێ سەلام عادل لە مۆسکۆبوو، ئیتر هاوڕێ عەزیز محەمەدی ڕاسپارد کە سەرکردەیی کۆمیتەی لقی حزب لە کوردستان بکاتو هاوڕێ (ئەبو فاروق) عومەر عەلی شێخ نێردرا ببێتە ئەندامی کۆمیتەی لقو مەکتەبەکەی، ڕاپۆرتەکەشم کە بۆ مەکتەبی سیاسیم ناردبوو لەگەلّ پێشنیازەکانم بۆ چاری بارودۆخەکەو دیاریکردنی هەلّوێستی حزب لەشۆرشی کورد، نێردرا بۆ مۆسکۆ بۆ هاوڕێ سەلام عادل کە پشتگیری ناوەرۆکی ڕاپۆرتەکەی کرد، هەرخۆشی لەو بارەیەوە ئاگاداری کردم، مەکتەبی سیاسی ئامادەکاریی کرد بۆ کۆبوونەوەیەکی تایبەتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ لێکۆلّینەوەی

بارودۆخەکەو دیاریکردنی هەڵوێست لە شۆڕشەکەی کوردو لە سیاسەتەکەی حکومەت، بەبێ ئامادەبوونی هاوڕێ سەلام عادل، لەم کۆبوونەوەیەدا هاوڕێ عەزیز محەمەد لەئامادە بوون بواردرا.

لەم کۆبوونەوەیەدا ڕاپۆرتێکم لەسەر بارودۆخی کوردستان پێشکەش کردو سەرلەنوێ ئەوەم دوپات کردەوە کە پێشان باسم کردبوو کە لەسەر حزب پێویستە لایەنگیری شۆڕشی کورد بکات و هاوپەیمانی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش ببەستێ لە دژی ڕژێم و داواشم کرد بزووتنەوەی جەماوەر چالاك بکرێ بۆ کۆکردنەوەی ئیمزاو ناردنی وەفد و سازدانی خۆپیشاندان بۆ پشتگیریی شۆڕشی کوردو مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد و لەدژی سیاسەتی حکومەت و چاری سوپایی‌و، پێویستی پەیوەندیکردن بە حزبی نیشتمانی دیموکراسی و پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ هێنانەدی هاوپەیمانییەکی نیشتمانی لەدژی حکومەتی قاسم. بەرپەرچدانەوەی هاوڕێ زەکی خەیری بۆ ڕاپۆرتەکە بە تووڕەبوونێکی توندەوە بە دوو ڕەوتدا بوو:

١. لەبارەی ئاسایشەوە، ئەگەر هێزەکانی حکومەت پەلاماریان هێنایەسەرمان و ئەم ڕاپۆرتەیان دیتەوە دەڵێن حزبی شیوعی لە دژی حکومەت پیلاندەگێڕێ

٢. ئەمە چوونە پاڵێکی نەتەوەیی کوردە.

گوتم: لەبارەی ئاسایشەوە هەرئێستا ڕاپۆرتەکە لەناو دەبەم ، بەڵام لەبارەی نەتەوەییەوە هیچ چوونەپاڵێکی تێدانییە بەڵکو بەرگرییە لە نەتەوەیەکی چەوساوە کە سیاسەتێکی شۆڤێنی لەدژ پەیڕەودەکرێ، شتێکی تریشی لەسەر زیاد دەکەم ئەویش ئەمەیە ئەو شیوعییەی بەرگری لە گەلەکەی ناکات کە لەسەر هەقیشە، ئەوا ئەو کەسە شیوعی نییە. بەمجۆرە هەستام و ڕاپۆرتەکەم لەناوبرد بۆ "قایل بوون" بە بواری ئاسایش. !

ئینجا کۆبوونەوەکە بڕیاریدا بزاڤی جەماوەری چالاك بکرێ و دەیان هەزار ئیمزا کۆبکرێنەوە بۆ داوای کۆتایی هێنانی شەڕو ڕاکێشانەوەی سوپا بۆ شوێنەکانی

خۆیانو دەستکردن بە گفتوگۆو چاری ئاشتییانەی مەسەلەی کورد، وەفدەکان بەو ئیمزایانەوە ڕوویان کردە بەغداو، خۆپیشاندان لەبەغداو شارەکانی تر دەستپێکران و هێزەکانی عێراق دەیان کەسیان لە وەفدەکان و لەخۆپیشاندەران دەستگیر کردو لە بەندیخانەو گرتووخانەکاندا مانەوە تا کودەتا ڕەشەکەی شوبات بەرپاکراو ئەوانەیان ئیعدام کرد کە داوای چاری ئاشتی مەسەلەی کوردیان دەکرد یان داوای یەکێتی تێکۆشانی هەردوو گەلی عەرەب و کوردیان لەدژی ئیستیعمارو لە پێناوی پێشکەوتن و دیموکراسیو مافە نەتەوەییە ڕەواکانی گەلی کوردا دەکرد.

هاوڕێ سەلام عادل لەبەهاری ١٩٦٢دا، لەوکاتەدا کەلەمۆسکۆ بوو، نامەیەکی بۆ سەرکردەکانی حزبە شیوعی و کرێکارییەکانی دنیاو بۆ دەوڵەتانی سۆسیالیستی نارد، داوای لێکردن پشتگیریی مەسەلەی کورد بکەن و لەدژی ئەو شەڕە بووەستن کە عەبدولکەریم قاسم بەرانبەری گەلی کورد ڕایگەیاندووەو داوا بکەن دەستبەجێ شەڕەکە ڕاگیرێ و پەنا ببرێتە بەر ڕێوشوێنی ئاشتییانە بۆ هێنانەدی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد.

کۆمیتەی ناوەندی، جگە لەبڕیارەکان لەبارەی مەسەلەی کوردەوەو چالاك کردنی بزاڤی جەماوەری بۆ ڕاگرتنی شەڕەکە لەدژی گەلی کورد، چەند بڕیارێکی تریشیدا لەبارەی بزووتنەوەی هۆشیاری لەئاست جموجوڵی کۆنەپەرستی وناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکان لەپیلانگێڕاندا دژی حکومەت و دەستکەوتەکانی شۆڕشو، لەبارەی خەباتی نهێنییەوەو دەرکردنی ڕۆژنامەی ناوەندی حزب (طريق الشعب) بەشێوەیەکی نهێنی، دوای ئەوەی حکومەتی قاسم بڕیارێکی دەرکرد کە دەرچوونی (اتحاد الشعب) بەشێوەی یاسایی قەدەغە بکرێت، هەروا حکومەت دەرچوونی ڕۆژنامەی (ئازادی) کوردی بەشێوەی ئاشکرا قەدەغەکرد، پێشنیازم بۆ کۆبوونەوەکە ئەوە بوو ناوی (ئازادی) بگۆڕدرێ بە(ڕێگای کوردستان) بەتەواوی دەنگ ئەم ناوە تازەیە بۆ ڕۆژنامەکەی لقی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق پەسەند کرا.

دوای کۆبوونەوەکەی کۆمیتەی ناوەندی گەڕامەوە بۆ کوردستان تا توانای خۆم بخەمە پاڵ توانای هاوڕێیانی سەرکردایەتی لقی کوردستان، هاوڕێ عەزیز

محەمـەدو عومـەر عـەلی شـێخ و ئـەوانی تـر. دوای ئـەو وەفدانـەی دەیـان هـەزار ئیمزایان گەیاندە حکومەت بۆ ڕاگرتنـی شـەڕ بۆ سـەر کوردسـتان و داوای چـاری ئاشـتییانەی مەسـەلەی کـوردو دەرچـوونی خۆیـشاندانەکان لەبەغـدا و شـارەکانی کوردستان‌و شارەکانی دیکەی عێراق‌و، داواکـردن لـە سـەلام عـادل کـە نەبریخاتـە سـەر حکومـەتی قاسـم بـۆ ڕاگـرتن و کۆتـایی هێنـانی کوشـتار لـە کوردسـتان و، خۆڕاگری شۆڕشی کورد لە ڕووی هێرشە سوپاییەکانی حکومەتدا، حکومەتی قاسم کوشتاری ڕاگرت بەڵام هێزە چەکدارەکانی لە کوردستان نەکێشایەوە.

هەڵوێـستەکە بەتـەواوی گـۆڕینی بەسـەردا هـات، لەکاتێکـدا گـەلی کـورد هاوپەیمانێکی بەهێزی حکومەتی قاسـم بـوو، چاوەڕوان بـوو(برابەشـیی عـەرەب‌و کـورد لـەم نیـشتمانەدا) بـەکردەوە پـەیڕەو بکـرێ، بـووە هێـزی بەرهەڵـستکار (ئۆپۆزیسیۆن)و بووە نەیاری دەسەڵات‌و، هەردەبوو داواکانی شۆڕشی کـوردو ئـەو برابەشییە بەکردەوە پەیڕەو بکرێن، بـەڵام تـا ئەوکاتـە نەلایـەنێکی عێراقـی‌و یـان کوردی داخوازیی سەرەکی شۆڕشەکەی کوردیان ڕوون نەکردەوە.

# دەستپێشخەری حزبی شیوعی
# بۆ پێشکەوتنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی کوردستان

حزبی شیوعی کەوتە خوێندنەوەی ئەو بارودۆخەی هاتبووە کایەوەو هەرچی پێویست بوو ئامادەی دەکرد بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردە نوێیەکانو دەستپێشخەری بۆ دیاری کردنی هەڵوێستی حزب لە پەیڕەوکردنی مافە نەتەوەییەکان، پاش ئەوەی سەرکردایەتی شۆڕشەکە کەوتە دەست بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان و هێزەکانی دەرەبەگی لەشوێنەواری کارکردنە سەر ڕووداوەکان کشانەوە.

لەساڵی١٩٦٢دا مەکتەبی سیاسی داوای کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی کرد کە تایبەتی بێت بۆ لێکۆڵینەوەی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی بۆ هەرێمی کوردستان، پاش ئەوەی کاتێك هاوڕێ سەلام عادل ئەم پرۆژەیەی لەسەرەتای ساڵی١٩٦١دا پێشکەشکرد هەڵوێستێکی سەلبی لەبەرامبەردا گیرایەبەر. پێش کۆبوونەوەکەو بۆ خۆئامادەکردن بۆ مشتومڕو گفتوگۆ پرۆژەکە بەسەر ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیدا دابەشکرا، من لەئامادەبوونی کۆبوونەوەکە بواردرام، بە وردی لەپرۆژەکەم کۆڵییەوەو هەروا لەپەرەسەندنی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی کوردستان، لەبارەی مەبدەئییەوە هیچ سەرنجێکی جیدیم نەبوو بەڵام لەباری سیاسی و پەرەسەندنی بزاڤەکەوە پرۆژەیەکی دیکەم خستە پێش دەمی کۆبوونەوەکە، کە ئەویش پرۆژەی ڕژێمی فیدراڵی بوو لەدەوڵەتێکی فرە نەتەوەدا، وەك عێراق، بەتایبەتی کە گەلی کورد دەبێ مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی هەبێتو، حوکمی زاتی ئەم مافە دەرنابڕێ. حوکمی زاتی، واتە ئۆتۆنۆمی خواستو ئاواتی قەومیەتی گچکە دەردەبڕێ کە مافی چارەنووسیان پەیڕەو نەکەن، ئەو کەمایەتییانەی لەسەر خاکی کوردستانو سنوری هاوبەشیان لەگەڵ دەوڵەتێکی بیانی نییەو درێژبوونەوەی نەتەوەییان لە دەرەوەی سنورەکەیان کە نووساوە

بەشـوێنی بوونیانــەوە نییــە. مەسـەلەی نەتـەوەیی کـورد جیـاوازە لەمەسـەلەی کەمەنەتـەوەکان، گـەلی کـورد نیـشتمانێکی هەیـە پێـی دەگـوترێ کوردسـتان و پانتاییەکـەی دەگاتـە ٥٥٠٠٠٠ پێـنج سـەدو پـەنجا هـەزار کیلۆمـەتر چوارگۆشـە، هـــەزاران ســـاڵەو تەنانـــەت لـــەپێش لـــەدایکبوونی عیـــساوە لەســـەری دەژی و، بارودخێکی کۆن وتازەی نێودەوڵەتی و بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ناوخۆ بوونـە ڕێگـر لـەپێش یەکگرتنیـداو لـەوەدا کـە قـەوارەی سیاسـی یـەکگرتووی نەیەتـەدی. لەسـەدەی بیـستەم و پەرەسـەندنی بزافـی ڕزگـاریخوازیی نیـشتمانی کوردستانیدا دەیکاتە ئەرك لەسەرمان وەك حزبێکی شیوعی کە بۆ ئـەم نەتەوەیـە بڕیاری مافی چارەنووس بدەین، لە هەلومەرجی ئێستاشدا فیدراڵیزم خواسـتەکانی نەتەوەیی گەلی کورد لەعێراقدا دەردەبڕێ.. هەروا پێشنیازم کرد لقەکەی حزب لـە کوردستان ببێتە حزبـی شـیوعی کوردسـتانی، کـە پەیوەندییەکـەی لەگـەڵ حزبـی شیوعی عێراقدا پەیوەندییەکی فیدراڵی بێت، ئەمەش دەربڕینێك دەبێ بۆ دروشمە سیاسییەکە. وادیارە هەردوو پێشنیازەکە پـەردەپۆش کران. بـەڵام بەڵگەنامـەی (سیاســـەتمان وڕێگامـــان بـــۆ چـــاری مەســـەلەی کـــورد لەعێراقـــدا بەچەشـــنێکی دیموکراسی ڕەوایانە) جەختی کردەوە لەسەر مافی بڕیاردانی چارەنووس بۆ گـەلی کـــوردو هێنانـــەدی دەوڵـــەتی نیـــشتمانی و(ئۆتۆنـــۆمی بـــەپێی یەکێتییـــەکی ئارەزوومەندانـەی تێکۆشـەرانەو برایانـە کارێکـە بەسـتراوە بەهەلومەرجەکەیـەوەو بەرژەوەندیی هەردوو گەلی عەرەب و کورد دەیکاتە پێویست و بەشـێوەیەکی ڕوون بەرژەوەندی گەلی کورد خۆی و ئەمەش بەم مانایە چارەسەرێکی کۆتایی نییـە بـۆ مەسـەلەی نەتـەوەیی کـوردو، ناشـکرێ جێگـەی مـافی بڕیـاردانی چارەنووسـی نەتەوەی کورد بگرێتەوە). شۆرشی کوردیش ئـەم پرۆژەیـەی ئۆتۆنـۆمی پەسـەند کـرد کـە حزبـی شـیوعی عێـراق بـۆ چـاری مەسـەلەی کـورد لـەو کاتەداواتـە لەساڵی١٩٦٢دا پێشنیازی کردبوو، هەروا شۆڕشەکەی ئەیلول شـێوازی تێکۆشـانی لـەپێناو هێنانـەدی ئـەم دروشمەداپەسـەند کرد،لـە کاتێکـدا چـەکی لـە ڕووی دەسەڵاتی فەرمانڕەوادا بەرزکردەوە داوای چاری ئاشـتییانەی مەسـەلەی کوردی کرد لەبەر ئەوەی ئەو دروشمەی شۆڕشی کورد بـەرزی کـردەوە بـووە ئەمـە(داوای

دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دەکەین) بەشێوازی ئاشتییانەو لەڕێگەی دیالۆگ و گفتوگۆکردنەوە.

لەو باوەڕەدام کە ئەگەر حزبی شیوعی ئەم مەسەلەیەی ئەوکاتە چارەسەر بکردایە کە هاوڕێ سەلام عادل لەساڵی١٩٦١دا پێشنیازێکی خستە پێش مەکتەبی سیاسی کە ئۆتۆنۆمی بۆ چاری مەسەلەی کورد پەسەند بکرێ، ئەوە زۆر باشترو ئیجابی تر بوو لە پرۆژەکەی ئۆتۆنۆمی کە کۆمیتەی ناوەندی لە ساڵی ١٩٦٢دا پەسەندی کرد.

# دەورگێڕانی دەستەبەشە چوارقۆڵییەکە لە پەرەپێدانی سیاسەتی حزبدا

نامەویّ بەدرێژی بچمە ناو باسی چالاکی دەستەبەشـە چـوارقۆڵییە تێکدەرەکـە چونکە هاوڕێ (أم ایمان) سەمینە ناجی یوسف هاوسـەری هـاوڕێی شـەهید سـەلام عادل ئەم بابەتەی لە بەشی دووەمی کتێبەکەیدا(ڕەوشی تێکۆشەرێك) بەدرێژیی و بەپشت بەسـتن بـە بەڵگەنامـەی حزبـی وەك کۆنووسـەکانی کۆمیتـەی ناوەنـدی و مەکتەبی سیاسـی و سـکرتاریەتی حـزب و دانپێـدانانی هەنـدێك لەوانـەی ئامـادەی کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی بوون بۆ لێپرسینەوەیان و نووسینەکانی ئەنـدامانی دیکەی کۆمیتەی ناوەنـدی و، خوێنـەرانی بـەڕێزیش لـەهاوڕێ و دۆسـتانی حـزب و بایەخداران بە مێژووی هاوچەرخی عێراق و دەورگێڕانی حزبی شیوعی لە خەباتیـدا دژی ئیستیعمارو کۆنەپەرستیی فـەرمانڕەوا، بـانگ دەکـەم بـۆ خوێندنـەوەی ئـەم کتێبە. بەڵام لێرەدا دەمـەویّ ئـەوە دەربخـەم کـە هـاوڕێی شـەهید سـەلام عـادلم ئاگادار کردەوە، پێش ئەوەی ئـەو هاوڕێیانـە بهێنرێنـە کۆمیتـەی ناوەنـدی، دوای دەرچوونیان لە بەندیخانە کە پەلەنەکەین لە هێنانیان بۆ کۆمیتەی ناوەندی پـێش ئەوەی هەریەکـەیان ئـەرکی ڕێکخسـتن و هـزری و ڕاگەیانـدن یـان پەیوەندییـەکان بگرنـە ئەسـتۆو ڕزگاریـان بێـت لـەبارودۆخی تەنگەبـەری بەندیخانـەو ناکۆکییـە خۆییەکانیو سەرنجدانی هاوڕێیان لە گۆشەنیگایەکی دوورە پەرێزەوەو، چاودێریی کردەوەی ڕۆژانەی هاوڕێیان، چۆن دەخۆن و چۆن لەبـەر دەکـەن ودەنـوون وچـی دەخوێننەوە.. چەند گروپ (تیپ) پێکدەهێنن کـە بێبـاك هـەموو شتێك و هـەموو کەسـێك دەدەنەبــەر..ئەمانــە هـــەموویان عــادەتی بەندیخانــەن و لای، زۆربــەی بەندییـەکان پەیـدا دەبـن، ئێمـە لەگـەڵیان ژیاینو دەزانـین ئـەم عادەتانـە چـەند کاریگـەریی لەسـەر هەریـەکێکیان هەیـەو، لەیادیـشمە چـۆن سـەلام عـادلم هـەروا ئاگادارکردەوە لـەوەی چـۆن ئـەو دەستەبەشـانەی بەندیخانـە پێکهـاتن و کەوتنـە زۆرانبازی شەخسی و پاشان بووە زۆرانبازیی (مەبدەئی)و دەستیان کردە نووسین

و تاوانبارکردنی ئەم وئەو بەوەو بەوەو ئەوکاتە سەرکردایەتی حزبیان ڕاکێشا لایەنگیری کۆمەڵێك بکاتو کۆمەڵێکی تریە (لەڕێ لادان!)گوناهبار بکات.

گوتم: من دەزانم تۆ چەند بەتەنگەوەی هاوڕێیان بەشداری بکەن و توانای سیاسی و هزرییان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی سیاسی سەرکردایەتی حزب بەکاربێنن و هەروا دەزانم بەتەنگ یەکێتی حزبەوەیت، دیسان دەزانم تۆ دەتەوێ باری سەرنجی ناو بەندیخانە کە بەرانبەر بەم یان بەو پەیدا بووە نەهێڵیتو دەتەوێ پێیان بڵێیت ئەمەتە حزب فەرموون وەرن پێکەوە کار بکەین بۆ بەهێزکردنی تا ڕۆڵی خۆی لەناو بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانیو دیموکراتیماندا ببینێت، ئەمانە هەموو ئاشکران بەڵام هەر دەبێ سەرقاڵی کاری ڕۆژانەی ڕێکخستن بێن تائاستی بنکەی حزب بەرز بکەنەوەو شارەزای ژیانی حزبی بێن کە ماوەیەکی درێژ لێی دووربوون، ئەم ماوەیە بۆ حزب و هەروا بۆ خۆشیان زۆر پێویستە. پاش ئەوە وردتر لەهەریەکەیان دەکۆڵینەوەو هەڵوێستی ڕاستیان بەگوێرەی بەرهەمی هەریەکەیان و ئاستو تواناییان دەگرینەبەر...هتد. بەڵام بەداخەوە بەمە قایل نەبوو هەموویانی بەکۆمەڵ بۆ کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی پێشخست.

کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی لە تەموزی ١٩٥٩دا خاڵی وەرچەرخان بوو لەکێشەی ئەم دەستەبەشەدا دژی سیاسەتی حزب و هەوڵدان بۆ لابردنی سەلام عادلو دەسەڵاتگرتن بەسەر سەرکردایەتیداو، دەربڕینی نیازپاکی بۆ قاسم وپەسەند کردنی و دارمانی و سیاسەتەکەی و دیکتاتۆریەتەکەی بخرێنە سەر ئەستۆی حزب، ئەمەش بەبڵاوکردنەوەی کورتەیەکی ئەو ڕاپۆرتە سیاسییەی یەکێك لە ئەندامانی دەستەبەشەکە، عامر عەبدوڵا نووسی بووی و (ڕەخنە لەخۆگرتن!)ی تێدا بوو کە پاش بڵاوکردنەوەی ناومانناا(جەڵدە لەخۆدان) بۆقایل کردنی قاسم. نامەیەکم بۆ مەکتەبی سیاسی و بەتایبەتی بۆ هاوڕێ سەلام عادل نارد، لەوێدا بیروڕای خۆم دەربڕی بوو کە دەبێ لەبارودۆخی سەرکردایەتی حزب بکۆڵرێتەوە، چونکە مانەوەی ئەم دەستەبەشە لەسەرەوەی لەحزبدا گەلێك گیروگرفتی سیاسی و هزری و ڕێکخستن پەیدا دەکاتو، سیاسەتە ڕاستەکەی حزب دەشڵەژێنێ. بەڵام هیچ کارێك نەکرا بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلەیە، جگە لە

پێکهێنانی کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی دوای داتەپینی بارودۆخەکەو دوای ئەوەی دەسەڵات کاروبارەکەی بەرەو خراپتر بردو هێرشەکەی بۆ سەر هاوڕێ سەلام عادل ئاراستەکردو، کۆمیتەی ناوەندیش هیچ ئەنجامێکی ئیجابی نەبوو جگە لەوەی حزب دەستی کردەوە بەکاری نهێنی و دەرکردنی رۆژنامەکە بەشێوەیەکی نهێنی و، داوای ڕاگرتنی شەڕ لە کوردستانداو چاری ئاشتییانەی مەسەلەکە.

پاشان دوای گەڕانەوەی هاوڕێیان جەمال حەیدەری و محەمەد سالّح عەبەلی لەیەکێتی شۆرەوی و، دوای ئەوەش گەڕانەوەی هاوڕێ سەلام عادل، نامەیەکی ترم پێشکەش کردو، ئەوکاتە بارودۆخەکە بەتەواوی پەشێوابوو، ئیتر نەدەتوانرا چاوپۆشی لەچالاکییەکانی ئەم دەستەبەشە بپۆشرێت، لەنامەکەمدا سەرلەنوێ داوامکرد کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی بکرێت بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی حزب بەپەیوەندی لەگەڵ بەرپرسێتی دەستەبەشەکە لە شلّەژانی سیاسەتی حزب و پاشەکشەی نارێکوپێك و دەسبەردار بوون لە شوێنەوارەکانی یەك لەدوای یەکی حزب بەشێوەیەکی بەزێوی و سەرپێی بۆ دەسەڵاتو بۆرژوای لیبراڵی و نەتەوەپەرستی شۆڤێنی.

سکرتاریتی کۆمیتەی ناوەندی لەنامەکەمی کۆڵییەوە کە دوای گەڕانەوەی هاوڕێ سەلام عادل بۆ مەکتەبی سیاسیم ناردبوو، پێشنیازێکی دابووە مەکتەبی سیاسی کە لەسەر داواکەی هاوڕێ (عریان)–ئەمە ئەوکاتە ناوە حزبییەکەم بوو– کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆبوونەوە بانگ بکرێت، ئەمە لە شوباتی ١٩٦١دا بوو، هاوڕێ سەلام عادل لەکۆبوونەوەکەی (سلم)دا باسی ئەم نامەیەی کردبوو، پاشان مەکتەبی سیاسی داوای کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی لە ١٩٦٢دا کرد تا لەوێدا لەبارودۆخی سەرکردایەتی بکۆڵرێتەوەو، بەپەیوەندی لەگەڵ ئاشکراکردنی دەستەبەشە هەڵپەرستە ڕاستڕەوەکەو بەجێگەیاندنی کاروباری پێویست بۆ پاکردنەوەی سەرکردایەتی حزب لەم کەسانەی بوونەتە کۆسپ لەرێگەی کاروچالاکیی سەرکردایەتی حزبداو لە رێگەی پەرەپێدانی سیاسەتەکەیدا. هەروا ئەوەشی لەسەر زیاد دەکەم کە کۆبوونەوەکەی کۆمیتەی ناوەندی، لەئابی ١٩٦٤دا ئیعتیباری بۆ ئەو هاوڕێیانە گێڕایەوەو خرانەوە ناو کۆمیتەی ناوەندی، بێ

ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەك بکرێ لەوەی تا چەند سودیان لەهەڵـەکانی پێـشوویان وەرگرتووەو تەنانەت دەستیان کردە بەهەڵەدانانی هەڵوێستی حـزب بەرانبـەریان‌و هەندێکیان ڕەخنەشیان لە خۆیان نەگرت کە چالاکی کەرتکاری تێکدەرانەیان لەناو سەرکردایەتی حزبدا هەبووە. لەو بـاوەڕەدام گێڕانـەوەیان بـۆ کۆمیتـەی ناوەنـدی کارێکی دەستوریی و ڕاست نەبوو. جارێکی تر تکام وایـە خوێنـەری بـەڕێز کتێبـی (ڕەوتی ژیانـی تێکۆشەرێك)—سـیرە مناضـل— لەنووسـینی سـەمینە نـاجی یوسـف (پمینە ناجی یوسف)، هاوسەری هاوڕێی شەهید سەلام عادل بخوێنێتەوە، تـا لـەم بارەیەوە لەبەڵگەنامەکانی حزب ئاگادار بیت.

# کودەتای ڕەشی شوباتی ١٩٦٣

پاش ئەوەی سیاسەتی قاسم تێکچوو بەرەو دوژمنایەتی هێزە دیموکراتییەکان‌و بەتایبەتی حزبی شیوعی عێراق و بزافی ڕزگاریخوازیی کوردستان تێوەرگەڕایەوە، هەموو هێزە سیاسییەکانی وڵات و دەرەوەی وڵات کەوتنە لێکۆڵینەوەو چاودێریکردنی پەرەسەندن‌و وەرچەرخانی ئەم سیاسەتە، کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی ناوەندی ئەم مەسەلەیەی خستە سەرووی ئەو بابەتانەوە کە پێویستە بخرێنە بەرباس‌و لێکۆڵینەوەو بۆ گەیشتنە ئەوەی لەتوانادابێت بکرێت تا کاروبارەکان بەتەواوی ئاڵۆز نەبن بۆ ئەو ئاستەی کە هەردەبێتە هۆی چوونە ناوکێشەی ڕاستەوخۆ بۆ ڕامالینی قاسم و ڕووخاندنی ڕژێمەکەی.

حزب ئەم مەسەلەیەی لەگەڵ حزبە نیشتمانییەکان و هەروا لەگەڵ(پارتی)باس دەکرد، کە چۆن دەتوانرێ ئەم تێکچوونە ڕابگیرێت‌و، ئاخۆ دەتوانرێ ڕابگیرێت؟ حزب گەیشتە ئەوەی کە لەتوانادایە ئەم تێکچوونە ڕابگیرێت گەر بێت‌و بەرەی نیشتمانی پێکبێت و بەڕێگای پەیڕەوکردنی زەبری سیاسی و لەسەر شەقامەوە بۆ داسەپاندنی، ئەو چارەسەرەی پێویستە بەسەر قاسم دا، بەلام حزبی نیشتمانی دیموکراسی بۆ پێکهێنانی بەرەی نیشتمانی ئەوەی کردە مەرج کە هێزە ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکانیش تێیدا بەشداربن، بەتایبەتی حزبی بەعس لەکاتێکدا دەیزانی حزبی بەعس و ناسرییەکان نایەنە ناو بەرەیەك کە حزبی شیوعی تێدا بێت چونکە ڕەوتی خۆیان هەبوو کە بەتەنیا دەسەڵات بەسەر حکومەتدا بگرن، وێڕای ئەوەش حزب هەوڵیدا پەیوەندی لەگەڵ بەعسییەکاندا بکات، بەلام ئەوان قایل نەبوون لەگەڵ حزب دیدار بکەن چونکە ئەوان وایان دانابوو ئەم تێکچوونەی سیاسەتی قاسم‌و دوژمنایەتی کردنی حزبی شیوعی هۆکارێکی باشە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەی پیلانگێڕییان بۆ ڕووخاندنی حکومەت دوای کەلاکەوتنی لە کۆمەڵانی فراوانی گەل و بەهۆی ئاڵوگۆڕیی ڕاستڕەوی دیکتاتۆری تەنیا کەسیی

قاسم.

بەڵی هێزە ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوکان و کۆنەپەرستی لە تۆکەرانی ئیستیعمارو هەوالگریی ئەمریکا هەموو هێزەکانی دوژمنی دیموکراسیی، لەناو بەرەیەکدا کۆبوونەوە کە کۆنەپەرست بوو بەسترابوو بەنەخشەکانی هەوالگریی ئەمریکاوە بۆ سازدانی کودەتایەك بۆ ڕووخاندنی قاسم و لێدانی حزبی شیوعی عێراق. بەلام کوردان پالپێوەنران بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێکی ناسیۆنالیست دوای ئەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ قاسم تێکچوون و هەندێ کاری ناپەسەندی کرد لەدژی گەلی کوردو دژی بارزانی خۆی.

کەواتە لەحالێکی وادا حزبی شیوعی عێراق کەلاکەوت لەهێزە سیاسییەکانی ولات، لە عەرەبو عێراقی و کوردو، کەلاکەوت لە دەسەلات، دەبوو پشت بەهێزەکانی خۆی ببەستێ، بۆ بەرگری لەشۆڕشو دەستکەوتەکانی وهەروا بەرگری لەخۆی، بەلام ئاخۆ ئەمە لەتواناادا بوو؟

بارودخی سیاسی ئەوەیان دەردەخست کە دەسەلات لەجەماوەر دابڕاوەو هەر هەولدانێك لە دژی دەسەلاتداریی قاسم بکرێت جەماوەر ئامادە نیە بەرگری لێبکات، ئەمەش لایەنێکی مەترسیداری بارودۆخی سیاسی بوو، لەلایەکی ترەوە حزب نەیتوانی هەلوێست لە دەسەلاتی قاسم یەکلابکاتەوە، ئەمەش بەهۆی بارودۆخی سەرکردایەتییەوە لە حزبدا، چونکە سیاسەتی حزب شلەژابوو، لەلایەکەوە حزب لەساڵی ١٩٥٩دا ڕایگەیاند کە قاسم ڕوویکردۆتە ڕاستڕەوی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان بەشێوازێکی تاقەکەسی دیکتاتۆری و ئەم مەسەلانەش دەخاتە بەردەم هێزە سیاسییەکانی تر، بەلام وێڕای ئەوەش هەر لەسەر بەرگریکردن لەدەسەلاتی قاسم مایەوە تەنانەت زۆر لەڕێکخراوەو هاوڕێیانی حزب ئامادە نەبوون بەرگری لەم حکومەتە بکەن کە دەیان ئەندام و لایەنگرانی حزبی خستبووە ناو بەندیخانەکان و کەوتە بەربەرەکانێی نەقابەو کۆمەلەکانی جوتیارانو ڕێکخراوە دیموکراسییەکان و، ژیانی حزبیو ڕۆژنامە دیموکراسییەکانو پێشکەوتنخوازەکانی هەلوەشاندەوەو، بواری بۆ هێزە ناسیۆنالیست وکۆنەپەرستان ڕەخساند کە چالاکییەکانیان لە دژی حزب ئەنجام بدەن و بکەونە

ڕەشەکوژیی هاوڕێیان‌و دۆستان. سێیەمیش بوونی شۆڕشی کورد بوو کە بەزەبری هێز ڕیشەکێش دەکراو، حزب هەڵوێستێکی بەکردەوەی نەبوو، حزب تەنیا توانی هەڵوێستی سیاسی خۆی بەرامبەر بەشۆڕش گەڵاڵە بکات وەك داخوازی ڕاگرتنی شەڕو چاری ئاشتییانەی مەسەلەی کورد بەڕێگەی وتووێژو هێنانە پێشەوەی دروشمی ئۆتۆنۆمی بۆ هەرێمی کوردستان وەك چارێکی ئێستاو بەپەلە بۆ گێڕانەوەی پەیوەندی برایانەی نێوان هەردوو گەلی عەرەب و کورد. چەند هەڵسوڕانێکی جەماوەریشی لە دژی سیاسەتی ڕیشەکێشانەی حکومەت ئەنجامدا، بۆ بەرگری لەگەڵ کورد، وەك کۆکردنەوەی ئیمزاو ناردنی وەفدەکان و ئەنجامدانی خۆپیشاندان لەبەغداو شارەکانی تر، بەڵام وەفدو خۆپیشاندەران دەستگیرکران و درانە دادگاکان وپاشان حکومەتی کودەتا ڕەشەکەی شوبات ئیعدامی کردن.

حزبی شیوعی بەتەنیا لە کۆڕی ئەم کێشەیەدا بوو دژی سیاسەتی ڕاستڕەوی قاسم و لاباڵێکیشی لە حزبی بۆرژوای نیشتمانی لیبراڵی حزبی نیشتمانی دیموکراسی، لەهاوکارییەکی بەهێزدا بوو لەگەڵ قاسم، کەسایەتی محەمەد حەدید لەمەدا بوو، بەڵام لاباڵەکەی تر دەستەوستان و تەماشاکاری ڕووداوەکان بوو، کەسایەتی کۆچکردو مامۆستا کامیل چادرچی لەمەدابوو.

لەبەردەم ئاوەها واقیعێکدا حزبی شیوعی نەیدەتوانی بچێتە کۆڕی جەنگێکەوە بۆ ڕووخاندنی قاسم، ئەمە لەبواری تیئۆریدا و واقیعی بارودۆخی سیاسی و پارسەنگی هێزەکان و ئەو هەلومەرجەی دەوری دابوو، چ جاری ئەوەی کە حزب هەر بڕیاریشی نەدابوو کار بۆ ڕووخاندنی حکومەتی قاسم بکات بەڵکو بڕیاری بەرگریکردنی دابوو، بەڵام بەکردەوە دەبوو بەجیدی هەوڵبدات بۆ دەستنیشانکردنی ئەڵقەی مەرکەزیی کە ڕووبەڕووی دەبۆوە ئەمەش بەڕێکخستنی پاشەکشەی ڕێکوپێك‌و گواستنەوەی تەواوی بۆ کاری نهێنی و دەسەلات پێدانی لقی حزب کە کاروباری پێویست ئەنجام بدات بۆ بەشداریی لە شۆڕشی کورداو، ئەنجام نەدانی هیچ هەڵسوڕان یان چالاکییەکی جەماوەری کە ببێتە بەفیڕۆدانی کادیران و هێزە حزبییەکان‌و، مانەوە لە شوێنی بەرگری لەحزب‌و بەتینکردنی ڕەخنە لەسیاسەتی حکومەت و، پاراستنی هێزە سوپاییەکانی کە ئاشکرانەبوون

ئەوانەشی ئاشکرابوون دەکرا بچنە پاڵ شۆڕشی کورد.

حزب دەیزانی کە هێزە ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکان پیلانێکی کودەتاگێڕانی سوپایی ئەنجام دەدەن، لەبەر ئەوە ڕێکخراوەکانی خستبووە حاڵەتی ئاگادارییەوە بەڵام کەس نەیدەزانی ئەم کودەتایە کەی ڕوو دەدا، ئامۆژگارییەکانی وابوون کە بەربەستی هەرکودەتایەك بکرێ و بەرگری لەدەسەڵات بکرێ بەڵام دەسەڵات دەبێ دوای لەناوبردنی پیلانگێڕیی کودەتاکە بێتە گۆڕدران.

ئاگادارییەکانی ڕێکخراوەکانی حزب یەکجار زۆرو بەردەوام بوون ئەمەش بەشێوەیەکی گەورە ئامادەیی و هۆشیاریی لاوازکردو بەڵکو وای لێهات گوێی پێ نەدرێ و باوەڕنەکرێ کە ڕوودەدا، چونکە ئەو سەربازەی کە چەك هەڵدەکێشێ و تاماوەیەك نایتەقێنێ دەستەکانی شل دەبن و چەکەکەی لەدەست دەکەوێت، چونکە دەستپێشخەر لەکارێکدا لە بارودۆخەکە بەچاکیو وردی دەکۆڵێتەوەو، حسابیش بۆ هەر ڕووداوێکی چاوەڕوانکراو دەکات و خاڵی لاوازو بەهێزی نەیارەکەی بەرامبەری دەستنیشان دەکاتو، نەخشە دەکێشێ لەکوێوە دەست پێ بکات و زەبری خۆی بووەشێنێت، نەخشەیەکی ڕووناکی هەیەو بەوردی جێبەجێی دەکات، بەڵام بەرگریکار نەخشەی دەستپێشخەر نازانێتو نە ڕەوتی زەبرەکەو نە هێزەکانی و نە خاڵی لاوازی دەزانێت، بۆیە لەسەرەتادا کوێرانە بەرگری دەکات، ڕەنگە ئەگەر بەرگری درێژە بکێشێت بەرگری ببێتە هێرش بردن، چونکە دەشێ بەرگریکار بتوانێ بەرامبەرەکەی سەرقاڵ بکات تا دەگاتە نەخشەیەکی تەواو.

لەشوباتی ١٩٦٣دا پیلانگێڕان بوون دەستپێشخەرییان کرد بۆ کارکردن بەپێی نەخشەیەکی بە وردی داڕێژراو دوای لێکۆڵینەوە کە خاڵی ناوەندییان بۆ لێدانەکە دەستنیشانکردووە، بۆ نمونە بەکوشتنی جەلال ئەوقاتی هێزی هەوایی کەوتە ژێر دەستی خۆیان و بەکوشتنی عەبدولکەریم قاسم ڕاستەوخۆ دەسەڵات کەوتە دەستیان، بەهەرحاڵ نامەوێ بەدرێژی باسی ئەو شتانە بکەم کە هاوڕێ عەزیز سیباهی لە کتێبەکەیدا (دەیان ساڵ لەمێژووی حزبی شیوعی عێراق–بەشی دووەم) بەدرێژی باسی کردووە، بەڵام لەسەری زیاد دەکەم کە بزووتنەوەکەی

حەسەن سەریعی شەهید ئەگەر لە ڕۆژی یەکەمی کودەتاکەدا بوایەو یاخیبوونی سوپایی لەجێگەیتر ڕوویان بدایەو بهاتنایە بەغدا کودەتاگێڕان نەیاندەتوانی دەسەلات بگرنە دەست تەنانەت ئەگەر عەبدولکەریم قاسمیشیان بکوشتایە، بەلام حزب نەیتوانی هێزی سوپا بجولێنێ بەلکو بەهاوڕێیانی حزب و چەکی سادەو فیشەکی کەم بەرگریی کرد! هەروا لەپارێزگەکانی تر زۆر بەدەگمەن نەبێ بەرگریی نەکرا.

ئێمە هەرسێکمان عەزیز محەمەد و عومەر عەلی شێخو من لە کەرکوك بووین، لە مەکتەبی لقی کۆمیتەی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق کارمان دەکرد، بەرەبەیانی ڕۆژی هەینی ۸ی شوباتی ۱۹٦۳لە ئیستگەی بەغداوە بیستمان کە کودەتای سوپایی ڕوویداوەو عەبدولکەریم قاسم گیراوە، کۆبوونەوەیەکی سێقۆلی بەپەلەمان کرد بۆ لێکۆلینەوەی هەلوێستەکەو فەرماندەرکردن بۆ هێزە سوپاییەکانی حزب بۆ بزووتنەوەو، سازدانی بەرگری چەکداریی و کاتێکیش هەولماندا پەیوەندی بە هاوڕێیانی عەسکەرەوە بکەین تەماشامان کرد گیراون، ئیتر نەدەتوانرا هیچ بەرگرییەکی چەکداریی تر بکرێت، کودەتاگێڕان دەسەلاتیان گرتبوو بەسەر بارەگای سەرکردایەتی تیپی دووەمداو سەرکردەی تیپی دووەمیان گرتبوو لەگەلێ ئەفسەرانی تری هەموو لەشکرەکانی تیپی دووەم، بانگەوازەکانی کودەتاگێڕان لەڕادیۆدا داوایان کرد شیوعییەکان لەناو ببرێنو سەرکردەکانیان بگیرێنو بکوژرێن لەبەر ئەوە بریاردرا داوا لەڕێکخراوەکانی لق لەشارەکاندا بکەین کەبڕۆنە دێهاتەکانو بچنە پالێ شۆرشی کورد. هاوڕێ عەزیزمان ڕاسپارد کە بڕواتە لای بارزانی ومەکتەبی سیاسی پارتی و بڕیاردرا هاوڕێ عومەر عەلی شێخ لەکەرکوك بمێنێتەوە بۆ ڕایی کردنی هەندێ ئیشوکارو ئەرکی گەیاندنی چاپخانەی حزب (ڕۆنیۆتایپ) بۆ ناوچەی شۆرشی کوردو، منیش ئەو ئەرکەم پێ سپێردرا کە تیپەکانی پێشمەرگە پێکبهێنم، بەدرێژی بۆتان باس دەکەم چۆن ئەم ئەرکە گرانەم بەجێ گەیاند. چەند ئەلقەیەکم بە زنجیرە لەبارەی چۆنیەتی دامەزراندنی تیپەکانی پێشمەرگە شیوعییەکانەوە لە شۆرشی کوردا نووسیو، لێرەدا ئەوەتان بۆ دەگوازمەوە کە لەگۆڤاری (هەندرێن)دا نووسیم دەیانخەمە سەر ئەم

یادداشتانە:

لەساڵی ١٩٦٣دا دوای کودەتای ٨ی شوباتی ڕەش و ڕووخاندنی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم، کاتێك کودەتاگێڕان دڕندانە پەلاماریان بردە سەر حزبی شیوعی عێراق و سەرکردەکانی حزبیان دەستگیرکردو لەناویان بردن، دەسەڵاتیان بەسەر سوپاو بەڕێوەبەرێتی دەوڵەتدا گرت، کۆمیتەی لقی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق کۆبوونەوەیەکی تایبەتییان پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخەکەو جێبەجێ کردنی هەرچی پێویست بێ بکرێت، کۆمیتەکە بڕیاری دا:

١. دامەزراندنی تیپەکانی پێشمەرگەی حزبی شیوعی عێراق لەناو شۆرشی کوردا لەهەموو پارێزگاکانی هەرێمی کوردستانی عێراقدا.

٢. ڕێکخستنەکانی حزب لەهەرێمدا پشت بەشێوازی کاری نهێنی دەبەستن و هەوڵدەدەن کادیرانی حزب لەشارو شارۆچکەکاندا بپارێزن.

٣. داواکردن لە گشت ئەندامان و لایەنگرانی حزب بۆ چوونە پاڵ تیپەکانی پێشمەرگەی حزبی شیوعی عێراق لە هەرێم دا.

٤. بڕیاردرا پەیوەندە بکرێت بەسەرکردایەتی شۆڕشی کوردو بنکەکانی پێشمەرگەوە.

٥. بڕیاردرا عەزیز محەمەد بچێت بۆلای سەرکردەی شۆڕشی کورد کۆچکردو بارزانی مستەفاو هەروا بۆ دیداری مەکتەبی سیاسی (پ.د.ك)، کەریم ئەحمەدیش پەیوەندی لەگەڵ بنکەی سیاسیو عەسکەری شۆڕشی کورد لە کەرکوك بکات و دوای ئەوەش ڕوو بکاتە هەولێر بۆ پێکهێنانی بنکەکانی پێشمەرگە لە هەرێمەکەدا.

٦. نووسینی نامەیەکی بەپەلە بۆ هەموو پارێزگاکانی هەرێم کە ئەم بڕیارانەیان تێدا بێو، دەستپێشخەری بۆ پێکهێنانی تیپە چەکدارەکانی پێشمەرگەوکارکردنی حزبی بەنهێنی.

٧. هاوڕێ ئەبو فاروق لە کەرکوك دەمێنێتەوە تا هەندێ شوێنو ماڵان ناهێڵێ و چاپخانەکەی حزب بگوێزێتەوە بۆ ناوچەی شۆڕش و، دوای

ئەوە خۆیشی دەگەڕێتەوە بۆ ناو شۆڕش.

ڕووم کردە هەولێر، بەرگری کودەتایەکە بەردەوام بوو بەلاَم لاواز بوو چونکە سوپاو بەرێوەبەرایەتی لایاندا بەلای کودەتاگێڕاندا. لەگەڵ مەکتەبی کۆمیتەی پارێزگا کۆبوومەوەو داوام لێکردن لەشار دەرچن‌و ڕوو بکەنە لادێ و ناوەندی کۆبوونەوە لە گوندی (مۆرتکە) دەبێ. لەئێوارەدا لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی مەکتەبی کۆمیتەی پارێزگای هەولێر و هەندێ لەهاوڕێیانیتر بەپێ بەرەو گوندی (مۆرتکە) کەوتینەڕێ‌و سکالاَم بوو لەدەست سوتانەوەی بڕبڕەکانی پشتم، لەرێگە زۆر ئازاری دەدام، ناچاربووم چەند جارێك لەرێگە دانیشتم، گەیشتینە گوندەکەو شەو لەوێ ماینەوە بۆ بەیانی خەڵکی گوندەکەم بۆ کۆبوونەوە لە قوتابخانەی گوندەکە بانگ کردو بۆم ڕوونکردنەوە کە کودەتاگێڕان دەستیان بەسەر دەسەلاَتدا گرت ئەوانیش نەتەوەپەروەرانی عەرەبی ڕاستڕەون‌و لەگەڵ هێزە کۆنەپەرستەکانی تردا هاوکارییان کردووەو بەپێی نەخشەی هەواڵگریی ئەمریکاو بەیارمەتی ئەوان ئەم کودەتایەیان سازکردو حکومەتی عەبدولکەریم قاسم‌و یان بابڵێین قاسم چەکی نەدایە جەماوەری گەل بۆ بەرگریکردن لە کۆمارەکەو دەستکەوتەکانی شۆڕش هەروا هیچ هێزێکی سوپایی لەدژی کودەتاگێڕان نەجولاَیەوەو بەمجۆرە دەستیان بەسەر حکومەتدا گرت‌و لەسەر کاریان بەردەوامن بۆ لێدانی حزبی شیوعی عێراقی ئێمەو هەروا لەسەر کاریان دژی شۆڕشەکەی کورد بەردەوام دەبن و، بەتەواوی هەڵەیە وا گومان بکرێ کە ئەمانە مافەکانی گەلی کورد دێننەدی چونکە ئەمانە ناسیۆنالیستی شۆڤێنین، ئێمەش ئێستا تیپەکانی بەرگری چەکداری بەهاوکاری لەگەڵ شۆڕشی کوردو لەدژی کودەتاگێڕان پێکدەهێنین‌و هاوپەیمانانی پارتی قەناعەت دەکەن کە ئەم کودەتایە مافەکانی گەلی کوردمان ناهێنێتەدی و لەخوێن ڕشتنی زۆرو قوربانیدان بەولاوە هیچی تریان نابێ.

بەمجۆرە ئەوەی گوتمان هاتەدی و عەلی سالح سەعدی سکرتێری سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعس ڕایگەیاند کە بەشەمەندەفەری ئەمریکی هاتوونەتە سەرحوکم شەڕێکی شۆڤێنییان بۆ سەر گەلی کورد بەرپاکردو وەزیری بەرگرییان شەڕی بۆ سەر گەلی کوردمان بەسەیرانێکی بەهارە دانا. وادیاربوو کودەتاگێڕان کارێکی

گەورەیان کردبووە سەر جوتیاران چونکە ئەوان لە چارەنووسی چاکردنی کشتوکاڵی دەترسان چونکە یەکێکیان پرسی ئایا ئەم کودەتایە یاسای ئیسلاحی زەراعی هەڵدەوەشێنێتەوە، لە وەڵامیدا گوتم کودەتاگێران ڕاستەوخۆ یاسای کشتوکاڵ هەڵناوەشێننەوە بەڵام دەسەڵاتی دەرەبەگ بۆ سەر جوتیاران دەگێڕنەوە ئەمەش بەرێگەی بەکارهێنانیان لە دژی شۆڕشی کورد(جاشەکان) ئەوانە دەستدرێژی دەکەنە سەر مافەکانی جوتیارانو هەندێکیان ناچار دەکەن بچنە ژێر فەرمانیان(جاشەچەکدارەکان).

بۆ بەیانی سێیەم ڕۆژ گوندی (مۆرتکە)مان جێهێشتو ڕوومان کردە کۆیە بەڵام زۆربەی هاوڕێیان هەولێری بوونو چەکدار نەبوونو زۆر کەم لەوانەی لەگەڵمان بوون چەکدار بوون کە ئەوانیش لە هاوڕێیانی جوتیار بوون و چەکی هەندێکیان زۆر کۆن بوون و بەجۆرێك بەکەڵکی ڕاوە بەرازیش نەدەهاتن، بەڵام لەوە باشتر بوون (کەهەرنەبن). گەیشتنە گوندی (داربەسەر) کە گوندێکی داخراوبوو بۆحزب، ئەو گوندە هاوڕێی شەهید عەلی مەولودی تێدا لە دایك بووبوو. هیچ دەرەبەگێکیش لە سەردەمی پاشایەتیدا نەیتوانیبوو دەستی بەسەردا بگرێت. گوندەکە موڵك سرفی جوتیاران بوو، شەوەکەمان لەوێ بردە سەرو بۆ سبەینێ بەیانی زوو هاوڕێیانم لە گوندەکە جێهێشت و ڕووم کردە کۆیە بۆ ئەوەی پەیوەندیی بەسەرکردەکانی (پارتییەوە) بکەم. مام جەلال و عومەر دەبابەی کۆچکردوو لە کۆیە بوون. زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردم بۆم باسکردن کە لەشۆڕشەکەدا بەشداری دەکەین و بنکە لە کوردستان لەناو قەوارەی هێزەکانی(پ.م)دا دادەمەزرێنین و بەڵام لەکاروباری بەڕێوەبردن و سیاسیدا سەربەخۆ دەبینو چالاکی عەسکەری لەدژی کودەتاگێران دەکەین، پێمگوتن نیازمان وایە گوندی (کلکەسماق) بکەینە مەڵبەندی کۆبوونەوەمان لەپارێزگای هەولێر. لەسەر ئەمە قایل بوون، بەڵام مەفرەزەکانی (پ.م) کە سەر بەمەکتەبی سیاسی بوون ڕێگەیان نەدا بەهاوڕێیانمان لەگوندی (داربەسەر) بجوڵێنو گەمارۆشیاندان منیش ئەو مەسەلەیەم خستە بەردەمیان فەرمانیاندا جارێکی تر ئەمجۆرە کارانە نەکەن. ئیتر ئاگاداری هاوڕێیانم کردو بەرەو گوندی (کلکەسماق) کەوتنەڕێ. یەکەمین بنکەی

پێشمەرگەكانمان لەم گوندە بوو كە سەر بەشێخ (مامەڕەزا) لە كۆمەڵی هەقـەكان بوو. هەقـە ڕێگەیـەكی ئاینییـە بـەدوای هەقـدا دەگـەڕێ، ئـەوان داوای بەكسانیو مرۆڤایەتی دەكەنو لەوەدا جیـاوازی لـە نێـو خەڵكدا نییـەو بەرهـەمی كشتوكاڵی وپیـشەییان مـوڵكی هەموویانـەو دەیانەویـست بیروڕایـەكانیان لـەڕێگای دیـالۆگی ئاشـتییانە بـلاو بێتـەوە لـەدژی توندو تیـژی. جارێكیـان كاربەدەسـتانی ڕژێمـی پاشایەتی عێراق (مامەڕەزا)یان گـرت، بۆیـە كۆمـەڵی هەقـەكان خۆپیـشاندانێكیان كرد بەپێ ڕۆیشتن بۆ كەركوكو لەسەر شـەقامەكان ڕاكشانو ڕێگـەی تێپـەڕبوونی ئۆتۆمبیلو عەرەبانەكانیان گرت لەپێناو ئازادكردنی (مامە ڕەزا)دا حكومەت ناچار بوو ئازادی بكات، پاش ئەوەی مامەڕەزا لەڕێگەی گەورە شـاعیری كـورد عەبـدوڵلا گۆرانـەوە حزبـی شـیوعی ناسـی بەلایـەنگرەكانی گـوت: ئێـستا واحزبـی هـەقمان دیتـەوە، هـەموان دەبـێ پـشتگیری ئـەم حزبـە بكـەین، خۆیـشی بـووە ئەنـدامی ئەنجومەنی ئاشتیخوازانی عێراق.

جێگەی ئەم گوندە بۆ ئەوە ناگونجێ ببێتە بنكەی پێشمەرگە چـونكە بەرانبـەر (دوكـان)ەو هـەرجموجوڵێك لـە گوندەكـەدا بەچـاو لـە(دوكانـەوە) دەبینـیو، لـەم مەحەتەی كەهرۆ ئاوییە هێزێكی سوپایی عێراق دانرابوو بۆ پاراستنی وێستگەكەی (دوكـان) لەبـەر ئـەوە بیرمـان دەكـردەوە كـە ئـەم بنكەیـەمان بـۆ شـوێنێكی تـر بگوێزینەوە كە بەكەڵكی بنكەی پێشمەرگە بێت، شتێكی تر ئەوەیە دەبێ بنكەكـە لەدێهاتەوە دووربێت چونكە دەكەوێتە بـەر بۆمبۆردومـانو وێرانكـاری، سـێیەمیش ئەوەیە گونـد ناتوانێـت بەرگـەی ئازوقـەی ئـەم ژمـارە زۆرەی پێـشمەرگە بگرێـت، گوندەكەش ناوەندێكی رۆحی كۆمەڵەی (هەقـەكان) بـوو پێویـستە ڕێـزی بگـرین و پارێزگاری لێ بكەین.

بـاری گوزەرانیـان یـەكجار خـراپ بـوو، لەلایەكـەوە نـانو ئازوقــەمان بەشـی ماوەیەكی درێژی نەدەكرد، لەلایەكی تریشەوە مەكتەبی سیاسی (پارتی) گەمارۆی ئـابوری خـستبووە سـەرمان، ئـەو پیتاكـەی ڕێكخراوەكـانی حـزب لـە لادێكـان و شـارەكانەوە، كۆیـان دەكردنـەوە هێزەكـانی(پ.م)ی پـارتی دەسـتیان بەسـەردا دەگـرتن و ڕێگـەیان نـەدەدا یارمــەتیمان پێبگـات، مەكتـەبی سیاسـی پـارتی

پشتگیریی خۆی بۆ کودەتای شوبات ڕاگەیاندبوو، بەو برسکە بەناوبانگەی کە تێیدا هاتبوو(هەردوو شۆڕشەکەمان پێکگەیشتن) واتە شۆڕشەکەی ئەیلولی کوردو کودەتایەکەی ٨ی شوباتی ڕەش، ئیتر چوونە وتوویژ لەگەڵ کودەتاگێڕان بەهیوای گەیشتنە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردمانو وەرگرتنیان لەدەست ناسیۆنالیستە دیکتاتۆرە شۆڤێنییەکان! بڵاوکراوێکی ناوخۆی وەك بەیانەکەی کودەتاگێڕان ژمارە (١٣) دەرکرا، کە داوای کوشتن و لەناوبردنی شیوعییەکانی دەکرد، ئەم بڵاوکراوەیەش داوای لەرێکخراوەکانی پارتی دەکرد ڕێگە نەدەن بەشیوعییەکان کە(شۆڕشەکەی کورد پیس بکەنو، دەبێ ڕیسواو بەرەنگاریی بکرێن..ڕوو ڕەش بکرێن) لەپارێزگای سلێمانی هێرشیان بردە سەر هاوڕێیانمانو دەستەیەکیان لێکوشتنو ئەوانی تریشیان دەستگیر کردن، لە(کلکەسماق) هێرشیان بردە سەر چەکدارانی کۆمەڵەی (هەقە)و هاوڕێیانی شیوعی و چەکیان کردن و دەستگیریان کردنو گەمارۆی ئابورییاندا‌ین بۆ برسی کردنمان و ڕێگەگرتن لەوانەی دەیانویست بێنە پاڵ پێشمەرگەکانمان.

ئەمە لەکاتێکدا بوو کە هەڵوێستی بارزانی بەتەواوی جیاواز بوو، بروسکەی بۆ هەموو تیپەکانی پێشمەرگە ناردو داوای کرد (پێویستە پێشوازیی شیوعی و دیموکراتەکان بکەن کە دەیانەوێ بێنە پاڵ شیوعی و یان دەیانەوێ بیانپارێزین، وا لەگەڵیان مامەڵە بکەن وەك لەگەڵ خۆتان) بارزانی کودەتا ڕەشەکەی پشتگیری نەکردو لەگەڵ ئەوەش نەبوو وتووێژیان لەگەڵ بکرێت و داوای لە کودەتاگێڕەکان کرد بەندو گیراوەکان ئازاد بکەن. بەڵام مەکتەبی سیاسی پارتی ژمارەیەکی زۆریان لەشیوعییەکان لەبارەگای (ماوەت) دەستگیرکردو ناچاریان کردن کاربکەن و بەردیان بۆ خانووی(پ.م)یێ بگوێزنەوەو لە پێش چاوی وەفدو ڕۆژنامەنووسانی بییانی لێیاندەدان تا تێیانبگەیەنن کە ئەمانە دژی شیوعییەتن و پێشەکی بەکودەتاگێڕەکان پێشکەش بکەن بەڵکو شتێکیان لەمافە نەتەوەییەکان لێوەربگرن. بێ ئەوەی هەست پێبکەن کە ناکرێ ناسیۆنالیستە شۆڤێنییەکان دانبنێن بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردماندا، شیوعییەکان هێزێکی سەرەکین بۆ چاری مەسەلەی کوردو کوردستانی لەسەر بنەمای مافی چارەنووسو

پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانی یان بێ ئەوەی ئەو ڕاستیە هەست پێ بکەن کە چاری مەسەلەی کورد لەبنەڕەتەوە بەستراوەتەوە بەڕژێمی دیموکراسی لە عێراقدا لەبەر ئەوەی چاری مەسەلەی کورد لەناو دەوڵەتی عێراقدا دەکرێت.

ڕۆیشتم بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ بارزانی کە ئەوکاتە هاتبووە قەلآدزەو، گیرۆدەی ئازاری برینەکانیش بووم، گەیشتمە قەلآدزەو پەیوەندیم لەگەڵ مام جەلال کرد کە ئەوکاتە لەوێ بوو بارودۆخی خۆمانم بۆ باسکرد کە چۆن کەوتوینەبەر جۆرەها تیرۆر و پەیوەندی خراپ لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوەو چۆن چەکی کۆمەڵەی مامە ڕەزاو چەکی ئێمەیان دەست بەسەردا گرتووەو هاوڕێیانمان گیراون و گەمارۆی ئابوریمان لەسەر دانراوە، بێزاریی دژی ئەم کردەوانە دەربڕی و گوتی دەبێ سنورێك بۆ ئەم کردەوانە دابنرێتو کاتی بۆ دانام کە چاوم بەبارزانی بکەوێت، پێکەوە لەگەڵ مام جەلال لەگەڵیدا کۆبووینەوەو بۆم باس کرد کەلەسەر دەستی مەکتەبی سیاسی پارتی چیمان بەرامبەر دەکرێ ئەویش بێزاریی لەو کردەوانە دەربڕیو نامەیەکم لێوەرگرت بۆ هەموو تیپەکانی (پ.م) کەپێویستە دەستبەرداری ئەو شێوازی داپڵۆسینەبن کە دەرهەق بەشیوعییەکان دەیکەن وپێویستە یارمەتی بدرێن ونامەیەکی تایبەتی بۆ سلێمانی نووسی کە پێویستە چەکەکانی کۆمەڵەی مامە ڕەزایی بدەنەوەو، نامەکەم برد بۆ بەرپرسو سەرکردەکانی بنکەکانی(پ.م) لەناوچەکەداو دوای هەفتەیەك کە بەپێ بەناوچەکەدا دەگەڕام وێڕای ئازارەکانی پشتم، بەلآم هیچ بایەخیان بەنامەکە نەداو زیاتر شێوازی داپڵۆسینیان بەکار دێناو چەکەکانی مامە ڕەزاییەکانیشیان نەداوە.

کێشەو ناکۆکی لەنێوان مەکتەبی سیاسی و بارزانی لەسەر چەندان مەسەلە هەبوون وەك هەڵوێست لە کودەتاگێڕانی شوباتو وتووێژ لەگەڵ حکومەت و هەڵوێست لە حزبی شیوعی، ئەم ناکۆکییانە پەرەیان سەندو بۆیان چارەسەرنەکراو مەکتەبی سیاسی بۆ بارزانی پاشەکشەی نەکرد، بەڵکو بارزانی بەدەنگ هەندێ لە داخوازییەکانیانەوە چوو، کارگەیشتە ئەوەی مەکتەبی سیاسی بڕیاری ڕاگرتنی ئەندامەتی بارزانی لەسەرۆکایەتی حزبدا بدات بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە پارتی لە دامەزراندنیدا پشتی بەناوبانگ و شوێن و پایەی

سەرکردەیی بارزانی بەستبوو لەناو بزافی ڕزگاریخوازیی کوردستانداو، هەربەم هۆیەشەوە پارتی بوو بەدوو بەش، بەشێك لەپارتی دەرچوون کە ئەویش مەکتەبی سیاسی بوو ڕێکخستنەکەی خۆی ناونا (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان)و پەنایان بردە بەرئێران و، هەرچیمان لەتوانادا بوو کۆششمان بەختکرد تادواکاتی دابەشبوون کە دەمانگوت ڕێگای وتووێژی ناخۆ ڕێگای ڕاستە بۆچاری ناکۆکییەکان نەك دابەشبوون بەلاّم مەسەلەکە لەئاقاری کارتێکردن و کۆششی ئێمە دەرچووبوو، بارزانی داوای پێکهێنانی کۆنگرەی کرد بۆ هەلّبژاردنی کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستانو دەرکردنی ئەوانەی لە حزب جیابوونەوە، ئەمەش لە کۆنگرەی سەرسەنگ دا کە سالّی ١٩٦٤پێکهات.

# بنکەی پێشمەرگە شیوعییەکان
# لەدوای کودەتای شوبات

١-بنکـەی کلکـەسماق یەکـەمین بنکـە بووبـۆ کۆکردنـەوەی پێـشمەرگەکان لـە پارێزگای هەولێردا.

٢-بەرسیرین، لێرە بنکەیەك دامەزرا بە سەرۆکایەتی ئەفسەرە شیوعییەکان کە هاتنە پاڵ شۆرشی کورد.

٣-کـانی گـوێز لـە ناوچـەی هـیران، ئـەم بنکەیـەی پێـشمەرگە لـە چـەکدارانی شەقلاوەپێکهاتبوو.

٤-خۆرنـەوەزان، بنکەیـەکی پێـشمەرگە لـە چـەکدارانی کـەرکوك و گـەرمیان پێکهاتبوو.

٥-بنکەیەکی پێشمەرگە لە سلێمانی پێکهـاتبوو بـەڵام (پ.م) سـەربەمەکتەبی سیاسی پارتی پەلاماریان دان و چەند هاورێیەکی پێشمەرگە شەهید بوون وئەوانی تریش دەستگیرکران و چەکەکانیان دەستیان بەسەردا گیرا.

٦-بنکەیەکی پێشمەرگە لە پارێزگای موسڵ پێکهات.

٧-ناوەنـدی کارەکـەمان لەبنکـەی (ئـاوەگرد) دانـا کـە دەکەوێتـە نێـوان دوو لوتکەی چیای (سەفین) کەبەسەر شەقلاوەدا دەڕوانێ، هـەروا ڕاگەیانـدنی حـزب و چاپەمەنی، ئەوە بـوو بنکـەی (کلکـەسماق) چۆڵکراو لەسـەرەتادا چووینە چیای (بـاواجی) لـەباکوری خۆرئـاوای کۆیـەو پاشـان گواسـتمانەوە بـۆ (ئـاوەگرد)کـە باسمکرد لەنێوان دوو لوتکەدایە، لەخواری ئەو شوێنەوەو لەسەر قـەدپاڵی چیاکە بیرێك لەبەرد هەیە تیرەکەی نزیکەی پێنج مەتر دەبێ و قوڵایی نزیکەی چوار مەتر دەبێو بـەفری زسـتانی تێدا کۆدەکرێتـەوە کـە لەسـەر چیاکە دەبـارێو پیـاوانی بـەهێز ئـەم بـەفرە دەپەسـتنەوەو پارچـەکانی یەکـدەگرنو پتـەودەبنو پارچـە بەفرێکی بەهێزیان لێ دەردەچێو لەهاویندا پارچـە پارچـەی بچکۆلەی لێدەکـەنو

ئەم بەفرە دەکەنە ناو ئاو یان ماستاو بۆ خواردنەوە یان ئەم بەفرە لەپاڵ گۆشت‌و شتی تردا بۆ پاراستنیان لە بۆگەن‌و لەناوچوون بەکاردێنن...تاد. واپێدەچێ خەڵك لەرابردوودا پانتاییەکی زۆریان لەسەر ئەم چیاولاپاڵانە کردۆتە دانەوێڵەی وەك گەنم و نیسك و نۆك چونکە هێشتا دەنکی ئەم دانەوێڵەیە دەڕوان بەڵام زۆر پتەو بوون‌و بەجۆرێکلەسەر ئاگریش پێنەدەگەیشتن، بەڵام لەمانە هەمووی گرنگتر بوونی سەرچاوەیەکی ئاوی سازگارو زۆر سارد بوو کە ڕاوچییەکان لێرە دەحەوانەوەو بۆڕاوی بزنەکێوی دەهاتنە ئێرەو هەموو شتێکی ئێرە باش‌و گونجاو بوو کە بکرێتە بنکەی پێشمەرگەکان. بەڵام پێویستمان بەدروستکردنی چەند ژوورێك بووبۆ ژیانی پێشمەرگەکان بۆیە فەرمانم دایە هاوڕێیان کە دەستبەکار بن بۆ دروستکردنی ئەم ژوورانەو لەپێشدا دروستکردنی چەند ژورێك بەدەوری بارەگاکەدا بۆ پاسەوانی کە هەندێك لە ژوورەکانی نووستنی پێشمەرگەوە دووربوون. پاشان دەستمان بە دروستکردنی ژوورەکانی نووستن کردو فرنێکی نانەواییمان لەگەڵ چێشتخانەیەك دروستکردو یەکەمین کەس بووم دەستم بەکارکردو قورسترین بەردم دەخستە سەرپشتم و بۆ شوێنی بیناکردنەکەم دەگواستنەوە هەرچەندە پشتیشم ئازاری زۆر بوو، بۆیە ئەم کارەم دەکرد تاهاوڕێیان فێربن چۆن خزمەتی خۆیان دەکەن، پاشان ژوورێکی پان‌وبەرینمان بۆ لاسلکی دروستکردو، ژوورێك بۆ چاپخانەی (ڕێگای کوردستان)و دەستمان کرد بەهێنانی فەرش‌و بەتانیە بۆ ژوورەکان‌و دانانی سۆپا بۆ گەرمکردنیان لە زستاندا. هاوڕێیان چالاکییەکی سەربازییان ئەنجامداو پەلاماری ڕانەمەڕێکی سەرۆك جاشەکانیانداو بەمەش باری گوزەران ودارابیمان باشتر بوو. جێگەی سەرنجە هەندێ لە پێشمەرگەکان هەندێ مەڕیان دەدزی‌و بۆ خۆیان دەفرۆشتن، بەرامبەر بەمانە کاروسزای توندمان داناو لەریزەکانمان دەرمانکردن. حەمامێکی گەرمیشمان دروستکردو پانتاییەکی گچکەشمان کردە سەوزە.

# گرانترین ئەرك

ئەرکی یەکەم و بنچینەیی ئەوە بوو هەموو پێشمەرگەکان چەکدار بکەین، بەڵام چۆن؟ پارەمان نییە چەکی پێبکڕین. شۆڕشی کورد ئەم چەکەمان ناداتێ، بەڵام چەك لای دوژمن هەیە. کەواتە دەبێ هەندێ چالاکی پێشمەرگەیی ئەنجام بدەین بۆ پەلاماردانی مەرکەزو ڕەبیە سەربازییەکانی دەسەڵاتی کودەتاگێڕان تا چەکەکانمان دەستکەوێ، بۆ ئەمەش پێویستە ژمارەیەکی باشمان پێشمەرگەی چەکدار هەبن تا ئەو چالاکییانە ئەنجام بدەین. بیرمان کردەوە نارنجۆکی دەستی دروست بکەین‌و پەلاماری ڕەبیە سەربازییەکانی حکومەتی پێ بدەین‌و دەست بەسەر چەکەکانیاندا بگرین. بەڵام چۆن و کێ دروستیان دەکات؟ مەسەلەی چەك بووە جێگەی بایەخ پێدانی سەرەکیمان‌و هەموو بیرکردنەوەیەکمان هاتە سەر ئەوەی چۆن چەك پەیدا بکەین، چونکە بووینەتە هێزێکی جەنگاوەر لەدژی دەسەڵاتی کودەتاگێڕان‌و هەردەبێ بوونی خۆمان لە شۆڕشەکەی کورددا بسەلمێنین وەك هێزێکی جەنگاوەر بۆ ڕووخاندنی دەسەڵات‌و بۆ ئەمەش دەبێ هێزێکی چەکداری جەنگاوەرمان هەبێت و دەبێ لەبیری پێشمەرگەو خەڵکدا ئەوە بسڕینەوە کە ئێمە لای شۆڕشی کورد پەنابەری سیاسی بین، هەروا دەبێ شۆڕشەکە بکرێتە شۆڕشێکی عێراقی بەبەشداریی حزبی شیوعی لە شۆڕشی چەکداریدا دژی حوکمی دیکتاتۆریی شۆڤێنی لە پێناو دیموکراسی بۆ عێراق وئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان.

بڕیارماندا هێزێکی چەکداری باش بۆ پەلاماردانی ڕەبییەکانی سەربازیی حکومەت‌و، دامەزراندنی داهێنانێکی هونەری تاکتیکی بۆ دروستکردنی نارنجۆکی دەستی پێکبهێنین، بۆ ئەمەش پێویستە هاوڕێیانی میکانیکی کۆ بکەینەوەو ئامرازی کار چی پێویستە بەکاری بهێنێت پەیدا بکرێت‌و، بۆ دروستکردنی نارنجۆکی دەستی پێویستە مادەی (TNT)و کەبسولەو لولەکی ئاسنین یان

ئەلەمنیۆم هەبن. ئەم تیپە بەسەرۆکایەتی ئەفسەرێکی ئەندازیاریی پێکهات و کارگەیەکیان لە(دۆڵە ڕەقە) کە ناوچەی عەباسی مامەند ئاغا بوو، دامەزراند. ئەم تیپە دەبوو هەرچی پێویست بێت بۆ کارگەکەی پەیدا بکات. بەلام وێڕای لاوازیی باری داراییمان، لەخۆراکی خۆمان پاشەکەوت دەکرد تا پێویستییەکان دابین بکەین. پاش باس و پشکنین جوتیاران و شوانەکان هەواڵیان پێدەگەیاندین کە هەندێ بۆمبا لە فرۆکەوە فڕێدراون و نەتەقیونەتەوەو، هاوڕێیانی تیپی هونەری دەچوون ئەو بۆمبایانەیان دەدیتەوەو مادەی(TNT)یان لێ دەردەهێنان و، ئەم بۆمبایانە بۆ سەر دانیشتوانی دێهاتەکان و شوانەکان مەترسی بوون، لەسەرەتاوە نەیاندەزانی ویارییان پێدەکردن وبەسەریاندا دەتەقینەوەو خەڵکیان دەکوشت.هەروا بۆری لولەکییان لە عەمودی تەلەفونەکان کە کەوتبوونە سەرزەوی دەستدەکەوت، بەلام کەپسولەو فتیلەکانمان لەبازاڕ لەرێگەی ڕاوکارانی ماسییەوە دەکڕی، هەروا تۆپیشیان دروست دەکرد. جارێکیان هاوڕێیان لە بنکەی (کانی گوێز) لەچیای سەفین و لەنزیك هیران بانگیانکردم بۆ بینینی تاقی کردنەوەی تۆپێك کەخۆیان دروستیان کردبوو، منیش ڕۆیشتم بۆ ئەو شوێنە کە لەئاوەگردەوە بەپێ نزیکەی سێ سەعات دووربوو، بۆرییەکی گەورەی عەمودی تەلەفۆنم دی لەدواوە فتیلێکی درێژیان تێ خستبوو، لولەکی تۆپەکە بەدوو سنگەوە توند بەگوریس بەستراباوەو گاشەبەردی گەورەیان خستبووە سەر گوریسەکەو پێش تاقیکردنەوەکە پێمگوتن: ئەم تاقیکردنەوەیە سەرکەوتوو نابێ چونکە تەنیا بۆیەکجارو فڕێدانی گولله تۆپێك بەکاردەهێنرێ.

هاوڕێی ئەفسەری ئەندازیاری دەستی بەئامادە باشی کرد بۆ تاقیکردنەوەکەو بەئێمەیان گوت دوور بکەونەوەو، فتیلەکەی بە جگەرەیەك داگیرساند تائاگر گەیشتە کەپسولەکەو دەنگێکی زۆر گەورەمان بەرگوێ کەوت و گوللەتۆپ و تۆپەکەو بەردە گەورەکان و گوریسی سنگەکان هەمووی بڵاوبوونەوە چونکە بنکەکە لاوازبوو بەرگەی هێزی پاڵپێوەنەری ئەو تۆپە گەورەیەی نەدەگرت. پێمگوت تاقیکردنەوەکە سەرکەوتوو نەبوو دەبێ دەستبەرداری دروستکردنی ئەم چەشنە تۆپانەبن و، بایەخ بە پەرەپێدانی نارنجۆکی دەستی بدەن، جاری دووەم

هاوڕێیان ئەم تۆپەیان تاقیکردەوە بەڵام تاقیکردنەوەی ئەمجارە بۆمبۆردومانی سوپاگەی شەقلاوە بوو، کاتێك گوللەتۆپەکە دەکەوێتە سۆپاکەوە ئیتر سۆپا دەست بەتەقاندنی گوللە هاوەن دەکاتو بەهەزارحاڵ هاوڕێیان توانییان خۆیان ڕزگار بکەن و بەسەلامەتی بگەڕێنەوە. لەناوچەکەدا بڵاوبۆوە کە یەکێتی سۆڤیەت تۆپی ناردووە بۆ شیوعییەکان! دوای ئەم تاقیکردنەوەیە ئاگاداریی هاوڕێیانمان کرد کە دووبارەی نەکەنەوە.

# یەکەمین شەڕی شیوعییەکان
# لە( سەری حەسەن بەگ و سەری بەردی )

بارودۆخەکە ئالۆز بوو، پەیوەندی نێوان پدك و کودەتاگێڕان دوای ژێرکەوتنی وتوویژ لەنێوانیاندا کەوتەبارێکی گرژەوە، دەسەلاتی شوبات شوێنەواری خۆی بەهێز دەکردو خۆی بۆ هێرشکردنە سەر شوێنەکانی شۆڕش ئامادە دەکرد، هێزێکی شەڕکەری جاشەکانی نارده (سەری حەسەن بەگ وسەری بەردی) لە باکوری شاری دیانە، بۆ پاراستنی هاتوچۆی سوپا لەم ناوچەیەدا، ئەوکاتە بارزانی لەناوچەی (خواکورك) بوو، هاوڕێیانمان لەبارودۆخی ئەم ناوچەیە کۆڵینەوە تالەوێ چالاکی پێشمەرگایەتی ئەنجام بدەن بۆ لەناوبردنی جاشەکان لە سەنگەرەکانی (سەری حەسەن بەگو سەری بەردی)، تیپی تفەنگو تیپی نارنجۆکی دەستی دروستکران و نەخشەی هێرش بۆ سەر ئەو سەنگەرانە دانرا کەدەسەلاتیان بەسەر هەموو ناوچەکەدا دەڕۆیشت، بەمەرجێك شەڕەکە شەو دەست پێبکات و، هاوڕێیانمان راسپێردران هێرش بەرنە سەر شوێنی (کوشینا) چەکەکانیشمان کەم و کۆن بوون، بەلام نارنجۆکی دەستییمان بۆ ناردن کە خۆمان دروستمان کردبوون (فتیلەدار) بۆ ئەمەش وایپێویست بوو هێرشی دەستەویەخە ببرێتە سەر سەنگەرەکان، ئەوەبوو هەندێك لە هاوڕێیانمان گەیشتنە شورای سەنگەرەکان و پێکەوە نارنجۆکی دەستییان هاویشتە ناو سەنگەرەکان ئیتر ئەو جاشانەی کە لەناو سەنگەرەکاندا بە زیندوویی مابوونەوە بەچەشنێکی شێتگیرانە بەهات وهاوارو ترسەوە دەرچووبوون وهاوڕێیانیشمان سەنگەرەکانیان گرتبوون و لەمەدا دوو شەهیدو چەند برینداریکمان هەبوون لەوانە نەجمەدین مامۆ کە قاچی بریندار بوو عەمەلیەتی قاچ برینەوەی بۆکرا، بەمجۆرە هێزەکانی مەفرەزەکە توانییان ناوچەیەکی فراوان و ستراتیژی لەهێزەکانی حکومەت بەهێزی جاشەکانیشەوە پاك بکەنەوە.

ئەمە یەكەمین شەڕ بوو بیكەین و سەركەوتنێكی گەورەی تێدا دەست بخەین و سەلماندمان كە ئێمە حزبێكی جەنگاوەرین نەك حزبی (ئەفەندییەكان) پێگەمان لە شۆڕشدا بەهێز بوو هەندێ چەكیشمان دەستكەوت. هەروا لەو كاتەشەوە سەركردایەتی شۆڕش لەجەنگەكاندا پشتی بەهێزی جەنگاوەریمان دەبەست، دەستی بەیارمەتیدانمان كرد، بەچەك و بەئازوقە یارمەتی دراین. ئەم سەركەوتنەمان بەسەر هەموو بنكەكانماندا بڵاوكردەوەو داوامان لێكردن سەركەوتنی نوێ بەسەر ڕژێمی دیكتاتۆری شۆڤێنیدا بێننەدی.

# پەیوەندی نێوان حزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان

کاتێك حزبی دیموکراتی کورد (پارتی) لەساڵی ١٩٤٦دا پێکهات، دوای ئەوە حزبی شیوعی کوردستانی عێراق خۆی هەڵوەشاندەوەو، زۆربەی سەرکردایەتی و کادیرەکانی چوونە ناو حزبی شیوعی عێراق و، پاش ئەوەی حزبی (ڕزگاری کورد) خۆی هەڵوەشاندەوەو کۆنگرەی یەکەم بۆ دامەزراندنی (پارتی) بەسترا، لەکوردستاندا دوو هێزی سەرەکی هەبوون، ڕێکخراوی لقی حزبی شیوعی عێراق و حزبی ڕزگاریی نیشتمانی لەلایەك و حزبی دیموکراتی کورد بەسەرکردایەتی بارزانی‌و سکرتێریی هەمزە عەبدوڵلاّ. پەیوەندی خەباتگێڕانەی هاوبەش لە نێوان ئەم دوو هێزەدا پێکهات چونکە هەردوو لایان لەسەر خاکی هەرێم هەبوون وەك دوو هێزی سیاسی خاوەن ئامانجی نیشتمانی‌و نەتەوەیی و دیموکراسی هاوبەش، چ سەبارەت بەمەسەلەی کورد و مەسەلەی رزگاریی عێراق لەدەسەڵاتی ئیستیعماری بەریتانیاو، مەسەلەی پێکهێنانی ڕژێمێکی نیشتمانی دیموکراسی لەعێراقداو، پارتی خولیای بەرەو هاوکاری بوو لەگەڵ حزبی گەل—الشعب— بەسەرکردەیی عەزیز شەریف‌و حزبی یەکێتی نیشتمانی —الاتحاد الوطني— بەسەرکردەیی عەبدولفەتاح ئیبراهیم‌و حزبی نیشتمانی دیموکراسی لەکاتێکدا هیچ کام لەم حزبانە هەڵوێستێکی مەبدەئییان لە مەسەلەی کورد نەبوو، بەم پێیە پەیوەندی لەنێوان هەردوو حزبەکەماندا لەهەڵکشان‌و داکشاندا بوو، هێزە ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکانی ناو پارتی لەهەڵسوڕاندا بوون بۆ ئاڵۆزکردنی پەیوەندیی نێوان حزبی شیوعی و حزبی دیموکراسی کوردی، هەروا شیوعییە بەستەڵۆکەکان و هەندێ لەوانەی خۆیان لەسەر شیوعییەکان حساب دەکرد هەوڵیان دەدا پەیوەندی خەباتگێڕانەی نێوان هەردوو لایان ئاڵۆز بکەن، هەر لەوکاتەشدا هێزە ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکانی عەرەب و هێزە کۆنەپەرستەکان و

نۆکـەرانی دەزگـای هــەواڵگری بێگانــەش لەچـالاکیدا بـوون بـۆ تێکدانی نێـوانی شیوعییەکان و پارتییەکان و، بەشێوەی تایبەتی، دوای شۆڕشـەکەی ١٤ی تـەموز بـــۆ دەروازە ئاواڵاکردنـــەوە لـــەپێش تێپـــەڕبوونی نەخـــشە پیلانگێڕییـــە کودەتاگێڕییەکانیانـدا لــە دژی شۆڕشـەکەی ١٤ی تمـوزو دەسـکەوتەکانیو بـۆ تێسرەواندنی هێزە نیشتمانیو پێشکەوتنخوازەکان و لەپێشیانەوە حزبی شـیوعی عێراق. بارئالۆزبوونی نێوان بنکـەکانی هـەردوو حـزب، پـارتی و شـیوعی گەیشتە ئاستێك هێندەی نەمابوو پێکدابدەن، لەبەر ئەوەبوو بڕیاردرا لەگەڵ عومەر دەبابـە سەردانی کۆیـە بکـەم تـا مەسـەلەکە چارەسـەر بکـەین، لـە کۆیـە کۆبوونەوەیـەکم لەگەڵ ڕێکخستنەکان کردو بۆم ڕوونکردنەوە کە بارئالۆزیی نێوان هەردوو حزبەکـە هەرچۆن بێـت لەبەرژەوەنـدی ئیـستیعمارو نۆکـەرانێتی، چـونکە ئـەم دوو حزبـە بەرژەوەندیو ئامانجی هاوبەشیان پێکـەوە هەیـەو دوو حزبـی دیمـوکراتن لـەدژی ڕاســـتڕەوی و کۆنەپەرســـتی و ئیــستیعمار. دوای ئـــەوە لـــە قائیمقامییـــەت کۆبوونەوەیەکی جەماوەریمان ڕێکخستو بـۆ ئـەو جـەماوەرە وتـارێکم پێشکەش کردو لەوێدا ڕوونمکردەوە کە (هێـزە ناسیۆنالیـستە ڕاسـتڕەوەکانو کۆنەپەرستی بـــەئامۆژگاریی هـــەواڵگری ئیـــستیعمار لەنەخشەکێـشاندان بـــۆ کودەتایـــەك بـــۆ ڕووخاندنی دەسەڵاتی١٤ی تەموزو دەستکەوتەکانیو هەندێك ناوەندی فەرمانڕەواو هەنـدێ هێـزی نـاو حزبـە نیشتمانییەکان، بیانــەوێو نەیانــەوێ، کەوتوونــە ئـەم نەخشەکێشانەوە، بەتایبەتی بۆ قەدەغەکردنی ژیانی حزبایەتی و ڕاگرتنی چـالاکی حزبییان بۆ ڕێگە خۆشکردن لەبەردەم ئەم پیلانەداو، حزبی ئێمە، حزبـی شـیوعی عێراقو پارتی دیموکراتی کوردستان ئەم ڕەوتەی دەســەڵاتی فـەرمانڕەوا دەدەنـە دواوە کـە دەیانــەوێ بەدەســتی خۆیــان گــۆڕی خۆیــان هەڵکـەنن، حکومــەت لــە سیاسەتی بەرەلاکردنی ئازادییـە دیموکراتییـەکان پاشەکـشەی کـردووەو دەیـەوێ ڕاسـتڕەوان و کۆنەپەرسـتی قایـل بکـات، هــەردوو حزبمـان لــەپێناو دیموکراسـیدا خەبات دەکەن، چونکە هەر ئەمەیـە زامنـی هێنانــەدی مافـە نەتەوەییــەکانی گــەلی کوردمان).

پاشان تێکۆشەری دیموکراتیو ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی مامۆستا عـەلی

عەبدوڵا لەم کۆبوونـەوە جەماوەرییـەدا وتـارێکی بـەنرخی پێشکەش کـردو لەوێدا جەختی لەسەر ڕەوتی بنچینەیی ڕێکـەوتن و هاوپـەیمانی دووقـۆڵی هـەردوو حـزب کـردەوە کەلەڕاسـتیدا مەترسـی پیلانگێڕیـی هەیـە بۆسـەر هـەموو دەسـتکەوتە پێشکەوتنخوازەکانی شۆڕشی ١٤ی تەموز و، هاوپەیمانیی هەردوو حزبی پـارتی و شـیوعی و بـەهێزکردنی زامنـە بـۆ پاراسـتنی کۆمـارو دەسـتکەوتەکانی شـۆڕش و بێزاریی لەهەڵوێستی حکومەت دەربڕی کـە ژیـانی حزبایـەتی ڕاگرتـووەو دووپـاتی کردەوە کە پارتی ئەم هەڵوێستە ڕەتدەکاتـەوە، هـەروا جـەختی لەسـەر ئـەوەش کردەوە کە کەسانێك هەن بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دەیانەوێ نێوانی هەردوو حـزب ئاڵۆز بێتو، هەندێ هەن پەیوەندی لەگەڵ حزبی شیوعی یان پارتی بەکاردێنن بـۆ بەرژەوەندیی خۆیان و ئەوانـەی لەدوایانـەوەن... بـەمجۆرە بارئـاڵۆزی تاڕادەیـەك زۆرخاو بۆوەو بەڵام بەگشتی بارودۆخەکە بـۆ بەرژەوەنـدیی هێـزە پیلانگێڕەکـانی ناسیۆنالیستی ڕاسـتڕەو وکۆنەپـەرسـتو نەخـشەکانی هـەواڵگری ئیـستیعمارگەران پـەرەی دەسـەندو، پەیوەندییـەکانی نێـوان حکومـەتی قاسـم وپـارتی دیمـوکراتی کوردستان بەرەو خراپی دەچـوون، ئەمـەش دوای ئـەوەبوو کـەپارتی قایـل نـەبوو چالاکی و ڕێکخستنەکانی ڕابگرێت.

# ساڵی ١٩٦٤ ساڵی ئاڵوگۆڕەکانی ناو عێراق‌و ناو بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان

لەو ساڵەدا ئاڵوگۆڕ لەعێراقدا ڕوویاندا، پەیوەندیی نێوان تیپە ناسیۆنالیستە کودەتاگێڕەکان ئاڵۆز بوو، نێوانی ناسیۆنالیستە ناسرییەکانی عەرەبی عێراق لەلایەك و حزبی بەعس لەلایەکی ترەوە. نەتەوەپەروەرانی عێراقی و ناسرییەکان بەسەرکردەیی عەبدوسەلام عارف توانیان دەسەلآت بگرنە دەست‌و بەعسییەکان لە گشت پلەو پایەکانی حکومەتدا ڕامالن‌و، حکومەت پەلاماریکی دەستگیرکردنی بردە سەریان و بەرپرسێتی گشت ئەو تاوانانەی لەکودەتای ڕەشی شوباتدا کران خرانە سەر ئەستۆی بەعسییەکان‌و لەناو ڕیزەکانیشیاندا شڵەژاوی و کێشەو ناکۆکی زۆر پەیدا بوون‌و، ئەحمەد حەسەن بەکر ڕاگرتنی چالاکی حزبی و سیاسی خۆی ڕاگەیاندو، عەلی ساڵح ئەلسەعدی کە بەرپرسی عێراقیان بوو، ڕایگەیاند کە (بەشەمەندەفەرێکی ئەمریکی هاتونە سەرحوکم) دوای لادانی بەعسییەکان ناسرییەکانیش هەوڵیاندا لە ریزەکانی پێشەوەدا جێگە بگرن وڕێکخستنێکی سیاسییان پێکهێنا بەناوی (یەکێتیی سۆسیالیستی عەرەبی—الاتحاد الاشتراكي العربي) لەسەر شێوازی یەکێتی سۆسیالیستی عەرەبی لەمیسر، بەلآم لە هەوڵدانیاندا بۆ دەستگرتن بەسەر حوکمدا ژێرکەوتن و، لەوکاتانەدا زەبری بەهێز لەبەعسییەکان دراو بەعسییەکان بوونە دوو تەوژم و دوو ڕێکخراو، تاقمەکەی بەکرو سەدام و، تاقمەکەی سەربە بەعسی سوریا.

هاوڕێیانی شیوعی، لەسەرکردایەتی ڕێکخستنی فوراتی ناوەڕاست، توانییان بگەنە بەغداو ڕێکخستنەکانی بەغدا کۆ بکەنەوەوبگرنەوەو پەیوەندی بەسەرکردایەتی ڕێکخراوی حزبەوە لە کوردستان بکەن و، ئیتر دەستمان کرد بە پێکهێنانی ناوەندێکی کاتیی کارکردن‌و، ڕەوتی کادیرانی سەرکردایەتی کەلەبەغدا کاریان دەکرد بەرەو ئەوە دەچوو پەیوەندیی تایبەتی لەگەڵ یەکێتی

سۆسیالیستی–الاتحاد الاشتراکی– پێکبهێنن تائەو ئاستەی بگاتە ئەوەی حزبی شیوعی بچێتە ناوئیتحادی ئیشتراکی، ئەم ڕەوتە لەلایەن باقیر ئیبراهیمەوە سەرکردایەتی دەکرا، بەڵام سەرکردایەتی ڕێکخراوی حزب لە کوردستان لەگەڵ ئەم ڕەوتە پاکتاوکارییە نەبوو بەرەنگاری وەستایەوەو بڕیاردرا هاوڕێ عومەر عەلی شێخ (أبو فاروق) بۆ بەغدا بنێردرێت تا لەگەڵ هاوڕێیان هاوکاری بکات بۆ گردکردنەوەو دروستکردنەوەی ڕیکخراوەکان.

لەم ڕۆژانەدا هاوڕێیانی دەرەوە داوای کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندییان کرد کە لەدەرەوە پێکبێت و، منو هاوڕێ عەزیز محەمەد بەشێوەیەکی نهێنی سەفەرمانکردو ڕۆیشتینە سلێمانی، لەوێوە بۆ بەغداو پاش گەیشتن و دیداری هاوڕێیان ئاگادار کراین کە هاوڕێیانی دەرەوە داوای کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزبیان کردوە بۆ مەبەستی دیاریکردنی سیاسەتی تازەی حزب و هەڵبژاردنی مەکتەبی سیاسیو سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی، هەروا بڕیاریش درا دوایی بچینە قوتابخانەی حزبی لەمۆسکۆ بۆ خوێندن لەوێ بۆ ماوەی دووساڵ. هاوڕێیان دوو پەساپۆرتیان بۆ سەفەر بۆ ناردین یەکێکیان بەناوی هاوڕێ عەزیزو ئەوی تریش بەناوی منەوە، سەفەرمان بۆ بەسرە کردو کاتی دیاریکراوی دەرچوونمان بۆ یەك ڕۆژ دواکەوت، منیش دەستکاریی مێژووەکەم کرد بەڵام دەستکارییەکە بەئاشکرا دیاربوو. لەبەر ئەوە لەسنور دەرنەچووم و گەڕامەوە بۆ بەغداو هاوڕێیانم لەمەی ڕوویدا ئاگادار کردەوە، بەڵام هاوڕێ عەزیز بەبێ هیچ کۆسپو تەگەرەیەك گەیشتە کوێت و لەوێشەوە بۆ بەیروتو ئینجا بۆ پراگ.

کاتی گەڕانەوەم بۆ بەغدا بەهاوڕێ ئەبو فاروق گەیشتم کە ئەوکاتە ناوەندی کاربوو، داوام لێکرد کە ئەو یادداشتەم بداتێ کە باقیر ئیبراهیم نووسیویەتی و داویە بەئیتیحادی ئیشتراکی، لەوێدا داوا دەکات حزبی شیوعی بچێتە ناو ئیتیحادی ئیشتیراکی، یادداشتەکەم خوێندەوە، ناوەرۆکەکەی ئەوەبوو پێویستە گشت ڕێکخراوەو حزبەکان کە ڕێبازیان ئیشتیراکییە لەیەك ڕێکخراودا یەك بگرنەوە کە ئەویش ئیتحیادی ئیشتیراکییە بۆ ڕاوەستان بەڕووی هێزە ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوە سەرچڵەکانداو لەدژی ئیستیعمار، لەیادداشتەکەدا بەشان و باڵی

عەبدوناســرو ئیتیحــادی ئیــشتراکی میــسریدا هــەڵگوترابوو کــە سۆســیالیزم دادەمەزرێنن. !

پــاش دیتنــی یادداشــتەکە وتــارێکم لــە (طریـق الـشعب)دا نووســی و ڕەخنــەم لەناوەڕۆکی یادداشتەکە گرتبوو، بەبێ ئەوەی ناوی ببەم، داوامکردبـوو بەرەیـەکی نیشتمانی دیموکراتی پێکبێت دوای ڕێکەوتن لەسەر ئامـانجی هاوبـەشو پـەیڕەوی ناوخۆی و، ئەوجا دەرگاکردنەوە لەڕووی هەموو حزبو ڕێکخراوەکاندا کە بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆکەیان لاپەسەندەو، بنچینەی ئەم بەرەیە دەبێ دیموکراسی بێتو، دەنگدان لەبەرەدا بەزۆربەبێتو ئەو حزبەی هەر بڕیارێك پەسـەند ناکـات دەتـوانێ پەسەند نەکردنی ئەو بڕیارە ئاشکرا بکات.

ئالــەو کاتــەدا کێشەی نــاوخۆ لــەناو کۆمەڵــە کادرەکـانی سـەرکردایەتی حزبـدا توندوتیــژ بــوو لــەبارەی ئــەو ئــاڵوگۆڕی کرانەوەیــە لەگــەڵ نەتــەوە پــەروەرو ناســرییەکاندا، واتــە لەســەر ئــەو یادداشــتەی بـاقیر ئیـبراهیم دابویـە ئیتیحـادی ئیشتیراکی عێراقی سەبارەت بە وەرگرتنو پاکتاوکردنی حزبی شیوعی.

کۆمیتەی ناوەندی لە پراگ–ی پایتەختی چیکۆسلۆفاکیا کۆبۆوە، بـۆ داڕشـتنی سیاسەتێکی تازەو هەڵبژاردنی سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسـی و نەمتوانی لەبەر ئـەو هۆیانـەی باسـم کـردن لـەم کۆبوونەوەیەدا بەشـداربم چـونکە نەمتوانی بەهۆی بەسەرچوونی کاتی دەرچوونمەوە سەفەر بکەم. سیاسەتی حـزب ناوەڕۆکی یادداشتەکەی باقیر ئیبراهیمی تێدا بالادەست بوو، بەڵام حـزب نەچـووە ناو ئیتیحادی ئیشتراکی چونکە ئەوان بەدەنگ داوای یادداشتەکەوە نەهاتن.

سیاسەتی حزب بە(سیاسەتی ڕاستڕەو) ناونراو لەناوحزبدا چەند دەستەبەشێك بـەدیار کـەوتن، دەستەبەشـێکی "چـەپگیر" کـە داوای لادانـی سـەرکردایەتیو، بـەرپاکردنی شـۆڕش یـان کودەتایـەکی سـەربازی دەکـرد بۆڕووخانـدنی ڕژێمـی دیکتـاتۆریو دانـانی دەسـەڵاتێکی دیموکراسـی شۆڕشـگێڕ، دەستەبەشـی ناوەنـد داوای دەکرد دان بنرێت بەهەڵەی سیاسی ڕاسـتڕەوداو یـەکێتی حـزب بپارێزرێـتو کاربکرێ بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و چـارکردنی بـارودۆخی حـزبو بـەهێزکردنی ڕێکخستنی حزبـیو ڕێکخـراوە دیمـوکراتیو نـەقابی وپیـشەییەکانو بزووتنـەوەی

جوتیاران‌و بانگکردنی حزب‌و ڕێکخراوەکانی تر بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی‌و دیموکراتی‌و بەهێزکردنی هاوپەیمانی لەگەڵ شۆڕشی کوردو هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی دەسەڵاتی دیکتاتۆری، بە بەکارهێنانی گشت شێوازەکانی خەبات لەگەڵ زیاتر پەسەندکردنی ڕاپەڕینی میللی چەکدار کە هێزەکانی سوپای شۆڕشگێڕ بەشداریی تێدا بکەن‌و دەبێ زۆر بەوردی‌و بایەخەوە ئامادەباشیی بۆ بکرێت. لەکاتێکدا دەستەبەشی سێیەم داوای پاراستن و پەرەسەندنی سیاسەتی ئێستای حزبی دەکردو داوای هاوکاریی دەکرد بەتایبەتی لەگەڵ ناسرییەکان بۆ ڕامالینی دەسەلات.

مەترسیدارترین دەستەبەشێك کە هەڕەشەی لە یەکێتی حزب دەکردو هەولیدەدا هەموو تەقەلاکان بۆ ڕاستکردنەوەی سیاسەتی حزب و نەخشەکێشانی سیاسەتێکی واقیعبینانە ژێرکەوتن بەدەست بێنێ، ئەو سیاسەتەی بەپێی تواناکانی حزب و بزووتنەوەی دیموکراتی بەهێزی شۆڕشی کوردیشەوە، بریتییە لە دەستەبەشی بەناو چەپخواز..

دوای کۆتایی هاتنی کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی هاوڕێیانی دەرەوە پەساپۆرتێکی تازەیان بۆ ناردم بۆ ئەوەی لەعێراق دەرچم و بچمە قوتابخانەی حزبی لە پەیمانگای زانستە کۆمەلایەتییەکان لە مۆسکۆ، نزیکەی چوارمانگێك لەخوێندن دواکەوتبووم بەلام توانیم بگەمەوە هاوڕێیان بەتایبەتی لە ئابوری سیاسیدا چونکە خۆم ئەم بابەتەم لە عێراق خوێندبوو لەناو بەندیخانەی کوتیش خوێندبووم.

خوێندنەکە دووساڵ بوو زۆریش بۆ ئێمە سودمەند بوو چونکە فێربووین چۆن مارکسیزم-لێنینیزم بخوێنین وەك بەرنامەیەك لە کاری حزبی و چالاکی سیاسیدا، مامۆستاکەش وەك مامۆستای قوتابخانەیەکی ئاسایی نەبوو بەپێی کتێبێکی قوتابخانە دەرسەکە بلێتەوە، بەڵکو ئێمەی ئاراستە دەکرد کە چۆن ئابوری سیاسی و فەلسەفەی مارکسی و مێژووی بزووتنەوەی کۆمونیستی‌و کرێکاری جیهانی بخوێنین، ئامۆژگاریی دەکردین بۆخوێندنی چەندان سەرچاوەی جۆربەجۆر لە ئابوریی سیاسیی سەرمایەداریی‌و سۆسیالیستیدا، هەروا تیئۆرییەکانی

ئابوریزانە سەرمایەدارەکان‌و تیئوری کارڵ مارکس لەئابوریدا بەتایبەتی کتێبە بەناوبانگەکەی (سەرمایە) هەروا لەبواری فەلسەفەشدا تیئورییەکانی فەیلەسوفە گریکەکان و ئایدیالیستەکانی چەرخەکانی هەژدەیەم و نۆزدەیەم‌و بیستەممان دەخوێند، لەڕاستیدا هەلێکی بەنرخ بوو بۆ ئێمە کە لەئابوریی و فەلسەفەو مێژوودا زانیارییەکانمان فراوان بکەین بەچاکی پلیخانۆف واتەنی (ئەلف‌و بێی شیوعی)فێربین.

لەکۆتایی خوێندنەکەمدا بەڕێوەبەرێتی پەیمانگا داوای لێکردم نووسراوێك (یان لێکۆڵینەوەیەك) لەبارەی گیروگرفتی زەوی و بزووتنەوەی جوتیارییەوە لە عێراقدا ئامادە بکەم، منیش لێکۆڵینەوەیەکی کورت‌و چڕوپڕم لەم بابەتە گرنگەدا نووسی‌و، کرایە ڕووسی‌و وەك سەرچاوەیەك بۆ قوتابیانی پەیمانگەکە دانرا، بەتایبەتی بۆ قوتابیانی ئەو وڵاتانەی لە عێراق دەچن.

دەستەی خوێندکارانی حزبی شیوعی عێراق ئەم هاوڕێیانە بوون: عەزیز محەمەد و باقر ئیبراهیم و کەریم ئەحمەدو هاوڕێیەکی تر لە موسڵەوە ناوەکەیم بیر کردووە، کە برای هاوڕێ د.غانم حەمدون بوو، دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق وازی لە حزب هێناو دەستی دایە کاروباری بازرگانی ، وێڕای هاوڕێ د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ کە لەزانکۆی مۆسکۆ دەرچووبوو، حزبیش دەیویست خوێندنەکەی لە مارکسیزمدا قوڵ بکاتەوە تا لەمەسەلەکانی فێربوونی تیۆریدا کەڵکی لێوەربگیرێت.. بەڵام لەبواری خوێندنی زانکۆدا خۆی خەریك کردو دکتۆرای لە ئەدەبی کوردیدا وەرگرت.

لەساڵی ١٩٦٧دا و، دوای تەواوکردنی کاتی خوێندنەکەم، بەڕێگەی سوریادا گەڕامەوە بۆ عێراق، هاوڕێ زەکی خەیریش گەیشتبووە دیمەشق، هاوڕێ شێخ عەلی بەرزنجیش لە دیمەشق چاوەڕوانی دەکردین کە حزب بەتایبەتی ناردبووی بۆ ئەوەی یاوەرمان بێت، لە دیمەشقەوە بەرەو قامشلی کەوتینەڕێ و هاوڕێ یوسف فەیسەڵ لە حزبی شیوعی سوریش تائەو شارە لەگەڵمان هات بۆ ئەوەی لەڕێگە تووشی گیروگرفت نەبین بەتایبەتی ئێمە هیچ ناسنامەیەکمان پێ نەبوو. پاش دوو ڕۆژ دەستەیەکی تر ئامادەکرا تاسەر ڕووباری (دیجلە) بەڕێمان بکەن و لەوێوە بۆ

خاکی عێراق بپەڕێنەوە، ئەو دەستەیە بەسەرکردەیی هاوڕێ (ئەبوجنگو رەمۆ شێخۆ)بوو، لێمپرسی ئاخۆ دەتوانین لێرە دوو ئێستر بکڕین‌و بۆ ئەوبەری عێراقیان ببەین، گوتی دەتوانرێ لەبەر ئەوە بڕیارماندا دوو ئێستر بکڕین‌و جانتاو شتەکانمانیان پێ بگوێزینەوەو بۆ سواربوونیش بەکاریان بێنین بەتایبەتی کە (ئەبویەحیا) توانای رۆیشتنی نەبوو، بەتایبەتی لەوڕێگەوبانە سەختەدا. خۆمان ئامادە کرد بۆ ئەوەی ئێوارە بەرەو شوێنی پەڕینەوە بچینە گوندێکی سەرسنوور. گەیشتینە ڕووبارەکەو دەستەی (مەلەوانەکان) خۆیان ئامادەکردو یەکەمجار ویستیان دوو ئێسترەکە بگەیەننە ئەوبەر، ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو پاش هەولێکی زۆر توانییان هەردوو ئێسترەکە بەناو ڕووبارەکەدا بگەیەننە ئەوبەری عێراق دوای ئەوە تیپەکە چەند چوپی ئۆتۆمبیلی لۆرییان ئامادەکردو پێکیانەوە بەستن و تەختەوداریان خستنە سەرو قایمیان کردن‌و من‌و ئەبویەحیا لەسەریان دانیشتین‌و مەلەشمان نەدەزانی بۆیە داوایان کرد تا ئەوبەر نەجوڵێینەوە. کاتێك گەیشتینە ئەوبەرو چوپەکان گەیشتنە تەنکاو هەستام و لە کەڵەکەکە هاتمەخوارێ. بەڵام ئەبویەحیا لەجێی خۆی نەدەجولایەوە، گوتم هاوڕێ گەیشتین، هەستە وەرەخوارەوە. لەوەڵامدا گوتی ئەی نەیانگوت مەجوڵێنەوەو وەك تەختە بن، دەبێ ئەوان پێم بڵێن دابەزە نەك تۆ، چونکە ئێمە فەرمان لەوان وەردەگرین! بەهەرحاڵ بەسەلامەتی گەیشتینە کەناری ئەوبەرو، دوو هێسترەکەیان هێناو بارمان کردن‌و بەسەلامەتی چووینە گوندی (دیرەبوون) کە گوندێکی فەلەی ئاشوری بوون، لەوێش چووینە ماڵی (ئێلیا) کە لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشی کوردەوە کرابووە بەرپرسی گوندەکە. هاوڕێیەکی جوتیاری سوری لە گوندەکانی سنوور لەگەڵمان بوو، بەچاکی شارەزای ناوچەکە بوو، بەرپرس‌و کەسابەتییەکانی ناوچەکەی بەباشی دەناسی.

ئێلیا زۆر بەگەرمی پێشوازیی لێکردین‌و خواردنی بۆ ئامادە کردین و جێگەی نووستنی گەرم، وەرزەکەش دوا رۆژەکانی پایز بوو بەرەو سەرما دەچووین بەتایبەتی بەشەو سارد بوو. بۆرۆژی دووەم ڕوومانکردە بارەگای عیسا سواری فەرماندەی (پێشمەرگە) لە ناوچەی زاخۆ، شەوێکیش لای ئەوماینەوە، هەواڵی بۆ

بارزانی ناردبوو کە فلآن‌و فلآن لە یەکێتی سۆڤیەتەوە هاتوون چۆن مامەڵەیان بکەین، بارزانی لە وەلآمدا گوتبووی دەبێ ڕێزیان لێبگیرێت ویارمەتی بدرێن بۆ گەیشتنە ئەو شوێنەی دەیانەوێ، ئەوجا هەڵوێستی عیساسوار گۆڕدراو ئامادەیی خۆی پیشاندا بۆ یارمەتیدانمان بەوشێوەیەی دەمانەوێ، ئێمەش سوپاسمان کردو بۆ بەیانی لەبارەگاکەی دەرچووین بەرەو بارەگای هاوڕێمان تۆما تۆماس (ئەبوجوزیف). جێی سەرنجە لەسەرەتادا عیساسوار هەڵوێستی بەرامبەرمان سەلبی بوو، هەروا بەرامبەر ئەو هاوڕێ سورییەی کە لەگەڵماندا بوو، هەروا بەرامبەر ئیلیا، بەلآم دوای گەیشتنی بروسکەی بارزانی هەڵوێستی لە ئێمە بەرەوباشی گۆڕدرا، لێرەشدا هەردەبێ بەوپەڕی خەم‌و دڵگیرییەوە ئەو ڕووداوە بێنمەوە یاد کە دوای چەند ساڵێك ڕوویداو عیساسوار یانزە هاوڕێمانی کوشت کە لەولاوانە بوون حزب ناردبوونی بۆ دەرەوە لەیەکێتی شورەوی‌و لەڕێگەی سوریاوە گەڕابوونەوەو لەکوردستانەوە هاتبوونەوە عێراق و عیساسوار گرتبوونی‌و بەخوێن ساردی هەموویانی کوشتبوو، ئەمەش هەرلەبەر ئەوەی ژنە ڕووسەکەی لێی جودا بووبۆوەو گەڕابۆوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت، دوای ئەوەی کە زانیبووی عیسا ژنێکی دووەمی هەیە، بۆ تۆڵە سەندنەوە لەو هاوڕێیە لاوەکانی ئێمەی بەبێ گوناە کوشتبوو! دوای چەند ساڵێکیترو پاش شکستییەکەی شۆڕشی کورد لەساڵی ١٩٧٥دا عیساسوار بەدەستی پاسەوانەکانی خۆی کوژرابوو.

مایەی سەرسامییە کەس تائێستا شوێنی ناشتنی تەرمی یانزە هاوڕێیە لاوەکە نازانێت، هەرچەندە ئێمە هەواڵەکەمان لە ڕۆژنامەی حزبدا بلآوکردەوەو پرۆتیست و بێزاریمان دابەسەرکردەی شۆڕشی کورد بەلآم هیچ کارێکیان نەکرد.

لەسەر ڕۆیشتن بەرەو بارەگای هاوڕێمان تۆما تۆماس بەردەوام بووین و پاش گەیشتن و حەسانەوەمان بۆماوەی دوو ڕۆژ لەبارەگا دەرچووین بەرەو بارەگاکەی حەسۆمیرخان کە سەرکردەی ناوچەی بادینان بوو، ئەبوجوزیف خۆیشی لەگەڵمان هات تا مۆڵەت لەسەرکردەی ناوچەکە وەربگرێت‌و لەگەڵمان بێت بۆ(بەرسیرین) کە بارەگای هاوڕێیانمانی لێبوو، نزیکی بارەگای کۆمیتەی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراقمان بوو لەدەرگەڵە.

دوای پێشوازیی و بەخێرهاتنی گەرم لەلایەن کاک حەسۆمیرخانەوە داوای مانەوەی لێکردین بۆدیتنی ناوچەکە بەلاَم ئێمە سوپاسیمان کردو مۆڵەتمان لێوەرگرت کە بڕۆین چونکە ڕێگەمان دوورە، ئیتر ماڵئاواییمان لێکردو بەرەو مەبەستی خۆمان دەرچووین. بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە (دەشتی زێبار) ویستمان لەوێ کەمێ پشوویدەینو نانبخۆین. ئەبوجوزیف سەرنجی چەند کەوێکیدا لەسەربەردێك، خۆی ئامادە کرد کە ڕووی تفەنگیان تێبکات، پێمگوت: هیچ سودێکی نییە چونکە تۆ هەریەك کەوت بۆدەکوژرێ و ئەوانی تر دەفڕن، چونکە تۆ تفەنگی ڕاوت پێ نییە. ئەویش گوتی: ئێستا دەبینی لە هەموویان دەدەم نەك تاقەیەکێك. گوللەیەکی تەقاندو ئەوەبوو کۆمەڵێك کەو کوژران، کە ژمارەیان پێنج کەو بوون. سەرسام بووم و گوتم: بەتەنیا گوللەیەك دەتوانیت لەم ژمارە زۆرە بدەیت؟ لەوەلاَمدا گوتی: ئەمە هونەری ڕاوە.. من ڕووی گوللەم کردە بەردەکەوکاتێکیش لەبەردەکە دەدرێ پارچەکانی بەهەموو لایەکدا بلاَودەبنەوەو هەموویان بەردەکەون، دەشێ ئەم ڕێگەیە لە کوشتاریشدا بەکاربهێندرێ، لەوکاتەدا جەنگاوەران لەدوای بەردێکەوە خۆدەشارنەوەو دەویستری لەدوای ئەم سەنگەرە بەردینەوە دەرپەڕێندرێن، گوللە بەزۆری ئاراستەی بەردەکە دەکرێ لەدژی ئەو دەستەیەی دەجەنگن و ئەوکاتە پارچە بەرد بەزۆری دەپرژێنو ئەوانەی لەپاڵ بەردەکەدا خۆیان پاراستووە ناتوانن سەرهەڵبڕن و یان لەپاڵ بەردەکەدا خۆیان بپارێزن.

کەوەکانمان کۆکردنەوەو ئاوەڕووتمان کردنو لەم دەشتە بەردینەدا بەدوای ئاودا دەگەڕاینو بەهەزارحاڵ سەرچاوەیەکی گچکەمان دۆزییەوەو شتماندنەوەو ئاگرمان کردەوەو برژاندمانن، لەڕاستیدا قاوەڵتییەکی بەتام بوو. پاش حەسانەوەیەکی کەمو چاخواردنەوە لەسەر ڕۆیشتن درێژەماندا و ڕێگاکە بەناوچەیەکی پڕ لە درەختی چڕدا تێپەڕدەبوو، قەدی درەختێك ئاسۆیی ڕاکشابوو ڕێگەکەش بەدرێژییدا دەڕۆیشتو سوارەی ولاَخ دەبوو بەژێردارەکەدا سەردانەوێنێ تا قەدی درەختەکەی بەرنەکەوێت، بەهاوڕێ ئەبویەحیام گوت: سەردانەوێنە. بەلاَم هاوڕێ گوێی نەدایە لەپڕێکدا کەوتەخوارەوەو ئێسترەکەی ڕایکرد. پاش

ڕازوگلەیی و دڵنیابوون لەسەلامەت دەرچوونی، پێمگوت: ئەی هاوارم لێنەکردیت سەردانەوێنی تا بەرقەدی درەختەکە نەکەویت. گوتی: تۆ لەئێسترەکە چاکتر دەزانی، دەبوو ئێسترەکە خۆی نزم بکاتەوە نەك من!

جارێکی تریش ئەو ئێسترەی ئەبویەحیا سواری بوو لەشوێنێکی بەردینـدا هەڵزنایەوە، (ئەبویەحیا) لەسەر پشتی کەوتە خوارەوە بەسەر بەردەکانـدا، خێرا ڕامانکردە شوێنی کەوتنەکەی و هەڵمانساندەوەو تەماشای لەشیمانکرد، گوتی هیچ شوێنێکی لەشم نەشکاوە، بەڵام باسی ئازاری کەوتنەکەی نەکرد، پاش هاتنە خوارەوەمان لەم شوێنە سەختەو گەیشتنمانە سەر ڕێگا گڵەکە ئەمجارە ئێسترەکەی من هەڵنوتا کە جاروبار لەکاتی ماندوو بوونـدا سواری دەبووم، ئێسترەکە بەپێشدا کەوتو منیش بەسەر ملیدا دابەزیمە سەرزەوی هەروەك بەشێوەیەکی ئاسایی لەشوێنی خۆم دابنیشم. ئەمەش دیارە بەرێکەوت بوو نەك بەهۆی شارەزایی منەوە، ئەبویەحیا هاواری لێکردم: ئافەرین، چۆنت سازاند، هەموو دامانە قاقای پێکەنین‌و لەسەر ڕەوتە درێژە ماندوو بوونەکەمان بەردەوام بووین، لەئێوارەیەکی زوودا گەیشتینە ناوچەی (بلێ)و دوای نانی ئێوارە بەهۆی ماندوو بوونی ڕێگەوە خەوێکی قووڵ بردینییەوە، بەڵام من گوێم لە نووکە نووکی (ئەبویەحیا) بوو کە لەئازاری کاتی کەوتنەکەیدا دەنگی دەهات چ جای ئەو هەموو ماندوو بوونەی ڕێگا بەتایبەتی بۆ پیاوێکی بەتەمەنی وەك ئەو.

باران دەستی بەبارین کرد چونکە دوارۆژەکانی پایز بوو، بەیانی زوو دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە، باران کەمی کردبوو، نمەنمە دەباری. گەیشتینە شوێنی سەختو دەمانەوێت بەرەو ژوور سەرکەوین، ڕۆژ لەئاوابووندا بوو بەرەبەرە تاریکییەکی ئەموستەچاو داهاتو دنیا کش‌ومات بوو جگە لەقیڕەی بۆق شتێکی تر نەدەبیسترا، هێشتا سەرما بۆقەکانی نەگەیاندبووە حاڵەتی سڕبوون، ئێسترەکان خۆکرد ڕێگەیان دەزانی، هاوڕێیانی پێشمەرگە بەدوای ئێسترەکاندا دەڕۆیشتن‌و هەندێکیان کلکیشیان دەگرتن، ڕێگەکە هەورازو پێچ و پەنابوو. گەڵای درەختەکان وەریبوون‌و گوێمان لەخشەی کەوتنی گەڵای درەختەکان و جێ پێی (پێشمەرگە)و ئێسترو بایەکەبوو، لەو تاریکییە ئەموستەچاوەدا هیچمان

نەدەدیت جگە لەهەندێ ئەستێرە کە جارجارە لەناو هەورەوە دەردەکەوتن‌و ون دەبوون، بەدرێژایی شەو ڕۆیشتین، هەندێ جار لەسەر پشتی ئێسترەکە خەومان پیادەکەوت، بەلاّم بۆ چرکەیەك، ئیتر خێرا بەخەبەر دەهاتین‌و کاتێك خۆرهەلاّت خۆمان لەسەر چیاکە دییەوە، لەوێڕا تەماشای خوارەوەمان کرد دۆلێکی یەکجار قوولّ بوو، ڕێگەکەش بەتەنیشت ئەم دۆڵەدا دەرۆیشت، بەهاوڕێ (ئەبوجوزیف)م گوت: بەخودای ئەگەر بمزانیبایە بەم ڕێگەیەدا دەڕۆین پرکێشی ئەوەم نەدەکرد تەنانەت لەرۆژیشدا پێیدا تێپەڕیم.

بەرەو چیای (زۆزك)و (سەری حەسەن بەگ) ڕۆیشتین‌و هەورەکە چڕدەبۆوە، کات نزیکەی خۆرئاوابوو بەرەو گوندی (شێنێ) سەرکەوتین ، وەك ناوەکەم لەبیرمابێ، ڕێگەکەش سەخت نەبوو، بارانیش دایکرد، هەموو لەشمان لەتەوقی سەر تابەری پێمان تەڕبوو، زیاتر پێمان هەلگرت تاپێش ڕۆژئاوا بگەینە گوندەکە، گەیشتینە گوندەکەو بەهۆی بارانەوە لەبارێکی ناخۆشدا بووین، لەدەرگای یەکەم ماڵماندا لێیان نەکردینەوە، پاشان لە دەرگای دووەم‌و سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەم ماڵماندا لێیان نەکردینەوە، پڕ بەدەنگم هاوارم کردە ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵمان بوون: وادیارە خەڵکی گوند پێشوازیمان ناکەن دەبێ لەگەڵ ئێسترەکان هەموو بچینە مزگەوت. تەماشامکرد هەندێ کەس سەریان لەدەرگای ماڵەکانەرە هێنایە دەرەوەو کەوتنە دەرگا کردنەوە، بەلاّم ئێمە هەر سووربووین بچینە مزگەوت چونکە جێگە نەبوو خۆمان لەبارانی زۆرو لەسەرمان بپارێزین جگە لەمزگەوت، کاتێك زانییان ئێمەو ئێسترەکانمان دەچینە مزگەوت، یەکێکیان دەرکەوت‌و گوتی: ڕاوەستن تا لێك تێبگەین. ڕاوەستاین‌و پیمگوت: بۆچی میوانداریمان ناکەن؟ گوتی ئێوە کێن؟ وەلاّم دایەوە ئێمە پێشمەرگەی شیوعین. گوتی کەوابێ بەسەرماڵەکاندا دابەشتان دەکەین. پێمگوت ئێمە هەموو دەچینە مزگەوت، ئێوەش ئێسترەکان ببەن‌و ئالیکیان بدەن‌و تابەیانی لاتان بمێننەوە. کابرا پێی خۆش بوو گوتی: شتەکانتان لەسەر پشتیان لەمزگەوت داگرن‌و ئێمە دەیانبەینە ماڵەکانی خۆمان. بەمجۆرە ڕێکەوتین. ئینجا خەڵکی گوند باوەشەداریان بەرەو مزگەوت هەلگرت‌و سۆپەکانیان داگیرساندو جلە تەڕەکانمان داکەند بۆ وشك

کردنـەوەیان. ژوورەکـان گـەرم بـوونو توانیمـان هـەموو جلـەکانمان دابکـەنین‌و لەکۆڵەپشتەکانمان جلی ترمان هێنانەدەر ئەوانیش تاڕدەیەك تەڕبوون بەڵام کەمتر لەوانـەی لەڕێگـە لەبەرمانـدابوون، هـەروا خەڵکەکـەمان دی نـان‌و خواردنیـان بـۆ مزگەوت هێنا، نانمان خواردو تێربووین ولەشمان گەرمەوەبوو. وەفـدێکی گـەورەی گوندەکـە هاتنـە مزگـەوت‌و لێفـەو بەتانیەشـیان هێنـابوو بـۆ نووسـتن، لەگـەڵیان دانیشتین‌و کەوتینە قسەوباس، لێمپرسین: لەبەرچی دەرگاکانتان لێ نەکردینـەوە؟ بۆچـی ئـەم هەڵوێـستە بەرامبـەر پێـشمەرگە؟ یـەکێکیان کەواپێدەچـوو بـەناوی گوندەکەوە قسە بکات یان موختاری گوندەکەبێت، هێشتا مزگەوتەکە مەلای نەبوو گـوتی: دوو ڕۆژی ڕابـردوو دەسـتەیەك (پێـشمەرگە) هاتنـە گونـد، پێـشوازیمان لێکردن‌و خواردنمان پێدان و جلەکانیانمان ششت بەڵام یەکێکیان لەشەودا هەستاو هەوڵیدا دەستدرێژی بکاتەسەر ئەو ئافرەتـەی خـۆراکی پێـدان‌و جلـی بـۆ شـشتن‌و خزمەتی کردن، لەبەر ئەوە بڕیارماندا لەمەولا پێشوازییان نەکەین، بەڵام کەزانیمان ئێوە شیوعین دەرگاکانمان لێکردنەوەو بەخێرهاتن سەرچاو، ئێوە کەسانی خاوەن ڕەوشتن‌و ڕێزی خەڵك دەگرن‌و خزمەتیان دەکەن‌و لەدروێنەو شـتی تـردا یارمـەتی جوتیـاران دەدەن، بـەخێرهاتن سەرچـاو. زۆر سـوپاسمان کـردن‌و تـا درەنـگ نووستنێکی قـووڵ نووستین ئەمـەش پـاش ئـەوەی بـەنۆرە پاسـەوانیمان بەسـەر هاوڕێیانی (پێشمەرگە) دابەشکرد. کاتێك هەسـتاین یـەکێکی خـەڵکی گونـد هـات‌و چای بۆ ئامادە کردین‌و نـان‌و ماسـت‌و هێلکەشـیان هێنـا، زۆر سـوپاسمان کـردن‌و ماڵئاواییمان لێ کردن‌و ڕوومانکردە گونـدی (بەرسـرین) کـە بارەگـای هاوڕێیانمـان بـوو بەسـەرکردەیی هـاوڕێ (کـەمال نوعمـان‌و مـولازم خـدر) نزیـك بـە خۆرئـاوا گەیشتین. لەوێ حەمامیان بۆ ئامـادەکردین خۆمـان شـت و تەماشـامانکرد پـشتی (ئەبویەحیا) شـین هەڵگـەڕابوو هەنـدێ جێگـەی پەڵـەی ڕەش بـوو کـە لەئـەنجامی کەوتنـــەوە لەســـەر ئێـــسترەکەوە وایلێهـــاتبوو. ڕۆژی ســێیەم چـــووینە گونـــدی (دەرگەڵە) کەبارەگای کۆمیتەی هەرێمی کوردستانی حزبـی شـیوعی عێـراق لـەوێ بوو، ئەوکاتە بەهادین نوری سکرتێری بوو.

کاتێك گەیشتینە ناوچەی (باڵەك) ڕۆژانی سەرکەوتنی شیوعییەکان بوو لەشەڕە

بەناوبانگەکەی (هەندرێن)دا بەسەر هێزەکانی حکومەتدا کە دەیانویست چیای (هەندرێن) داگیر بکەن کە شوێنێکی ستراتیژیی سەربازیی بوو بۆناوچەکەو بۆ شۆڕشی کورد، لەوەوبەر سەرکردایەتی شۆڕشی کورد ئەرکی پاراستنی ئەم ناوچەیەی بەشیوعییەکانو هاوپەیمانەکانیان سپاردبوو، کە جەماعەتەکەی کاك عزەت سلێمان بەگ بوو، کە گەورەی گوندی دەرگەڵە بوو. باوکی کاك عیزەت لەگەڵ برا گەورەکەی، هاوڕێی شیوعی زراربەگ لەگەڵ بارزانیدا رۆیشتنە مەهابادو لەوێشەوە چوونە یەکێتی شورەویو پێکیشەوە دوای شۆڕشەکەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ گەڕانەوە. هاوڕێ زرار ئافرەتێکی سۆڤیەتی خواستبوو کە چەند کوڕوکچیان هەیە، هەر پێکیشەوە دەژیان وێرای هەموو دەردی سەریو بێبەشییەك تا لەهاوینی٢٠٠٦دا پاش تەمەنێکی پیری کۆچی دوایی کرد.

خەڵك باسی ئازایەتی شیوعییەکانیان لە هەندرێن دەکرد هەرچەندە ژمارەو چەکیشیان کەم بوون بەڵام هێزەکانی حکومەتیان بەزاند ئەگەر چی پڕچەکی جۆربەجۆر بوونو بەفڕۆکەو تۆپیش پشتگیریی دەکران. جا لەبەر بایەخی ئەم شوێنە ستراتیژییە لەڕووی سەربازییەوەو ئەو دەنگدانەوەیەی شەڕی هەندرێن لە ڕووی سیاسییەوە، هێزە ڕاستڕەو و کۆنەپەرستەکانی ناو شۆڕشی کوردستان و دەرەوەی واباسی شەڕەکەی هەندرێن یان دەکرد وەك خۆیان بەتەنیا ئەم (داستانەیان) تۆمار کردبێ بەبێ ئەوەی ناوی شیوعییەکان ببەن، هەندێکی تریش وایان باسدەکرد کەئەم شەڕە بایەخدار نییە.. بەپێچەوانەی جەماوەرو سەرکردایەتی شۆڕشەوە، تەنانەت حکومەتیش بایەخی ئەم شوێنەیان دووپاتکردەوە کە چەند زیانی بەورەی هێزە چەکدارەکانی حکومەت گەیاندووە، ج جای ئەوەی، هاوڕێیانمان لەم شەڕەدا چەکی جۆربەجۆریان دەستکەوت کە زۆرمان پێویست بوون.

لەڕۆژی چوارەم یان پێنجەمی گەیشتنماندا چووینە سەردانی بارزانی کە زۆر بەگەرمی پێشوازی کردین و باسی بارودۆخی یەکێتی سۆڤیەتی لێپرسینو باسی ئەو ڕێگا دووروودرێژەی گرتبوومانە بەر تا گەیشتینە بنکەکەمان، لەو سەردانەماندا مولازم خدرمان لەگەڵ بوو کەلای بارزانی جێگەیەکی بەرێزی هەبوو، چونکە

لەشەڕی هەندرێندا ئازایی نواندبوو چونکە بە تۆپی هاوەن مەڵبەندەکانی حکومەت و شوێنەکانی هێزەکانی عێراقی تۆپباران کردبوو، جێگەی تۆپەکە لەلایەن فرۆکەکانی حکومەتەوە دۆزرابۆوەو فرۆکەکانی حکومەت هێرشیان بردبووە سەرو مولازم خدر لەقاچیدا بریندار بوو بوو بەوهۆیەوە گواسترابۆوە بۆچارەسەرکردن، بارزانی لەبەر ئازایی و لەبەر ئەوەی لەنەتەوەی عەرەب بوو بەرگری لە شۆڕشی کوردستان دەکرد خۆشی دەویست، بەمەش جێگەی حزبی شیوعی لە شۆڕشدا پتەوببووبوو، چونکە تاقە حزبێکی عێراقی بو بەرگریی لە مافە نەتەوەییەکانی کورد دەکردو دروشمی دیموکراسی بۆ عێراقو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی بەرزکردبۆوە.

هاوڕێیانی هەرێم پێیان باش نەبوو بەهادین نوری لەسەردانی بارزانیدا لەگەڵماندا بێت، چونکە بیستبووی کە بەهادین لای ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی بەسەلبی باسی بارزانی کردووە بەوەی کە هیچ لە رێکخستنو ژیانی حزبی نازانێت، ئەم قسەیە لەلایەن ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی پارتییەوە گەیەندرابووە بارزانی، بۆیە هەر لەوکاتەوە بەجۆرێکی سەلبی تەماشای بەهادینی دەکردو چەندجارێك داوایکرد لە کوردستان بگوێزرێتەوە. لەدیدارێکدا بەئامادەبوونی عەزیز شەریف شەوێکیان میوانی بارزانی بووینو لەژوورەکەی هاوڕێ عەزیز شەریف چاوەڕوانی بووین تالەگەڵ بارزانی قسەبکەین، بارزانی شەو تابەرەبەیان نەدەنووست، کاتێك لەگەڵیدا دانیشتین بارزانی داوای لەمن کرد بەهادین نوری بگوێزمەوە، پاش قسەی دوورودرێژ لەسەر هەڵوێستی سەلبی لەبەهادین نوری و پێشنیازی دەرکردنی پێمگوت: تۆدەزانیت بەهادین حوکمی ئیعدامی لەسەرە ئەگەر بگیرێتو حوکمەکەی جێبەجێ بکرێت دوور نییە حزبی شیوعی لەبەیانێکیدا بڵێت بارزانی هۆی ئیعدام کردنەکەی بووە چونکە داوای کردووە بۆ ناوچەکانی حکومەت بگوێزرێتەوە. بارزانی کەمێك بێدەنگ بوو ئینجا گوتی: کەواتە بالێرە لەناوچەکانی شۆڕش بمێنێتەوەو مانەوەی هیچ بایەخێکی نییە.

گەڕاینەوە بۆ بارەگای هەرێم لە(دەرگەڵە) و باسی دیدارەکەی بارزانیمان بۆ هاوڕێیان کردو، جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە دەبێ پەیوەندی لەگەڵ بارزانی

بەهێز بکرێت لە ڕێگەی ئەو هاوڕێیانەوە کە جێگەیەکی بەرێزیان لای هەیە. پاش نزیکەی دە ڕۆژ (ئەبویەحیا) چووە بەغداو دوای چوار پێنج ڕۆژ لەسەفەرەکەی ئەو، منیش لەهەرێمی کوردستانەوە چوومە بەغدا، ئەرکی سەرپەرشتیکردنی کۆمیتەی ناوچەی بەغدام پێسپێردرا کە لەبواری سیاسەتی حزبدا تووشی شڵەژانێکی هزریی هاتبوو، سەرنجمدا ڕێکخراوی بەغدا بەگشتی دووچاری دیاردەی باوەڕنەبوونە بەسەرکردایەتیو بەسیاسەتی حزبو، داوای شۆڕشێکی چەکداری یان کودەتایەکی سەربازی دەکەن بۆ ڕوخاندنی حکومەتو پێکهێنانی (حکومەتێکی دیموکراتی میللی بەسەرکردایەتی حزب) پێشتریش کۆبوونەوەیەکی فراوانی کۆمیتەی ناوەندی کرابوو، لەم کۆبوونەوەیەدا (سیاسەتێکی بەناو چەپی شڵەژاو) داڕێژراو کەسانی تازە هێنرانە کۆمیتەی ناوەندیو لەکاتی خۆیدا بیروڕای خۆمان دەربڕی کەئەم کۆبوونەوەیە ڕەوا نییە، چونکە ئێمە، هاوڕێ عەزیزو مەنو باقر ئیبراهیم هێشتا لەیەکێتی سۆڤیەت بووین و (زەکی خەیریو عەزیز الحاج) لەپراگ بوون، کێشەی ناوخۆییمان هەر لەناوخۆدا نەبوو بەڵکو لەدەرەوە توندتر بوو چونکە دەستەبەشی سەرەکی بەناو چەپخواز لەوێ بوون.

زۆر هەوڵمدا هاوڕێیان بخەمەوە سەر هێڵی ڕاست لەم کێشەیەدا لەسەر بنچینەی:

١. پشت بەستن بەشەرعیەتی دیموکراسی حزبیی ناوخۆو مافی ئاڵوگۆڕی سەرکردایەتی حزبو سیاسەتەکەی.
٢. هەوڵدان بۆ پێکهێنانی کۆنگرە یان کۆنفرانسی حزبی.
٣. ئیدانەکردنی هەر کارێکی دەستەبەش پێکەوەنانو هەرچۆن بێت چونکە ئەمە دەبێتە هۆی تێکدانی یەکێی حزب.
٤. ڕەوایەتی کێشەی ناوخۆ کەئەوکاتە لەئارادا بوو، بێویستی بەڕێوەبردنی کێشەکە لەلایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە کەئەو هزرو ڕەوتانەی دەبێ مشتومڕیان لەسەر بکرێ دەخاتە پێش بۆ گفتوگۆکردن.
٥. ئەو مشتومڕە دەبێ لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیو مەکتەبی سیاسییەوە

بخرێتە ناوەندو سەرکردایەتی بکرێت.

٦. کاتی مشتومڕەکە دیاری بکرێتو پاش کۆتایی هاتنی گفتوگۆ دەبێ کۆمیتەی ناوەندی بەستنی کۆنفرانس یان کۆنگرە بڕیار بدات تا ئەنجامەکانی مشتومڕەکە یەکلایی بکەنەوە.

ئەمانە بوون ئەو بنەمایانەی لەگفتوگۆمدا لەگەڵ هاوڕێیانی بەغدا جەختم لەسەر دەکردنەوە، توانیشم کار بکەمە سەر ناوەندێکی فراوانیان، هەوڵیشم دەدا ڕەوتە بەناو چەپەکان کەلابخەم، ئا لەم کاتەدا مەکتەبی سیاسی داوای لەعەزیز الحاج کرد بگەڕێتەوە عێراق. بەئاگاداریی حزبی شیوعی سوریا گەیشتە سوریا (دواتر هاوڕێ خالد بەگداش تێبینیەکی هەبوو لەسەر دوو دڵی عەزیز الحاج لەگەڕانەوەی بۆ عێراقو ترسی لەدەسگیرکردن). وێڕای ئەمەش هاوڕێیانی سوری هانیاندا کەبگەڕێتەوە بۆ عێراق دوای ئەوەی ورەیان بەرزکردەوەو گەیاندیانە هاوڕێیانی هەرێمو ئینجا لەکانونی دووەمی ١٩٦٧دا هاتە بەغداو یەکەو ڕاست پەیوەندی لەگەڵ تاقمە "چەپگیرەکەی" ڕێکخراوی بەغداکرد.

لەم کاتەدا کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوەیەکی کرد بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی ناوخۆی حزب و هەوڵدان بۆ ئامادە کردنی کۆنفرانسی گشتی، لەو کۆبوونەوەیەدا هێنانی (عزیزالحاج) بۆ مەکتەبی سیاسی باسکرا. ڕاپۆرتێکی درێژم لەسەر چالاکی ئاشکرای (عزیزالحاج) لەبواری دەستەبەشکاریدا پێشکەش کردو ئەوەشم تێدا باسکردبوو کەچەند ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی لایەنگیریان کردبوو، لەڕاپۆرتەکەدا ئەوەشم ڕوونکردەوە کەمەترسی کەرتکاریی لە حزبدا هەیە... بەڵام کۆمیتەی ناوەندی ڕاپۆرتەکەمی پشتگوێ خستو عەزیز حاجیان بۆ ئەندامەتی مەکتەبی سیاسی هەڵبژاردو ئەرکی سەرپەرشتیکردنی ناوچەی بەغدای پێسپێردرا، پلاری منیش لەسەر ئەم کارە ئەو پەندە میللییەبوو کە بەهەندێ لەهاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندیم گوت (بەزیان بەپشیلە سپارد).!

منیش گواسترامەوە بۆ سەرکردایەتی هەرێمو هاوڕێ عەزیز محەمەد سەفەری دەرەوەی کردو سەرکردایەتی کەوتە دەست کەسانی کەرتکارو لەپێشیانەوە (ئەبوویەحیا) ئیتر عەزیز حاج ئەم هەلەی قۆستەوەو کردەوەیەکی کودەتاگێڕانەی

تیرۆریستانەی ئەنجامداو بەهادین نوری دەستگیرکردو(ئەبویەحیا)ی بۆ ماڵێکی تر گواستەوە، بەلاّم بەهادین توانی لەدەستیان قوتاربێتو نامەیەکی بەپەلەی بۆ ناردمو داوای کردبوو بچمە بەغدا چونکە لەناو حزبدا کەرتکارییەك بەسەرکردەیی عەزیز حاج ڕوویداوە. لەماوەی دووڕۆژدا کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی هەرێمم ڕێکخست و مەسەلەی ڕوودانی ئەم کەرتکارییەم بۆ ڕوونکردنەوە کە بەسەرکردەیی (عزیزالحاج) کراوە، بەیاننامەیەکمان دەرکردو لەوێدا بەتوندی ئیدانەی ئەم کەرتکارییەمان کردو داوامان لە ڕێکخراوەکانی حزب لەهەرێمدا کرد کە ڕووبەڕووی ئەم کەرتکارییە بووەستن کە گەورەترین زیانی بەحزب گەیاندووە. بەم بۆنەیەوە دەبێ ئەوەش بڵێم کە (عزیزالحاج) نامەیەکی بۆ من نووسیبوو بەلاّم نازانم ناوەرۆکەکەی چیبوو چونکە پێم نەگەیشت، واپێدەچێ داوای لێکردبم کە بچم بۆ بەغدا بەمەبەستی دەستگیرکردنی منیش، چوومە بەغداو چاوم بەبەهادین کەوت کە ئەوکاتە لەسەر شەقامەکان لەڕاوڕاوێنی کەرتکاراندا بوو بۆ دەستگیرکردنیان(!) هەروەك چۆن ئەوان کردیان. دووپاتم کردەوە کە ئەم شێوازە هەڵەیەو پێویستە دەست لەشێوازی چەتەگەری وعصابات هەڵگیرێ داوای بەستنی کۆبوونەوەیەکی لەناکاوی کۆمیتەی ناوەندیم کرد بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو بارودۆخەی بەهۆی کەرتکارییەوە پەیدا بووە، تەماشامکرد ورەی ژمارەیەك لەئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بەهۆی ئەم ڕووداوەوە دارماوە، کۆبوونەوەکە لەئەیلولی ١٩٦٧دا لەهەلومەرجێکی خەمباریدا گیرا، عامر عەبدوڵا دەستکێشانەوەی لەکۆمیتەی ناوەندی پێشکەش کرد، هەروا باقر ئیبراهیمو کەسانیتر بەلاّم بۆم دووپاتکردنەوە کە دەستکێشانەوەکانتان دەدرێتەدواوە بەتایبەتی لەم هەلومەرجە سەختەدا کە ڕووبەڕووی حزب بۆتەوە، چونکە سەرکردایەتی حزب لەسەریەتی ورەی خۆی بەرز بکاتەوە چونکە ئەم ڕووداوە نەیەکەمو نەدوا ڕووداوی کەرتکارییەو حزب بەهەلومەرجی قورستر لەمەدا تێپەڕیووە بەلاّم بەپتەوی‌و توندوتۆڵی پێیدا تێپەڕبوو بۆ پاراستنی یەکێتی حزب، توانیم ورەیان بەرزبکەمەوەو هاوڕێ (ثابت حبیب العانی) یارمەتیدامو بەهادین قایل نەبوو دەست لەکار بکێشێتەوە و ئاراخاچادۆر ئۆسکانیانیش هەروای کرد.

پاش ئەوەی وردەی هاوڕێیان بەرزبۆوە بڕیاردرا بەیاننامەیەك بەناوی کۆمیتەی ناوەندییەوە دەربکرێتو ئەم کەرتکردنەی حزب کە زیانێکی زۆری بەحزب و بزووتنەوەی دیموکراتی گەیاند ئیدانە بکرێ، هەروا بارودۆخی سیاسی گشتی لەعێراقداو بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی عەرەبو بارودۆخی نێودەوڵەتی باسیان لێوەکراو بڕیاردرا(عزیز الحاج)و ئەو کەرتکارانەی لەگەڵیدا بوون لە حزب دەربکرێن. (حسین جواد الگمر) کە یەکێك لەڕابەرانی کەرتکاران بوو دانەیەك لەبەیاننامەکەی کۆمیتەی ناوەندی گەیاندە ئەبویەحیاو گاڵتەی بەوبەیاننامەیە دەکرد، (ئەبویەحیا) بەیاننامەکەی دی و بڕیاریدا لەماڵی کەرتکاران دەرچێ وبگاتە حزب، کەلەوماڵە دەرچوو لەڕێگەی خوشکە تێکۆشەرەکەیەوە زەکیە خەیری (أم فؤاد) پەیوەندی بەحزبەوە کردەوە،هەرلەو کۆبوونەوە ناکاوەی کۆمیتەی ناوەندیدا بڕیاردرا سێیەمین کۆنفرانسی حزب ببەسترێو بۆ چاوگێڕانەوە بەسیاسەتی حزبداو هەڵبژاردنەوەی کۆمیتەیەکی ناوەندیی نوێو هەڵوێست گرتنەبەر لەکەرتکارییەکەو هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی کۆمیتەی ناوەندی لەکەرتکارییەکە، بەڵام لە کۆبوونەوەکەدا کاتی بەستنی کۆنفرانسەکە دەستنیشان نەکرا.

کەرتکاران وەفدێکیان بەسەرکردەیی عزیزالحاج و ئیبراهیم عەلازی ناردە کوردستان؛ وەفدەکە دیداری لەگەڵ هاوڕێیانمان لە(بەرسرین)کردو هاوڕێیانمان ئەم کەرتکارییەیان ئیدانەکردو نەیانتوانی کەسیان بۆلای خۆیان رابکێشن، ئینجا وەفدەکە چاویان بەسەرکردایەتی شۆرش کەوت ڕێگەیان پێدان هێزێکی (پێشمەرگە) لەناوچەی شۆرش پێکبێنن بەلام لەمەدا ژێرکەوتن وچەند پێشمەرگەیەکیان ناردە ناوچەی هۆرو زۆنگەکانی خواروو تا ئەم ناوچەیە بکەنە بنکەی سەرەکییان بۆ هەڵگیرساندنی "شۆڕشێکی میللی" بەلام هێزەکانی حکومەت پەلاماریاندانو هەموویان لەناوبردن بەمجۆرە زەبری بەهێزیان بەرکەوت لەئەنجامی ئەو سەرچڵییە هەڵەشەکارەی دەیانکردو زیانێکی گەورەیان لەباشترین کەسانی شۆڕشگێڕو دڵسۆز دەدا، لەوانەی کە بەدروشمە "چەپگیرییە" کانیان هەڵخەڵەتابوون، لە ئەنجامی ئەم سەرچڵییەدا بیریان لەوە کردەوە هەندێ کاری

تیرۆریستی لەدژی هێزەکانی حکومەت ئەنجام بدەن، کە دووربوون لە بزووتنەوەی جەماوەر، ئینجا شێوازی تیرۆر گەیشتە ناو ڕێکخستنەکەی خۆشیانو، ئەوکەسەی لەگەڵیاندا بوایە نەیدەتوانی دەستبەرداریان بێت، ئەوەبوو(ئەبو جەعفەر)* کە یەکێك بوو لەسەرکردەکانیان تیرۆریان کرد، ناوبراو کەسایەتییەکی کرێکاریی دڵسۆز بوو، کاتێك لەوان ڕایکردو هەوڵیدا بگەڕێتەوە بۆ حزب (چەکدارێکیان) گەیشتە سەری و پێش ئەوەی بگاتە بارەگای هاوڕێیانمان لە(بەرسیرین) لەڕێگە کوشتیان.

لەئەنجامی ئەم کارەتیرۆریستییەدا پەیوەندییان لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش ئاڵۆز بوو، سەرکردایەتی شۆڕش ویستی کاروباری توند بەرامبەریان پەیڕەو بکات بەڵام کەسانی ڕاستڕەو لەناو سەرکردایەتی (پارتی)دا هەوڵیاندا ئەو کاروبارانەی سەرکردایەتی شۆڕش بەنیازی جێبەجێ کردنیان بوو سەرنەگرن، ڕێگەی هەرکارێکیان لێگیرا ئەوە نەبێ بۆ پاراستنی خۆیان لەناوچەی شۆڕش بمێننەوە، بەرەبەرە زۆربەی سەرکردەکانیان لەناوچەکانی شۆڕش کشانەوە، هەندێکیان چوونە دەرەوەی وڵاتو بەشێکیان گەڕانەوە بۆ شارەکان، زیاتر پێیان لەسەر بیرۆکەی (شەڕی زۆنگاوەکان) داگرت تاڕاستی ئەم بیرۆکەیە بچەسپێنن و بەرپەرچی ئەو بیرۆکەیە بدەنەوە کە دەڵێ ئەم ناوچانە بەکەڵکی شەڕی پارتیزانی درێژخایەن نایەن وەك ناوچە شاخاوییەکان، بەمەش کەوتنە هەڵەیەکی گەورەوە کە ئەو یەکەمین دەستەیەی ویستیان بنکەیەك لەناوچەی زۆنگەکان دابنێن هەموویان لەناوبران.

ئالەم کاتەدا کودەتایەکی سەربازی لەلایەن حزبی بەعسو کەسانی نەتەوەپەروەری سەربەخۆی ناوسوپاوە لەهاوینی ١٩٦٨دا ئەنجامدرا، دەسەڵاتی کودەتاگێران هەندێ کاروباریان جێبەجێ کرد، لێبوردنێکی گشتییان بۆ هەموو بەندە سیاسییەکان بڕیارداو هەموو فەرمانبەرانی دەرکراویان بەهۆی سیاسەتەوە گێڕایەوە بۆسەر کاروفرمانەکانیان، ڕێگەیاندا کۆچ پێکراوان بگەڕێنەوە بۆ

*ناوی ڕاستیی خدر سەلمان عەبدولعەزیز بوو، برادەرم بوو، بەمەبەستی گەڕانەوەی بۆ حزب لەدەرگەڵە سەردانی کردینو پاشان لەگەڵ هاوڕێیان بڕیاریدا کەبگەڕێتەوە -وەرگێر-.

ولأتەکـەیان، بـەلأم کودەتـاگێڕان ڕێگـەیان نـەدا بەئازادییـە دیموکراتییـەکانو مۆڵەتپێـدانی حزبـە سیاسـییەکانو دیـاریکردنی مـاوەی گواسـتنەوەو هەڵبـژاردنی پەرلـەمانو دانـانی دەسـتورێکی دیمـوکراتی بـۆ ولأتو، پێکهێنـانی بەرەیـەکی نیـشتمانی وچـاری مەسـەلەی کـورد بەئاشـتی و لەسـەر بنـچینەی هێنانـەدی ئۆتۆنۆمی.

لـەمانگی تـشرینی دووەمـدا شـەپۆلێکی تـیرۆر دەسـتپێکرا، وەزیـری دەرەوەی پێـشوو (ناصـرالحانی) تـیرۆر کـرا، پـێش ئـەوەش دووهاوڕێمـان لـەکرێکارانی مانگرتووی کارگەی (زیوتی نەباتی) کوژران و دوای ئـەوەش بەسـێ ڕۆژێك چـەند هاوڕێیەکمان لەئاهەنگێکدا بەبۆنـەی یـادی شۆڕشـی ئۆکتۆبـەرەوە لـە گۆڕەپـانی (سباع) کوژرانو حزبی بەعس خۆی لەم تاوانانـە دەرخـستو وایـان دانـا ئەوانـەی کردوویانن هەروا دوژمنانی حزبی بەعسن.

ئەم ڕووداوانە لەلایەن کرێکارانەوە کرانە بیانوو بڕیاریاندا بەرپـەرچی بدەنـەوەو بەتیرۆر دژی سەرکردەکانی بەعس وەلأمی ئەم تیرۆرە بدەنـەوە، تەقـەیان لـەماڵی سەدام و ماڵی سەلاح عمرالعلی کردو، هەندێ تیپی چەکداریان هێرشیان بردە سەر هەندێ کۆمپانیاو پیاوانی کارگوزار، لەسلێمانی و لەبەغدا بەمەبەستی پـەیداکردنی پارە، بەهەمووی دەستیانگرت بەسەر (٢٠,٠٠٠) بیست هەزار دینـاردا بـۆ خـەرجیی (شۆڕشی چەکداری). لەئـەنجامی ئـەم کـردەوە سەرچڵییانەدا دەسـەلأتی بـەعس چەقی لەسـەر ئـەوەگرت کـە پێویـستە عـەزیز حـاج دەسـتگیربکرێتو، ئـەوە بـوو لەشوباتی ١٩٦٩دا عەزیزحاج دەستگیرکراو برایە کۆشکی کۆتایی –قصر النهایة– بـەو هۆیـەوە ڕووخـاو ڕاسـتی لەسـەر ئەنـدامانی سـەرکردایەتی ناوەنـدی (القیـادة المرکزیـة)و هـەموو ماڵـە نهێنییـەکانی تاقمەکـەی دانپێـداناو، کەسـانی تریـشیان ڕووخاند وەك (حمید خضرالعاني و کـاظم الـصفار)و کەسـانی تـر لەکاتێکـدا (مـتي الهندي)و ئەحمەد مەحمودی دەلاك لەژێر ئازاردا کوژرانو لەڕاسـتیدا شکـستییەکی زۆر گەورەی هزریو ڕێکخراوەیی بوو بـۆ کـەرتکاران و زیـانێکی گـەورەش بـوو بـۆ شۆڕشگێڕە دڵسۆزەکان بەمەش سەرکردایەتی کەوتە دەست ئیبراهیم عـەلاوی کـە لەدەرەوە دەژیا.

# سێیەمین کۆنفرانسی حزبی شیوعی عێراق

لەکۆبوونـەوەی ناکـاوی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حزبـدا لـە ١٩ی ئـەیلولی١٩٦٧داو لەدوای ئەوەی (عزیزالحاج) یەکێتی حزبی کەرتکرد، بڕیاردرا سێیەمین کۆنفرانسی حزب ببەسترێت، لەوکاتـەدا حـزب دووچاری کێشەیەکی نـاوخۆیی تونـد هـاتبوو، بەچەشـنێکی لیـبرالیش بـوو، گەیـشتبووە گـشت شـانەو لیژنەیـەك. پـاش بەیاننامەکەی حزب لەبارەی کەرتکارییەکەو دەرکردنی کەرتکارانەوە لەحزب، ئـەم کێـشەیە بەرەبـەرە گەڕایـەوە بـۆ بەناوەنـدی بـوون، بـەڵام بنکـەکانی حـزب دڵنیانـەبوون لـەوەی کۆنفرانـسی سـێیەم لەسـەر دەسـتی کۆمیتـەی ناوەنـدی پێکبێتو، کەرتکاران هزری پڕ لەگومانیان بەو ڕێبازەدا بڵاودەکردەوە.

مەکتـەبی سیاسـی بڕیاریـدا هێرشـێکی بـەراوەژوو دەسـت پێبکـات بەڕێگـەی ڕێکخستنی کۆبوونەوەی فراوان لەهەموو عێراقـدا. لەلایـەن مەکتـەبی سیاسـییەوە ڕاسپێردرام کە ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ئەم کۆبوونەوانە بکەم بۆ بەرپەرچدانەوەی هـزرو ڕەوتـی سەرچـڵانەی کـەرتکاران‌و جـەختکردن لەسـەر ئـەوەی بەراسـتی کۆمیتەی ناوەندی دەیەوێت بەونزیکانـە کۆنفرانـسی سـێیەم ببەسـتێت، لەڕسـتیدا ئەو کۆبوونەوە فراوانەمان ئەنجامدا بـۆ هەڵبـژاردنی نوێنـەران بـۆ کـۆنفرانس ئـیتر بارودۆخی حزب‌و ڕەوتی کێشەی نـاوخۆ لەگشت ڕێکخراوەکـانی حزبـدا گـۆڕدران، لەکاتێکدا حزب بـۆ پێکهێنـانی کۆنفرانـسی سـێیەم، لـەبارەی هـزرو ڕێکخـستنەوە خۆی ئامادە دەکرد، کەرتکاران خەریکی نەخشەدانان بوون بۆ ئەنجامدانی هەنـدێ کاروچـالاکی تیرۆریـستیو سەرچـڵ بـەبێ بزووتنـەوەی جـەماوەرییو هەلومـەرجی نـاوخۆو دەرەوە، وەك تەقـەکردن لـە بەرپرسـێکی دەسـەڵات یـان کۆمپانیایـەکی بەڵێندەری یان هەڕەشەکردن لەکەسانی دەوڵەمەند بۆ پەیداکردنی پارە بەبیانووی کڕینی چەك بۆ شۆڕش لە هۆرو زۆنگاوەکانـدا یـان هێرشـکردنە سـەر مەخفـەرێکی پۆلیس بۆ بردنی چەکەکانیان..

بڕیاردرا کۆنفرانسەکە لە گوندی (داربەسەر) لەماڵی هاوڕێ عەلی مەولود ببەسترێت. هاوڕێ عەلی کادیرێکی سەرکردەیی بوو لە بزووتنەوەی جوتیاری کوردستاندا، لەقەزای کۆیەدا، دەبوو هاوڕێیانی نوێنەر لە گشت پارێزگاکانەوە بگوێزینەوە بۆ ئەم گوندە. بەمجۆرە زۆر بەوردیو نهێنی توانیمان کۆبوونەوەی فراوان لەهەموو ڕێکخراوەکانی حزبدا ڕێکخەین بۆ هەڵبژاردنی نوێنەران بۆ کۆنفرانسی سێیەم، کە لەڕاستیدا کۆنفرانسێکی ئاسایی نەبوو بەڵکو وەك کۆنگرە وابوو چونکە نوێنەران لە کۆبوونەوەی فراواندا هەڵبژێردرابوون و ئەو کۆبوونەوانەش هەروەك کۆنفرانسی ناوخۆیی وابوون، لەسەرەتای مانگی کانونی یەکەمی ١٩٦٧دا کۆنفرانسەکە بەستراو بەرنامەی کارەکەی بەمجۆرە بوو:

١. هەڵسەنگاندنی سیاسەتی حزب.
٢. پرۆژەی بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی حزب.
٣. تاکتیکی حزبو شێوەکانی خەباتی.
٤. پاراستنی یەکێتی حزب.
٥. پرۆژەی بڕیارەکان.
٦. هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی.

کۆنفرانسەکە نزیکەی دەرۆژ درێژەی کێشاو، وایدانا کە ئەوسیاسەتەی لەئابی١٩٦٤ بڕیاردرا سیاسەتێکی چەوت بوو ناوی نا(هێڵی ڕاستڕەوی ئاب) هەروا ئیدانەی کەرتبوونەکەی کردو سیاسەتی کەرتکارانی بەسیاسەتێکی بەناوچەپو سەرچڵانە دانا کەزیانی بەبزووتنەوەی نیشتمانی دیموکراسی گەیاندو شێواندنی مارکسیزم–لینینیزم بوو، کۆنفرانسەکە لەسەر گفتوگۆکردن دەربارەی بەرنامەی کارەکەی بەردەوام بوو، بڕیاردرا ڕاپۆرتێکی سیاسیو هزری بڵاوبکرێتەوەو بارودۆخی سیاسی ناوخۆو هەڵوێست لەحکومەتو پێویستی ڕووخاندنیو هەروا بارودۆخی عەرەبو بەشێوەی تایبەتی مەسەلەی فەلەستین لەپێناو دانەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی نیشتمانپەروەری فەلەستینیدا، گرتبووە خۆی، سەرەڕای بارودۆخی بزووتنەوەی شیوعیو خەبات لەدژی ئیستیعمارو لەپێناو ئاشتیو

ڕزگاریی نیشتمانی و دیموکراسیداو، هەروا لەم کۆنفرانسەدا کۆمیتەی ناوەندیی تازە هەڵبژێردرا.

جا وێڕای ئەو کاتە درێژەی گفتوگۆی لەسەر بەرنامەی کارتێدا کراو ماندوو بوون کە بەڕووخساری هاوڕێیانەوە دیاربوو، شوێنەکەش تەنگ و زستانەکە سارد بوو خۆراکی پێویست زۆر سادەو ئاسایی بوو چەند مێرووی بێزارکار لەجەستەماندا پەیدابوون، وێڕای ئەو ماندووبوونەی خێزانی هاوڕێ عەلی مەولود لەورۆژانەدا کە نان و خۆراکیان ئامادە دەکردو پاکوخاوێنی شوێنەکەو جێگەی نووستنیان ڕادەگرت، دەڵێم وێڕای ئەمەش نوکتەو قسەی خۆش لەژیانی هاوڕێیان لەو بارودۆخەدا دیاردەیەکی ئاشکرابوو، لەناو کۆنفرانسەکەدا دەستەبەشێك لەهاوڕێیان پەیدابوو کە تەشویشیان دەخستە سەر هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندی لەوانەی کە رۆڵیان لە(هێڵی ئابدا) هەبووە، هەرکە یەکێك لەو هاوڕێیانە بیروڕاو باری سەرنجی خۆی لەسەر مەسەلەکانی باس دەردەبڕی، ئەم دەستەیە قسەیان پێ دەبڕین، بۆیە ناچاربووم بۆ دانانی ڕادەیەك بۆ ئەم تەشویشە دەستبخەمە کارەوەو ناوم نان (شارە زەردەواڵە) بەمجۆرە دەمگوت (ئەوە شارە زەردەواڵە دەستی پێکرد) ئیتر هەموو دەستیان بەپێکەنین کردو بەدەگمەن نەبێ تەشویش دووبارە نەکرایەوە. سەرمای زستان وایکردبوو هاوڕێیان لەدەوری سۆپای دارەکە کۆبنەوە بۆخۆگەرم کردنەوە، ئەم سۆپایە بۆرییەکی درێژی بۆ دەرەوەی ژوورەکە ڕاکێشرابوو، سۆپاکە بەو ئاگرەی لەناویدا دەسوتا گەرمو سوور بوویوەوە، هەروا بۆرییەکانیش. لەکاتێکدا هاوڕێیان لەدەوری سۆپاکە بوون یەکێك لەهاوڕێیان ویستی هەستێو لەژوورەکە دەرچێ، لەهەستاندا دەستی بەبۆرییە گەرمەکەی سۆپاکەوە گرت بۆ یارمەتی هەستانەکەی، بەمە دەستی سووتاو لەئازاردا هاواری کرد، دەسبەجێ چارەسەری کرا.هاوڕێ عەلی مەولود گوتی: هاوڕێ ئەم سۆپا سورەوە بووەت نەدی و تەنانەت بۆرییەکانیشی، جائیتر چۆن گیروگرفتەکانی گەل دەبینی؟ هەمووان بەو هاوڕێیەشەوە کە دەستی سوتابوو دایانە قاقای پێکەنین.

یەکێك لەبڕیارە گرنگەکانی کۆنفرانسەکە ئەوە بوو کەبڕیاردرا ناوی لق بکرێ بە کۆمیتەی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق و، مافی پێدرا کۆنگرەی خۆی

بەستی‌و سیاسەت و بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی ڕێکخراوی هەرێم بڕیاربدات‌و ئەندامانی کۆمیتەی هەرێم هەڵبژێردرێت بەو مەرجەی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراق پەسەندی بکات. ئەمە یەکەمین هەنگاو بوو بۆ پەرەپێدانی ڕێکخراوی هەرێم بۆ حزبی شیوعی کوردستان، لەئەنجامی ئەم هەنگاوەدا کە سێیەمین کۆنفرانسی حزب بڕیاریدا ڕێکخراوی هەرێم دەستی بەخۆئامادە کردن کرد بۆ پێکهێنانی یەکەمین کۆنگرەی ڕێکخراوەکە، بڕیاردرا کۆمیتەیەك پێکبێت بۆ ئامادەکردنی پرۆژەی یادداشتێك کە دوای کۆنگرەکە بدرێت بەسەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، بەلاَم پرۆژەیەك بۆ پەیڕەوی ناوخۆ دانەنراو، پەیڕەوی ناوخۆی حزبی شیوعی عێراق هەروا دەشبێتە پەیڕەوی ناوخۆی ڕێکخراوی هەرێم، ئەم پرۆژانە ئامادەکران وبڕیاردرا کۆنگرەکە لەئایاری ١٩٦٩دا لە گوندی (دەرگەڵە)ببەسترێت کە پتر لەپەنجا هاوڕێی نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی حزب لەهەرێم ئامادەی بوون، لەکەشوهەوایەکی پڕ لەحەماسەتدا بەڵگەنامەکانی ئامادە کراوگفتوگۆیان لەسەرکراو، کۆنگرەکە یەك هەفتە درێژەی کێشاو لەکۆتاییدا ئەندامانی کۆمیتەی هەرێم هەڵبژێردران‌و کۆمیتەی هەڵبژێردراوی هەرێم بڕیاریدا ڕاپۆرتێك بۆ کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی عێراق ئامادە بکات دەربارەی کۆنگرەکەو لەپاڵ ئەو بەڵگەنامانەی کە بڕیاردران بۆیان بنێرێت..

جێگەی داخە سەرنجمدا ئەم ڕووداوەی ژیانی حزب بایەخی پێنەدراو، ڕۆژنامەو ڕاگەیاندنی حزب باسی بەستنی ئەم کۆنگرەیەو بایەخدارییەکەی لەژیانی حزبدا نەکرد وەك ئەنجامێکی پەرەسەندنی بزافی ڕزگاریخوازیی نیشتمانیی کوردستان، لەبەرانبەردا حزب بایەخیدا بەو یادداشتەی بەناوی کۆنگرەی هەرێمەوە درایە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد چونکە یادداشتێکی ڕەخنە ئامێزبوو لەولایەنە سەلبی‌و گیروگرفتە زۆرەی شۆڕش دووچاری هاتبوو،یادداشتەکە پێشنیازی چارەسەرکردنی ئەو هەڵانەی تێدا بوو، ئەگەر ئەوە نەکرێ مەترسییەك بۆ سەرشۆڕش‌و بزافی ڕزگاریخوازیی کوردستان‌و بزافی دیموکراسی عێراق پەیدا دەکات.

# گەڕانەوەی بەعس بۆ فەرمانڕەوایی بەڕێگەی کودەتایەکەی ۱۹٦۸

پاش کودەتایە ڕەشەکەی ۸ی شوباتی ۱۹٦۳و ئەو هەموو تاوانەی دژی حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق‌و هێزە نیشتمانی و دیموکراسییەکان و دژی عەبدولکەریم قاسم وتاقمە ئەفسەرە نیشتمان پەروەرەکە کران، حزبی بەعس لەعێراقدا بە حزبێکی دیکتاتۆری فاشیست لەشێوازی دەسەڵاتداریدا دانراو، حزبی شیوعی عێراقی ئێمە وایدانا کەنابێ بەباشی و ئیجابی تەماشای حزبی بەعس بکرێ، چونکە نابێ بەیەکێك لەحزبە نیشتمانپەروەرەکان دابنرێ کە هاوکاریی وهاوپەیمانی سیاسی لەگەڵ بکەین.

لە۱۷ی تەموزی ۱۹٦۸دا کودەتایەك ڕێکخرا کەفەرمانڕەوایی عەبدولڕەحمان عارفی ڕامالی، ئەم کودەتایە لەلایەن حزبی بەعس‌و چەند ئەفسەرێکی عێراقییەوە، عەبدولڕەزاق نایف‌و ئیبراهیم عەبدولڕەحمان داودو سەعدون غەیدان- ەوە ئەنجامدرا. ئەوسێ ئەفسەرە پلەی گرنگیان لەسوپای عێراقدا هەبوو. نایف بەرپرسی دەزگای هەواڵگری سوپابوو، داود فەرماندەی پاسەوانی کۆماری بوو، سەعدون غیدان سەرکردەی کەتیبەی تانکەکان بوو لە کۆشکی کۆماری، حزبی بەعس ئەم ئەفسەرانەی هەڵخەڵەتاند، وەزارەتی بەرگری بەداود سپاردو سەرۆکایەتی وەزیران بە نایف، بەعس لەولاشەوە خۆی ئامادە دەکرد بۆ لادانی ئەو ئەفسەرانەو دەستگرتنی تەواوی بەسەر دەسەڵاتدا. ئەوەبوو لە۳۰ی تەموزی ۱۹٦۸دا داودو نایف لابران‌و سەعدون غیدان دوای ئەوەی بووە لایەنگیریان کردیان بەسەرکردەی پاسەوانی کۆماری. بەمکارەش دەسەڵاتی دەوڵەت بەتەنیا کەوتە دەست حزبی بەعس‌و ئەویش دەستی بەکارسازی کرد بۆ پاکتاوکردنی حیسابی، بەرەبەرە، لەگەڵ هەرکەسێکدا کە لەهێزە چەکدارەکاندا بەعسی نەبوو.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کەلەپێنج کەس پێکهاتبوو، بووە دەسەڵاتی

ڕەهاو، ڕێوشوێنی ئەوپەڕی توندوتیژی لەدژی کەسانی بەرهەڵستکار یان ئەوانەی لەسەر لایەنی نایفو داود دادەنران یان ئەوانەی بەسیخوڕ ناویان بردن گیرایەبەرو هەروا پاکتاوکردنی حیساب لەگەڵ ئەو بەعسییانەی گومانیان لەلایەنگیریان هەبوو (واتە بۆدەستەی بەکرو سەدام) دواتریش تەنیا بۆ (سەدام) کە توانی سوپاو پۆلیسو بەڕێوەبەرێتی شارستانی ژیانی کۆمەلایەتی هەمووی بگۆڕێت بۆ بەعس-سەدام.

هەڵوێستی حزب لەدەسەلاتی تازەی بەعس ئەوەبوو بیخەینە بەردەم ئەرکە نیشتمانی و دیموکراسییەکان و داخوازییەکانی جەماوەریو کۆمەلایەتی و ئابوری و چاری مەسەلەی کورد بەئاشتی و بەرێگەی هێنانەدی ئۆتۆنۆمی بۆ هەرێمی کوردستانی عێراقو، هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی دامەزرێنەر کە دەستورێکی دیموکراسیی هەمیشەیی دابنێو پەرلەمان لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرێتو هەموو بەندە سیاسییەکان ئازاد بکرێنو کرێکارو فەرمانبەرانی دەرکراو بۆ سەرکارو فەرمانەکانیان بگێڕدرێنەوە...هەندێ شتی تریش.

وەکو باسمکرد لەئەیلولی ١٩٦٨دا لێبوردنی گشتی لە هەموو بەندە سیاسییەکان دەرچوو، ئەو فەرمانبەرانەی لەسەر سیاسەت دەرکرابوون بۆسەر کارەکانیان گێڕدرانەوەو ڕێگەدرا هەموو شیوعییەکان لەدەرەوە بۆ عێراق بگەڕێنەوە بەلام هیچ ئامادەییان پیشان نەدا بۆ بەرەلاکردنی ئازادییە دیموکراتییەکانو مۆڵەتدانی ژیانی حزبیو ئازادیی بلاوکردنەوەو ڕۆژنامەگەریو مانگرتنو کۆبوونەوەو خۆپیشاندان. لەو ڕۆژانەشدا داپلۆسین زۆرتر بەکارهێنراو وەزیری دەرەوە (ناصرالحانی) تیرۆرکراو هەروا دوو لەهاوڕێیانمان لەمانگرتنی کرێکارانی ڕۆنی ڕووەک‌و، سێ لەهاوڕێیانمان لە کۆبوونەوەی یادی شۆرشەکەی ئۆکتۆبەردا لە گۆڕەپانی(سباع) لەبەغدا شەهیدکران. خۆیان لەم تاوانانە دزییەوەو گوتیان لێکۆڵینەوە لەسەر کوژرانی کرێکارانی ڕۆنی ڕووەك (الزیوت النباتیة) دەکەن وبێزارییان دەربڕی بەرامبەر کوشتنی هاوڕێیانمان لەگۆڕەپانی (سباع)و وایان دانا تاوانی کوشتنی شوعییەکان لەگۆڕەپانی (سباع) کارێکە لە دژی شۆرشەکەیان! بەعسییەکان هەوڵی بەهێزکردنی شوێنەواری خۆیان لەناوخۆو

ناودەوڵەتاندا دەداو، کەوتنە نزیکبوونەوە لە شۆڕشی کوردو لە حزبی شیوعی، هەروا کۆماری ئەڵمانیای دیموکراسییان بەڕەسمی ناسیو ڕێکەوتنی ئابورییان لەگەڵ پۆلۆنیا بۆ بەرهەمهێنانی گۆگرد مۆرکردو ڕێکەوتنی ئابوریو هونەرییان لەگەڵ ئەڵمانیای دیموکراسی و یەکێتی سۆڤیەت پێکهێناو بەعسو حزبی شیوعی لەبواری بزووتنەوەی ئاشتیو هاورکاریو لەکۆمەڵەی دۆستایەتی سۆڤیەت- عێراقدا هاوکارییان کردو بەعسو شیوعی لیستێکی هاوبەشیان هەبوو بۆ هەڵبژاردنی نەقابەی پارێزەران لەساڵی١٩٧٠دا و مامۆستا عەزیز شەریف بووە سەرۆکی ئەنجومەنی ئاشتیخوازانی عێراق و ساڵی ١٩٦٩ بووە وەزیری داد.

وێڕای ئەوەش حزبی شیوعی لەسەر خەبات درێژەیدا لەپێناو بەرەلاکردنی ئازادییە دیموکراسییەکانو هێنانەدی ئۆتۆنۆمی کوردستان و بەردەوام ڕەخنەی لە دەزگاکانی داپلۆسین و چەوسانەوەی هێزە نەتەوەپەروەرو نیشتمانی و دیموکراسییەکان دەگرتو، لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی لەتشرینی یەکەمی ١٩٦٩دا حزب ڕاپۆرتێکی سیاسی بلاوکردەوەو بەتوندی ڕەخنەی گرت لەوەی (ستارخضير) تیرۆرکراوەو، هاوڕێ (عبدالامير السعدي) ڕفێندراوەو سووربوو لەسەر ئەوەی بوونی کەسانی دیموکراسیو سەربەخۆ لەئەنجومەنی وەزیراندا ناکرێ جێگای دامەزراندنی حکومەتێکی ئیئتیلافی دیموکراسیو بەرەیی بگرێتەوە. هەروا بەشداریی هەموو حزبە نیشتمانیو دیموکراسییەکان لەبەرەیەکی نیشتمانیو دیموکراسیدا بەپێی بەرنامەیەکی هاوبەش پێداویستییەکی نیشتمانییە بەمەرجێ سەربەخۆیی هەموو حزبەکان مسۆگەر بکرێ وەك مەرجێکی سەرەکی هەرحکومەتێکی ئیئتیلافی ڕاستەقینەو، حزبی شیوعی بەبێ هێنانەدی ئەم مەرجانە لەهیچ حکومەتێکدا بەشداری ناکات.

جا هەرچەندە حزبی بەعس ڕووی کردە باسکردنی پەیوەندی لەگەڵ شۆڕشەکەی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، لەدوای بەیاننامەی ١١ی ئاداری١٩٧٠ بەلام ئەم ڕەوتە کاتێکی زۆر کەم نەبێ درێژەی نەکێشاو لەم کاتەدا جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ژیانی حزبایەتی پێویست نییە چونکە (دوو حزبی پێشڕەو) هەن لەعێراقدا حزبی بەعسو لەکوردستانیشدا پارتی دیموکراتی

کوردستان لەبەر ئەوە بەعس شاڵاوی تیرۆرو داپڵۆسینی بۆ سەر حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق، دەستپێکردو ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەو کادیرو ئەندامانی حزب گیران، ئەمەش لەو خۆپیشاندانەوە دەستپێکرا کە بۆ پشتگیریی بەیاننامەی ١١ی ئادار دەرچوو، هەروا پیشاندانی شادیو خۆشیی لەنەورۆزدا کە جەژنی نەتەوەیی گەلی کوردە، ئەوە بوو هاوڕێ محەمەد ئەحمەد الخضری تیرۆرکراو، حزبمان لە دژی ئەم ڕێبازە تیرۆریستەی حزبی بەعس پرۆتێست و بێزاری دەربڕی.

لەسەرەتاکانی تەموزی ١٩٧٠دا پارتی دیموکراتی کوردستان کۆنگرەی هەشتەمی بەستو داوەتنامەی نارد بۆ ئامادەبوونی نوێنەرانی حزبی شیوعی عێراق لەم کۆنگرەیەدا، منو عبدالرزاق الصافی لەم کۆنگرەیدا ئامادەبین و وتاری حزب بخوێندرێتەوە. وتارەکەم بەناوی حزبی شیوعییەوە پێشکەش کردو لەوێدا جەختم کردەوە لەسەر سیاسەتی حزب بۆ چاری مەسەلەی کوردو پیاهەڵدانی بەیاننامەکەی ١١ی ئادار و ڕەخنەشم لە حزبی بەعس گرت چونکە لەرێکەوتنەکە دوور دەکەوێتەوەو، هێشتا لەسەر سیاسەتی تیرۆر بەرامبەر حزبمان بەردەوامە، ڕەخنەشم لەو بیرۆکەیە گرت کە ژیانی حزبی پێویست نەبێ چونکە حزبی بەعس لەعێراقو پارتی لەکوردستاندا هەن، ئەوەم دووپاتکردەوە کە ڕێگای چاری هەڵەکانو چاری گیرگرفتەکانو هێنانەدی بەیاننامەی ١١ی ئادار لەوەدایە بەرەیەکی نیشتمانی دیموکراسی پێکبهێندرێتو ئازادییەکان بەئازادی حزبەکانیشەوە بەرەلاّبکرێنو بەپێی بەرنامەیەکی سیاسیو ئابوریو کۆمەلاّیەتی هاوبەش کاربکرێت. ئەم وتارە لەرۆژنامەی پارتی (التآخي)دا بلاّوکرایەوەو لەناوەندە سیاسییەکاندا دەنگدانەوەیەکی فراوانی هەبوو. نوێنەری حزبی بەعس (کە وابزانم ناوی سلیمان بوو لە سودانەوە) بەرامبەر بەم وتارە لای بارزانی پرۆتێستی پیشاندابوو، ویستبووی لە کۆنگرە دەرچێو بگەڕێتەوە بۆبەغدا، بەلاّم بارزانی وەلاّمی دابۆوە کە ئەمە باری سەرنجی شیوعییەکانەو لەمەشدا هەقی خۆیانە.

وتارەکە ناوەندە سەرکردەییەکانی بەعسی بێزار کردبوو، تەنانەت ئەحمەد حەسەن بەکری سەرکۆمار لە کۆنگرەیەکی رۆژنامە نووسیدا شیوعییەکانی

لە(یاریکردن بەئاگر) وریا کردەوەو تاوانباری کردن کە چاکەیان لەبەرچاو نییەو هەرەشەی لەهەرکەس‌و کۆمەڵێك کرد کە لەرژێمی گشتی لابدەن. ڕاگەیاندنی بەعسیش هێرشێکی فراوانی ڕاگەیاندنی لە دژی من‌و لەدژی حزب دەست پێکردو، کاتێکیش گەڕامەوە بۆ بەغدا گوێم لەڕادیۆی بەغدا بوو کەناوەرۆکی وتارەکەی دەشێواند، لەتاکسییەکەدا کە بردمییەوە بەغدا گوێم لەو شێواندنە بوو هەستیشم کرد لە ئۆتۆمبیلەکەدا دوو پیاوی ئەمن هەن بەلاّم وایان دەردەخست کەهەر بەڕێکەوت لەهەمان ئۆتۆمبیلدا سواربووین. پاش گەیشتنە بەغدا وریا بوومو هەوڵمدا خۆم لەو کەسانەی ئەمن ون بکەم. پاش گەیشتنە ماڵەوە هاوڕێیان ئاگاداریان کردمەوە کە بۆ کوردستان بگەڕێمەوە چونکە بەعس دەیانەوێ بمگرن، بەمجۆرە ڕۆژی دووەم گەڕامەوە بۆ کوردستان.

لەڕاستیدا بەعس لەساڵانی ١٩٧٠و ١٩٧١دا هێرشێکی درندانەی دژی حزبی شیوعیمان لەبەغداو ناوچەکانی باشوور دەستپێکردو هاوڕێ (کاظم الجاسم) گیراو شەهید کراو، هەروا هاوڕێ عەزیز حەمید و شێخ عەلی بەرزنجەیی گیران و شەهیدکران وشاکر مەحمود لەشەقامدا تیرۆرکراو (ثابت حبیب العاني) گیراو ئازاردرا... بەدەیان‌و بەسەدان لەهاوڕێیان‌و دۆستانیش لە زیندانەکانی (کۆشکی کۆتایی–قصر النهایة)ی شوومدا لەناوبران و لەوڵاتدا کەش‌وهەوایەکی وابەربڵاوبوو کە بەهیچ جۆرێك لە ڕۆژانی دوای کودەتا ڕەشەکەی ١٩٦٣ باشتر نەبوو، لەسەردەستی دەستەوتاقمەکەی سەدام حسێن و لایەنگرانیان لەنمونەی نازم گزارو کەسانیتر تاوانی کوشتن و ئازاردان و دەسدرێژی بۆ سەر شەرەف‌و بەجۆرێك ئەنجامدران کە لەهەرکاتێکی پێشووی عێراق و بەڵکو لەهەموو جیهاندا نمونەیان نەبووە. هەرلەم کاتانەشدا پەیوەندییەکانی نێوان پارتی و بەعس بەرەو ئاڵۆزبوون دەچوون و بەعس کەوتە خۆدزینەوە لەرێکەوتنەکەی ١١ی ئادار، لەکاتێکدا بەعس لەلایەکی ترەوە زیاتر خۆی لە یەکێتی سۆڤیەت نزیك دەکردەوەو رێکەوتنی لەگەڵ بەستن بەتایبەتی لەبوارەکانی بەرهەمهێنانی فوسفات‌و کارگەی پەینی کیمیایی‌و ڕاکێشانی بۆری نەوت‌و دوو وێستگەی بەرهەمهێنانی وزەی کارەباو پەرەپێدانی کێڵگەی نەوتی باکوری ڕەمیلە، هەروا ڕێکەوتنێك لە نێوان هەردوو لادا

بۆ ماوەی پانزە ساڵ بەستراو دوای ئەوەش دەکرێ تازە بکرێتەوە، ئەویش ڕێکەوتنی دۆستایەتیو هاوکارییەو پەرەپێدانی تواناى بەرگری عێراقە...هتد.

حزبی ئێمە، شیوعی زۆر بەگەرمی ئەم ڕێکەوتنەمان پشتگیریی کردو هەرئەمەش هۆیەك بوو کە پاڵی بەحزبەوەنا بۆ دەستکردن بە وتوویژ لەگەڵ بەعس دوای ئەوەی پرۆژەی بەرنامەی نیشتمانییان بۆ هاوکاریی نێوان هێزە نشتمانیو دیموکراتییەکان بلاوکردەوە، واتە بەعس و پارتی و شیوعی، وەفدی وتوویژ لەلایەن حزبمانەوە لەم هاوڕێیانە پێکهاتن، (کەریم ئەحمەد)و هاوڕێ مەهدی عەبدولکەریم و موکەڕەم تاڵەبانیو لەلایەن بەعسەوە (مرتضى سعید عبدالباقي) کە ئەوکاتە وەزیری دەرەوە بوو، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا. لەپاڵ پرۆژەکەی بەعسدا حزبی ئێمە پرۆژەیەکی تری بۆ هاوکاری بلاوکردەوە، بەم هۆیەوە بەعس هەندێ دەستکاری پرۆژەکەی کرد کە بۆ گفتوگۆ لەسەر کردن بگونجێت. وێڕای ئەوەش حزبمان بەهەنگاوێکی ئیجابی دانا بۆیە توانرا لەسەر پرۆژە تازەکە گفتوگۆ بەردەوام بێت، بەلام ئێمە سەرنجی جدیمان لەسەری هەبوو بەتایبەتی دەربارەی حزبی (سەرکردە). پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان کرد بۆ هاوکاریمان لەمەسەلەی هێنانەدی بەرەدا، بەلام پارتی پرۆژەکەی بەعسی دایە دواوەو تەنانەت نەهاتە گفتوگۆکردن لەسەر ئەوەشی کە دەستکاری کرابوو، هەروا پرۆژەکەی ئێمەشیان دایە دواوە. ئێمە دەمانویست وەفدەکانی هەرسێ حزب کۆببنەوەو پێکەوە گفتوگۆ لەسەر پرۆژەکە بکەن بەلام بەعس بەگفتوگۆی هاوبەش قایل نەبوو، چونکە دەیویست لەگەڵ هەرلایەنێك بەتەنیا گفتوگۆ بکات نەك پێکەوە. بەهەرحاڵ من پێموایە هەڵوێستەکەی پارتی هەڵەبوو، چونکە ئەگەر بهاتایە ئێمە هەردوو حزبەکەمان، پارتیو شیوعی، یەکگرتوو بووینایە دەمانتوانی سنورێك بۆ دیکتاتۆرێتی بەعس دابنێین. بەهەرحاڵ لەمەودوا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەم کە هەروا خستیشمە پێش چاوی بارزانی.

وتوویژی نێوان ئێمەو بەعس ساڵونیوێکی خایاند. لە ڕۆژانی ئامادەکاریی بۆ دووەمین کۆنگرەی حزبی شیوعی لە ئەیلولی ١٩٧٠دا کە لەناوچەی (کاروخ) بەسترا، لەبەغدا هاوڕێ عەزیز محەمەد لەسەر داخوازیی بەعس لەگەڵ ئەحمەد

حەسەن بەکرو سەدام حسین دیداری کرد، پێش ئەوەی بۆ شوێنی کۆنگرە بەڕێ بکەوێت، هاوڕێ عەزیز ڕەخنەی لەسیاسەتی تیرۆریستی بەعس گرت کە لەدژی حزبمان و تەواوی بزافی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی پەیڕەوی دەکات‌و، چەند ڕووداوی بە نمونە هێنایەوە کە هاوڕێیانمان گیراون و هەندێکیان تیرۆرکراون‌و کەسانی تریش ئازار دراون و ڕووخێندراون، جا ئاخۆ دەکرێ لەژێر قامچی تیرۆرو داپڵۆسیندا هاوکاری بکرێت؟ بەهەرحاڵ ئامادەیی خۆیان پیشاندا دەستبەرداری ئەم سیاسەتەیان بن‌و لاپەڕەیەکی نوێ بکەنەوە. کاتێک هاوڕێ عەزیز گەیشتە جێگەی بەستنی کۆنگرەکە ئەنجامی ئەم دیدارەی بۆ هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندی باسکرد، کۆمیتەی ناوەندی بڕیاریدا ئەم مەسەلەیە بەقوڵی لێی بکۆڵێتەوەو ئەم بڕگەیە بەجۆرێك لەجۆرەکان بخرێتە پێش کۆنگرەکە. دوای کۆنگرەکە کاروبار بەرەوتێکی کەمکردنەوەی تیرۆرداو پاشان کۆتایی پێهێنانی لەساڵانی دواتردا دەڕۆیشت‌و، گفتوگۆو دیالۆگ لەبارەی بەرەو بەرنامەیەکی نیشتمانی هاوبەشەوە پەرەی سەند.

دوابەندی گفتوگۆیەکە مەسەلەی بەعسی سەرکردە بوو، هەردوو وەفدەکە نەگەیشتنە چارەسەرکردنی ئەم گرێکوێرەیە، داوامانکرد کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی کۆمیتەی ناوەندی حزبمان و سەرکردایەتی هەرێمی حزبی بەعس پێکبێت، بەوە قایل بوون کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی نێوان هەردوو سەرکردایەتی بکرێت. ئەم مەسەلەیەمان بەدرێژی باسکرد بەڵام بەعسییەکان وێڕای بەڵگەو بیانووی لاوازیان لەگفتوگۆکەدا هەر سوربوون لەسەر هێشتنەوەی ئەو بڕگەیەو ئێمە سوربووین لەسەر لابردنی لەپەیماننامەی نیشتمانیدا، هاوڕێ عەزیز سەرۆکی وەفدەکەی ئێمە بوو، سەدامیش سەرۆکی وەفدەکەی بەعس بوو. بەسەدامم گوت: دەکرێ هەرحزبێك بەسەرکردەیی حزبێکیتر قایل بێت، ئێوە حزبێکن سەرکردایەتی دەسەڵات دەکەن بەڵام سەرکردایەتی حزبەکانی تر ناکەن، جا ئەگەر سەرکردایەتی حزبی تر بکەن مانای وایە ئەو حزبانە ڕێکخراوی بنکەیی حزبەکەی ئێوەن نەك حزبی سەربەخۆ، ئیتر چۆن دەکرێ بەو دارشتنە قایل بین لەبەرئەوە دەبێ ئەو بڕگەیە لابدرێ. پاش قسەو مشت‌ومڕو بێنەو بەردە داڕشتنی (ڕۆڵی سەرکردایەتی)

هاتو ئەم مەسەلەیەش خرایە بەردەم کۆبوونەوەی تەواوی کۆمیتەی ناوەندی (کەلەتەموزی ١٩٧٣دا) بەسترا بۆ ئەوەی بڕیاری کۆتایی لەسەر بدرێ، یان قبوڵ بکرێ یان قبوڵ نەکرێ، ئیتر کۆمیتەی ناوەندی بڕیاری پێکهێنانی بەرەی لەگەڵ بەعس داو بەرنامە هاوبەشەکەی بەرەی پەسەند کرد.

مەهرەجانێکی وتار خوێندنەوە لەیاریگەی گەل پێکهات و. بالێۆزو دیپلۆماتەکان‌و جەماوەرێکی زۆر ئامادەی بوون، ئامادە بوونی جەماوەری حزبمان دیارو کاریگەر بوو چ لەڕووی ژمارەو چ لەڕووی ڕێکخستن‌و دروشم و بانگو هاوارەوە کەئەمەش بەتەواوی بەعسی بێزارکردو دووپاتکردنەوەی هێزی حزب بوو. لەم مەهرەجانەدا وتارێکم بەناوی حزبەوە پێشکەش کردو هەروا نەعیم حەداد بەناوی بەعسەوە وتارێکی خوێندەوە... پاش کردنەوەی مەهرەجانەکە ڕوومانکردە کۆشکی کۆماریی بۆ ئامادەبوونی ئیمزاکردنی پێکهێنانی (بەرەی نیشتمانی‌و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز) لەلایەن ئەحمەد حەسەن بەکر لە جیاتی بەعس‌و هاوڕێ عەزیز محەمەد لەجیاتی حزبی شیوعی. بڕیاردرا کۆمیتەی باڵای بەرە لەبەعسییەکان و شیوعییەکان‌و حزبە کوردییەکانی جیابۆوە لەپارتی و هەندێ کەسایەتی سەربەخۆ پێکبێت. نوێنەرانی بەعس لەم کۆمیتەیەدا بەسەرۆکایەتی سەدام‌و ئەندامەتی نەعیم حەدادو کەسانی تربوو نوێنەری حزبیشمان لەم کۆمیتەیەدا بەسەرۆکایەتی عەزیز محەمەدو ئەندامەتی کەریم ئەحمەدو عامر عەبدوڵاو رەحیم عجینەو کەسانیتر بوون. ئەوکاتە بەرپرسی پەیوەندییە نیشتمانییەکانی حزبی شیوعی عێراق بووم. پارتی بەم هەنگاوە قایل نەبوو. چەندان جار لەگەڵیان کۆبووینەوەو پێمانگوتن ئێمە پێمانوایە پێکەوە بین لەوتووێژی بەرەی نیشتمانی‌و لەوتووێژکردن لەسەر پرۆژەکەی بەعس بەڵام قایل نەبوون‌و پێمانگوتن کەوابی پێویستە خۆتان بەتەنیا بچنە وتوێژ لەگەڵیاندا، هەرچەندە ئێمە دەمانەویست بەڕاستی پێکەوەبین چونکە ئێمە بەتوندی باوەڕمان وابوو کەبوونی ئەوان لەگەڵ ئێمە لەبەرەدا دەتوانین پێکەوە ڕادەیەك بۆ سەرگەرمیی زیادەڕۆیی بەعس دابنێین‌و زۆر مەسەلەی وا داسەپێنین کەخزمەت بەئازادییە دیموکراتییەکان‌و هێنانەدی ئۆتۆنۆمی دەکاتو دەبینە ڕێگر لەبەردەم

دارمانی بارودۆخەکەدا، بەڵام برایان لەپارتی دیموکراتی کوردستان بەمەش قایل نەبوون. ئیتر چی بکەین: ئەوەمان کردو لەگەڵ بەعس بەرەمان پێکهێنا.

پێکهێنانی بەرە ڕووداوێکی گرنگ نەبوو کە بنکەی حزبی پشتگیریی بکات تەنانەت هەموو حزبەکان و جەماوەری ناحزبیش، چونکە خەڵکی بەسەلیقەی شۆرشگێڕانەو تاقیکردنەوەی تاڵیان هەستیان بەوە کردبوو کە ئەم پرۆسەیە لەلایەنی بەعسەوە شتێك نەبوو جگە لەوەی بیانەوێ پێی خۆیان لەدەسەڵاتدا بچەقێنن و حزبی شیوعی لەهاوپەیمانەکانی لەناو بزووتنەوەی کورددا دووربخەنەوەو دەست بەلێدانی هەریەکەمان بەجیاواز بکەن و خۆیان بەبێ ئەوەی کەس مونافەسەیان بکات دەست بەسەر بارودۆخەکەدا بگرنو تیرۆر بەسەر گەلدا بسەپێننو عێراق بکەنە عەسکەرتاریو سەرچڵیی هەڵەشەکارانە لەدژی دەوڵەتی دراوسێ ئەنجام بدەنو عێراق لەناو گێروگرفتا نوقم بکەن وێڕای نزم بوونەوەو داکەوتنی باری ئابوری و گوزەرانی خەڵك.

چوارەمین کۆنگرەی حزب لەساڵی١٩٨٥ لە(دۆڵی خواکورك) بەسترا باسو لێوردبوونەوەو هەڵسەنگاندنی لەسەر بابەتی پێکهێنانی بەرە لەگەڵ بەعسدا ئەنجامداو گەیشتە سەرئەنجامێکی ڕەخنەگرانە لەسیاسەتی حزب لەبارەی ئەم بابەتەوەو وایدانا کە ئێمە خەیاڵێکی هزریو سیاسی خاومان هەبوو کە بتوانرێ بەعس بگۆڕدرێ و ببێتە حزبێکی نیشتمانی و پێشکەوتنخواز.

# بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ و هەڵوێستی حزبمان لەم بەیاننامەیە

بەیاننامەی ١١ی ئاداری مێژوویی ئەنجامی خەباتو نەبەزین و قوربانیدانەکانی گەلی کوردستانمان بوو، بەپشتیوانی هێزە دیموکراسییەکان و لەپێشەوەیان حزبی شیوعی عێراقو بەبەشداری کاریگەری لەشۆڕشەکەیداو، لایەنگیریی دەوڵەتانی سۆسیالیست لەوکاتەداو، لایەنگیریی هێزە دیموکراسیو کرێکارییەکانی دەوڵەتان، کاتێك گەلی کوردستانمان لە شۆرشەکەیدا چەکی بەڕووی حکومەت و ڕژێمە دیکتاتۆرییە شۆڤێنییەکاندا بەرزکردبۆوە ڕێگای چاری ئاشتییانەی بەرێخەی وتوێژ بۆ هێنانەدی ئامانجە نیشتمانو نەتەوەییەکانی دانەخستبوو، ئەمەش بوو پشتگیریی فراوانی نێودەوڵەتانو لایەنگیریی گەلی عەرەبو هێزە پێشکەوتنخوازەکانی دەرخستبوو، دوای ئەوە حکومەتە شۆڤێنییەکان یەك لەدوای یەك لەشەرەکانیاندا دژی گەلەکەمان تووشی بەزین هاتن، حکومەتی بەعس ناچار بوو لەگەڵ سەرکردایەتی شۆرش وتووێژ دەست پێبکات، ئەمەش هەروا هەر لەوکاتەوە کە شۆرشی ئەیلول بەرپاکرابوو داخوازیی حزبی شیوعیمان بوو.

حزبی شیوعی هێزی دووەم بوو لەشۆڕشدا لەبەر ئەوە کاتێك حزبی بەعس داوای چوونە ناو وتووێژی کردو وەفدێکی وتووێژکردن لەپارتی دیموکراتی کوردستانی پێکهات بارزانی نەمر داوای کرد حزبی شیوعی عێراق لە وەفدی وتوێژکاردا بەشدار بێتو لەم بارەیەوە ئاگاداری وەفدەکەی پارتیشی کرد داوای لێکردن کە مەسەلەکە بخەنە پێش چاوی بەعس چونکە حزبی شیوعی لایەنێکە لە شۆڕشدا، بەڵام بەعس داوایەکەی وەفدی پارتی دایەدواوە، بۆیە بێ ئەوەی وتووێژبکەن گەڕانەوە بۆ کوردستان، وەفدەکە بارزانی سەرکردەی شۆڕشەکەی لەوە ئاگادار کردەوە کە بەعس ئەو داخوازییەی داوەتە دواوە، ئەوەبوو

وەفدەکەی بەعس ((جەختی لەسەر ئەوە کردبۆوە کە شۆڕشەکە شۆڕشێکی کوردییە لەپێناو ئامانجی نەتەوەیی کوردیدا، بوونی حزبی شیوعی لەگەڵتان شتێك ناگۆڕێ و ئێمە لەگەڵ شیوعییەکان هەڵوێستێکی ترمان هەیە هەروا گیروگرفتەکانمان لەگەڵیان چارەدەکەین لەبەر ئەوە ئێمە بەجیا لەگەڵ ئێوەین)) بەلاّم بارزانی دووپاتی کردەوە کەبوونی شیوعییەکان لەوەفدی وتووێژکار پێویستە بەلاّم دەبێ حزبی شیوعی لە هەڵوێستی ئەو و لەهەڵوێستی بەعس ئاگادار بکرێن‌و دەبێ بیروڕای شیوعییەکانیش وەربگیرێت، بۆیە چاوپێکەوتن لە نێوان سەرکردایەتی حزب‌و وەفدی وتووێژکاری (پارتیدا)کراو گوتیان: بارزانی سورە لەسەر بەشداریی ئێوەو ئەمە بەمەرجێك دەزانێ بۆ جیدیەتی وتووێژەکەو بۆ چارکردنی گشت گیروگرفتەکان، بەلاّم بەردەوامبوونی لەسەر ئەمە مانای پچڕاندنی وتووێژەکەو درێژەدانە بەشەڕو کوشتار. سەرکردایەتی حزبمان ڕایگەیاند کەهەڵوێستی بارزانی ڕاستەو بەلاّم لەوەدا کە وتووێژ ببێ یان نەبێ ئێمە لەگەڵ بەردەوامبوونی وتووێژەکەین‌و نابینە هۆکارێك بۆ پچڕاندنی. وادیاربوو وەفدەکە لەگەڵ درێژەکێشانی وتووێژەکە بوو بەبێ شیوعییەکان بەلاّم بارزانی بۆیانی دووپاتکردەوە کە دەبێ بیروڕای شیوعییەکان لەمەدا وەربگیرێت.

وتووێژ بەردەوامبوو هەردوو لاڕێکەوتن کە بەیاننامەی ئاداری ۱۹۷۰ دەربکەن، بەیاننامەکە لەلایەن عەزیز شەریفەوە دارێژرابوو کەڕۆڵێکی دیاری لەڕێکەوتنەکەی هەردوولادا بینی‌و، حزبی شیوعی عێراقیش بەگەرمی لایەنگیری کردو بەشداریی شادی و خۆشی جەماوەری عێراقی کرد بۆ ئەم ڕێکەوتنە مێژووییەی کە بۆیەکەمجار لەمێژووی سیاسی عێراقدا حکومەتی عێراق لەو بەیاننامەیەدا دانینا بەنەتەوەی کوردو مافە نەتەوەییەکانیدا بۆ پێکهێنانی ئۆتۆنۆمی کوردستانی عێراق، ئەمەش دەسکەوتێکی سیاسی‌و هێزی‌و مافناسی بوو بۆ بزافی ڕزگاریخوازیی نیشتمانیی کوردستان، بەلاّم لای حزبی بەعس پاشەکشەیەکی تاکتیکی بوو چونکە حزبێکی شۆڤێنییەو دژی مافە نەتەوەیی‌و دیموکراسییەکانە.

هەر لەڕۆژانی یەکەمی ئیمزاکردنی بەیاننامەکەوە، بەعس بەڕەوتێکدا دەڕۆیشت پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش ئاڵۆز بکات و ئەوە بوو هەوڵیدا

ئیدریس بارزانی لەبەغدا تیرۆر بکاتو، پاشان لە کردەوەیەکی نامەردانەو بێزراودا هەوڵیاندا لەساڵی ۱۹۷۱ دا بارزانی خۆی تیرۆر بکەن[٥] ئەمەش لەحاجی ئۆمەران من ئەوکاتە لەبارەگای هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق بووم، بۆ ڕۆژی دووەم چوومە شوێنی ڕووداوەکە بۆ سەردانی بارزانی وهیوای تەمەندرێژیو تەندروستیم بۆ خواست، بارزانی زۆر بەهێمنی باسی ڕووداوەکەی بۆ کردین کە چۆن لاشەو مێزەری مەلاکان کە ڕژێم بۆ تیرۆرکردنی ئەو ناردبوونی لەو هۆڵەی بۆ دیدارەکە تەرخان کرابوو بڵاوبوونەوە.

من خۆم پارچە گۆشتو ڕیشی مەلاکانم دی بەژێر بانو دیوارەکانی هۆڵەکەوە نووسابوون پاش لەتوپەت بوونیان بەو بۆمبە تەقینەوەیەی یەکێك لەمەلاکان لە پشتی بەستبوو بەبێتەل تەقێنرایەوە بەئامانجی لەناوبردنی ژیانی سەرکردەی شۆڕشی کورد کە ڕزگاری بوو هیچ ئازاری پێنەگەیشت. ئەم تاوانە بووەمایەی پرۆتیستو بێزاریی توند لەناوخۆو دەرەوەدا، بەڵام سەرکردایەتی شۆڕش زۆر بەهێمنی و وریایی بەرەنگاری ئەم بارودۆخە ئاڵۆزەبۆوە.

بەرەبەرە بەعس چارەی شۆڤێنی ڕەشی خۆی دەرخستو دەستدرێژی کردە سەر جوگرافیاو مێژووی کوردو دەستی کردە پەیڕەوکردنی سیاسەتی شومی بەعەرەبکردن بەتایبەتی لە پارێزگای کەرکوك و جیاکردنەوەی ناوچە کوردییەکانی وەك خانەقین و شەنگارو شێخان و ئاکرێ لەبەڕێوەبەرێتی کوردی و، دەرچوونی ئاشکرا لەدەقی بەیاننامەکەی ۱۱ی ئادار. پەرەسەندنی ڕووداوەکان وایکردە پێویست کۆمیتەیەکی سێقۆڵی هاوبەش، لەبەعسو پارتیو شیوعی پێکبێت. سەرۆکی وەفدەکەی بەعس خوالێخۆشبوو عەبدولخالق سامەڕائی بوو، لەگەڵ محەمەد فازڵو سەعدون غیدان، وەفدی پارتی بەسەرۆکایەتی سامی عەبدوڕەحانوو فوئاد عارف و یەکێکی تربوو کەناوەکەیم لەبیرکردووەو وەفدی ئێمە بەسەرۆکایەتی خۆم (کەریم ئەحمەد)و مەهدی عەبدولکەریم(ئەبو کیسرا)و هاوڕێ موکەڕەم تاڵەبانی بوو. هەردوو وەفدی بەعس و پارتی باسی کاری

---

(٥) ڕۆژی ۲۹ی ئەیلولی ۱۹۷۱ بوو -وەرگێڕ-

لادەرانەی یەکتریان دەکردو هەریەك ئەو لایەکەی تری تاوانبار دەکرد، هەندێ جار عەبدولخالق سامەڕائی لایەنی پارتی دەگرتو هەوڵی دەدا بگەنە چارە، چونکە بەتەنیا پێیگوت، "ئەو لەسەرکردایەتی هەرێمی بەعسەوە ڕاسپێردراوە کە گیروگرفتەکانی پەیوەندیی هەردوو لا چارەسەر بکاتو، کەسانی وا لەڕیزەکانیاندا هەیە کە پێشەکی گرەوی لەسەر ژێرکەوتنی کردووە.. من لەگەڵ مافەکانی گەلی کوردمو بەرگرییان لێدەکەمو دۆستایەتییانم دەوێ بۆ ئێمەو بەبێ هاوکاریی برا کوردەکان ناتوانین وڵاتەکە بەرەوپێش ببەین."

دوو کۆبوونەوەمان کردو ئێمەش لایەنی وەفدی کوردیمان دەگرت لەدژی لادەرییەکانی بەعس لەکوردستاندا، کۆششی کۆمیتە سێقۆڵییەکە بۆ چاری گیروگرفتەکان بەژێرکەوتن کۆتایی هات، ئێمە هەرچەند هەندێ پێشکەوتنمان لەچاری گیروگرفتە لاوەکییەکاندا بەدەست بهێنایە، ئەوەندە لەلایەکی ترەوە بارودۆخەکە زۆرتر ئاڵۆز دەکراو گیروگرفتی تازە ڕوویان دەدا.

دواجار گیروگرفت و ئاڵۆزی نێوان بەعس و پارتی وەردەچەرخێ بۆ پەیوەندیی نێوان حزبی شیوعی و پارتی، ئەم نەخشەیە بەوردی داڕێژرابوو بۆ کەلاخستنی حزبی شیوعی لەکوردستان، پارتیش شاڵاوێکی فراوانی لەهەموولایەکی کوردستان بۆ سەر ڕێکخراوەکانی حزبی شیوعی دەستپێکردو (١١) یانزە هاوڕێ لاوەکەمانی کوشت کە لە دەرەوە گەڕابوونەوەو لەلایەن عیسا سوارەوە کوژرانو هاوڕێ د.فارس لە سلێمانیو عەلی مەولودو چەندانی تر گیران و ئازاردران و کوژران.

وەفدێکی حزبمان کە لەزەکی خەیری و کەریم ئەحمەد پێکهاتبوو سەردانی بارزانی کردو لەهۆکاری ئەو گرتنو ئازاردانەی شیوعییەکانو کوشتنی هەندێکیانی پێچایەوە، هەندێکیان بەرەڵاکران بەڵام پەیوەندییەکانی نێوان حزبی شیوعیو پارتی یەکجار زۆر بەبارێکی خراپ و سەلبیدا شکایەوەو ئێمەش داوامان لە هێزە چەکدارەکانمان کرد(پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی) کە شوێنەکانی خۆیان جێبهێڵن، ئەمەش دوای ئەوەی کە زانیمان نەخشەیەك هەیەبۆ ڕاکێشانی پارت بۆ کوشتار لەگەڵ شیوعییەکان، داوای دیدارێکی یەکترمان کرد لەگەڵ پارتی لەبەغدا، لەلایەنی ئێمەوە هاوڕێیان عەزیز محەمەدو من (کەریم ئەحمەد)و دکتۆر ڕەحیم

عەجینــەو موکــەڕەم تاڵــەبانی ئامــادە بــووینو لەلایــەنی پارتیــشەوە ســامی عەبدولڕەحمانو ساڵح یوسفیو نوری شاوەیس ئامادە بوون، پێمان ڕاگەیاندن کە شــەڕەکە لــەنێوان ئێمــەو ئێــوەدا نییــەو، مافــەکانی گــەلی کــورد لەلایــەن حزبــی شــیوعییەوە داگیرنــەکراوە، ئێــوە زۆر چــاك ئــەمــە دەزانــن ئــیتر بۆچــی ئەتانــەوێ هێــرش بەرنــە ســەرمانو لەگــەڵ ئێمــە دەکەونــە شــەڕ، ئــەی ئێمــە هاوپــەیمانیی هەمیشەیی ئێوە نین؟ تکام وایە ســەرکردایەتی شــۆڕش ئاگــادار بکــەن کــە ئەگــەر ئێوە شەڕ لەدژی حکومەت دەست پێبکەن ئێمە بەهیچ جۆرێك هاوشانی حکومــەت نــابین بــۆ شــەڕ لــەدژی ئێــوە. ئێمــە لــەدژی شــەڕ دەســتپێکردنەوەینو شــەڕ تازەکردنەوە بەپیلانێك دەزانین لەدژی بزووتنەوەو شۆڕشی کوردو ئێــوە دەتــوانن لەشەڕ دوور بکەونەوەو ئێمەش لەگەڵتان دەبین.

بەلاَم بەداخەوە پیلانگێڕانەکە لەو خواستو هیــواو ئامانجانــە بــەهێزتر بــوو کــە گەلی کوردمان بەهەزاران لە ڕۆڵەکانی کردبوونە قوربانی لــە پێناویانــدا، ئــەوە بــوو شــەڕ (لەنێوانمانــدا) دەســتی پێکــردو هێزەکــانی شــۆڕش پــەلاماری شــوێنەکانی پێــشمەرگەکانمانیانداو حکومــەتیش وەك گوێنەدانــە بارودۆخەکــە تەماشــاکاری شەڕەکە بوو!

سەدامیش توانی شای ئێران قایل بکات کــە نیــوەی (شــط العــرب) بداتــە ئێــران لەبەرامبــەر داخــستنی ســنوری ئێــران لــەڕووی شۆڕشــی کــورداو بڕینــی ئــەو یارمەتییەی ئێران دەیدایە شۆڕشو یان لەرێگەی ئێرانەوە لــە دەرەوە بــۆ شــۆڕش دەهات. ئەمەش لەساڵی ١٩٧٥دا لەجەزائیری پایتەخت بوو، کە سەرۆکی جــەزائیر هواری بومدین ئامادەی بــوو. هــەروا ئــەمریکا لەســەر ڕاوێــژی هێنــری کیــسنگەری وەزیــری دەرەوەی دەســتبەرداری پــشتگیریی شۆڕشــی کوردبــوو. بــەمجۆرە بەرژەوەنــدی نێودەوڵــەتی کــۆك بــوون لەســەر ئــەوەی لــە شۆڕشــی کوردســتان بسرەوێندرێو شــۆڕش تووشــی شکــستییەکی گــەورە بــوو پــاش ئــەوەی هێزێکــی گەورەی بەچەکەوە خۆیان دابەدەستەوەو، ســەرکردایەتی شۆڕشــیش بــەخۆیان و بەچەکەوە خۆیاندا بەدەست ئێرانەوە بەمەرجێ هــیچ چــالاکی سیاســی و ســوپایی لەدژی عێراق نەبێت.

لەکۆبوونەوەی کۆمیتەی باڵای بەرەی کوردستانیدا کە سەدام ئامادەی بوو، دڵخۆشی سەرکەوتنەکەی بوو، ناوەڕۆکی ڕێکەوتنەکەی بۆ باس کردین، کاتێك لەسەر دەستبەرداربوونەکەی لە (شط العرب) دا پرسیارم لێکرد، لەوەلامدا گوتی "ئەوەی شتێکی بوێت دەستبەرداری شتێکی تر دەبێت" پاشان پرسیاری ئەوەم لێکرد کە شا گوتویەتی ئێوە بەربەرەکانیی حزبی شیوعی دەکەن بەشێوەیەکی پێچ و پەنا گوتی: تەحەدای شادەکەم ئەگەر هەر ڕێکەوتنێکی لەو جۆرەهەبێت با بلاوی بکاتەوە.

پیلانەکەی بەعسی سەدامی لەسەر ئەوە دامەزرا بوو کە(ئەگەر نەتتوانی شتێك بێنیتەدی دەبێ بۆ هێنانەدیی ئەو شتە دەستبەردارییەك بکەیت... پاشان ئەگەر هەلومەرجی گونجاوت بۆ پەیدابوو لەو دەستبەردارییەی کردووتە پەشیمان ببەرەوە)، ئەوە بوو پاشان سەدام بەکردەوە ئەمەی پەیڕەوکرد. کاتێك شەڕی دژی ئێران بەرپاکرد بۆسەندنەوەی نیوەکەی (شط العرب) لەئێران و "سەرکەوتنەکەی" بەسەر شۆڕشەکەی کوردستاندا بەو دەستبەردارییەی باسکرا هێنایەدی. داوای دیدارمان لەگەڵ پارتی کرد لەبەغدا بۆ ئەوەی بارودۆخەکەیان بۆ ڕوون بکەینەوەو بزانین چی بکەین، لەلایەنی ئێمەوە هاوڕێ عەزیزو منو دکتۆر ڕەحیم عەجینەو موکەرەم تاڵەبانی ئامادەبووین و لەلایەنی ئەوانیشەوە سامی عەبدولرەحمان و نوری شاوەیس و دارا تۆفیق و سەیدا ساڵح یوسفی ئامادە بوون، هاوڕێ عەزیز دەستی کردە ڕوونکردنەوەی بارودۆخی سیاسیو پەرەسەندنە سەلبییەکانی لەدوای ڕێکەوتنەکەی جەزائیرەوە کە شۆڕشی کوردی خستە سەر دووڕیانێك، یان وازهێنان لەشۆڕشی چەکداری، ئەمەش مانای داخستنی سنورە لەگەڵ ئێران و دابڕینی یارمەتی دەرەوەو پشتگیری ئەمریکاو، یاخود بەردەوامبوونی شۆڕش بەپشت بەستن بەتواناکانی ناوخۆو هەندێ یارمەتی کەمی دەرەوە، هاوڕێ عەزیز ڕایگەیاند کە: ئێمە لەگەڵ بەردەوامبوونی شۆڕشی چەکدارین و ئامادەشین لەبەرەی نیشتمانی دەرچین و دەسبەجێ بێینە لای شۆڕش ئەگەر ئەمەتان پەسەند کرد، پێویستە کەوا دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان بارزانی لەمە ئاگادار بکەن. بەلام بەداخەوە بڕیار ئەوە بوو دەست لە شۆڕش

هەڵگیرێت‌و خۆبەدەستەوەدان و کۆچکردن پەسەند بکرێت. ساتێکی زۆر کاریگەرو ناخۆش‌و پڕ لەداخ بوو کەدەماندی (پ.م)و سەرکردایەتی دەچوونە ئێران‌و چەکەکان‌و خۆیان دەدایە دەست دەسەڵاتی شا. لەدواییدا ئەو ساتە پڕئازارانەو هەستی بارزانیم دەهاتەوە یاد کە لەدوادیداریدا لەگەڵ وەفدەکەی مەکتەبی سیاسی بەسەرۆکایەتی هاوڕێ عەزیز محەمەدو (ئەبو یەحیا)و من‌و ثابت حەبیب (ئەبو حەسان)و، بەئامادە بوونی کاك ئیدریس‌و کاك مەسعود‌و سامی عەبدولرەحمان، کاتێك بارزانی گوتی: من ئێستا لە دەمی دڕندەیەکدام واخەریکە دەخنکێم‌و قوتم دەداو لەناوم دەبات، ئایا ئێوە دەتوانن ڕزگارم بکەن؟

لەم دیدارەدا ڕوونمان کردەوە کە ئێمە: بەئاگاداریتان بەرەمان لەگەڵ بەعس پێکهێناو داوامان لێکردن لەم بەرەیەدا بەشداربن تا ببینە هێزێکی یەکگرتوو لەڕووی بەعسدا. بەعس زۆر بەتواناترە لەوەی ئێمە بتوانین بەتەنیا ڕووبەڕووی ببینەوە، بەڵام ئەگە پێکەوەبین هەزار حیسابمان بۆ دەکەن، ئەگەر بیانەوێ کردەوەیەکی دیاریکراو بەرامبەر ئێوە یان ئێمە بکەن، بەشداری نەکردنتان لەبەرەدا مانای وایە دەبێ بەتەنیا ڕووبەڕووی بەعس ببنەوەو ئەویش دەتوانێ ئازارتان بدات، جا لەپێناو ئەم شۆڕشەدا، شۆڕشی هەموو گەلی کورد کە لەدەوری سەرکردایەتییەکەتان کۆ بونەتەوە، پێمان وایە هێزمان یەکخەین‌و پێکەوە لەبەرەدا کاربکەین بۆ بەرژەوەندی ئازادییە دیموکراتییەکان و هێنانەدی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان.

ئەمە لەپێش ڕێکەوتنەکەی جەزائیردا بوو بەماوەیەك و ئەمە دوادیداربوو لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشدا. سەرکردایەتی شۆڕش هەستی کردبووکە دوژمنانی شۆڕش‌و مافەکانی گەلی کوردو دوژمنانی ئازادییە دیموکراسییەکان پیلانەکەیان لەسەر ئاگرێکی کز ئامادە دەکەن.

شکستیەکەی شۆڕشەکەی کوردستان شکستی بوو بۆ بزاڤی نیشتمانی‌و دیموکراسی لەعێراقدا. پەیوەندییەکانی بەرەیی نێوان حزبی شیوعی‌و حزبی بەعس بەرەو خوار دادەکشان تا گەیشتە ئەوەی دەستوەربدەن لەوەی لە ڕۆژنامەو ڕاگەیاندنماندا دەماننووسین.

لــە کۆبوونەوەیــەکی کۆمیتــەی بــاڵای بــەرەدا کــاك تایــەر شــەریف ســکاڵای لەدەستەی نووســەرانی ڕۆژنامــەی (التـآخي) کـرد کـە هەرچییەکیان بۆ نـاردوون بڵاویــان نەکردۆتــەوەو وایــدانا کــە ڕۆژنامەکــە بــۆ هەموانــە، نەتەوەیــەروەری کۆچکردووی دڵسۆز عـەزیز عـەقراوی سکرتێری حزبـی(دیموکراتی کوردستان)ی سەر بەحزبی بەعس وەڵامـی دایـەوە کـە ڕۆژنامەکـە زمانحـاڵی حزبەکەیـەتی ئـەی خــۆی بۆچــی داوای مۆڵــەتی دەرکردنــی ڕۆژنامەیــەك بــەناوی حزبەکەیــەوە (پێشکەوتووی کوردسـتانی) نـادات...[٦] سـەدام زۆر بـەتورەیی وەڵامـی عـەزیز عــەقراوی دایــەوەو گــوتی ڕۆژنامەکــە بــۆ هــەموو حزبــە کوردییەکانــەو دەبــێ دەستەیەکی نووسەرانی هاوبەشی بۆ هـەموان هـەبێت، ناویشی دەگـۆڕینو دەبـێ بە(العراق) لەجیاتی (التـآخي)، عـەزیز عـەقراوی بەسروشـتی خـۆیو سـەرگەرمیی کوردانەی خۆی گوتی: قایل نابین. سەدام گـوتی: (قایـل نـابین نییـەو دەشـبینی چـۆن قایــل دەبــی) بــۆ ڕۆژی دوایــی ڕۆژنامەکــە بــەناوی (العــراق) دەرچــوو، کۆبوونەوەیەکیش کرا نـاونرا (کـۆنگرە)ی حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان کەسـەربە دەزگای هەواڵگری مخابرات–ی بەعس بوو، سڵاو لەعەزیز عەقراوی کۆچکردوو.

بەمجۆرە گیروگرفتـەکان زۆربـوونو دەسـتدرێژی زیـادی کـردو دیسان هێرشـی گرتنی هاوڕێیانو ئازاردانیـانو تەنانـەت کوشـتنیان دەسـتی پێکـردەوە هـەر وەك چۆن هاوڕێ محەمەد زخوك گیراو تامردن ئازاردرا. لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی باڵای بەرەدا مەسەلەکەم خستە پـێش چـاوی سـەدام و گـوتم چـۆن دەکـرێ هاوڕێیـەکی ئێمە تامردن ئازار بدرێت لەم ڕۆژەدا کەلەنێوان حزبی شـیوعیمانو حزبـی بەعـسدا "بەرە"و هاوکاری هەیە، ئاخۆ هۆی گرتن و ئـازاردانی تـامردن چـی بێـت؟ سـەدام پرسیاری لە تاریق عەزیز کرد کە زانیاری لەسـەر ڕووداوەکـە چییە، تـاریق عـەزیز فایلێکی گەورەی هێنایە پێشەوەو دەستی بەخوێندنەوەی ئەوی لەوێدا نووسـرابوو کرد(محەمەد زخۆك چەکی هەڵگرتبوو خەڵکی هاندەدا بۆ شۆڕش لـەدژی بـەعس) گـوتم: ئـەبوعودەی.. ئـەو چـەکەی محەمـەد زخـۆك هـەڵیگرتبوو دەمانـچەیەکی

---

(٦) حزبەکەی شێخ ستار تایەر شەریف ناوی "شۆڕشگێڕی کوردستان-الشوري الكردستاني"بوو-وەرگێر-

گچکەیەو لە کوردستان پێی دەڵێن (مێش کوژ)و بەعەرەبی (قاتل الذبان) چونکە ئەم دەمانچەیە مرۆڤ ناکوژێت بەڵکو دەشێ تا مەسافەی "٥"مەتر برینێکی گچکە بکات، جا ئایا ماقوڵە محەمەد زخۆك بەم دەمانچەیە ڕژێمی حوکم هەڵگێڕێتەوە؟

سەدام گوتی: کەواتە خۆت‌و تاریق عەزیز کۆمیتەیەکی لێکۆڵینەوە پێکبێنن. گوتم ئەم کۆمیتەیە هیچ سودی نییە چونکە تاریق عەزیز هەر لەئێستاوە فایلێکی گەورەی هەڵگرتووە پڕ لەڕاپۆرتی دیشداشە لەبەرەکانە (مەبەستم پیاوانی ئەمنە). لێرەدا سەدام بەهەڵچوونەوە وەڵامی دایەوەو گوتی: دیشداشە لەبەر ئەگەر هەواڵی بۆ ناردین کەماڵی کەریم ئەحمەد چەکی تێدایە ئەوا بێ هیچ لێکۆڵینەوەیەك ماڵی کەریم ئەحمەد دەپشکنین.

گوتم: ئەگەر درۆ دەرچوو چی لەگەڵ دیشداشە لەبەر دەکەن؟ وەڵامی دامەوە کە هیچیان لەگەڵ ناکەن: چونکە ئەوانە هەواڵ‌و زانیاریمان بۆ دەنێرن ئیتر چۆن بەرپەرچیان بدەینەوە نەخێر ئێمە زیاتر هانیان دەدەین تەنانەت ئەگەر هەواڵەکانیشیان درۆبن.

جارێکی تر بۆ شتێکی تر من‌و ئەبویەحیا لەدیداری سەدامدا بووین، بارودۆخەکەمان بۆ باس دەکرد کە پێویستە پەرەسەندنی ئابوریمان بایەخی پێبدرێت بەتایبەتی پیشەسازدارکردنی وڵات‌و بەرز کردنەوەی ئاستی بژێوی‌و نەهێشتنی بێکاری‌و نەخوێندەواری‌و هاوکاری‌و پێکەوە ڕۆیشتن تاعێراق بکرێتە نمونەیەکی سەربەخۆی پەرەسەندوی دیموکراسی.

سەدام گوتی: لەوەی باستان کرد لەگەڵتاندام بەڵام دەمەوێ بۆتان ڕوون بکەمەوە کە هاوکاریمان بەتەنیا هاوکارییەو بەس، بەهیچ جۆرێك بیر لەدەسەڵات گرتنەدەست مەکەنەوە چونکە هاوکاریمان لەگەڵتان بۆ ئەوە نییە ئێوە ئەم تاکتیکە بەکار بێنن بۆ نزیك بوونەوە لەدەسەڵات ئێمە لێتان نزیك بووینەتەوە لەو پێناوەدا نییە غافڵگیرمان بکەن‌و بازدەنە سەر دەسەڵات، پەندێکی میللی هەیە دەڵێ ((لەدوامەوە سواربوو دەستی بۆ ناوجەواڵەکە درێژکرد)). پاشان گوتی: ئێوە حزبێکی سیاسین بەرنامەی خۆتان هەیەو پەیوەندیتان لەگەڵ خەڵك بەرین دەکەن بۆ پشتگیری بەرنامەکەتان‌و ڕاکێشانیان بۆلای خۆتان، بەنهێنی‌و بەئاشکرا

خەڵك لەبواری جۆربەجۆردا ڕێکدەخەن تا خەڵك بەرەو وەرگرتنی دەسەلآت پاڵپێوە بنێن، بەڵام بەعس شتێکی ترە، بەبێ دەسەلآت نابێتە حزبێکی سیاسی جەماوەری، بۆیە ئێمە بەهەموو جۆرێك هەوڵی دەسەلآت گرتنە دەست دەدەین گەر گرتیشمانە دەست نایکەینە دیاری بۆ کەسی تر. ئەگەر هەستمانکرد کە دەستەیەك یان کەسێك هەیە باسی پێویستی وەرگرتنی دەسەلآت لەبەعس دەکات یان تەنانەت گومان لەو کۆمەڵە خەڵکانە بکەین ئەوا دوودڵ نابین لەبەکارهێنانی داپڵۆسین لەدژیان. خۆ ئەگەر گومانی ئەوە لەکەسێکی ناوڕیزەکانی خۆمان بکەین ئەوا دەست بەجێ و بەبێ دوودڵ سەریان دەبڕین. ئێوە بەنهێنیو ئاشکرا حزبێکی سیاسین، ئێمە لەدەرەوەی دەسەلآتدا دەستەیەکین بۆ وەرگرتنی دەسەلآت پیلان دەگێڕین تا ببینە حزبێکی جەماوەری.

سەدام ئاوابیری دەکردەوەو ئەمە بوو شێوازی مامەڵەی لەگەڵ کەسانی تردا، دەیویست دەسەلآت بەتەنیا بەدەست حزبی بەعسەوە بێت و مەسەلەی هاوکاری لەگەڵمان مەسەلەی کات و نەخشەیەکی دیاریکراو بوو بۆ ماوەیەکو دوای ئەوە جیابوونەوە دێت، هاوکاریش لەپێناو کۆکردنەوەی هێزەکان بۆ پەرەپێدانی وڵاتو خۆشگوزەرانی گەلو بەرگری لەسەربەخۆیی نیشتمانی نەبوو.

دوادیداری بەرە ئەوە بوو سەدام داوای کۆبوونەوەیەکی کرد لەگەڵ کۆمیتەکانی بەرە لەپارێزگاکاندا، لەم کۆبوونەوەیەدا سەدام باسێکی لەسەر بارودۆخەکە خستە بەرچاو ئینجا هاتە سەرباسی پەیوەندیی نێوان ئێمەو ئەوان کەپەیوەندیی پاشکۆییە بۆ حزبی سەرکردە هەروا پێناخۆشی خۆی دەربڕی لە چالاکیو گەورە بوونی حزبی شیوعی لەناو کەرتە جۆربەجۆرەکانی گەلدا. چەند هاوڕێیەك لە پارێزگاکانەوە قسەیان کردو هاتنە سەرباسی تەنگ پێهەڵچنینو شێوازی تیرۆریستی لەلایەن دامەزراوەکانی ئەمنو ڕێکخستنەکانی بەعسەوە لەدژی هاوڕێیانو ڕێکخراوەکانمانو لەپێشی هەموویانەوە هاوڕێ عادل سەلیم لەهەولێر قسەی کرد هەروا هاوڕێ دکتۆر (صباح الدرة)، بەڵام وتارەکەی بەرپەرچدانەوەی وتارەکەی سەدام بوو لە کۆبوونەوەکەدا. دوای ئەم کۆبوونەوەیەو لەساڵی ١٩٧٧دا بەعس دەستی دایە کاروکردەوەی هێرش بردن بۆ سەر ڕێکخراوەکانو

هاوڕێیانی حزب، ئەوەبوو ۳۱هاوڕێ و دۆست لەپۆلیس‌و سەربازانی سوپا گیران‌و حوکمی ئیعدام دران‌و لەئایاری ۱۹۷۸دا ئیعدام کران‌و هێرشی دڕندانە بۆ سەر حزب دەست پێکرا لەبەر ئەوەی کۆمیتەی ناوەندیی حزب لەئایاری ۱۹۷۸دا کۆ بۆوەو بەتوندی ڕەخنەی لە سیاسەتی تیرۆریستانەی بەعس گرت کە چۆن بۆتە مایەی زیان گەیاندن بەسەربەخۆیی وڵات‌و ئابوری نیشتمانی‌و هەردەشبێتە دیکتاتۆری، پاشان کاروباری پێویست بۆ گەڕانەوە بۆ کاری نهێنی و بەرگریی چەکدارانە جێبەجێ کران‌و تیپەکانی پارتیزان بەهاوکاری لەگەڵ (پێشمەرگەکانی) کوردستان دامەزرێندراو چەندان بنکە لەسەر سنوری عێراق و ئێران پێکهێنران و کادیران‌و سەرکردە ناسراوەکان بۆ دەرەوەی عێراق‌و بۆ ناوچەی پارتیزانە چەکدارەکان نێردران.

بەمجۆرە حزبی شیوعی لەهاوپەیمانی و هاوکاری بەعسەوە، کە "هیوا"دەکرا لەحزبێکی تیرۆریستی دیکتاتۆرەوە ببێتە حزبێك بۆ خزمەتی گەل‌و پەرەپێدانی وڵات، دەڵێم حزبەکەمان بووە حزبێکی بەرهەڵستکار کە داوای دەکرد‌و هەوڵی دەدا بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی دیکتاتۆریی شۆڤێنی بەعس کە دوژمنی نیشتمان و گەل بوو.

# بەعس لەهەرێمی کوردستان چ جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی پێکهێنا؟!

پاش ساڵی ١٩٧٢ پەیوەندییەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردو حزبی فەرمانڕەوا بەردەوام کەوتە داتەپین و ئیتر پارتیو سەرکردایەتی شۆڕش باوەڕیان بەهیچ کارێکی بەعسییەکان نەماو لایەنگرییان نەدەکرد. سیاسەتی وریایی و گومان کەوتە نێوان هەردوولایان حزبیشمان هەروا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئێمە ئەگەر لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان لەهەڵوێستی سیاسیدا یەکبگرین و پێکەوە لەناو بەرەو دەرەوەیدا کاربکەین دەتوانین ڕێگە لە داڕوخانی بارودۆخەکە بەرەو ئەو هەڵدێرەو بەوخێراییە بگرین بەلآم پارتی نەخشێکی دیکەی هەبوو بۆ هاوکاری لەگەڵ بەعس بەتەنیا، بێ ئەوەی هەست بکات کەنیازەکانی بەعس بۆگەن بوون، ئەوەبوو پارتی کەلاخستو لەشۆڕشی کوردستانی سرەواند.
ئالەم کەشوهەوایەدا ساڵی ١٩٧٤ پرۆژەی ئۆتۆنۆمی لەلایەن بەعسەوە بڵاوکرایەوە ئێمە لەڕاگەیاندندا پرۆژەکەمان خستەبەر لێکۆڵینەوەو لێوردبوونەوەو ڕەخنە، داوامان لەپارتی کرد هەڵوێستمان لەم پرۆژەیە یەکخەین بەلآم پارتی بەوە قایل نەبوو نەیویست پێکەوە لەسەر پرۆژەکە هەڵوێست بگرینو گوتیان ئەوان لەجیاتی پرۆژەکەی بەعس پرۆژەی تایبەتی خۆیان پێشکەش دەکەن، داوامان لێکردن کە پێش ئەوەی بیخەنە بەردەم وتووێژ دانەیەکمان بدەنێ، بەلآم ئەوەشیان نەکرد.
جێگەی سەرنجە ئەو پرۆژەیەی پارتی پێشکەشی کرد، پرۆژەیەك بوو توانای جێبەجێ کردنی نەبوو، پرۆژەی ئۆتۆنۆمی نەبوو، تەنانەت لەئەوپەڕی ئاستی بەرزی ئۆتۆنۆمیدا نەبوو، بەڵکو پرۆژەیەك بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی.
لەبەر ئەوە بڕیاردرا پرۆژەکەی پارتی بۆ وتووێژ دەستنادات وپاش ئەوە نوێنەری پارتی ئامادەی ئەو کۆبوونەوانە نەبوو کە بۆ گفتوگۆ لەسەر پرۆژەکەی بەعس بۆ ئۆتۆنۆمی تەرخان کرابوو. بەلآم ئێمە ناوەڕۆکی ئۆتۆنۆمیمان خستەبەرچاو

تەنانەت یاسای حوکمی زاتی ئەوەش لەچەند وتارێکدا کەلەرۆژنامەی بیری نوێدا نووسیم، هەروا ئەوەی هاوڕێ (صفاء الحافظ)ئامادەی کردو وەك پرۆژەیەکی حزبی شیوعی عێراق لەبارەی حوکمی زاتییەوە پێشکەشی کرد.

دوای چەندان کۆبوونەوەو وتووێژی دوورودرێژو قورس‌و گران توانیمان هەندێ لەبەندو مادەکانی چاك بکەین، بەلاَم وێڕای ئەوەش حوکمی زاتی ڕاستەقینە نەبوو. ئێمە بەهەنگاوێکی ئیجابیمان دانا کە دەتوانرێ بەرێبازێکی راستدا پەرەی پێبدرێ، بەتەنیا داننانی بە بوونی نەتەوەی کوردا، وەك دووەمین نەتەوەی عێراق کەمافی نەتەوەیی هەیەو دەبێ پەیڕەوی بکات سەرکەوتنێکی هەستپێکراوەو، بەبێ ئەوە مەسەلەکە دەبێتە گیرگرفتێکی بەردەوامو، دەبێ بەڕێگەیەك چارەسەر بکرێ کە خزمەتی یەکێتی عێراقی فرەنەتەوە بکات لەسەر بنچینەیەکی دیموکراسی، هەروا ئەوە هەنگاوێك دەبێ بەرەو پێکهێنانی قەواریەکی بەڕێوەبەری و سیاسیی نەتەوەی کوردو ئێمە وامان دانا کە هەڵوێستی نەناسینی ئەم حوکمە زاتییە مانای پەیڕەوکردنی سیاسەتێکە کە دەڵێ: (هەمووشتێك یان هیچ).

بەڵێ یاسای ئۆتۆنۆمی، بەمشێوەیە، وێڕای ناتەواوییەکانی، هەنگاوێکی ئیجابییەو دەتوانرێ لەهەلومەرجێکی دیکەی گونجاودا پەرەی پێبدرێ، ئەمە ئەگەر بێت وهەردوو حزبی پارتی و شیوعی پێکەوە هاوکاری بکەن بەلاَم ئەمە نەرکراو ئۆتۆنۆمی بەتەواوی کەوتە ژێر دەسەلاَتی حزبی بەعس پاش ئەوەی شیوعییەکان دەستیان کێشایەوەو حزبی شیوعی بووە حزبێکی بەرهەڵستکاری حوکمەکەی حزبی بەعس و دروشمی ڕووخاندنی هەڵگرت.

# پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ بەعس

پێموایە، ئەگەر بیرەوەریم تەواوبێ، مەکتەبی سیاسی حزب دوا کۆبوونەوەی لەبەغدا لەمانگی تشرینی دووەمی ١٩٧٨دابوو، بڕیاریدا بەخێرایی کاروباری پێویست لەوبارودۆخە تازەیەدا بگرێتەبەر، لەبەر ئەوەی بەعس ٣١ شیوعی لەهێزە چەکدارەکان ئیعدام کرد، کاروبارەکان بەمجۆرە بوون:

١. هاوڕێیانی هەرێم ئامۆژگاری بکرێن کەتیپی پارتیزانی لەو ناوچانە پێکەوەبنێن کەبنکەی (پێشمەرگە)ی حزبە کوردستانییەکانی تێدایەو ئەوانیش دەستیان کردە خۆچەکدار کردنو پێکهێنانی بنکەکانیان لەسەر سنوری ئێران–عێراق.

٢. گۆڕینی هاوڕێیانی نەناسراو بۆ ڕێکخستنی حزبیی نهێنیو، ئەم ئەرکەش درایە هاوڕێ (ئەبو فاروق) عومەر عەلی شێخ.

٣. داواکردن لە هەموو هاوڕێیانی ناسراو کە بەهێمنی و زۆر بەنهێنی بۆ دەرەوەی عێراق دەرچن.

٤. ڕۆژنامەی طریق الشعب بەشێوەیەکی ئاسایی دەرچێتو تائەوپەڕی توانای کادیری نووسینی کەم بکرێتەوە.

٥. بارەگای گشتیو بارەگای بەغدا هیچ بەڵگەنامەیەکیان تێدا نەهێڵدرێت.

٦. دەرچوونی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیو، مانەوەی ژمارەیەکیان کەنەناسراون بۆ سەرکردەیی کارو ڕێکخستنە نهێنییەکان.

٧. ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان دەرەوەو ناوەوە.

بۆ منیش بڕیاردرا سەفەری مۆسکۆ بکەم، لەبەغداوە بێ هیچ کۆسپو تەگەرەیەك گەیشتمە مۆسکۆ، لەوێ نزیکەی مانگێك مامەوە، لەماوەی ئەم مانگەدا چەند هاوڕێیەکی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی گەیشتن، لەوانە

هاوڕێیان عەزیز محەمەدو زەکی خەیریو مەهدی عەبدولکەریم، بڕیاردرا بچینە دیمەشقو لای کاربەدەستانی سوریا بەرێگەی حزبی شیوعی سوری هەوڵبدەین سوریا بکەینە بنکەی دەرچوونمان بۆ گەڕانەوە بەرەو هەرێمی کوردستانو چوونە پاڵ پارتیزانەکان و رێکخستنی پەیوەندیی لەگەڵیانو ناردنی یارمەتی بۆیان.

پاش گەیشتنە شام لەلایەن موخابەراتی سوریەوە گیرام بێ ئەوەی هۆیەکەی باس بکەن. لەفرۆکەخانەوە بەئۆتۆمبیلی کرێ، کە دەبوو خۆشم کە گیراوم کرێیەکەی بدەم، منیان گواستەوە بۆ دیمەشق. پاش چەند سەعاتێك هاوڕێیانی سوری هاتن بۆلام: عومەر سباعیو یوسف فەیسەڵو دکتۆر نبیە رەشیدات. لەوێ هاوڕێ خالد بەگداشو ئەبویەحیا چاوەڕوانم بوون. لەهاوڕێیانی سوریم پرسی: بۆچی ئەم کارەیان لەگەڵ کردم؟ گوتیان دەزگای هەواڵگری سوریا باوەڕی وایە کە کەریم ئەحمەد لەگەڵ بەعسی عێراق هاوکارە چونکە من پێشتر لەگەڵ وەفدێکی عێراقیدا سەفەری شامم کردبوو لەگەڵ سوریەکان دەربارەی ئاوی فورات وتووێژمان کردبوو کە بەهۆی ئەو بەربەستەی لەسەر فورات بۆکردنەوەی ئاو لەلایەن سوریاوە دروستکرابوو لەعێراق ئاو زۆر کەمی کردبوو. باری زیانی ئەو کەسانەم باسکرد کە لەسەر هەردوو کەناری ڕووباری فورات دەژیان و چۆن کەمکردنەوەی ئاوی فورات کاریکردۆتە سەرژیانی خەڵك و باری گشتوکاڵو ئاژەڵ. وابێدەچێ ئەو بەرگری کردنەم لەبەرژەوەندییەکانی خەڵکی عێراقو دانیشتوانی ناو حەوزی فورات، بەپەیوەندی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی سوریا کە بەربەستەکەی فوراتیان دروست کردبوو، بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەباو ئاودێریی پانتاییەکی فراوانی زەویو زاری کشتوکاڵو دوای تەواوبوونی بەربەستەکە، دەڵێم ئەم بەرگری کردنە هەندێ ناوەندی سوریی دلگران کردبوو بۆیە بەبێ ئاگاداری سەرکردایەتی سوریاو ئەولایەنە دەسەلأتدارانەی لەوەوبەر پەیوەندیی برایانەو تێکۆشەرانەم لەگەڵیاندا پەیدا کردبوو، ئەم کارە ستەمو زۆرداریییەیان بەرانبەرم ئەنجامدا.

پاش چەند سەعاتێك بەردرام و هاوڕێیانی سوریا منیان وەرگرتو، ئەوکاتە حزبی شیوعی سوریا یەککگرتوو بوو پەتای کەرتکاریی گەورەیان تووش نەهاتبوو

جگە لەجیابوونەوەی ریاض الترك پێش چەند ساڵێك. هاوڕێیانی سوریا ئاپارتومانێکی گچکەیان لەژێر زەمینێکدا لەژێر ئاپارتومانەکەی هاوڕێ نبیە رەشیدات دا بۆکاتێکی دیاریکراو گرتبوو بۆ ئەوەی لێیانەوە نزیك بین، گوتیان حزبی شیوعی سوریا لەخزمەتی حزبی شیوعی عێراقدایەو ئێوە بڕیار بدەن و ئێمە جێبەجێی دەکەین... لەڕاستیشدا وابوون.

بڕیارماندا بەرنامەیەك بۆ کارکردنمان ڕێکخەین، یەکەمین هەنگاو چییە کە دەبێ بیهاوێژین، پاشان دەست بەجێبەجێ کردنی بەرنامەی کارەکەمان دەکەین.

دیدارمان لەگەڵ سەرکردایەتی بەعسی سوریاو عێراقییەکانی سەربەوان ڕێکخست، هەروا لەگەڵ ئەو ڕێکخراوانەی پێکهاتبوون یان خۆیان ناونابوو ڕێکخراوەکان، لەکاتێکدا بەم یان بەو شێوەیە وابەستەی موخابەراتی سوری بوون. دەبوو بەرانبەریان وریا بین، هەرکە ڕاستییەکەیانمان دەزانی ئیتر لێیان دوور دەکەوتینەوەو گوێمان پێنەدەدان. هەروا پەیوەندیمان لەگەڵ حزبە شیوعییەکان و بزووتنەوەو ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی وڵاتانی عەرەب پتەوکرد، هەروا پەیوەندی بەهێزمان لەگەڵ ڕێکخراوەکانی فەلەستین بەهێزکرد، بەتایبەتی ڕێکخراوی فەتح و بەرەی دیموکراتی بۆ رزگارکردنی فەلەستین‌و بەرەی میللی بۆ رزگارکردنی فەلەستین، بەرەی دیموکراتی بۆ رزگارکردنی فەلەستین یارمەتی بەنرخیان پێشکەشی حزبمان کرد لەبارەی مەشق پێکردنی ژمارەیەکی زۆر لەهاوڕێیانمان لەبارەی مەشقی سوپاییەوە لەسوریەو لوبنان. هەروا ژمارەیەك چەکیشیان دایە هاوڕێیانی پارتیزانمان کە زۆرمان پێویست بوون لەکاتێکدا ئێمە لەکات و یان سەرەتای پێکهێنانی تیپەکانی پارتیزانی بووین. گیروگرفتی زۆریشمان ڕووبەڕوو دەبۆوە لە گواستنەوەی ئەم چەکانەدا بۆ پارتیزانەکان لەهەرێمی کوردستانی عێراق. ئەم مەسەلەیەش بەدرێژی و لەژێر ناونیشانی جۆربەجۆر لەئاییندەدا باس دەکەم.

توانیم پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتی سوری بچەسپێنم‌و سەرۆك حافظ الاسد بڕیاریدا دەرگا لەڕووی شیوعییە عێراقییەکاندا بکاتەوە تابەبێ هیچ کۆسپ‌و تەگەرەیەك لە سوریا دانیشن بەڵام بەبێ پێشکەشکردنی یارمەتی دارایی، چونکە

بودجەی دەوڵەت یاریدەدەر نەبوو بۆ پێشکەشکردنی یارمەتی دارایی. ئیتر کۆمەڵ کۆمەڵ هاوڕێیان‌و دۆستەکانیان دەهاتنە سوریەو، لەبارەی باری گوزەران‌و نیشتەجێ بوون‌و کارکردنەوە، ڕووبەڕووی گیروگرفتی ئەم ژمارە زۆرە بووینەوە، هاوڕێ فەخری کەریم گەیشتە بەیروت‌و بەرپرسێتی حزبم لەلوبنان پێسپارد، لەوکاتەدا لەلوبنان جەنگی تایەفەگەری هەڵگیرسابوو، نەدەسەڵات‌و نەیاسای تێدابوو جگە لەجەنگەکانی ناوخۆو نەبوونی حکومەت و یاسا هێزەکانی فەلەستینی، هەموویان بەخۆیان و بەگیرگرفت‌و تەنانەت بەکێشەو ناکۆکییانەوە لەئەردەنەوە گواستیانەوە بۆ لوبنان وە دەستدرێژی ئیسرائیل بۆسەر فەلەستینییەکان بەردەوام بوو هەر وەك چۆن ئیسرائیل ئەو قەسابخانەیەی لەدواییدا لە(سەبراو شاتیلا) ڕێکخست‌و فرۆکەکانی ئیسرائیل فەلەستینیان بۆمبۆردومان کردو سەرانی فەلەستینییان تیرۆر کردو هێزەکانی ئیسرائیلی هێرشیان بردە سەر بەیروت و ئەو بەرگرییە قارەمانانەیەی فەلەستینییەکان لە بەیروتیان کردو، هەربەمبۆنەیەشەوە هاوڕێیانی حزبی شیوعیمان کەلەبەیروت مەشقیان دەکرد شەڕی قارەمانانەیان ئەنجامداو لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانە بوون کە بەرگرییان لەبەیروت دەکرد، لەگەڵ تیپە فەلەستینییەکان بەشدار بوون لەبەربەستی تانك‌و زرێپۆشەکانی ئیسرائیلی بەئاربیجی"٧"، ئەمەبوو لوبنانی کلێپەسەندو بەجەنگە تایفییەکانی ناوخۆ بۆ بەرپەرچی دەستدرێژییەکانی ئیسرائیل، ئالەم کەش‌وهەوا هەڵچووەدا هاوڕێیانمان مەشقیان دەکردو شەڕیان دەکردو خۆیان ئامادە دەکرد بۆ چوونە پاڵ پارتیزانەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق تا لەشۆڕشدا دژی دەسەڵاتی دیکتاتۆریی شۆڤێنی بەغدا بەشداری بکەن.

ئەرکەکانی پێش هاوڕێ فەخری کەریم زۆر گرانبوون لەلایەکەوە دەبوو پەیوەندییەکانی لەگەڵ ڕێکخراوە فەلەستینییەکان پتەو بکات‌و مەشق پێکردنی هاوڕێیانمان‌و ژیانیان دابین بکات‌و پەیوەندییەکانی لەگەڵ حزب‌و ڕێکخراوە لوبنانییە جۆربەجۆرەکان بەهێزبکات وێڕای دەرکردنی ڕۆژنامەکەو گۆڤاری "النهج"، لەپاڵ پەیداکردنی دارایی کە لەم بوارانەدا خەرج دەکرێن بۆ خزمەتی چالاکی‌و هەڵسوڕانی جۆربەجۆری حزب، پەیوەندی بەتینی لەگەڵ سەرکردەی

دیاری فەلەستینیو براماان یاسر عەرەفات پەیدا کردبوو، لەگەڵ ئەوپیاوەی دەستی نەگرتەوە لە یارمەتیدانی حزبمانو هەروا پەیوەندی بەهێزکرد لەگەڵ یەمەنی دیموکراتی (باشوری یەمەن)و سەرکردایەتییەکەی لەوکاتەدا. ژمارەیەکی زۆرمان لەهاوڕێیان نارد بۆ ئەوێ بۆکارکردن و مەشقو کردنەوەی دەورەیەك بۆ دەرچوونی ئەفسەران بۆ سەرکردایەتی تیپەکانی پارتیزانی.

ئەم ماوەیە کاتی بزووتنەوەیەکی بەردەوام بوو بۆ مەشقو شارەزاکردنی هاوڕێیانو ئامادەکردنیان بۆ چوونە پاڵ تیپەکانی پارتیزانی لەکوردستان بەڵام گیروگرفتی گەورەی ئێمە گەیاندنی چەك بوو بۆ تیپەکانی پارتیزانی. بەشێوەیەکی هەمیشەیی سەرقاڵی ئەم مەسەلەیە بوومو لەگەڵ ڕێکخراوە فەلەستینییەکان دەربارەی چەك و گەیاندنییە کوردستانی عێراق باسم کرد، ئەوانیش هەمیشە دووپاتیان دەکردەوە کە چەك پێدانمان مەسەلەیەکی ئاسانەو لەتوانادایە بەڵام گەیاندنی بۆ ئەوشوێنانەی دەمانەوێ لەتوانادا نییە، لەبەر ئەوە لەزۆر دەرگاماان دەدا بەڵام پێمان ڕاگەیەندرا کە پەیوەندی لەگەڵ لایەنەکانی سوریا بەهێز بکەینو ئەوان دەتوانن ئەم ئەرکە جێبەجێ بکەن بەڵام ئاخۆ دەکرێ ئەرکێکی وا بۆ حزبی شیوعی عێراق ئەنجام بدەن؟! بەهەرحاڵ لەسەرەتادا پەیوەندیم بەڕەفعەت ئەسەدەوە کرد تالێیان تێبگەم. دیدارەکە بۆ هاوکاری بوو، نەداوام لێکردو نەئەو باسەم لەگەڵ کردەوە، هەستم کرد بایەخ بەبارودۆخی عێراق دەداو بەشێوەی تایبەت بەبارودۆخی حزبی شیوعی عێراق، ئامادەیی پیشاندا بۆ ئەوەی لەسوریادا هەریارمەتییەك پێویست بێت بیدات دوای ئەوە هاتینە سەر باسی گەیاندنی چەك بۆ کوردستانی عێراق لەگەڵ لایەنەکانی تری سوریادا. گوتیان ئێمە نامانەوێ گیروگرفتێکی نێودەوڵەتی بۆ دەوڵەتانی دراوسێ پەیدا بکەین، بەڵام یارمەتیتان دەدەین بۆ گواستنەوەی چەك لەلوبنانەوە بۆ سوریاو ئێمە بۆتان دەگەیەنینە قامیشلیو ئەم چەکانە لە مەخزەنەکانماندا دەمێننەوەو ئەرکی خۆتان دەبێ بۆ هەرشوێنێکی بگوێزنەوە.

ئەمە یارمەتیەکی گەورە بوو چونکە لەپێشدا گیرۆدەی چۆنیەتی ناردنی چەك بووین لە لوبنانەوە بۆ سوریەو لەوێشەوە بۆسەر سنوور، بەمجۆرە گیروگرفتێکی

گـەورەمان چارەسـەرکرا کـە دووچـاری بـووین، ئێـستا لەسـەرمانە پرۆسـەی گواستنەوەی ئەم چەکانە بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق رێکخـەین و بیانگەیەنینـە دەست (پێشمەرگە) شیوعییەکان.

# چۆن مامەڵەمان لەگەڵ ئەم گیروگرفتە کرد؟(٧)

١) لەسەرەتادا دەستمان بەباسکردن لەگەڵ ئەوانەکرد کەشارەزایی‌و تاقیکردنەوەیان لەبارەی مەسەلەی ناردنی چەکەوە بەسنووردا هەیە، بەتایبەتی لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەلأم بۆمان دەرکەوت کە ئەزمونیان لە گواستنەوەی چەك لە سوریاوە بۆ کوردستان کەمەو خۆشیان گیروگرفتی گەورەیان هەیە، گیروگرفتی تێپەڕبوون بەخاکی تورکیاداو تێپەڕبوون بەناوچەکانی

---

(٧) هاوڕێ کەریم ئەحمەد لەبارەی هێنان و بردنی چەك بۆ کوردستان و سەرکردایەتی کردنی ئەم کاروبارەو زۆرشتی تر لەدوورو نزیکەوە باسی وەرگێڕی ئەم کتێبە-جەلال دەباغ- ناکات. نازانم لەبەرچی؟.. ئایا هەر لەبیرکردن بێت؟..

هاوڕێ کەریم لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٩دا بەناوی مەکتەبی سیایی حزبەوە منی ڕاسپارد کە بچمە قامیشلی و ببمە بەرپرسی ناردنی چەك و هاوڕێیان بۆ کوردستان، چ بەرێگای قاچاغچیان، یان ڕاستەوخۆ بەرێگای هاوڕێیانی خۆمان.

کەپێمڕاگەیانن من نووسەرێکم و چۆن لەوبوارەدا کاربکەم.. سووربوون لەسەر ئەنجامدانی ئەو ئەرکەو گوتیان پێمان وایە تێیدا سەرکەوتوو دەبیت.

بەمجۆرە دەستبەکار بووم‌و لەسەرەتادا بەتەنیا و پاشان لەساڵانی دواتردا خێزانەکەشم بەبڕیاری حزب گەیشتە قامیشلی..ئێمە لەوێ ڕێکخراوی حزبیشمان دامەزراند وێڕای کۆمیتەی باڵای ئەوکارە..

هەرلەچەند مانگی سەرەتای کاردا دوانزە تەن چەك بەیارمەتی قاچاغچی و هاوڕێیان پێشر. دامەزراندنی مەفرەزەی ڕێگا بەسەرکەوتوویی نێردرایە کوردستان، نزیکەی دەساڵ لەوکارو بەرپرسییەدا مامەوە،کە ناوبەناو سەردانی کوردستانم دەکردو دووجاریان ماوەیەکی درێژخایەن مامەوەو یارمەتیدەری بەرپرسی ڕاگەیاندنی ناوەندی حزب بووم. یارمەتیدەرەکەم هاوڕێ عادل عەلی (ئەبوحەسەن) لەقامیشلی سەرپەرشتی کارەکەی دەکرد، چەند جارێك ڕاستەوخۆ لە لوبنانەوە لەگەڵ لۆرییە چەکدا دەگەیشتمەوە قامیشلی..

ئەم بابەتە زۆر دوورو درێژە، لێرەدا تەنیا ئەوە دەڵێم کەهاوڕێیان عادل عەلی (ئەبو حەسەن) محەمەد شیروانی (ئەبوعەلی)و (ئەبو حەربی)و (ئەبو نادیە)و (ئەبوسامر)و ماوەیەکیش هاوڕێ (خەیری قازی)و هەروا (ئەبو جاسم-محەمەد چوارقوڕنەیی)و هاوڕێ (فارتان-ئەبوعامل)و (کامەران ئەحمەد مەساح)و (دەرویش-شێرۆ) یەزیدی و گەلێکی تریش لەهاوڕێیان ڕۆڵێکی باشیان هەبوو. ئەمە جگە لەهاوڕێیانی (مەفرەزەی ڕێگا) کە دواتر پێکهات و ڕۆڵێکی کاریگەریان گێڕا.. هیوادارم لەبیرەوەرییەکانی خۆمدا بەدرێژی لەئایندەدا باسیان بکەم. -وەرگێڕ-

ژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراقدا ڕووبەڕوویان بۆتەوە، ئەمەش زیاتر نێپەڕبوون بەو ناوچانەدا کە بنکەی (پ.م)ی پارتی دیموکراتی کوردستانی تێدان ڕووبەڕوویان بۆتەوە. هەردوولاش ڕێکنین‌و دەکەونە بەر مەترسیی کوشتارەوە ئەگەر ڕووبەڕووی یەك ببنەوە. ئەمەش مانای یان خۆبەدەستەوەدان‌و چەك تەسلیم کردنە یاخود شەڕکردن‌و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی یەکێتی نیشتمانی ئەم ڕێگە پرمەترسییە نەگرێتەبەر. لەبەر ئەمە ڕێگای ئاسان ڕێگای ئێران بوو هەرچەندە بۆماوەیەکی تارادەیەکیش درێژ دۆستایەتی لەگەڵ بەرپرسەکانیاندا نەبوو.

٢) گەڕاین بەدوای قاچاغچی چەکدا، بەڵام ئەمە زۆری تێدەچوو. حزب نەیدەتوانی مامەڵە لەگەڵ قاچاغچییەکاندا بکات[٨]. دوای ئەوەی قسەمان لەگەڵ هاوڕێ کوردەکانی حزبی شیوعی سوریدا کرد هاوڕێ ڕەمۆ شیخۆ (ئەبو جەنگۆ) ئێمەی گەیاندە یەکێك لە قاچاغچییەکان کە پەیوەندیی لەگەڵ موخابەراتی سوری هەبوو، ناوی (عەبدولکەریم شەلال کوردی) بوو دیارە لەقاچاغچییە (ساختەچییەکان) بوو، داوای کرد ئێمە بڕێك پارەی بدەینێ بەناوی خۆی بیخاتە یەکێك لە بانکەکانی لوبنانەوە تا مامەڵەی پێبکات لەگەڵ قاچاغچییەکانی تورکیادا کە چەك بۆ ناو کوردستانی عێراق دەگوێزنەوە. وەك هەنگاوێکی سەرەتایی هەندێ پارچە چەکی گواستەوە ئەوەش بۆ چەواشەکردن بوو دوای ئەوە هیچ هەنگاوێکی نەناو بەردەوام خۆی دەدزییەوە. ئەو بڕەپارەیەشم لەدەوڵەمەندێکی کوردی دیمەشق قەرز کردبوو کە بەزوویی بۆی بگێڕمەوە. دواجار هاوڕێ عەزیز محەمەدو (سلیمان یوسف) ئەبو عامل لەگەڵ ئەو قاچاغچییە کۆبوونەوەو داوایان لێکرد مادام ناتوانێ ئەرکەکە جێبەجێ بکات پارەکە بگێڕێتەوە. ئەویش گوتی ناتوانێ پارەکە بداتەوەو پێشنیازی کرد مانگانە بەش بەش‌و بەلیرەی سوری

---

(٨) داخەکەم ئەم بۆچوونە وردنییە، حزب لەڕێگەی ئێمەوە توانیمان مامەڵە لەگەڵ دەیان قاچاخچیدا بکەین کەتەنانەت سێ کەسیان لەکاری ئێمەدا شەهید کران. ئەوانی تریان بەسەدان هاوڕێ‌و چەکێکی زۆریان بۆ گەیاندینە کوردستان -وەرگێڕ-.

دیداتەوە.

٣) ئینجا بڕیارماندا پشت بەخۆمان ببەستین‌و بیرمان کردەوە ئۆتۆمبیلێکی پیکاب بکڕین‌و شوێنی شاردنەوەی تێدا بکەین‌و بۆ ئەمەش خەرجکردنی بڕێ پارەی زۆر پێویستەو حزب ئەو توانایەی نەبوو. لەم کاتەدا هەندێ چەك لە بەیروتەوە (بۆئێمە) گەیشتە شام بەلاّم چۆن بۆمان دەگەیەندرێتە سنوور. پەیوەندییم بەهاوڕێیەکی قامیشلییەوە کرد کە ئۆتۆمبێلێکی لۆری هەبوو.

لەگەڵیدا باسم کرد کە ئەم چەکانە بگەیەنێتە قامیشلی و بیداتە هاوڕێیان ئەویش ئامادەیی پیشاندا. بەلاّم چۆن هەڵیگرین؟ گوتم: دەیخەینە ژێر چەو.ئۆتۆمبیلەکە پڕ لەچەو دەکەین و چەکەکان دەخەینە ژێر چەوەکە. ئەم بیرۆکەیە سەرکەوتوو بوو چەکەکان بەسەلامەتی گەیشتن بەلاّم ئەو هاوڕێیە سورییە کە ئۆتۆمبێلەکەی بۆچوو پێویستی بەو چەوە بوو بۆ چاکردنەوەی خانووەکەی، کاتێك لۆرییە چەوەکەی لەبەرماڵەکەیاندا بەتاڵ کرد لەناکاو چەکەکان لەژێر چەوەکەوە بەدیارکەوتن بەلاّم بەخێرایی چارەسەریان کردو چەکەکانیان گەیاندە هاوڕێیانی عێراقی کەلەقامیشلی بوون‌و ئەوانیش بەرەبەرەو بەرودوا گەیاندنیانە دەست پارتیزانەکان لەکوردستان.

٤) سەردانی دێهاتەکانی سەرسنوورمان کردو پەیوەندیمان بەهاوڕێ جوتیارە سورییەکانەوەکردو لەگەڵیان باسی توانای گواستنەوەی چەکمان بۆ کوردستان کرد گوتیان ئێمە ئامادەی هەر یارمەتییەکین لەناو سوریادا بەلاّم ناتوانین

---

(٩) لەراستیدا من زوو بەزوو ئەو عبدالکریم شەلالەم ناسی کەلەگەڵ دەزگاکانی هەواڵگیری پەیوەندیی ڕاستەوخۆی هەبوو، ئەدەبوو نووسەری بەڕێز لەپشت منەوە کەبەرپرسی ڕێکخراوی حزب بووم لەقامیشلی مامەڵە لەگەڵ ئەو قاچاخچییە بکات.. بەلاّم پاشان ئاگادار کرام لەگەڵ ناوبراو کەخزمی "ابو جنگو" بوو سەفەرێکی دیاربەکرو باتمانی باکووری کوردستان بکەم. لەسەفەرەکەدا باش لێی تێگەیشتم‌و ناسیم. بۆیە هەرزوو بەهاوڕێیانم ڕاگەیاند کەمامەڵەی لەگەڵ نەکەن، بەلاّم پاش چی؟ دوای ئەوەی پارەیەکی زۆری حزبی لێیان وەرگرتبوو خواردی‌و شتێکی واشی بۆ نەکردین، بەداخەوە لەم بیرەوەرییانەوە ئێستا دەزانم کەچەند پارەیان بۆناردۆتە بانکی لبنان!! –وەرگێڕ-.

(١٠) دوو سێ جار منیش لەقۆناغەکانی دوای پارەپێدانەکەیدا بەشداری ئەو کۆبوونەوانەم کردووە، بەلاّم نووسەر ناوی نەبردووم. –وەرگێڕ-.

لەدەرەوەی سنوور هیچ بکەین. داوامان لێکردن شوێنی شاردنەوەمان لەناو ماڵەکانیان بۆ بکەن بڕیاریانداو ئەم شوێنانەیان بۆشاردنەوە ئامادە کرد بەو شێوەیەی بۆمان دیاریکردبوون، بەڵام بەهیچ جۆرێك بەکارمان نەهێنان چونکە حکومەتی سوری بڕیاری دا بۆ مەخزەنەکانی خۆیان بۆ قامیشلی بیانگوێزنەوە.

٥) هەندێ لەهاوڕێیانی ناسراوی سەرکردایەتی کەبە(خەلەفلوغی) ناسراون (لەناوی خەڵەف کوڕی ئەمینی بەغدادییەوە هاتووە) ئامادەیی خۆیان پیشاندا کە بێنە سەر ئەم هێڵە بەڵام ژێرکەوتن. سورییەکان گیروگرفتێکی گەورەیان بۆ چارکردین کە ڕێگەیاندابن مەخزەنەکانیان بەکاربێنین. هەر ئەوەیان ماوە کە ئێمە گواستنەوەیان بۆ کوردستانی عێراق ڕێکخەین و بیانگەیەنینە دەست هاوڕێیانی پارتیزان. لەسەرەتادا ئەوە کرا کەهەرهاوڕێیەك ئامادەی ڕۆیشتن بێت بۆ کوردستان چەکداری بکەین و بەچەکداری و زۆر بەنهێنی لە سنور تێپەڕبێت.

ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە چوونە پاڵ پارتیزانەکان کرایە ئەرکی هەموو ئەوانەی کە لەسوریەو لوبنان و یەمەنی دیموکراسی مەشقیان تەواو کردبوو. ئیتر تێپەڕبوون لە سنور بەکۆمەڵ بوو کە هەموو چەکەکانیان هەڵدەگرتو دەبوونە تیپێکی جەنگاوەر ئەگەر لەگەڵ جەندرمەی تورك یان سوپاو جاشەکانی عێراقی ڕووبەڕوو ببووینایەوە لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو لەهەر پێکدادانێك دووربکەونەوەو ڕێگەیەك بگرنەبەر کە لەمەترسی شەڕ دووریان بخاتەوە تابەسەلامەتی بگەنە بنکەکانیان. هەندێ لەهاوڕێیان هەرجارەی یەك تاسێ پارچە چەکیان هەڵدەگرت،[11] ئەم دەستپێشخەرییە دەرگای بۆ کردینەوە کە مەفرەزەی

(١١) هاوڕێ کەریم دیارە بەبیستن ئەو شتانەی بیستووەو دەیگێڕێتەوە، یان لەخوێندنەوەی ڕاپۆڕاتەکانمان کەدانەیەکی بۆ (م.س) دەنێردرا هەندی زانیاریی وەرگرتووە، جێگەی سەرسامییە کەلەدوورو نزیکەوە ناوی هاوڕێ (ابو محمود-ج.د)و هاوڕێ (ابو حسن-ع.ع) نابات.

ئەی بەداواو سەرپەرشتی کێ چەندان جار بەیارمەتی هاوڕێ خالد (ابو هەژار)ی حزبی شیوعی سوری لەحەلەبەوە دەیان ئەسپی تونددڕەو دەکڕدرانو مەشق پێدەکرانو بارە چەکیان لێ بار دەکراو لەگەڵ قاچاخچی یان لەگەڵ (مەفرەزەی ڕێگا) دەنێردران؟

بەراستی زۆر لەهاوڕێیانو پێشمەرگە دێرینەکان سەیریان لێهات کەناوی هاوڕێیانی ئەو بوارە پشتگوێ بخرێت، لەکەسێکیشەوە کەخۆی ئاگادارەو دەشزانێ؟! -وەرگێڕ-.

ڕێگا دروست بکەین کە دەیتوانی مانگی دووجار هاتوچۆ بکاتو هەرجارەی (٢٠) پارچە چەك لەگەڵ فیشەکەکانی بگوێزنەوەو هەروا لەگەڵ R.B.G و هاوەنی (٦٠ ٢ملم)و فیشەك لەسەر پشتی ئێستر. بەڵام بەداخەوە ئەم مەفرەزەیە جارێکیان لەکاتی گەڕانەوەیان لەسوریەوە بۆ عێراق کەوتنە کەمینێکەوە کەلەئەنجامی هەواڵگەیاندنی جاسوسێکی موخابەراتی عێراقیدا بەو هێزانەی عێراق کە لەناوچەی فیشخاپور بوون بۆیان دانرابوو، لەئەنجامدا کەس لەوهاوڕێیانە دەرنەچوون جگە لەدوو هاوڕێ (وابزانم یەکێکیان ناوی ئەبوزەفەربوو) کەبەبریندارى بەدیل گیراو (ئەبوئەفکار) کەتوانی ڕابکاتو بگاتەوە بنکەکە.[١٢] ئێمە تووشی زۆر ناڕەحەتی بووین لەئەرکی گەیاندنی چەکدا بەهاوڕێیانی پارتیزان تا بەپشت بەخۆبەستن نەك بەقاچاغچیان گەیشتینە ئەو ئەنجامە، لەم ڕێگەیەشدا قوربانیو زیانی مادی زۆرمان بەختکرد.

---

(١٢) ئەم زانیارییانە وردنین، ئەم کەمینە (بۆسەیە) لەسەر رووباری (دەجلە) لەقولاییدا دانرابۆوە، هاوڕێیان بەناو خاکی سوریەدا، لەسنور تێپەڕ دەبوونو دوای سێ سەعاتێك لەتاریکایی شەودا دەگەیشتنە سەر رووباری (دەجلە)و لەوێوە بۆ چیای (بێخێر) دەچوون.

ئەو جارەیان لەپەڕینەوەی دەجلەداو لەناو ئاوەکەداو لەسەر کەڵەك لەلایەن بۆسەکەوە درانە بەر گوللە، بەرپرسەکەیان هاوڕێ (أبو هدیل)و چەند هاوڕێیەکی تر بەرگرییەکی چاکیانکرد بەڵام شەهیدبوونو تەرمەکانیان بەرووباردا چوونو چەکەکانیشیان کەوتنە رووبارەکەوە.

ئەم هاوڕێیانە شەهید بوون: ابو هدیل، بو سحر، أبو جهاد و هاوڕێ ناهل.

ئەم دوانە دەسگیرکران: د. ابوظفر و عەبدی (ڕێزان —دلیل).

ئەم هاوڕێیانەش رزگاربوون: ابو وسن، ابو حسنة، ابو أفکار و هاوڕێ رەمەزان (دلیل-ڕێزان)..تاد

هۆی بۆسەکەو لێدانەکەشیان کابرایەك بوو کەدواتر گشت پەیوەندییەکانی بەدەزگای موخابەراتی رژێمەوە ئاشکرابوونو بەمافی خۆی گەیشت —وەرگێڕ-.

# ڕاپەڕینی ئێران لەساڵی ١٩٧٩دا

یەکەمجار ئەگەر تەماشای بارودۆخی ناوچەکەمان بکردایە دەماندی ڕژێمی ئێران بەڕواڵەت وادەردەکەوت کە بەهێزترین‌و جێگیرترین ڕژێمە لەناوچەکەدا. بەڵام لەڕاستیدا بەوجۆرە نەبوو. کێشەو ناکۆکی ئەم ڕژێمەی بنکۆڵ دەکرد، ئەمەش لەئەنجامی سیاسەتی دیکتاتۆری و داپڵۆسێنەرانەی شای ئێراندا کە لەدژی حزبە سیاسییە جۆربەجۆرەکانی ڕاست‌و چەپ پەیڕەوی دەکرد.

دەزگاکانی ساواك و هەواڵگری شمشێرێکی هەڵکێشراوبوون بەڕووی گەلی ئێران‌و هێزە سیاسییە جۆربەجۆرەکانیدا بارودۆخی ئابوری و گوزەران لەئاستی سامانەکانی ئەم وڵاتە دەوڵەمەندەدا نەبوو، بەشی زۆری بودجەی دەوڵەت لەبواری بەهێزکردنی سوپاو دەزگاکانی ئەمن (ساواك)و هەواڵگیریی داپڵۆسێنەرداو لەو بوارانەدا کە هیچ پەیوەندییان بە پێشەسازدارکردنی ئێرانەوە نەبوو خەرج دەکراو ئەم وڵاتە هەموو توانایەکی هەبوو بۆ پەرەپێدانی وڵات‌و خۆشگوزەرانی گەل. چەندان گیروگرفتی ئابوری وباری گوزەران و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و گیروگرفتی نەتەوەکانی ئێران کە بێچارەکردن مابوونەوە بەسەر یەکدا کەڵەکە بووبوون، ئیتر جەماوەری تووڕە لەڕاپەڕینێکی سەرانسەریدا تەقینەوە بەڵام حزب‌و ڕێکخراوە جەماوەرییەکان لەمەیداندا نەبوون و پیاوانی ئاین (شیعەکان) بەسەرکردەیی خومەینی کارتێکردنیان هەبوو خەڵکیان ئاراستە دەکردو، ڕاپەڕینەکە ڕژێمی دیکتاتۆری شاهەنشاهی ڕووخاندو پیاوانی ئاینی توانیان دەسەڵات بگرنە دەست و سەرکردایەتی حزبە سیاسییەکان لەتاراوگەوەو سەرلەنوێ دەستیان بەدامەزراندنی ڕێکخراوەکانی حزبەکانیان کردەوە جگە لە (فیدائیانی خەڵك) کە لەسەردەمی شادا ڕێکخراوی نهێنییان هەبوو، ئەم ڕێکخراوەیە بەهێزترین ڕێکخستن بوو لەئێراندا بەڵام کارتێکردنی ئاین و خومەینی لەم ڕێکخراوەیە بەهێزتربوو.

لەقۆناغی یەکەمی دەسەڵات گرتنی پیاوانی ئاینی بەسەر حکومەتدا ئازادییە

دیموکراتییەکانیان بەرلاکرد، بەلأم دوای ئەوەی پێیان جێگیرکردو حکومەت بەتەواوی کەوتە دەستیان کەوتنە بەربەرەکانی خەڵك و چەوساندنەوەی حزبە سیاسییەکان و لەپێشەوەیاندا حزبی تودەو فیدائیانی خەڵك و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران وجارێکی تر سەرکردایەتی ئەم حزبانە پەنایان بردەوە بەر دەرەوە جگە لەحزبی دیموکراتی کوردستان کە دەستی دایە چەك بۆ بەرگری لەخۆی لەماوەی یەکەمی شالأوی تیرۆرداو دوای ئەوەش حکومەتی پیاوانی ئاینی توانییان دەسەلأتی تەواو بەسەر ئێراندا بگرن.

لەرۆژانی یەکەمی شۆرشی ئێراندا بڕیاردرا لەشامەوە بۆ تاران سەفەر بکەم و لەم سەفەرەمدا هاوڕێ عادل حەبەم لەگەڵدابوو کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی عێراق بوو[١٣]، لەوەبەر سالأنێکی لەبەندیخانەکانی شادا لەسەردەمی پاشایەتی عێراقدا بەسەر بردبوو، لەکاتێکدا گیرابوو کەلەئێران پەنابەربوو لەوێ بەشێوەیەکی باش زمانی فارسی فێر بووبوو، لەبەندیخانەدا چەندان پیاوی ئاینی ناسی بوو لەوانە ئایەتولا تاڵەقانی و مونتەزەری، هەروا ژمارەیەکی زۆری لەهاوڕێیانی تودەیی لەبەندیخانەدا ناسی بوون لەوانە شەڵتوکی و عەموئی و کیانوری.

چووینە ئوتێلێك، وابزانم ناوی (خوسرەوی) بوو. یەکەمجار پەیوەندیمان بەحزبی تودەوەکرد کە سەرلەنوێ دەستی بەدامەزراندنەوەی ڕێکخستنەکانی کردبوو، هەروا (فیدائیانی خەڵك) و ڕێکخراوی فەتحی فەلەستینی کەبالیۆزخانەی ئیسرائیلی لەتاران کردبوە بارەگای خۆی و لەوەبەر لەبەغدا بەرپرسەکەیانم ناسیبوو لەپاشدا ناوبراو لەگەڵ وەفدی حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق سەردانی عەمانی پایتەختی ئەردەنی کرد تا پەیوەندی و دیدار لەگەڵ ڕێکخراوەکانی فەلەستینی لەئەردەن بکات و بووە میوانی ڕێکخراوی فەتح، هەروا هەر لەڕێگەی

---

١٣ وەرگێڕی ئەم بیرەوەرییانەشیان لەگەڵدابوو کەهەرسێکمان (کەریم ئەحمەدو عادل حەبەو جەلال دەباغ) پێکەوە بەفڕۆکە کەلەبەیروتەوە گەیشتینە تاران و چوینە ئوتێل و پاشان لەگەڵ گشت دیدارەکانی سەرکردایەتی تودەی ئێران (نورالدین کیانوری ئەوانی تر..) منیش بەشداربووم، وێڕای دیدار لەگەڵ د.عەبدوڕەحمان قاسملو.

عـادل حەبـەوە پەیوەنـدی بەهەنـدێ لـە پیـاوانی ئاینیـەوە کـرا وەك تاڵـەقانی و مونتەزەری.

کاتێـك لـەتاران بـووین کـاك مەسـعود لـەئوتێل سـەردانی کـردین‌و گلەییـەکی برایانەمان لەنێواندا بوو سەبارەت بەو پەیوەندییە سەلبییەی لەنێوان حزبی ئێمە حزبی شیوعی عێراق‌و پارتیدا لـە سـاڵی ١٩٧٤دا لـەپێش شکستییەکەی شۆڕشـی ئەیلولداپەیدابوو، دوای ئەوە پێمگوت: ئێمـەو ئێـوە کەوتینـە هەڵەیـەکی سیاسـی گەورەوە گرنگ ئەوەیە ئێستا پێویستە چۆن دەست پێبکـەین، لەسـەر ڕۆشنایی ئـەو ئەزمونـە خراپـەی پێـشوومان‌و پەیوەنـدیمان ببێتـە هاوپەیمانییـەکی بـەهێز لەدژی ڕژێمی دیکتـاتۆریی شۆڤێنی‌و لـەپێناو دیموکراسـی‌و مافـە نەتەوەییـەکانی گەلی کوردستانمان، لەسەر ئەمە هاوبیرم بـوو، ئاگادریشی کـردم کـە تەندروسـتی مـەلا مـستەفای بـارزانی وەك پێویـست نییـەو ئێـستا لەولایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکایە، کاك مەسعود گوتی بـارزانی لـەتۆی پرسـیوەتەوە هـەروا لـەکاك عـەزیز محەمەدو ئایا توانیویانە لەزۆرداریی سەدام ڕزگاریـان بێـت‌و ئەمـەی بـەلاوە گـرنگ بووە منیش لەجیاتی خۆم‌و بەناوی هاوڕێ عەزیزەوە سـلاوی خۆمـان پێڕاگەیانـدو هیوای چاکبوونەوەو تەندروستی‌و گەڕانەوەیمان بۆ بەئاوات خواست.

بەمجۆرە پەیوەنـدیمان لەگـەڵ پـارتی گەڕایـەوە بـاری ئاسـایی خـۆی، ئەمـەش پێش کۆچی دوایی بارزانی نەمر نزیکەی بەهەفتەیەك دەبوو.

دوای ئـــەوە ســـەفەری مـــەهابادم کـــرد چـــونکە هەنـــدێ لـــەهاوڕێیانمان تـــازە گەیـشتبوونە ئـەوێ، وەك ئەحمـەد بـانیخێلانی‌و بـەهادین نـوری‌و جـەلال دەبـاغ‌و ئیبراهیمـی سـۆفی. مامۆسـتا کـەریم حیـسامی لەسـەفەرەکەمدا بەشـەمەندەفەر لەگەڵمدا بـوو لەتارانـەوە بـۆ مەحەتەیـەکی نزیـك مـەهاباد لەوێـشەوە بـەئۆتۆمبیل بەنیوسەعات گەیشتین. بـەیانی زوو گەیـشتین‌و هاوڕێیانمـان لـەماڵێکی سـەرڕێگە بـەرەو ناوەنـدی شـار دابـەزیبوون. هاوڕێیـان حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانیان لەگەیـشتنم ئاگـادارکرد. بـۆ ئێـوارە هـاوڕێی تێکۆشـەر عەبـدولڕەحمان قـاسملو سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەگـەڵ چـەند هاوڕێیـەکی مەکتـەبی سیاسی حزب هاتن. بەخێرهاتنی گەرمیان کردم کەگەیشتومە مەهابادی پایتەختی

کوردســـتانی شـــەهیدکراو لـــەئێران. باســـی بارودۆخەکـــەمان کـــرد، حزبەکـــە لەکوردستاندا گەورەترین حزب بوو، نفوزو ڕێکخستنی لە گشت شـارو دیهاتـەکانی کوردستانی ئێرانـدا هـەبوو. خۆیـان بـۆ پێکـەوەنانی وەفـدێکی میللـی بـۆ دیـداری خومەینی ئامادە دەکرد کە مەسەلەی کورد بخاتـە پـێش چـاوی وێـڕای پێویـستی چارەکردنی لەسەر بنچینەی هێنانەدی حوکمی زاتی، ئەوەبوو دیداری خومەینییان کردو باسی کۆسپ و تەگەرەکانی ڕێگای چاری مەسەلەکەیان خستە پێش چـاوی، وەك ئەوەی رژێمی نوێ هەڵوێستی لەچاری مەسەلەی کورد لەئێران هیچ جیـاوازی نییە لەهەڵوێستی شا، بـەلاَم خومـەینی دەیگـوت: ئێمـە هـەموومان موسـوڵمانین‌و مەسەلەیەك نییە ناوی مەسەلەی نەتەوەیی بێت‌و رژێمی ئیسلامی باوەڕی بەبوونی مەسەلەی نەتەوەیی نییە، چونکە گەلی ئێران گەلێکی موسوڵمانەو نەتەوەکان نین. مەسەلەی نەتەوەیش بەپێی لێتێگەیشتنیان دروسـتکراوەو هـەر دروسـتکراوێکیش چەواشەکارییە. جێگەی سەرنجە حزبی تـودە لەگـەڵ وروژانـدنی مەسـەلەی کـوردا نەبوو هەروا لەگەڵ حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران ڕێـك‌و تـەبا نـەبوو، ئـەم حزبەی بەلقێکی حزبـی تـودە دادەنـا بـەلاَم سـەرکردایەتی (حـدکا) لقەکـەی گرتـە دەست‌و لەحزبی تودەی جیاکردەوە.

لـەم بارەیـەوە لەگـەڵ حزبـی تـودە نـاکۆك بـووین هـەروا لـەبارەی مەسـەلەی نەتەوەیی و چارەسەرکردنی لە ئێراندا. جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کـە حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان لەئێرانـدا حزبێکـی نەتـەوەیی کوردسـتانییەو لـەکۆماری (مـەهاباد) بەسـەرکردەیی شـەهیدی تێکۆشـەر(قـازی محەمـەد) دامـەزراو، ئێـران دەوڵـەتێکی فرەنەتەوەیـە، وەك کـوردو تورکمـان و ئـازەری و عـەرەب و بلـوش، پێکهاتـەی نەتـەوەیی جیـاواز لـە فارسـە فـەرمانڕەواکان کەلەدەوڵـەتی ئێرانـدا زۆربەن‌و ئەمجۆرە پێکهاتەیەش پێویستی بەهەڵوێستێکی مەبدەئی هەیـە لەچاری مەسەلەی نەتەوەیی لە ئێرانداو لەمەشدا مەبەستمانە کە هەموو ئەم نەتەوانە مافی خۆیانــە دەوڵــەتی نەتــەوەیی سـەربەخۆ یـان ڕژێمـی کۆنفیـدراڵی لـە دەوڵـەتی یەکگرتووی ئێراندا پێکبهێنن و کۆمار بۆهەر یەکێك لەم نەتەوانە پێك بێـت و بـچنە پەیوەنـدیی یـەکگرتووەوە. بـەلاَم سـەرکردایەتی تـودە لەسـەر ئـەم چارەسـەرە

مەبدەئییە قایل نەبوون. هەروا ئێمە بۆمان دووپات کردنەوە کە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لقێك نییەو حزبێکی نەتەوەپەروەری دیموکراسی کوردستانی سەربەخۆیەو دەبێ هاوپەیمانی لەگەڵ بکرێت، هەروا حزبی تودە مافی تەواوی خۆیانە کە هەوڵبدەن ڕێکخستنی(تودەیی) لەکوردستانی ئێران پێکبهێننو هەروا لەنێوان هەموو نەتەوەکانی ئێران و هەڵوێستی مەبدەئی لەچاری مەسەلەی کوردو دامەزراندنی بەهێزترین هاوپەیمانی سیاسی لەئێراندا. تودە لەم هەڵوێستە مەبدەئییە لەگەڵمان نەبوو، هەروا لەسەر ئەم بەئەنجام گەیشتنە سیاسییە ڕاستییە قایل نەبوو.

دوای ئەوەی دیدارەکانم تەواو کردن کۆبوونەوەیەکم لەگەڵ هاوڕێیان ئەبوسەرباز و بەهادین نوری و ئەبو جوزیف (تۆماتۆماس)و جەلال دەباغ ڕێکخست. بەهادین نوری دەیگوت گوایە حزب ڕایسپاردووە سەرکردایەتی ڕێکخراوی پارتیزان بکات بەلام لەراستیدا حزب ڕاینەسپاردبوو لەبەر ئەوە ڕوونمکردەوە کەهاوڕێ (ئەبو سەرباز) سەرکردەیی ڕێکخراوەکە بکات، بەمجۆرە کێشەی نێوان هاوڕێیان بۆ سەرکردایەتی ڕێکخراوەکە کۆتایی هات.

لەرۆژی سێیەمی گەیشتنمە مەهاباد ڕوومکردە ئەو شوێنەی ناوکی ڕێکخراوی پارتیزانی تێدابوو، لەسەر سنوری کوردستانی عێراقو ئێران لەناوچەی (ناوزەنگ)و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەو ناوچەیە بنکەیەکی ناوەندیی هێزەکانی پێشمەرگەو سەرکردایەتیی سیاسیی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی بەسەرکردایەتی مام جەلال پێکهێنابوو. تائەوکاتە دەستەیەکی سەربە تێکۆشەری کوردی ناسراو دکتۆر مەحمود عوسمانو دەستەی تێکۆشەر ڕەسوڵ مامەند هێشتا لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوون. بەلام ناکۆکی کەوتبووە ناو ڕیزەکانی یەکێتیو بۆ تێکدانی یەکێتییەکەی بەجیابوونەوەی ئەو دوو دەستەیەو دامەزراندنی حزبی سۆسیالیستی کوردستان لەپاش ئەوەی کۆنگرەی دامەزرێنەریان بەست.

ئەبو جوزیف و جەلال دەباغ و من ئێوارە گەیشتینە ناوچەی (ناوزەنگ) کە هاوڕێیانی تێدا نیشتەجێ بوون و بەردەوام دەگەیشتنە ئەوێو بووە شوێنێکی

تازەی تێکۆشان لەدژی دیکتاتۆریی شۆڤێنی و، بەشداربوونێك لەتازەکردنەوەی شۆڕشەکەی کوردستاندا دوای تێشکانەکەی ١٩٧٥. ئەم شوێنەی نیشتەجێبوونی هاوڕێیان دەکەوتە دۆڵێکی چیای (مامەندە) لەپشت بنکەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە. هاوڕێیانمان پێویستیان بەماڵو شوێنی نیشتەجێبوون و چەك و پێکهێنانی بنکەیەکی جێگیر هەبوو، وێڕای مەشقکردن لەسەر شەڕی پارتیزانی، واتە هاوڕێیان پێویستییان بەهەر شتێك هەبوو کە شوێنی سیاسی و عەسکەری حزب بەهێز بکات.

کە دیدارم کردن و بەمشێوەیە دیتمن ئەم بارودۆخەیان زۆر کاری تێکردم و فرمێسك لەچاوانم دەتکاو دامە پرمەی گریان!

بۆ ڕۆژی دووەم دیدارێکم لەگەڵ مام جەلال کردو زۆر خۆشحاڵ بوو کەوا حزب هاتۆتە سەر خەباتی چەکدارو هاتنەپاڵ شۆڕشی کورد کە خۆیشی لەبارودۆخی سەرکردایەتیدا ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. خەباتی چەکداریی حزبەمان هەروا مەودایەکی عێراقی پێداوە چونکە حزبی شیوعی تاقە حزبی سیاسیی عێراقییە کە تواناکانی لەگەڵ حزبە نەتەوەییەکانی گەلی کوردستانماندا یەکدەخاتو، بەڵکو هەروا لەدژی دیکتاتۆری و لەپێناوی دیموکراتیدا بۆ عێراق. هەروا ڕەهەندێکی نێونەتەوەیی و نێودەوڵەتی داوەتە مەسەلەی گەلی کوردکە ئیتر لە سنوری کوردستانی عێراقدا گیری نەخواردووە کە دیکتاتۆریی شۆڤێنی هەوڵی دەدا لەبارودۆخی نێودەوڵەتان کەلای بخات. لەم دیدارەدا بارودۆخی سیاسی عێراق و بارودۆخی شۆڕشی کوردستان و پەیوەندییەکانی نێوان حزبی شیوعی عێراق و یەکێتی نیشتمانی کوردستان خرانە بەرباس و لێکۆڵینەوە. هەروا باسی پەیوەندیی نێوان یەکێتی و (پارتی) دیموکراتی کوردستان–مان کردو هەڵوێستی یەکێتی زۆر سەلبی بوو: لەباسکردنەکەی و بەئەنجام گەیشتنەکانیدا هاوبیری نەبووم. پاشان داوام لێکرد کە یارمەتی چەکمان بدا ئەویش ژمارەیەکی چەك پێدان و بەڵێنی زیاتریشی دا.

پاش مانەوەم بۆ سێ ڕۆژ لای هاوڕێیان گەڕامەوە مەهابادو لەوێ چاوم بەڕەسوڵ مامەندو دکتۆر مەحمود کەوتو ناکۆکییەکانی خۆیان لەگەڵ یەکێتی

نیشتمانی کوردستان بۆ ڕوونکردمەوە کە نەیاتوانیوە لەناو قەوارەی ئەم یەکێتییەدا بمێننەوە لەبەر ئەوە بڕیاریان داوە حزبێکی سەربەخۆ پێکبێنن کە ئەویش حزبی سۆسیالیستی کوردستانە، هەروا ڕایانگەیاند کە حەزدەکەن پەیوەندیی و هاوکاری و هاوپەیمانی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق پێکبێنن.

لێرەدا باشە ئەوەش بڵێم کە ئێمە دوای دەرچوونمان لەبەغدا لەسالی١٩٧٨دا ئیتر هەواڵی ئەو ئاڵوگۆڕانەی بارودۆخی سیاسیمان پێنەگەیشت بەتایبەتی پاش ئەوەی ڕژێمی دیکتاتۆری ئەوەی زانی کە حزب بۆتە بەرهەڵستکاری چەکدارو چۆتە پاڵ شۆڕش لەهەرێمی کوردستاندا. لەبەرئەوە هاوڕێ جەلال دەباغ-مان نارد بۆ ئەوەی لەناوخۆدا بگەڕێو تەماشای بارودۆخەکە بکاتو لەدیدارەکانیدا زۆر وریا بێتو لەتوانای پەیوەندیکردنەوە بەهاوڕێیانی پچڕاوەوە بکۆڵێتەوە. پاش ئەوەی هەواڵی بەسەلامەتی گەیشتنە بەغدای هاوڕێ جەلال دەباغ-مان پێگەیشتو هیواداربووم هەروا بەسەلامەتیش بگەڕێتەوە لامان.

بۆ تاران گەڕامەو لەوێ چاوم کەوتەوە بەهاوڕێ عادل حەبەو پێکەوە چووینە دیداری هاوڕێیانی تودە کە داوەتێکی نانی ئێوارەیان بۆ کردینو لەماڵێکی حزبی خۆیاندا میوانداریان کردین. ئیتر سودم لەم هەلە وەرگرتو داوامان لەهاوڕێ عادل حەبە کرد کەدیدارێکم لەباڵوێزخانەی شۆرەوی لەتاران بۆ ڕێکخات، بۆ ڕۆژی دووەم ئەو دیدارە ڕێکخراو لەئەنجامی گفتوگۆدا دەرکەوت کەبەرپرسانی باڵوێزخانەکە دوورنین لەو پەرەسەندنانەی لەسەر گۆڕەپانی ئێران دوای لەناوبردنی ڕژێمی شا ڕوودەدەن. بەوردیو هێمنی سەرنجی ئەم پەرەسەندنانەیان دەدا بێئەوەی وابەپەلە ئەنجامگیری دیاریکراو بخەنە پێش. ئاگاداریان کردم کە هاوڕێ عەزیز محەمەد گەیشتۆتە مۆسکۆ، خۆم بۆ نووسینی ڕاپۆرتێك ئامادە کرد لەگەڵ لایەنە سیاسییە جۆربەجۆرەکانی ئێرانو ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین و هەندێ لەپیاوانی ئاینی و لایەنی کوردستانی ئێرانیو بەتایبەتی (حدکا)لایەنی کوردستانی عێراقی و پارتی لەو سەردانەی کاك مەسعودەوە کە هاتەلام و پەیوەندیی هاوپەیمانیمان لەگەڵیاندا پێکهێنایەوە، هەروا دیداری دوورودرێژم لەگەڵ مام جەلال و ئامادەبوونی بۆ ئەوپەڕی هاوکاری لەگەڵماندا. لەم ڕاپۆرتەدا

ڕامگەیاند کە بارودۆخی ئێران تانووسینی ئەم ڕاپۆرتە هێشتا نەبڕاوەتەوە. بارودۆخێکی لیبرالّی بێسەروبەر هەیەو دوژمنایەتی ئەمریکا بەدرێژایی پانتایی ئێران هەست پێدەکرێ و لەناوەندی پیاوانی ئاینیدا کێشە لەنێوان دوو ڕێبازدایەو وادیارە خومەینی لەسەرکردایەتی خۆپارێزەکانو تاڵەقانی لەپێشڕەوی هێزە دیموکراتە لیبراڵەکاندایە، ئەم ڕێبازەی دوایی هەریەك لەتاڵەقانی و مونتەزیری و پیاوانی دیکەی ئاینی لەپارێزگاو هەرێمەکان تێدایەو هەروا بەهەشتی مشتومڕێکی لەگەڵ تودەییەکان لەبارەی مەسەلە جۆربەجۆرەکانو ئاینیەکان دەست پێکردووە. ئەم گفتوگۆیانە زۆر بەسودبوونو تەلەفزیۆنی ئێران بلاّوی دەکاتەوەو خەڵکی زۆر بەبایەخەوە گوێ لەم مشتومڕانە دەگرن و دەگاتە شەقامی ئێرانی، فیدائیانیش ڕێکخراوێکی مارکسی بەهێز بوون لەگەڵ ئەوانیش باسی ئەوەمان کرد کە پەیوەندییان لەگەڵ حزبی تودە بەهێز بکەنو پەیوەندیی هاوپەیمانی لەنێوان هەردوو لایاندا پێکبێت بەلاّم ئەوکاتە هەردوولایان ڕێکنەبوونو ئەمانە خۆیان بە بەهێزتر لە تودە دادەناو لەسەردەمی شادا ڕێکخستنی نهێنی بەهێزیان پێکهێنابوو لەکاتێکدا سەرکردەکانی تودە دەرچووبوونە دەرەوەو نەیانتوانیبوو ڕێکخستنی نهێنی لەئێراندا دامەزرێنن وێڕای ئەوەش جەختمان بۆ کردنەوە کە پێویستە لەئێستاوە هەوڵبدرێو کاربکرێ. دواتر ناکۆکی لەناو ڕێکخراوی (فیدائیانی خەڵك)دا ڕوویداو بووە هۆی دابەشبوونی ڕێکخراوەکە بەدووبەشەوە (کەمایەتی و زۆربە) دەستەی زۆربە لەحزبی تودە نزیك بوونەوە تاتاستی تێکەڵبوون بەیەکتر پاشان دەستبەرداری ئەم ڕێبازە بوونو بەباشیانزانی بگەڕێنەوە بۆکاری سەربەخۆ.

ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵك بەهێزترین ڕێکخستنی سیاسی بوون لەهەموو ئێرانداو هەرڵی دەدا دەسەلاّتی پیاوانی ئاین ڕامالێت، بەلاّم لەبواری لایەنگیری گەلدا نەیانتوانی پێشی خومەینی بکەون. لەڕاپۆرتەکەمدا بۆ هاوڕێ عەزیز محەمەد ئەوەم خستە ڕوو کەکێشەکە هێشتا یەکلانەکراوەتەوەو هەموان لە زۆرانبازیدان بۆ یەکلاکردنەوەی مەسەلەی دەسەلاّت، هاوڕێیانی سۆڤیەت لایەنگیری ئەم باری سەرنجەی من بوون. گوتم لێرە هەموو بەتەنیا کاردەکەن

بەبێ ئەوەی بیربکەنەوە لەدیاریکردنی هێزی سەرەکی لەم قۆناغەداو دیاریکردنی ئامانجەکانی قۆناغەکەو مۆڵدانی هێزەکان لەدەوری، لەبەر ئەوە لەڕاپۆرتەکەمدا وامپێشبینی دەکرد کە لایەنگرانی خومەینی پاڵێوراون بۆ بڕینەوەی جەنگەکە لەبارەی دەسەڵاتەوە، ئەوەبوو لەڕاستیدا هێزە خۆپارێزەکان ئیتر نەیاندەتوانی لەبەردەم ئەم بارودۆخە لیبراڵییەدا کە لەهاتوچۆدابوو خۆبگرن. بۆیە هێرشیان لەدژی تودە دەستپێکردو حسابیان لەگەڵدا پاککردنەوە دوای ئەوە وەرگەڕانە سەر موجاهیدینی خەڵك و فیدائیانی خەڵكو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.

ئیتر لەئێران هیچ ڕێکخستنێکی سیاسی نەمانەوە جگە لەلایەنگرانی خومەینی کەتائەمڕۆ جڵەوی دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست. جا هەرچەندە ڕەوتی دیموکراتی لیبراڵی لەناوەندە فراوانەکانی گەلدا دەرکەوتن، بەڵام ڕێکخستنێکی سیاسی و سەرکردایەتییەکی سیاسییان نەبوو کەشایانی سەرکردایەتی کردنی ئەم تەوژمە فراوانەیان هەبێ و ئاڵوگۆڕی دیموکراسی لەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ژیان و گوزەرانی حەڵکدا بکرێت بەتایبەتی سوککردنی بێکاریو گرانیو چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردستانی بەهێنانەدی مافە نەتەوەییەکانی گەلەکەمان لەکوردستانی ئێران، لەکاتێکدا حزبی تودە بڕوای وابوو کە دەتوانرێ چاکسازیی دیموکراسی لەسێبەری ڕژێمی ئێراندا بەسەرکردەیی خومەینی بهێندرێتەدی، بەدرێژی وتووێژمان لەگەڵ کردن کە ئەزمونی حزبی ئێمە حزبی شیوعی عێراق دووپاتی دەکاتەوە کە لەتوانادا نییە پشت ببەسترێ بەم توێژانە بۆ ئەنجامدانی ئەم چاکسازییە چ جای ئەوەی پیاوە ئاینییەکان بەتەواوی لەڕووی هزرییەوە لەگەڵمان ناکۆکنو خۆپارێزەکانیشیان دوژمنایەتییەکی توندمان لەگەڵدا دەکەن، لەسەر ئەم بنەمایە دەبێ بەدوای هاوپەیمانی ڕاستەقینەدا لەناوەندە دیموکراتییەکاندا بگەڕێین، هەروا لە بزاڤی نەتەوەیی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییە پێشکەوتنخوازەکانو دەتوانرێ تەکتیکی نەرمونۆڵ لەهەڵسوڕانی ئێستادا لەگەڵ دەسەڵاتی ئاینی بگیرێتەبەرو، پێویستی بەهێزکردنی ڕێکخستنی حزبیو بەتینکردنی پەیوەندیی حزب لەگەڵ جەماوەر بەڕێگەی ڕێکخراوەکانی دیموکراسیو نەقابیو پیشەییو جوتیاریو ئافرەتانو، گرتنەبەری هەڵوێستێکی

مەبدەئی لەچارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەیی لەئێراندا. بەمجۆرە ئەزموونی خۆمان خستە بەرچاویان بەلآم هاورێیانی سەرکردایەتی تودە بەتایبەتی (نورەدین کیانوری) دڵخۆش نەبوون لەوتووێژەکەمان لەگەڵیاندا، بەمەش لێیان گەڕاین خۆیان چۆنیان دەوێ وابکەن چونکە ژیانو پەرەسەندنەکانی بارودۆخی سیاسی قەناعەتیان پێدەکات ئەگەرچی دوای تێپەڕبوونی کاتیش بێت وەك ئەوەی ڕوویدا. ئێستاش گۆڕەپانی ئێران چۆڵ بووە لەتودەو کارتێکردنی هێزیو سیاسی بۆکۆکردنەوەی هێزە دیموکراتییەکانو سەرکردەیی بزاڤی جەماوەر کەتینووی ئاڵوگۆڕی دیموکراتییە لەژیانی گەلانی ئێراندا.

گەڕامەوە بۆ سوریاو هاورێیانی سەرکردایەتیم لە(م.س)و (ل.م)و کادیرانی پێشکەوتووی دیکەم لەبارودۆخی ئێران و لەبارەی بارودۆخی شۆڕشەوە لەهەرێمی کوردستانی عێراق ئاگادار کردەوەو هەموو کۆششی خۆم بۆگەیاندنی یارمەتی بەهاورێیانی پارتیزان تەرخانکرد واتە بۆگەیاندنی چەكو پارە، هەروا پەیوەندیکردن بەهاورێیانی عێراقییەوە کە بۆرزگاربوون لە تیرۆری فاشیانەی ئەوکاتەی عێراق لەلایەن دەسەلآتی دیکتاتۆری سەدامەوە لەولآت دەرچووبوون تاوەك پارتیزانی جەنگاوەر ئامادە بکرێن، ئەمەش بەرێگای هاوکاری لەگەڵ رێکخراوە فەلەستینییەکاندا کە هاورێ فەخری کەریم لە لوبنان لەگەڵیان رێکەوتبوو، هەروا رێکەوتن لەگەڵ کۆماری یەمەنی دیموکراتی بۆ مەشق پێکردنو ناردنیان بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق کە بگەنەلای هاورێیانی پارتیزانیان لەوێ.

بەپێی بریاری مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی عێراقمان سەردانی ئۆردوگەکانی مەشق پێکردنیانم دەکرد.

هەروا بەرپرسی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی حزب بووم و لەسەرم پێویست بوو کە پەیوەندیی بەگشت رێکخراوە عێراقیو سوریو لوبنانیو فەلەستینییەکانەوە بکەم تەنانەت بەکۆماری یەمەنی دیموکراتیشەوە.

لەچەندان دیداری هاوبەشدا لەگەڵ حزبی بەعسی عێراقی سەربە حزبی بەعسی سوریدا، کەئەوکاتە جەبار کوبەیسی بەرپرسی بوو، هەروا لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان و کۆمەڵە نەتەوەپەروەرکانی تر گەیشتینە پێکهێنانی

بەرەیـــەکی نیـــشتمانی بـــەپێی بەرنامـــەو پێـــڕەوی نـــاوخۆی هاوبـــەش‌و داوامانکرد(پارتی) لەناو ئەم بەرەیەدابێت، بەڵام داواکەمان درایە دواوەو لەمەشدا سەرنجی خۆمان دەربڕی. لەئاهەنگی دەستپێکی ئەم بەرەیەدا (جوقد) هاوڕێ عەزیز محەمەد گوتی هیواداریـن لـەنزیکترین کاتدا مەسەلەی بەشداریی حزبی دیموکراتی کوردستان لە (جوقد)دا چارەسەرکرێ، چونکە پارتی هێزێکی سەرەکی دەبێ لەناویداو وادەبینین کە نارێکییەك هەیەو هەردەبێ چارەسەر بکرێ.

هاوڕێیانمان لەکوردستان دەستپێشخەرییان کرد بۆدامەزراندنی بەرەی (جود) لەنێوان پارتی‌و سۆسیالیست‌و حزبی شیوعی عێراقداو ئەمەش مافێك بوو لەمافەکانمان. چونکە کاتێك کەسانی تر لەوە بێبەش دەکرێن کەبچنە ناو هەرهاوپەیمانێتییەك لەگەڵ هێزە نیشتمانی‌و دیموکراتەکان دەشێ هاوپەیمانییەکی ئازادانەی تر ببەسترێ لەگەڵ ئەوانەدا کە لەهاوپەیمانیی یەکەم بێبەشکراون. بەڵام بەعسی عێراقی سەر بەسەرکردایەتی نەتەوەیی سوریاو یەکێتی نیشتمانی کوردستان بڕیاریاندا ئەندامەتی حزبمان لە(جوقد) هەڵپەسێرن، چونکە چووینە ناو هاوپەیمانییەکی ترەوە کەئەوانی تر لە(جوقد) قایل ناکات‌و دواجار (جوقد) هەڵوەشێندرایەوەو ئەوانیتر ناچاربوون بچنە ناو(جود) جگە لەیەکێتی نیشتمانیی کوردستان بەمجۆرە (جود) چەند کۆبوونەوەیەکی لەشام و لەکوردستان ئەنجامداو هەندێ چالاکی سیاسی هەبوو پاشان بەبێ ئەوەی بڕیارێك لەکۆمیتەی باڵاوە بدرێت هەڵوەشایەوە.

# جارێکیتریش.. ئەرکی گران

هەر لەوکاتەوە حزب بەلای بەرهەڵستکاریی چەکداردا لەدژی دیکتاتۆریەت وەرگەڕاو تیپەکانی پارتیزانیی پێکەوەناو کۆششی خۆی لەگەڵ کۆششی حزبە کوردستانییەکاندا یەکخست گەلێك ئەرکی زۆرگران ڕووبەڕووی بوونەوە ، جگە لەئەنجامدانی هەڵسوڕانو چالاکی سەربازی لەدژی دەسەڵاتی دیکتاتۆری بەرەو ڕووی کێشەیەکی دوژمنانەی نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستانو پارتی دیموکراتی کوردستان بۆوەو هەردەبوو کاری بێکۆڵدانو بێپشوو بکرێت بۆ یەکەمو لەپێش هەموو شتێکدا سوککردنی دوژمنایەتی نێوان هەردوولا تەنانەت (پارتی) هێزێکی گەورەی ئامادەکرد بۆ هێرش کردنە سەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان، هێڵی هێرشەکە بەناو شوێنەکانی ئێمەدا دەڕۆیشت هەواڵمان دانیّ کەئێمە لەدژی ئەم هێرشە دەوەستینەوەو ڕێگەنادەین ئەم هێزە تێپەڕبێت، مەگەر بەسەر لاشەکانماندا، بۆیە پارتی ناچاربوو ئەم هێرشە نەکات.

ئێمە هەرچی لەنێوان هەمواندا هاوبەش بوایە، ئەوەمان باس دەکردو دەهێنایە پێشەوە، وێڕای ناکۆکییەکان، جەختمان لەسەر کاری هاوبەشو هەڵوێستی هاوبەش دەکردەوەو باسمان لەوە نەدەکرد کە لەسەری ناکۆك بووین، هەوڵماندەدا باری سەرنج لێکتر نزیك بکەینەوەو لایەنگیریی ئەم یان ئەو لایەنە نەکەین. یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەوتە لایەکی دژی پارتیو سۆسیالیستو پاسۆك. ئێمە هەڵوێستی بێلایەنیمان گرتەبەرو هەوڵماندەدا دوژمنایەتی نێوان ئەم دوو لایەنە ناکۆکانە کەم بکەینەوەو ڕێکخراوەو هێزە کوردستانییەکان یەکبخەین. جگە لەمە ناکۆکی کەوتە نێوان (پارتی)و (حدکا)و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بووە هاوپەیمانی (حدکا) لەدژی پارتی و لەدژی حکومەتی ئێرانو هێزەکانی (ینك) واتە یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ هێزەکانی (حدکا) بەشداری شەڕبوون لەدژی هێزەکانی ئێران کە پەلاماری شوێنەکانی (حدکا) یان لەکوردستانی ئێران

دەداو دەبوو ئێمەش هەروا ڕۆڵی ئاشـتبوونەوەی نێـوان (حـدك)و (حـدكا) بگـرین. چونکە نەدەکرا ئەم هێزانە شەڕی دەسەلاتی دیکتاتۆری بکەن لەکاتێکدا سەرقاڵی شەڕی نێوخۆیان بن، هەندێ جاریش یەکێتی نیشتمانی کوردستان وتووێژی لەگەڵ دەسەلاتی دیکتاتۆری دەکرد بۆ گەیشتنە ڕێکەوتنی دیاریکراو و هێرشـی دەبـردە سـەر بنکـەکانی (پـارتی)و پاڵەپەسـتۆی دەخـستە سـەر ڕێکخراوەکـانی پـارتی لەشارەکاندا ئێمەش دەبـوو پەیوەنـدیی هاوپـەیمانیمان لەگـەڵ لایەنـە ناکۆکـەکان بەشێوەیەکی بەرانبەر بپارێزین لەسیاسەتی بێلایەنی لانەدەین‌و نەچینەپاڵ لایەك. هـەر لەوکاتەشـدا ڕەخنـەمان لەوتووێـژی (ی.ن.ك) لەگـەڵ حکومـەت دەگـرت‌و هەوڵماندەدا مەترسییەکانی ئەم سیاسەتەو زیانەکانی بۆ سەر بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردسـتان ببیـنن، بـەلام هەڵوێـستی وەك حزبـە کوردسـتانییەکانی دیکـەمان نەدەگرتەبـەر کەئـەوان (ی.ن.ك)یـان بـەهێزێکی نەتەوەپـەروەری کوردسـتانییان نەدەزانی بەڵکو بەهێزێکی لادەرو دوژمنی بزاڤی رزگاریخوازیی کوردستان دەزانی، لەبەر ئەمە ئەوحزبانە بەجیدی لەکارابوون تائێمەش ڕابکێشنە سەر هەڵوێستەکانی خۆیـان‌و نێـوان ئێمـەو یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان تێکـدەن بـەلام ئێمـە لـەم چالاکییانە هۆشیاربووین.

لەپاڵ ئەمەشدا دەسەلاتی دیکتاتۆریی شۆڤێنی هەوڵیدەدا نەخشێکی پێکدادان ڕێکخـا لـەنێوان (پ.م) یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان و مـەفرەزە پارتیزانـەکانی حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراقدا کە لەدەشتی (کۆیە)و (دەشتی هەولێر) کاریان دەکـردو لـەدانانی نەخـشەیەکدا سـەرکەوتن بـۆ پێکـدادانی چـەکدارانە (بەسـتی شـەرغە) لەدەشـتی کۆیـە کـە مەفرەزەیـەکی (ینـك) کـەمینێکی دانایـەوە بـۆ مەفرەزەیەکی حزبمان لەکاتی گەڕانەوەیدا لەدەشتی هەولێرەوە بۆ دەشتی کۆیە. جاسوسـانی حکومـەت لـە مەفرەزەکـەی (ینـك)دا ڕێکیـان خـست‌و توانییـان وا لەمەفرەزەکـەی (ینـك) بگەیـەنن کەئـەو مەفرەزەیـەی لەدەشـتی هـەولێرەوە گەڕاوەتەوە مەفرەزەکەی حزبی سۆسیالیستی کوردستانە کەپەیوەندییان لەگـەڵ (ینك) دوژمنانـەبوو، مـام جـەلال خـۆی مـەفرەزەکانی خۆیـانی هۆشـیار کردبـۆوە کەلەهەر پێکدادانێك لەگەڵ مەفرەزەکانی حزبی شیوعی عێـراق خـۆ بـەدووربگرن،

کاتێکیش ئەو پێکدادانە ڕوویدا بەتوندی بەسەر برادەرەکانیاندا هەڵشاخاو تورەبوو، دوای ئەوەی کەزانی لەمەفرەزەکەی حزبی شیوعیدا قوربانی هەیەو، لەوەڵامی مەفرەزەکەدا جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەم کەمینەیان بۆمەفرەزەی حزبی شیوعی نەبووە، بەڵکو بۆ مەفرەزەی (حسك) بووەو هەڵەیان کردووە، لەبەرئەوە داوامانکرد دەستەیەکی لێکۆڵینەوەی هاوبەش دابنرێت و کێ لەم ڕووداوە بەرپرسە دیاری بکرێ، ئەوەبوو دەستەی هاوبەش پێکهاتو وەفدی ئێمە لەم دەستەیەدا بەسەرۆکایەتی هاوڕێ مولازم خدر بوو. چەند کۆبوونەوەیەکیان کردو جاسوسەکانی دەزگای هەوالگری عێراقی زۆر هەوڵیاندا کۆششی دۆزینەوەی ڕاستی ژێرکەوتوویێتو بەمجۆرە دەستەکە لەدەستنیشانکردنی بەرپرسی و بەرپرسانی ئەم ڕووداوەدا سەرکەوتوو نەبوون و ئێمەش بەرپرسیی تەواویمان خستە سەر(ینك).

شایانی باسە پاش ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی ساڵی ١٩٩١هەندێ بەڵگەنامەی موخابەراتی عێراقیمان دەستکەوت کە یەکێك لەم بەڵگەنامانە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ڕووداوی پێکدادانە چەکدارییەکەی نێوان مەفرەزەی (ینك) و مەفرەزەی حزبی شیوعی لەبەستی شەرغە لەلایەن موخابەراتی عێراقەوە سازکراوەو نەخشی بۆ کێشراوە.

بەمجۆرە کاروبارەکان لە پەیوەندی نێوان (ینك) لەلایەکو (پارتی و حسك) لەلایەکی ترەوە بەرەو خراپتر پەرەیان دەسەند، ئەوەبوو یەکێك لەمەفرەزەکانی (حسك) دوو کادیری (ینك) شەهید شەماڵو یەکێکی تریان لەگوندی بادارەی نزیك ڕێگەی سلێمانی-ڕانیە-کۆیە تیرۆر کردو لەدیدارێکمدا لەگەڵ مام جەلال گوتی گوایە هاوڕێمان محەمەد حەلاق بووە ئەو دووکادیرەی یەکێتی کوشتووەو منیش بەتوندی ئەم گوناهبارییەم ڕەتکردەوە، ئەوجا مام جەلال گوتی محەمەد حەلاق خۆی نەیکوشتوون بەڵکو بۆ مەفرەزەی (حسك) دەستنیشانی کردوون و قیژاندویەتی ئەمە فلان و ئەوە فلان کادیری یەکێتییە ئیتر مەفرەزەکەی (حسك) دەستڕێژیان لێکردوون و بەوهۆیەوە هەردووکیان شەهید بوون.. (ینك)خۆی بۆ تۆڵە سەندنەوە ئامادە دەکرد.

# حزبو ڕێکخراوەکان..
# خەباتو کێشەو ناکۆکیو دوژمنیش هەر یەکە

لەناوچەی بالیسان بنکەکانی ئەم حزبانە هەبوون:

١. حزبی شیوعی عێراق بەرپرسی سیاسیی ئەوکاتە یوسف حەنا (ئەبو حیکمەت)بوو.

٢. (ی.ن.ك) بەرپرسەکەی دکتۆر کەمال خۆشناو بوو.

٣. پارتی بەرپرسەکەی کاك (مەلا محەمەد)بوو

٤. (حسك) ناوی بەرپرسەکەیم لەیادنەماوە.

ڕێکخراوەکانی پارتیزانەکان و(پ.م)ی ئەم سێ حزبە شیوعی و پارتی و حسك، ئەندامی بەرەی (جود) بوون بەڵام (ینك) لەدەرەوەی ئەم بەرەیەدا بوو، لەگەڵ پارتی و حسك رێك نەبوون. بەڵکو پەیوەندییەکانیان لەگەڵیاندا دوژمنانەبوون. پارتی و حسك نەیاندەویست بنکەی (ینك) لەبالیساندا هەبێتو چەندان جۆر شێوازی زەبریان پەیڕەودەکرد تا (ینك) ناچاربکەن لەناوچەکە دەرچێت. بەڵام (ینك) هێزەکانی خۆی پتەوتر دەکرد.

جا لەم کەشوهەوا ئاڵۆزەی نێوان (ینك) لەلایەك و(پارت و سۆسیالیست) لەلایەکی ترەوە ئێمە وەفدێکمان رێکخست کە لەمن و عەبدولڕەزاق سافی پێکهاتبوو بۆ ئەوەی چاومان بەمام جەلالو سەرکردایەتی (ینك) بکەوێتو لە(پشتئاشان)ەوە بۆ(ناوزەنگ) سەفەرمان کرد کەبارەگای سەرکردایەتی (ینك) لەوێ بوو بارودۆخی سیاسیی گشتیمان لە عێراقدا باسکرد، هەروا باسی هێزەکانی شۆرش لەهەرێمی کوردستانی عێراقو پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان ئەم هێزانە کەبەبارێکی نیگەتیڤدا کاردەکاتە سەر شۆڕشو سەربزافی ڕزگاریخوازیی کوردستان و پێویستی چارەسەرکردنی ئەم بارودۆخە خراپە. بڕیاردرا پەیوەندییەکانی نێوان حزبی شیوعی عێراقو(ینك) بەهێزبکرێنو، کاروهەڵسوڕان

لەبواری شەڕدا لەدژی ڕژێمی دیکتاتۆر ڕێکبخرێت‌و هەروا بڕیاردرا حزبی شیوعی عێراق ڕۆڵێکی کاریگەری هەبێت بۆ دیداری نێوان پارتی و ینک بۆ چارەکردنی کێشەو ناکۆکییەکان‌و یەکخستنی کۆشش‌و کار ڕێکخستن‌و هاوکاری لەدژی ڕژێمی بەعس.

بەمجۆرە کۆبوونەوەکە کۆتایی هات و هەندێ بڕیاری باش دران‌و گەڕاینەوە بۆ پشتئاشان. لەڕێگەی گەڕانەوەمان لەگەڵ ڕەسول مامەندی تێکۆشەرو ژمارەیەک ئەندامانی سەرکردەیی (حسک) یەکترمان دی‌و لەبارەی دیدارمانەوە لەگەڵ مام جەلال و ..سەرکردەیی (ینک) ئاگادارمان کردن و سەرنجمدا لەدیدارەکەمان‌و ئەنجامەکانی خۆشحاڵ نەبوون. پاشان گەیشتینەوە بارەگاکەمان لە پشتئاشان و ڕاپۆرتێکمان لەبارەی دیدارەکەوە بەهاوڕێیانی سەرکردایەتیمان پێشکەش کرد.

ئیتر دەستمان بەهەوڵدان کرد بۆ ڕێکخستنی دیدارێك لەگەڵ کاك مەسعودو کاك ئیدریس‌و مەکتەبی سیاسی پارتی بۆئەوەی لەدیدارەکەمان لەگەڵ مام جەلال ئاگاداریان بکەینەوەو پێویستی دیدارێکی سێقۆڵی(پارتی و ینك و حشع) بۆ باسکردنی ناکۆکییەکان‌و کۆتایی پێکهێنانیان‌و ڕێکەوتن لەسەر هەرچی هاوبەشە لەکارو چالاکی سیاسیمانداو پێشەکی داوای دیدارێکی هاوبەشمانکرد لەنێوان (پارتی و حسك و حشع) داو جێگەش لەگوندی ڕۆست دیاریکراو لەلایەنی (پارتییەوە) برای تێکۆشەر کاك عەلی عەبدوڵا ئامادە بوو، لەلایەنی (حسك)ەوە کاك ڕەسوڵ مامەندو لەلایەنی خۆشمانەوە من (کەریم ئەحمەد) ئامادە بووم هەرسێ لایەنمان ئەندامانی (جود) مەسەلەکەمان باسکرد بۆ پێویستیی کۆتایی هێنانی ناکۆکییەکانی نێوان حزبە کوردستانییەکان‌و یەکخستنی تەقەلامان‌و کاروبار ڕێکخستن لەدژی دەسەڵاتی دیکتاتۆریی شۆڤێنیست.

پاش گەڕانەوەمان بۆ بارەگاکەمان لە پشتئاشان بەچەند ڕۆژێك نامەیەکمان لە ئەبوحیکمەتەوە بۆ هات کە ئەوکاتە بەرپرسی بنکەکەمان بوو لە (بالیسان) لەنامەکەیدا دەڵێ (پارتی و حسك) دەیانەوێ چالاکییەکی سەربازی ئەنجام بدەن بۆ دەرکردنی (ینك) لەم ناوچەیەو لەسەر ئێمەش پێدادەگرن کەلەم کارەدا بەشداربین چونکە ئێمە لەناو (جود)دا هاوپەیمانیانین ڕاستیش نییە دەستبەرداری

هاوپەیمانەکانمان بین بەتەنیا بمێننەوەو تەماشای ڕووداوەکان بکەین وپێشنیازی کردبوو کە هەموو پێکەوە کارێکی هاوبەش لەدژی بوونی (ینک) لەبالیسان ئەنجام بدەین. نامەیەکمان بۆناردەوە لەوەلأمدا پێمانگوت ڕاست نییە کارێکی وابکرێت‌و پێویستە ڕۆڵی خۆی ببینێ بۆ ئەوەی ڕێگە نەدرێ بارودۆخەکە پەرەبگرێ و بگاتە ڕادەی کوشتار لە نێوان هێزە کوردستانییەکاندا بەتایبەتی کە ئێمە لەگەڵ (ینک) ڕێکەوتووین هەوڵ بۆ دیدارێکی سێقۆڵی بدەین بۆ چاری ناکۆکییەکان. ئەبوحیکمەت بەنامەیەکی تر وەلأمی داینەوەو لەوێدا دەڵێ پارتی و حسک سورن لەسەر بەشداریمان لەم پرۆسەیەدا ئەگەرنا ئەوا بوونمان لەناو (جود)دا نابێت‌و پەیوەندییەکانیشمان ئاسایی نابن.

لەوەلأمی دووەمماندا هەڵۆێستمان هەڵبوو دوودڵی تێدا بوو مەسەلەکەمان بۆ خۆیان دانا کە چۆنیان بەباشزانی وابکەن ئەوانیش لەپرۆسەکەدا بەشدارییان کردو هێزەکانی ینك ناچاری کشانەوە بوون لە (بالیسان) بەلأم سەرکردایەتی (ینك) بڕیاریدا لەبەرامبەردا هێرش بۆسەر شوێنەکانی هەرسێ حزبەکە (پارتی و حسك و حشع) دەست پێبکات و هەنگاوی یەکەم هێرش بوو بۆسەر هێزەکانی(حسك و حشع) لە (ئاشقولکەو پشتئاشان). چەند جارێك هەوڵمدا بەبێتەل پەیوەندی بەمام جەلالەوە بکەم تاهۆیەکانی ڕاستەقینەی ئەم هێرشە بزانم‌و ڕێگە لەدەستپێکردنی بگیرێت بەلأم لەوەدا سەرکەوتوو نەبووم‌و لەهاوڕێیانی بێتەلەوە پێمدەگوترا وەلأم نادەنەوە، هێرشەکە دەستیپێکردو نەوشیروان مستەفا سەرکردەیی دەکرد، ئێمەو(حسك) بڕیارماندا بەرگری لەشوێنەکانمان بکەین بەلأم بەرگری لەپێش پەلامارێکی بەهێزو دڕی هێزەکانی (ینك)دا خۆی ڕانەگرت‌و نەوشیروان بەهێزەکانی دەگوت: (پەرێزتان پاك بێت) واتە پێویستە (دروێنەکانتان پاك بێت) مەبەست لەمەش ئەوە بوو کە بکوژن‌و ببڕن‌و کەس نەپارێزن. لەم هێرشەدا سیاسەتێکی نەتەوەیی پڕ لەکینە لەدژی هاوڕێیانی عەرەب بەژن‌و پیاوەوە پەیڕەوکراو زۆرترین قوربانییەکان لەناو هاوڕێیانی عەرەبدا بوون لەپارتیزانە کوڕو کچەکان. دوای ئەوەی (حسك) پاشەکشەی کرد بێ ئەوەی تەنانەت لەپاشەکشەکردنیش ئاگادارمان بکەنەوە، ئێمەش بڕیاری پاشەکشەماندا، بەلأم پاش ئەوەی

پاشەکشەیان کردو گەیشتنە شوێنی سەلامەتی عەبدولخالق زەنگەنە یان نارد کەلەپاشەکشەکەیان ئاگادارمان بکەنەوە.

بەلآم هێزەکەی ئێمە لەکاتی پاشەکشەدا پەرت و بلآو بوونەوە: هەندێك لەهێزەکەمان توانییان ڕێگەی پاشەکشە بدۆزنەوەو بەشەکەی تریش ڕێگەیان هەڵەکردو من لەگەڵ ئەم بەشەدا بووم کە ونداببووین، لەجیاتی ئەوەی ڕووبکەینە سنوری ئێران خۆمان دیتەوە کە ڕێگەی ناوعێراقمان گرتۆتەبەرو شەوێك لەچۆڵ ماینەوە. وەرزی بەهار بوو زۆر سەرمابوو بەفر هێشتا لەسەر لاپاڵەکانی چیاکان مابوونەوە، بۆبەیانی ڕووماندکردە گوندێك گوتیان ئاوەدانە بۆ ئێوارە گەیشتینە ئەو گوندە بەلآم چۆڵ بوو جگە لەچەند شوانێك کەسی تێدا نەبوو ئەوانیش خواردنیان پێدایین بەلآم هەندێ پرسیاریان لەبارەی شەڕەکەی ئێمەو (ینك)ەوە دەکرد. بۆشەوێ یەکێکیان لەگەڵماندا هات تابمانخاتە سەر ڕێگە، بەلآم بەشێوەیەکی هەڵە ڕێگەکەی پیشاندایین‌و دوای نزیکەی یەك سەعات ڕۆیشتن ڕێزانەکەمان رایکردو ئێمەی جێهێشت پاشان ئاگرێکمان لەدوورەوە بەدیکرد پرسیم ئەم ئاگرە چییە؟ گوتیان شوانەکانن لەم ڕۆژانەدا بۆ مەڕ لەوەڕاندن دەمێننەوە، ئاگرەکە زۆربوو دەسوتا، بەهاوڕێیانم گوت بابەلای ئەم ئاگرەدا نەڕۆین‌و ڕێگەمان بگۆڕین، بەلآم بەرپرسی عەسکەریمان گوتی دەڕۆین، ئێمە هێزێکی جەنگاوەرین‌و دەتوانین شەڕ بکەین گوتم دەبێ ئێمە لەهەر شەڕێك خۆبەدوور بگرین بەلآم هاوڕێیان لایەنگیریان نەکردم‌و بەرەو ئاگرەکە ڕۆیشتین تاگەیشتینە گوندێکی چۆڵ گوتم پێویستە لەگوندەکە تێپەڕین بەلآم هاوڕێیان زۆر ماندووبوون‌و ویستیان کەمێك پشوو بدەن‌و کەس گوێی بەسەرنجەکانی من نەدا، پاش کەمێك یەکێك لە بۆسەکەی یەنەکەوە هات‌و لایتێکی بەدەستەوە بوو سەرنجی بارودۆخەکەیدا، کاتەکە شەوبوو نەدەتوانرا دوژمن لەدۆست جودا بکرێتەوە، هاوارم لێکرد کە ڕووناکییەکە بکوژێنێتەوە چونکە کۆمەڵی ئاگرەکە دەمانبینن وامدەزانی یەکێکە لەهاوڕێیانمان. پاش پێنج خولەك دراینە بەرگوللەو ڕیزەکانمان پەرت‌وبلآو بوونەوە هەرکەسە دەیویست خۆی دەرباز بکات هەموو ڕایانکردو تەقەیەکیان نەکردو بێ بەرگریکردن ماینەوەو بوون بەچەند کۆمەڵێکەوە، کۆمەڵێکیانم دیتەوەو چوومە پاڵیان‌و

بەوریێبازەدا هەڵاتین کە لێوەی هاتبووینو خۆمان لەپاڵ تاشە بەردێکی گەورەدا پاراستو ژمارەمان پتر لە دە هاوڕێ بووینو هاوڕێ (ئەبوعادل)ی کرێکاران لەگەڵ گروپەکەماندا بوو کەمێك بریندار بوو تابەرەبەیان لەوێ ماینەوەو بەرەبەیان دراینەوە بەرگولله ئێمە خۆماندا بەدەستەوەو بۆبەیانی ئێسترێکیان هێنا بۆمن کەسواری بم بەڵام قایل نەبوومو ئێسترەکەم دا بەهاوڕێ (ئەبوعادل) کە بریندار‌بوو، لەکاتی خۆبەدەستەوەدانمان تەماشامکرد ڕێزانەکەمان کە شەو لەگەڵماندابوو پاشان ڕایکرد ڕووپۆشی خۆی کردووەو لەگەڵیاندایەو چاوەڕوانی فەرمانی بەرپرسەکەی (ینك) دەکات کە هەرچی لێ داوابکات ئەنجامی بدات دوای ئەوە زانیم کە هەموو ئەو هاوڕێ عەرەبانەی لێرەو لەوێ دیویاننەتەوە کوشتویانن هەروا هاوڕێ ئەبو مەکسیم شەهید کراوە ئەمەش لەوکاتەدا بووە کە کاتی خۆشاردنەوەمان لەپەنا بەردە گەورەکەدا تەقەمان لێکراو تەماشای تەواوی لەشی ئەوهاوڕێیەم کرد بەڵام هیچ جێگەی گوللە یان برینێك بەلەشییەوە دیارنەبوو پێدەچوو تووشی جەڵتەی دڵ هاتبێت، بەڵام زۆربەی هاوڕێیانمان لەپیاو و ئافرەت لە گروپەکەی ئێمەدا عەرەب بوونو کەسیان ئازارێکیان پێنەگەیشت.ئینجا دەستگیر کراین بەڵام فەرمانیان پێگەیشتبوو کە هیچ کەسێکی گروپەکەمان تووشی هیچ نەبێت و بەرەو بارەگاکەیان لەخانەقا کەوتینەڕێو هاوڕێ ئەحمەدی بانیخێڵانی (ئەبو سەربان) یشیان هێنا، ئێمە سێ کەسی سەرکردەیی بووین (ئەبوسەربازو قادر ڕەشیدو من) ژوورێکی تایبەتییان بۆ تەرخانکردینو ئەوانی تریان بردە گرتوخانەی (وەرتێ). نەوشیروان هاتە سەردانمانو بەتوندی لەسەر ئەم هێرشە ڕەخنەمان لێگرتن ئیتر کەوتە باسی بێبەختیو ڕەخنە لەخۆگرتن چونکە ئەو کەسێك نییە بۆ کوشتار بەڵکو بۆ سیاسەتو ڕۆشنبیرییە، بەڵام بارودۆخەکە خستویەتییە ئەم شوێنە. بۆ ڕۆژی دوایی بردینیان بۆ بارەگای مام جەلال لە(ناوزەنگ) بۆ ڕۆژی سێیەم گەیشتینەجێ، ئەوەی جێگەی سەرنج بوو نەوشیروان گوتی هێرشەکە لەدژی ئێوە نەبووە، بەڵکو دژی (حسك) بووە بەڵام: کاتێك تەماشامانکرد ئێوەش لەگەڵیاندا لەشەڕی ئێمەدا بەشداربوون هێرشەکە ئێوەشی گرتەوە. هەروا مام جەلالیش ئەمەی دووپاتکردەوە.

کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ سەرکردایەتی (ینک) ئەنجامدا بەئامادە بوونی مام جەلال و ڕەخنەمان لێگرتن بۆ ئەو هێرشەیان بۆسەرمان ئەوانیش دووپاتیان کردەوە کەئەوان مەبەستیان حزبی شیوعی نییەو بەڵام حزبی شیوعی تێوەگلا بەهاوکاریکردنی لەگەڵ (پدك و حسك) لەبالیسان کە هێرش بکەنەسەر بنکەکەیان لەوێ هەروا لەگەڵ (حسك) تێوەگلا لە (ئاشقولکەو پشتئاشان) و داوامان لێکردن کە شەڕوکوشتار ڕابگرن‌و فەرمان بدەنە هێزەکانیان کە ڕاوەستن و هێرش مەکەنە سەر (بالیسان)و پێشتریش هاوڕێیانمان لەبالیسان ئاگادارکرد کەدەستبەجێ لەناوچەکە بکشێنەوە بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی قایلبوونی (پدك و حسك) بکەن چونکە جەنگەکە دوڕاوە. وا دیارە هەموان لەبالیسان (پدك و حسك و حشك) پێش ئەوە بڕیاریاندا بکشێنەوە. جەختمان لەسەر ئەوەش کردەوە کەپێویستە دەستبەجێ بەندو گیراوە سیاسییەکان ئازادبکرێن‌و پێشنیازم خستەبەردەم مام جەلال کە پێکەوە بانگەوازێکی هاوبەش دەربکەین و پرۆسەکە ئیدانە بکەین واتە کوشتاری نێوان هێزەکانی شۆڕش و داوای یەکگرتنی هێزەکان بکەین لەدژی دەسەڵاتی دیکتاتۆریی شۆڤێنی داوای دەستبەجێ ڕاگرتنی کوشتار بکەین.

دەمویست بەم پێشنیازە لەپێش هەرشتێکدا شەڕی نێوان ئێمەو (ینک) ڕابگیرێت‌و هەوڵی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان هێزەکانی شۆڕش بدرێ. بەڵام وادەرکەوت کە هاوڕێیانی(م.س) حزبی شیوعی عێراق‌و هاوڕێیانی سەرکردایەتی لەبزووتنەوەی پارتیزانیدا بڕیاریان لەسەر ئەم بانگەوازە نەداو کەوتنە هێرش بردن بۆسەر ئەم بانگەوازە تەنانەت پێش گەڕانەوەشمان بۆلایان ئیتر هاوڕێ ئەبوفاروق لەجیاتی من بەرپرسێتی سەرکردەیی کۆمیتەی پارتیزانەکانی گرتبووە دەست.

وەفدی سەرکردایەتی (حدکا) گەیشتە بارەگای مام جەلال لەناوزەنگ بۆئەوەی لەسەلامەتیمان و بەردانمان دڵنیابن، منیش زۆر سوپاسم کردن مام جەلال پێیگوتن ئەوانە دەسگیرنەکراون‌و ئازادن و لای ئێمە میوانن و هەرکاتێك بیانەوێ لەلامان دەرچن دەتوانن. لەرۆژی چوارەمدا یان پێنجەم ڕوومانکردە سەردەشت‌و هێزێکی (پ.م)ینك تا ئەوسنورەی ڕێگە هەبێت لەگەڵمان هاتن و دوای ئەوە

هەرسێکمان، ئەبوسەربازو ئەبوشوان (قادر ڕەشید)و من گەیشتینە سەردەشت‌و لەماڵی یەکێك لەهاوڕێیانی (حدکا) میوان بووین‌و بۆرۆژی دوایی گەیشتنمانە سەردەشت ڕوومانکردە (ورمێ–ڕەزائیە). بەمبۆنەیەوە لەیادمە کاتی دەرچوونمان لەبارەگای (ینك) لەناوزەنگ مام جەلال دەمانچەی بۆ خۆپاراستن دایە من‌و ئەبوسەرباز، من دەمانچەکەی خۆمدا بەهاوڕێ ئەبوشوان ئەویتر لای ئەبوسەرباز مایەوەو کاتێ گەیشتینە خاڵی سنور کە دەبوو (پ.م)ی (ینك) بگەڕێنەوە بۆ بارەگاکەیان لەناوزەنگ هاوڕێ ئەبوسەرباز دەمانچەکەی دایەوە بەپێشمەرگەکان تا بیدەنەوە بەمام جەلال بەڵام هاوڕێ ئەبوشوان دەمانچەکەی نەگێڕایەوەو گوتی ڕەنگە لەڕێگا پێویستمان بێت لێرەدا کینە لەدڵان دژی ئەبوشوان زۆر هەڵچون‌و دواتر زۆر بەتوندی قسەیان پێدەگوت. هەروا مام جەلال هەندێ پارەی دابووینێ بۆ خەرجی ڕێگاو کەگەیشتینە بارەگای کاتیمان لەگوندێکی ئێرانی نزیك سنوری هەرێمی کوردستانی عێراق‌و نزیکی (خانە یان پیرانشەهر)ی ئێرانی ماوەی پارەکەم دایەدەست ئەبوفاروق.

# پشتئاشانی دووەم

پاش گەڕانەوەم لەبارەگای مام جەلال لە(ناوزەنگ)بۆ بارەگا کاتییەکەمان هاوڕێیان کەوتبوونە ناوداوی ئێران ئەمەش پاش ئەو تێکشکاندنەمان لە(پشتئاشان)و کاردانەوەی هاوڕێیان بەرەو ئەنجامدانی هەڵسوڕاندنێکی تۆڵەسەندن لەدژی (ینک)، ئێران و پدك لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون کە پێکەوە هێرش بەرنە سەرناوچەی حاجی ئۆمەران و چۆمان و باڵەك بۆ پاکردنەوەیان لەهێزەکانی عێراق. لەئەنجامی تێکشکانە سەربازییەکەماندا و کاردانەرەی تۆڵە سێنانە لای هاوڕێیانمان چووبوون لەگەڵ هاوڕێیانی (پدك) قسەیان کردبوو کە پێویستە پشتگیریان بکەن و هێزێکی (پارتی) لەگەڵماندا بەشداربن بۆ هێرش بردنەسەر بنکەکانی (ینك) لەپشتئاشان و ئەمەش لەناو نەخشەی (ئێران-پدك) دابوو کە هێزێکی (پ.م)ی پارتی بنێرنە ناوچەی پشتئاشان کە ڕێگە بگرن لەگەیشتنی کۆمەکی میری لەڕانیەو قەلادزەوە بۆ هێزەکانیان لەحەوزی حاجی هۆمەران و چۆمان و باڵەك لەکاتێکدا ئەگەر هێرشی ئێران و پدك بۆسەر هێزەکانی عێراق لەم ناوچەیە دەست پێبکات. هاوڕێیانمان لەگەڵ پدك ڕێکەوتبوون کەهێزی هاوبەش بۆ پشتئاشان و بۆڵێ بنێرن بۆ لێدانی (ینك)و گێڕانەوەی ناوچەکە.

کاتێك گەیشتمە لایان ڕێکەوتنەکەیان لەگەڵ (پدك) خستەبەرچاوم منیش زۆربەتوندی بەرهەڵستیم کرد چونکە یەکەم دەکەوینە ناوداوی ئێران و دووەم ئێمە لەشەڕێکی دۆڕاو دەرچووین کە بەهیچ جۆرێك جەنگی ئێمە نەبوو بەڵکو جەنگی (پدك و حسك) بوو بەسەر ئێمەدا سەپێندراو ئەمەش ئەنجامەکانێتی لەکاتێکدا ئێمە لەنێوان لایەنە کوردستانییە ناکۆکەکاندا بێلایەن بووین و ڕۆڵی ئاشتبوونەوەو چاری ناکۆکییەکان و ڕێکخستنی هێزەکان-مان لەدژی دیکتاتۆری شۆڤێنی دەگێڕاو ئێستا بووینە لایەنگری لایەنێك لەدژی لایەنەکەی تر. هەروا من لەگەڵ سەرکردایەتی (ینك) ڕێکەوتم کە شەڕ ڕابگرین و پێویستە هەموو گیراوەکان

بەربدرێن و لەبەر ئەمانەش هەمووی من لەدژی ئەم پرۆسەیەم و دۆڕاویش دەبێ و قوربانی زۆر لەلایەنی ئێمەوە دەبێ. بەڵام هاوڕێیان بەوەی خستمە پێش چاویان قایل نەبوون و، گوتیان ئێمە لەگەڵ(پدك) ڕێکەوتووین و پەشیمانبوونەوە نابێ و داوایان لەهاوڕێیانی پارتیزان لەبادینان و لەهێزی کۆسرەت بەسەرکردەیی عەلی حاجی نادرکرد، هەروا هێزی تریش کە دەستبەجێ ڕووبکەنە پشتئاشان بۆبەشداری لەشەڕەکەداو هێرشێکی بەرینیان بردە سەرم کە من سازشکاریم لەگەڵ مام جەلال کردووە بەوەی بانگەوازێکم دەرکردووە بۆ ڕاگرتنی کوشتار لەنێوانمانداو لەهەڵوێستەکەشیاندا بەبڕیارەکەی (م.س)ی حزبمان، حزبی شیوعی عێراق پشت ئەستوربوون، ئەوکاتە (م.س) بارەگای لەشام بوو، لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی سەرکردەیی پارتیزانەکانماندا بەرهەڵستی ئەم پرۆسەیەم کرد، ئەم کۆمیتەیە ئەمانە بوون: (ئەبوفاروق-ئەبوخولە-ئەبوعامل-ئەبوحیکمەت-ئەبوسەرباز-ئەبو موخلیس و من) گوتم من ناتوانم بەرپرسی بگرمە ئەستۆ، ئیتر هاوڕێ ئەبوفاروق-یان هەڵبژاردو هەر ئەمەشیان دەویست بەڵام ئەبو خولە پێی خۆش نەبوو کە ناوی ئەبوفاروق هێنرایە ناوەوە کە ببێتە بەرپرس چونکە ئەو دەیویست خۆی بێت نەك کەسێکی تر.

کاروبارەکە بەمجۆرەی لێهاتو هاوڕێیانی بادینانو کۆسرەتو هیتر گەیشتنو بۆسەرکردایەتی ئەم پرۆسەیە سەرکردایەتییەك بەسەرۆکایەتی ئەبو حیکمەتو ئەبوعامل و بەسەر پەرشتی ئەبوفاروق دامەزراو هاوڕێیان ڕوویان کردە پشتئاشانو بۆڵێ. بەرهەڵستکاریی خۆم بۆئەمە لەبەرچاوی هاوڕێیانی پێشمەرگە دەرنەبڕی نەك ئەمە کاریکاتە سەر ورەیانو جگە لەمە خولیای تۆڵەسەندنەوە لای هەندێك گەیشتە ئەوپەڕیو منیش زۆر لەدڵەڕاوکێدا بووم بۆ ژیانی هاوڕێیانم چونکە گەیشتبوومە ئەو بەئەنجام گەیشتنە کە لەم پرۆسەیەدا زیانمان لێدەکەوێت.

دەنگوباس گەیشت کە پرۆسەکە ژێرکەوتوو بووەو(پ.م-پدك) پێش ئەوەی هاوڕێیانمان ئاگاداربکەن پاشەکشەیان کردووەو دیسان ئەو سیناریۆیە دووبارە بۆتەوە کە ئەوە بوو (پ.م حسك) لەپشتئاشانی یەکەم پاشەکشەیان کرد بێئەوەی ئەو(ئەرکە) بدەنە بەرخۆیانو ئاگادارمان بکەن. هاوڕێیانمانو بەتایبەتی ئەوانەی

بادینان قوربانیی گەورەیان بەختکرد.

بەمجۆرە تووشی زیانێکی تر بووین بێ ئەوەی لەوانە بپرسرێتەوە کەلەم زیانە بەرپرسن. پەیوەندیشمان لەگەڵ (ینک) پچڕاو هەڵوێستمان بووە چوونەپاڵ لایەنی (پارتیو حسک)و لەوکاتەدا (ینک) هەڵوێستی دژایەتی هەموانی گرتەبەرو ساسۆژێکی بۆ ڕژێمی دیکتاتۆریی شۆڤێنی ئەنجامداو شەڕی توند لەنێوان مەفرەزەکانمانو هێزەکانی (ینک)دا ڕوویداو قوربانی زۆرترمان پێشکەش کرد

# گۆڕینی شوێنەکەمان بۆناو هەرێمی کورستانی عێراق لەناوچەی لۆلان

پاش شەڕەکەی (پشتئاشان)ی دووەم دەستمان بەلێکۆڵینەوەی بارودۆخەکە کردو بارەگامان لەهەرێمی کوردستانی ئێرانەوە بگوێزینەوە بۆ ناوهەرێمی کوردستانی عێراق، بەتایبەتی دەسەلاتی ئێرانی دوای شەڕە دۆڕاوەکانیان کەبەهاوکاری (پارتی) لەدژی هێزەکانی عێراق کردیان. کەوتنە زەبر خستنە سەرمان بۆ ئەوەی لەناوچەکە دەرچین، ئێمەش دەستمان بەگەڕان کرد بۆشوێنێکی گونجاو ئیتر ناوچەی (لۆلان)مان هەڵبژارد کە ناوچەیەکی چۆڵ بوو خەڵکەکە کۆچیان کردبوو گوندەکان بەتەواوی کاولکرابوون، ئێمە چووینە گوندی(ماڵی مەلا)و پارتیش لەشوێنێکی نزیکمان و هەروا دەستەی (پ.ك.ك)، لەو ناوچەیە چەند بنکەیەکمان دامەزراند، هەروا بۆ ئیستگەی ڕادیۆکەمان‌و چاپەمەنیمان. لەم ناوچەیە گژوگیای بەسودمان دۆزییەوەو زۆریش، قارچك‌و دۆمەلانی تێدا هەبوو، لەباشترین جۆرەکانیان لەو ناوچەیە دەڕوان، بەچەقۆ دەمانبڕین، ڕەنگیان زۆر سپی بوون، دوای هەربارانێکی بەهارە لەژێر ڕووەکی گەلاپاندا دەردەچوون، ئێرانییەکان بۆ ئەم ناوچەیەو بۆکۆکردنەوەی ئەم خۆراکە دەگمەنە دەهاتن‌و بەولاخ دەیانبردنەوەو لەسندوقی تایبەتیان دەنان و بەنرخی گران دەیانفرۆشتنەوە، ئێمەش لەم خۆراکەمان بۆ هەموو بارەگاکانمان دەناردو لەوەرزی خۆیدا ڕۆژانە سێ ژەممان لێ دەخواد، وێڕای ڕووەکی بەکەڵکی تر کە لەسەریان دەژیاین و لەچێشتلێناندا بەکارمان دەهێنان. هەروا ناوچەکە زۆر هەنگوێنی تێدا بوو کە جوتیاران دوای کۆچیان لەدێهاتەکانیان بەجێیان هێشتبوون. ئێمە بڕێکی باشمان لەو هەنگوینە دەستدەکەوت هەروا بزنەکێوی لەم ناوچەیە بەڕانی بچووك دەژیان بەلام بۆمان ڕاونەدەکران هەرچەندە لەسەر بەرزایی چیاکانەوەو لەئاقاری ماوەی تفەنگ هاویشتندا تێپەڕ دەبوون، هەندێ جاریش ئەم ڕانە بچوکانە بەنزیکماندا تێپەڕ دەبوون.

کۆبوونـەوەی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حزبـی شـیوعی عێراقمـان بەسـتراو لـەم کۆبوونەوەیەدا بڕیـاردرا هـاوڕێ (ئەبوسـەلام) بـانگ بکـرێو لێپرسینەوەی لەگـەڵ بکرێو بڕیاری سـزادانی بـدرێو بڕیـاردرا لـەحزب دەربکـرێ چـونکە دەسـتەبەش و ڕێکخراوێکی تایبەتی بۆخـۆی پێکهێنـا، هـەروا بڕیارمانـدا لەناوچـەکە بیهێڵینـەوەو ناردمانـە لای ڕێکخـراوی (حـدکا) لەناوچـەی خواکـورك بـەلام لـەوێ نەمایـەوەو گەڕایەوە بۆ ناوچەی سلێمانیو وای بلاوکـردەوە گوایـە لەبەنـدیی حزبـی شـیوعی ڕایکردوە. هەروا لێپرسینەوەی کەسانیتر کراو لێکۆڵینـەوەیان لەگـەڵ کـرا چـونکە لەکاتی گیرانیاندا لەلایەن دەزگـای ئـەمنی ڕژێمـی دیکتـاتۆرەوە هەڵوێستیان لاواز بـووە. دوای ئـەم کۆبوونەوەیـە بـەپێ و بـەناو تورکیـادا سـەفەری سوریام کـرد، لـە(لـۆلان)ەوە کـە بنکەکـەمانی لێبـوو بـۆ بنکەکـەمان لـە بادینـان ڕۆیـشتین و لەوێشەوە مەفرەزەی ڕێگامان بەسـەرکردەیی هـاوڕێی کرێکـار(ئەبوهـدیل) خۆیـان بۆسەفەری سوریا بەخاکی تورکیادا ئامادەکرد کە ڕێگەیەکی درێـژو مەترسیدارەو لـەوێوە دەبـێ لەهـەر کاتێکدا ئامـادەی شـەڕبیت لەگـەڵ جەندرمـەی تـورکی.

لەبارەگای بادینان هاوڕێ (دایکی بەهار) هاوسەری ئـەبوفاروق خرایـە نـاو لیـستی سەفەرکاران، بەهاوڕێم ڕاگەیاند کە ئێمـە دەبـێ بـەپیادەیی ڕێگەکـە ببڕین گـوتی ئەوە دەزانمو لەو پیاوانە کەمتر نیم. دوای دووشەو گەیشتینە دواگونـدی عێراقـی (گوندی سەنات) شەو لەوێ ماینەوەو بەیانی زوو ڕوومانکردە تورکیـا، هاوڕێیـەکی حزبی (کوك) لەگەڵماندا بوو وەك ڕێـزان بەچـاکی شـارەزای ڕێگەکـە بـوو. بـەنزیك سنوری هەرێمی کوردستانی عێراقدا دەڕۆیشتین. کاتێـك لەشـەودا سـەردەکەوتینە سـەر چـیاکان شـاری زاخۆمـان دەبینـی، ڕۆشـنایی شـارەکەمان لێـوە دیـاربوو، دووشـەوی دیکـە بـەناو تورکیـادا ڕۆیـشتین تاگەیـشتینە چـیای (جـودی) بـەم چـیابەرزەدا تـانزیکی لوتکـە سـەرکەوتین، هاتنـەخوارەوەشمان بـۆ نـاو دۆڵەکـە نزیکـەی چـوار سـەعاتی پێـچوو، لـەم بەرزاییـەوە شـارەکان و دەشـت و کێڵگـە چێندراوەکان و ڕووبارەکـان دەبینـران بەتایبـەتی ڕووبـاری دیجلـە وەك جـوانترین دیمەنی سروشت دەهاتنە بەرچاو. وێڕای ئەوەش خۆشـیمان لـەم دیمەنـە جوانانـە نەدەدی، چونکە تـەنیا دەمانویـست ماوەکـان بـبڕین و بـەهێمنی لـەخاکی تورکیـا

تێپەڕبین و لەشوێنی مەترسیدار دوورکەوینەوە تا لەپێکدادانی چەکداریی بەدوور بین کە نەشماندەزانی ئەنجامی چۆن دەبێ.

هاتینە خوارەوە بۆ ئەو دۆڵە قوڵەی چیای مەزنی جودی دەوریداوەو تاقە یەك ڕێگاهەیە کەبیگەینێ‌و بۆدەرچوونیش تاقە یەك ڕێگە هەیە جا ئەگەر ڕێگەی سەرکەوتن‌و ڕێگەی دەرچوونیان لێگرتین ئەوکاتە لەناوچوون دەبێتە شتێکی حەتمی، بەڵام جەماهیری ناوچەکە لەدێهاتی کوردستانی تورکیا ئێمەیان دەپاراست و لەم دۆڵەدا سێ شەو ماینەوەو دەبوو ئێوارە دوای خۆرئاوابوون کاتێك تاریکی دادێت لەم دۆڵە دەرچین و بەرەو ناوچەی (سلۆپی) لەهەرێمی کوردستانی تورکیا بکەوینەڕێ کە دواشارەدێ بوو لەسەر سنووری تورکیاو عێراق لەبەرامبەر شارەدێی زاخۆ لەهەرێمی کوردستانی عێراق. هەرجارێك دەرچوون لە دۆڵەکەو گەڕانەوە بۆ ئەوێ شەش سەعاتی پێدەچوو چونکە هاوڕێیانی (کوك) ئامرازی تێپەڕبوونیان لەشەقامی نێودەوڵەتی نێوان عێراق و تورکیا ئامادە نەکردبوو. لەجاری پێنجەمدا پێشنیازم کرد لەگەڵ دایکی بەهار لەمەفرەزەکەی ڕێگا جیابینەوەو هەوڵبدەین لەڕووباری دیجلە بۆبەری سوریە تێپەڕین‌و پێشنیازەکەمیان پەسەند کردو سواری (تراکتۆرێك) بووین بۆشارەدێی سلۆپی و دایکی بەهارو منیان لەدەرەوەی شار هێشتەوەو ڕۆیشتن تاجێگەیەکمان بۆئامادە بکەن کە شەولێی بمێنینەوەو دوای نزیکەی دوو سەعات هاوڕێی ڕێبەر گەیشتەوە لای ئێمەو بردینی بۆ ماڵێك‌و شەو لەوێ ماینەوە، واپێدەچوو خاوەن ماڵەکە پێیان خۆش نەبێ کە ئێمە لەوێبین، تائێوارە لایان ماینەوەو ئینجا بردینیان بۆ ماڵێکی تر کەخانوویەکی داڕوخاوبوو یەك ژووری تێدابوو بۆ ژن و مێردێك، ژنەکە ڕۆیشتە ماڵی باوکی و مێردەکەی سەعات چوار بۆماڵەوە گەڕایەوەو تەماشای کرد من لەسەر زەوی جێگەم ڕاخستووەو دایکی بەهار لەسەر چرپایەکە نوستووە تێگەیشت کە ژنەکەی لەماڵەوە نییەو ڕۆیشتووە بۆ ماڵی باوکی بۆیە دەرگاکەی داخست‌و ڕۆیشت‌و ماڵەکە–ژوورەکە لەسەر ڕێگەی هاتووچۆی خەڵك بوو لەم (ماڵەدا) ئاودەست نەبوو، بۆ توالێت دەچووینە ژوورە ڕووخاوەکەی تر، بۆ ئێوارەی ڕۆژی دووەم بەئۆتۆمبیل لەڕێگەی نێودەوڵەتی دەربازیان کردین‌و

لەئۆتۆمبیلەکە دابەزین‌و ماوەی چارەکە سەعاتێك بەپێ ڕۆیشتین‌و لەڕێگەکە دوورکەوتینەوە ئینجا ڕووناکی لایتی تراکتۆرێك دەرکەوت‌و سواربووین‌و دوولاوی حزبە کوردستانییەکانمان لەگەڵ بوون ئەوانیش دەیانویست بچنە سوریا قاچاغچییەکە (بەناوی خواستراو)ی (مەلا عەلی) ڕێبەرمان بوو، لەتراکتۆرەکە هاتینە خوارەوەو ماوەی نیوسەعاتێك بەپێ ڕۆیشتین‌و گەیشتینە سەر ڕووباری خابوور، بەپێلاوو جلەوە تێیکەوتین‌و ئاو تاپشتێنەمان دەهات. پاش ئەوەی بۆماوەی دە دەقیقەیەك بەتەنیشت ڕووبارەکەدا ڕۆیشتین مەلا عەلی پێیگوتین لەناو ئەم دارودەوەنەدا خۆتان بشارنەوەو مەبزوون‌و قسە مەکەن، لەوکاتەدا گوێمان لەوەڕەی سەگی پاسەوانیی سوپای عێراق بوو، سەگەکان لەبەرامبەر جێگەی خۆشاردنەوەماندا ڕاوەستان‌و سەربازە پاسەوانەکان هاتنە جێگەی سەگەکان‌و دە دەقیقە ڕاوەستان‌و وەڕینی سەگەکان کەمبوونەوەو یەکێکیان گوتی وابزانم سەگەکان هەستیان بەجوڵانەوەی ڕەنگە بەرازەکێوی کردبێت لەم شوێنەدا ئیتر ڕۆیشتن‌و سەگەکانیان لەگەڵ خۆیان ڕاکێشان پاش چەند دەقیقەیەك لە ڕۆیشتنیان مەلا عەلی‌و یارمەتیدەرەکانی کەشتییەکیان ئامادەکرد کە دەبێ بۆناو ئاوەکە دابەزێندرێ کە ئێمەش سواری بووین تەماشامان کرد کەڵەکێکیان لەچووپی پێچکەی ئۆتۆمبیلی گەورە یان تراکتۆر ئامادەکردووەو چووینە سەر پارچە تەختەیەکی گەورە کەبەچاکی لەسەر چووپەکان بەستراوەتەوەو بەڕووباری خاپوردا شۆڕبووینەوە بۆ دەجلەو ڕووناکی بەهێزی پرۆژەکتۆرەکان کەبەسەر ڕووباری ئاوی دەجلەدا درابوو پەستی کردین وچاودێر سێبەری هەرجوڵەیەکی لەئاوەکەداو لەسەر خاکی سوریی بەری ئەوبەری دەجلە دەدی‌و ئێمەش بەهێزو هێمنی سەوڵمان لێدەداو لەشمان تاپشتێنەمان تەڕبوو. کاتیش سەرەتای پایز بوو هەستمان بەجۆرێك لەسەرما دەکردو تەنانەت من چاکەتم داکەندو دامە دایکی بەهار چونکە لەسەرماندا هەڵدەلەرزی، بەرەبەیان گەیشتینە سەر خاکی سوریەو ڕوومانکردە خاڵێکی پۆلیسی سنور کە هێشتا نووستبوون خەبەرمانکردنەوەو

گەیاندینیانە شارەگوندی سەرسنووری نێوان سوریاو عێراقو تورکیا بەناوی (الیعربیة)[١٤] ئینجا ئۆتۆمبیلی پۆلیسی سوری لەقامشلییەوە هاتو ئێمەی گەیاندە قامشلی.

ڕێڕەوەکەمان درێژ بوو بەتایبەتی بەناو چیا سەختەکانداو لەبەر مەترسی پێکدادان لەگەڵ دەوریەکانی تورکیدا. پاش چوار ڕۆژ لە گەیشتنمانە شام مەفرەزەی ڕێگا گەیشتە خاکی سوریەو ئەپارتومانێکی تایبەتییان بۆ ئامادە کرابوو کە گشت کەلوپەلێکی نووستن وئامادەکردنی خۆراك و تەلەفزیۆن و شتی وای تێدابوو تا ئەم ئەپارتومانە بۆ کاتی هاتنیان و ڕۆیشتنیان لەشام لەژێر دەستیاندا بێت چونکە ئەرکەکەیان گەورەو گران بوو ماندوو دەبوون لەبەر ئەوە دەبێ مەفرەزەکە بحەسێنەوە تا بەچالاکی ئەرکەکەیان جێبەجێ بکەن بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند تاکەوتە داوی دزەکردنی جاسوسو خەبەرلێدان لەکاتی گەڕانەوەیاندا لەسوریاوە بۆ هەرێم کە ئەوەبوو کەوتنە بۆسەی هێزەکانی عێراقەوەو هەموویان شەهید بوون جگە لەدکتۆر ئەبو زەفەر کەبەبرینداری بەدیلگیراو هاوڕێ ئەبو ئەفکار کە توانی لەبۆسەکە ڕزگاری بێتو بگاتەوە بنکە بەمجۆرە پەردە بەسەر مەفرەزەی ڕێگادا دادرایەوەو جارێکی تر سەرلەنوێ پێك نەهاتەوە.[١٥]

(١٤) مەبەست شارەگوندی (دێریك)ـە کەناوەکەی کراوە بەعەرەبی (الیعربیة) -وەرگێڕ-.

(١٥) ئەم زانیارییەش ورد نییە، دوای ئەم کارەساتە دڵتەزێنەی بەسەر (مەفرەزەی ڕێگادا) هات، هاوڕێیان کۆڵیان نەداو لەسەر کارە پڕ لەقارەمانێتییەکەیان بەردەوام بوونو خۆمو هاوڕێ (ابو حسن) سەرپەرشتی هاتوچۆیانمان کردووەو جارەهای جار چەكو هاوڕێیانیان گەیاندووەو، لەکوردستانیشەوە هاوڕێیانیان گەیاندۆتە قامیشلیو لەم کارانەو کارەکانی پێشووشدا، دەبێ ئەو ڕاستییە بڵێین کەهاوڕێیانی حزبە کوردستانییەکانی باکوور زۆر هاوکاریان کردووین، بەتایبەتی هاوڕێیانی (کوك) و (کوکسی)و (دەقەدە)..تاد. -وەرگێڕ-.

# شەڕی عێراق-ئێران

پەیوەندییەکانی نێوان ڕژێمی دیکتاتۆرو ڕژێمی شای ئێران پەیوەندیی هاوکاری بوون بەتایبەتی دوای ڕێکەوتنەکەی جەزایر کە سەدام دەستبەرداری نیوەی شط العرب بوو بۆئێران بەرانبەر بەوەی شا دەستبەرداری پەیوەدی بێت لەگەڵ شۆرشەکەی هەرێمی کوردستانی عێراق، سەدام حسێن بەڵێنیشی دابوو کە لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق پەیوەندیی بپچڕێتو پەیوەندیی بەرەیی لەگەڵ حزبدا هەڵوەشێنێتەوەو دەست بە بەربەرەکانی حزب بکاتو هێرشێکی تیرۆری بکاتە سەر.

پاش ئەوەی ڕژێمی شا لەئەنجامی ڕاپەڕینەکەی گەلی ئێراندا داڕماو لەبەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لەئێراندا درا. ڕژێمی عێراق بەپشتیوانی ئەمریکا هەوڵیدا دەرفەت لەهەڵوەشاندنەوەی دەزگاکانی بەرگریو بەتایبەتی سوپای ئێرانی وەربگرێت بۆ وەرگرتنەوەی ئەوەی لە شط العرب لەدەستی دابوو، هەروا بۆ دەستگرتن بەسەر ناوچەی ئەهوازی عەرەبی پڕ لەنەوت لەئێراندا تابخرێتە سەرعێراق، ئەمەش بەپێی سیاسەتی دەستبەرداربوون لەکاتی لاوازیداو گێڕانەوەی ئەوەی دەستبەرداری بوویت لەکاتی بەهێزبووندا. بەڵام هەموو حیسابەکانی سەدام بەتەواوی هەڵەبوون چونکە هەموو گەلی ئێران شۆڕشی بەرپاکرد بۆ لەناوبردنی ڕژێمی دیکتاتۆیی شاو ئامادەشبوو بەرگریی لە نیشتمانەکەی و لەئەنجامەکانی شۆڕشەکە بکات، لەبەر ئەوە بوو تەماشات دەکرد تەواوی گەلی ئێران تەقەلای شەڕی بەرگریی بەپیاووماڵو خۆراك ئامادە دەکرد.

هەڵوێستی حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق لەدژی ڕژێمی دیکتاتۆریی شۆڤێنی بوو، لەدژی ئەو شەڕەی بوو کەبەرانبەر ئێران بەرپای کردو پێشتر مەکتەبی سیاسی حزب بروسکەی پشتیوانی و لایەنگیریی بۆ شۆڕشی ئێران ناردو هەروا بەیاننامەیەکی دەرکرد کەشەڕی دەستدرێژی سەدامی دژبە ئێران تاوانبارکرد بەڵام لەناو سەرکردایەتی حزبدا هەندێ بیرورا دەرکەوتن کە داوای ڕاوەستانیان دەکرد

لەپاڵ سەدامداو لەدژی ئێران ئەمەش بەبیانوی نیشتمانپەروەری‌و لەبێشەوەی ئەوانەدا باقر ئیبراهیم (ئەبوخولە)و زەکی خەیری (ئەبویەحیا). ئەبوخولە دەستی کردە کۆکردنەوەی خەڵك لەدەوری خۆی‌و لەدژی سیاسەتی حزب، چەند جارێکیش لەسەر کردەوەی ناڕێکخستنی‌و دەستەبەش دروستکردن لێپرسینەوەی لەگەڵ کراو پێمان ڕاگەیاند کە ئەوکردەوانەی دەبنە مایەی کەرتکردنی حزب‌و دەتوانێت بچێتە کۆڕی کێشەیەکی ناوخۆوە بەشێوەیەکی مەبدەئی‌و ڕێکخراوەیی، بەڵام ناکرێ جڵەو بۆ کردەوەی لیبراڵی شۆڕ بکات لە دژی زەبت‌وڕەبتی حزبی.

بەڵام سنوری بۆ خۆی دانەناو لەسەر کارو چالاکی دەستەبەش‌و کەرتکاری درێژەی دا بۆیە لەمەکتەبی سیاسی بڕیارماندا لەحزب دەربکرێ. بەڵام (ئەبویەحیا) بەتوندی لێپرسینەوەی لەگەڵ کراو دانینا بەچالاکی لیبراڵییانەی خۆیداو پەیمانیدا بیروڕای خۆی لەناوحزبدا بهێڵێتەوە، لەبەر ئەوەبوو لەناوحزبدا مایەوەو هەموو مافەکانی ئەندامەتی هەبوو.

لەئەنجامی نەبەزینی گەلی ئێرانداو بەرگریی لەنیشتمانەکەی کە زیانێکی گەورەی بەهێزەکانی ڕژێمی دیکتاتۆری عێراق گەیاند سەرۆکی ڕژێم ناچار بوو شەڕ ڕاگرێت‌و، لەلایەن خۆیەوە کۆتایی بەشەڕ بهێنێت، حزبی ئێمەش پشتگیریی کۆتایی هاتنی ئەم شەڕە گلاوەی کردو بەتوندی ڕژێمی بەهەڵگیرساندنی تاوانبارکرد بەبێ ئەوەی هیچ بیانوویەکی هەبێت جگە لەخواست و حەزی دیکتاتۆر بۆ دەستدرێژی کردنە سەرو دوژمنایەتی و حەزی دەسەڵاتگرتن بەسەر سەرچاوەکانی نەوتدا لەناوچەکەدا بەونیازەی دیکتاتۆر ببێتە ئیمپراتۆرێکی نەوتین لەناوچەکەداو لە کەنداوداو ئەوجا لەسەر ئەم بنچینەیە لەگەڵ دەوڵەتانی سەرمایەداری و دنیا مامەڵە بکات‌و دەسەڵات و نفوزی خۆی بەسەر وڵاتانی عەرەبدا بکێشێت‌و بەزەبری هێز بەیەکبوونی عەرەب بێنێتەدی بێ ئەوەی گوێ بداتە تایبەتمەندییەکان‌و خاسیەتە مێژوویی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتییەکان کەلەهەر وڵاتێکی عەرەبیدا لەقۆناغی مێژوویی درێژخایەندا پەیدابوون.

سیاسەتی ڕژێمی دیکتاتۆریی لەبواری ڕاگەیاندندا کەپشت بەدیماگۆگی فاشیستی دەبەستێت، هەموو تێکشکان‌و بەزین‌و ژێرکەوتنێك بە(سەرکەوتن‌و

توانابوون) دادەنێت لەبەر ئەمە زووڕناژەنەکانی پروپاگەندەی ڕاگەیاندن کەوتنە دەهۆڵ لێدان بۆ ئەو سەرکەوتنەی لەشەڕەکەدا بەسەر ئێراندا هێناویانەتەدی‌و لەگۆشەی (تواناداریەوە) شەڕەکەیان ڕاگرتووە نەك لەبەر لاوازی و بەزین، لەبەر ئەوە گشت هێزی داپڵۆسێنەرو تیرۆریستانەی خۆیان لەدژی گەلی کوردو شۆڕشەکەی خستەکارو، چەکی کیمیایی لەزۆر ناوچەی کوردستان بەکارهێنرا، لەهەڵەبجەو بالیسان و بادینان و شەڕی ئەنفالیش ڕاگەیەندراو پرۆسەی شۆڤێنیزم دەستپێکرا لەوێڕا کە دەستکرا بە بەعەرەبکردنی ناوچەی کەرکوك و ناوچەکانی ترو بارپێکردنی دانیشتوانی کورد بۆ ناوچەکانی ناوەڕاست و باشورو زۆرکردن لەهەندێ عەرەب کە جێگەی ئەو بارپێکراوانە بگرنەوەو ژمارەیەکی زۆری تریش تەماعیان خرایەبەرو یارمەتی دران تابینە ئالاتی سیاسەتی شومی کۆچبەری‌و تەعریبو، خەڵك بەکۆمەڵ دەکوژرانو لەگۆڕی بەکۆمەڵدا دەنێژرانو، ژمارەی ونبووەکانی شەڕی ئەنفال گەیشتە سەدو هەشتاو دوو هەزار کورد، لەئافرەتو پیاو، لەپیرو بەساڵاچوانو لاوان و منداڵان کەبەزیندوویی لەو چاڵانە دەنران کە پێشەکی بۆ ناشتنی هەموویان ئامادە کرابوون.. لەبۆنەیەکدا سەدام گوتی"گەلی کورد دەزانێت چۆن مافەکانی وەدەستبێنێ، بەڵام تەحەدایان دەکەم کە یەکگرن.."

# بەڕاستی کارکردن بۆ پێکهێنانی بەرەی کوردستانی

وتە دەربڕینەکەی سەدام پشتی بەوە بەستبوو کەلەنێوان حزبە کوردستانییەکاندا دووبەرەکیو پەرشو بڵاویو کێشەی ناوخۆیی تەشەنەی سەندبوو، بەتایبەتی کێشەی دوژمنانەی نێوان (پدك و ینك)و لەنێوان ینك و هەموو حزبە کوردستانییەکانو حزبی شیوعیو بەتایبەتی پاش ڕووداوەکانی پشتئاشانو کەرتبوونەکانی ناو ریزەکانی (پدك)و سۆسیالیست. ئەوەبوو سامی عەبدولڕەحمان لەپارتی دیموکراتی کوردستان جیابۆوەو (حزبی گەل)ی دامەزراندو، کاك قادر عەزیز لەسۆسیالیست جیابۆوەو حزبی زەحمەتکێشانی دامەزراند، وێڕای ئەوەش لەو کاتانەدا بارودۆخەکە بەرەو ئەوە دەچوو پەیوەندییەکان چاکبن، یان هەستکردن بەبەرپرسی بەرانبەر بارودۆخەکە ببزوێت کەبەڕەوتێکی سەلبیدا لای (پدك و ینك)و حزبە کوردستانییەکانی تر دەرۆیشت. وەفدێکی ینك سەردانی بارەگای پارتی کرد لەراژانو پێدەچێ ئەوە دەستپێشخەرییەکی سەرەتایی بێت بۆپاشبوونی پەیوەندی، منیش دەستپێشخەریم کردو نامەیەکم بۆ مام جەلال نووسیو داوام لەکاك عەلی عەبدولا کرد بیگەیەنێتە مام جەلال چونکە دوای ڕووداوەکانی پشتئاشان پەیوەندیمان پچڕابوو، لەو نامەیەدا پشتیوانی دەستپێشخەرییەکەیم کرد کە وەفدی بۆ بارەگای پدك ناردبوو، لەنامەکەدا نووسیبووم من وا تەماشات دەکەم کە تۆ ئەو قوتابییە گچکە بزێوو شەڕانییەی بەلأم زیرەکیت تەنانەت کاك عەلی عەبدوللا داوای کرد بەوجۆرەی بۆ نەنووسم بەلأم پێمگوت هەڵسوڕانی ئێستای مام جەلال لەسیاسەتدا ئێستاکە درێژەپێدانی هەڵسوڕانی ئەو کاتەیەتی کە بچوك بوو. پاش ماوەیەك مام جەلال نامەیەکی بۆ هاوڕێ عەزیز نووسیبوو لەوێدا گوتبووی کەریم ئەحمەدی مامۆستام ئاوهام لەسەر دەنووسێ لەکاتێکدا ئێستاکە من لەتەمەنی گۆڕباچۆڤدام.

هەر لەوڕۆژانەدا سەدام قسەو باسێکی زۆری لەدژی بزاڤی ڕزگاریخوازیی

كوردستان گوت بەوەی كە یەكناگرنو تەحەدای كورد دەكات كە یەكبگرن. بەكاك مەسعودو ئیدریسی كۆچكردووم گوت دەبێ ئێمەش تەحەدای سەدام بكەین بەوەی هەوڵبدەین بۆ هێنانەدی بەرەی كوردستانی، كاك مەسعود گوتی جاچۆن كار لەگەڵ (ینك)بكەین كاك ئیدریس گوتی قەناعەت پێكردنی (ینك بۆمن دابنێنو سەفەر بۆ بارەگای مام جەلال دەكەم) ڕێگەی خۆشكرد بۆ باشبوونی پەیوەندیو چاری ناكۆكییەكانو ئێمەش دەستخۆشیمان لەتەقەلاكانی كاك ئیدریس كردو ئەوەبوو بەرەو بارەگای یەكێتی ڕۆیشتو لەوێ زۆر بەگەرمی لەلایەن مام جەلالو سەركردایەتی (ینك)ەوە پێشوازیی لێكراو، لەوكاتەوە پەیوەندی بەرەوباشبوونی بەردەوام دەچوو، مام جەلال دروشمی كاركردن لەپێناو هێنانەدی ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینەو دامەزراندنی بەرەی كوردستانیدا خستە پێشەوە.

بەپێویستمزانی كە كۆششێكی فكری وسیاسی ئەنجام بدەم بۆ ڕوونكردنەوەی ئۆتۆنۆمیو بەرەی كوردستانی و وتارێكم نووسی بەسەردێڕی (كام ئۆتۆنۆمیو كام بەرەی كوردستانیمان دەوێت) دەمەوێ لێرەدا لەبیرەوەرییەكانمدا ئەم وتارە بڵاوبكەمەوە بۆ ئەوەی گەلەكەمان لەمەسەلە نەتەوایەتیو نیشتمانییەكەیو لەهەڵوێستی ئێمە لەم مەسەلەیە ئاگاداربێ.

# کام ئۆتۆنۆمی‌و
# کام بەرەی کوردستانیمان دەوێ ؟

**لەنووسینی هاوڕێ کەریم ئەحمەد**

*مەسەلەی کورد لەپێش‌و لەدوای شەڕی جیهانیی یەکەم، شوێنێکی گرنگی لەباروبۆخی نێودەوڵەتیدا داگیرکردووەو، شارەزایانی دەوڵەتانی ئیستیعماری دەهاتنە سێ پارچەی کوردستان و لەباروبۆخەکەیان لەلایەنی جۆربەجۆری ئابووری‌و سیاسی‌و سوپاییەوە دەکۆڵینەوەو، راپۆرتە درێژەکانیان بۆ حکومەتەکانیان دەنارد تا لەهێنانەسی بەرژەوەندیەکانیاندا سودیان لێوەربگرن. دوای شەڕی جیهانیی یەکەم‌و ڕووخاندنی ئیمپراتۆری عوسمانی‌و دابەشکردنی ولاتە ژێردەستەکانی، لەنێو دەوڵەتانی هاوپەیماندا بەپێی پەیمانی سایکس بیکۆ، مەسەلەی کورد گەیشتە کۆمەڵەی نەتەوەکان‌و، لەوێدا بڕیاردرا دەوڵەتێکی کوردی لەبەشەکانی کوردستاندا دابمەزرێ، لەوبەشانەیدا کە لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون (کوردستانی تورکیاو عێراقی ئەمرۆ)، ئەمەش بەگوێرەی پەیمانی سیڤەر. بەلام دوای سازشکاریی دەوڵەتە ئیستیعمارییەکان لەگەڵ حکومەتی تازەی تورکیا بەسەرکردەیی مستەفا کەمال و دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لەژێر دەسەلاتی ئینگلیزدا کوردستانی عێراق خرایە سەر دەوڵەتی عێراق، ئالەم قۆناغەی خەباتی گەلی کوردا مەسەلەی کورد ئالۆزبوو، خەبات لەپێناو هێنانەدی حکومەتی کوردی لەعێراق‌و توریاو ئێران دەستی پێکرد، هەریەکەشیان بەجیاواز جا ئەم تێکۆشانەش کەلەراپەرین‌و شۆرشەکاندا بەرجەستەبوو سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، ئەمەش لەبەر هەندێ هۆکاری خۆیی، کەپەیوەندن بەجولانەوەی نەتەوەیی کوردەوەو لەپێش هەموو شتێکدا سروشتی چینایەتی سەرکردایەتییەکانیان و مانەوەیان لەشوێنی سنورداراو نەبوونیان بەبزووتنەوەیەکی جەماوەریی بەرفراوان وێڕای هۆکاری تر کەهاوپەیوەندن لەگەڵ پارسەنگی هێزەکان لەناو هەر ولاتێکداو لەسەر شانۆی نێودەوڵەتان‌و سازشکاریی کۆنەپەرستیی کورد لەگەڵ فەرمانڕەوایانی کۆنەپەرستی تورکیاو عێراق‌و ئێران.*

دوای ئـەوەی کۆمـاری تورکیـا دامـەزراو حکومـەتی پاشـایەتی لـەعێراق دامـەزرا، کوردستان بوو بەبەشێك لەو حکومەتانەو مەسەلەی کوردیش بووە بەشێك لەبزاڤی نیشتمانیو دیموکراتی دژی ئیستیعمارو حکومەتە کۆنەپەرستەکانو مەسـەلەی چارەکردنیشی چووە ناو قەوارەی دەوڵەتە فرەنەتەوەکانو ئالێرەشەوە مەسەلەی کورد چووە قۆناغێکی تازەوەو سروشتی نوێی گرتەخۆ.

حزبی ئێمـە، حزبـی شـیوعی عێـراق هـەر لەدامەزراندنییـەوە لەسـەر بنـەڕەتی مەبدەئەکانی مارکسیزم-لێنینیـزم مـافی بڕیـاردانی چارەنووسـی بـۆ گـەلی کـورد لەعێراقدا بەمافی لەدامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆی خۆیدا بڕیـاردرا. پشتگیریی ڕاپەڕینە نەتەوەییەکانی کردو پشتیوانی خەباتی گەلی کـوردی لەگـشت پارچەکانی کوردستاندا کـرد لـەدژی چەوسـانەوەی نەتـەوەیی و لـەپێناو یـەکێتی نەتەوەییدا. لەکاتێکدا کـە حزبـی ئێمـە ئـەم مافـە سروشـتییانەی دانپێـدانا پێـی لەسـەر ئـەرکی یـەکگرتنی هێزەکـانی هـەردوو گـەلی عـەرەبو کـوردو کەمینـە نەتەوەییـەکان داگـرت لـەدژی ئیـستیعمارو حـوکمی پاشـایەتی کۆنەپەرسـتو دەرەبەگی ولەپێناو دامەزرانـدنی ڕژێمـی حـوکمێکی نیشتمانیو دیمـوکراتی. لـەم قۆناغـەدا حزبمـان بەرنامەیـەکی نەتـەوەیی دیمـوکراتی هێنایـەناوەوە کـە لەگـەڵ ئامادجە نیشتمانییەکان دەگونجاو هێزە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانیشی دەگرتەخۆ کەسوپای سیاسی ئەوتۆیان پێکدەهێنا توانای هێنانەی ئەو بەرنامەیەی هەبێت. ئەم بەرنامەیەش ئۆتۆنۆمی بوو کە گشت هێـزە دیمـوکراتی وپێـشکەوتنخوازەکان پەسەندیان کردو لەسەری کۆبوونەوە بەو پێیەی بەشێکە لەمەسەلەی دیموکراسی کە لەپێناویدا خەبات دەکەین.

حزبی ئێمە چاری هەستپێکراوی مەسەلەی کوردی لەگەڵ مەسەلەی دیموکراتیدا هاوپەیوەنـد کـرد بـەوەی کـە دوو مەسـەلەی پێکـەوە بەسـتراون ئـالێرەوە ئـەم دروشمەی بەرز کردەوە (دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان)ئەمـەش پـشتگیرییەکی فراوانـی کـرا چ لەلایـەن هێـزە نیـشتمانیو پێشکەوتنخوازەکانی گەلەکەمانـەوە بەگـشتی یـان لەلایـەن بزاڤـی نەتـەوەیی ڕزگـاریخوازیی کـوردەوە بەشـێوەی تایبـەتی کـە دەسـتی پێـوەگرتو بەدرێـژایی ئـەم قۆناغـەی مێـژووی

خەباتی گەلی عێراقمان بەعەرەب و کوردو کەمینە نەتەوەییەکانییەوە لێی لادەدا، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو چونکە گەلی کوردمان بەهۆشمەندییەکی قووڵەوەو بەو ئەزموونەی ژیان ڕاستییەکەی دەرخستبوو هەستی کردبوو کە مەسەلەکەی لەناخەوە هاوپەیوەندە لەگەڵ مەسەلەی هێنانەدی ڕژێمێکی دیموکراسی لەعێراقداو ئالێرەشەوە هێزەکانی خۆی لەگەڵ هێزەکانی گەلی عەرەب و کەمینە نەتەوەکان یەکدەخات بۆ خەبات لەپێناو هێنانەدی ئامانجە ڕەواکانیدا.

بەئەزموونی شۆڕشگێڕانەی زۆری هەستی کردووە کە بۆرژوای شۆڤێنی عەرەبی فەرمانڕەوا بەهیچ جۆرێك ناتوانێت ڕژێمێکی دیموکراسی بێنێتەدی بەمجۆرەش ناتوانێ حوکمی زاتی بۆ کوردستان بڕیارداو بێنێتەدی. هەروا بۆرژوای لیبراڵی عەرەبیش بۆی ناکرێ دیموکراتی و ئۆتۆنۆمی بێنێتەدی ئەگەرچی خۆی هەڵکێشێ‌و دروشمی فریودەرانە بێنێتە کایەوە وەك "برابەشی عەرەب و کورد لەنیشتماندا و یەکسانی لەمافەکاندا".

دروشمی یەکسانی کە بۆرژوا بەبێ هیچ ناوەرۆکێك بانگەشەی بۆ دەکات ئامانجی تواندنەوەی مەسەلەی نەتەوەییەو درێژەپێدانی دەسەڵاتداری‌و چەوساندنەوەو هەژموونییە بەسەر نەتەوەی کوردا یەکسانی ڕاستەقینە بەپێی تێگەیشتنی مارکسی- لێنینی‌و ئایدیۆلۆژی پرۆلیتاریا مانای مافی گەلی کوردە لەبڕیاردانی چارەنووسیداو دامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆی هەروەك ئەوەی گەلی عەرەب هەیەتی.

بۆرژوای بیرۆکراسی‌و مشەخۆری شۆڤێنی فەرمانڕەوا تێگەیشتنی ئۆتۆنۆمی لەبارەی سیاسی‌و هزرییەوە شێواندو ئەم تێگەیشتنەی سڕییەوە بەجۆرێك لەپەیڕەوکردندا تەنانەت ناویشی نەما لەکاتێکدا لەهەلومەرجێکدا ناچاربوون دانیپێدابنێن کە پارسەنگی هێزەکانی ناوخۆو نێودەوڵەتان بەلای بەرژەوەندیی هێزە دیموکراتەکان‌و بزاڤی ڕزگاریخوازیی کورددا دەشکانەوەو ئەم دانپێدانانەش بنچینەیەك بوو بۆ مانێڤر بەئامانجی تێکدانی یەکێتی هێزە دیموکراتەکان لەوڵاتداو کەلاخستنی بزاڤی کوردی کەلەبواری کردەوەدا بووە هۆی گۆڕینی پارسەنگی هێزەکان بۆ بەرژەوەندیی حوکمی دیکتاتۆریی شۆڤێنی کە هێرشێکی داپڵۆسینی

دڕندانـەی دژی بزاڤـی دیموکراسـیو بزاڤـی ڕزگـاریخوازیی کـورد دەسـتپێکردو ئەمڕۆش هەندێ لەهێزەکان پەنایان بردۆتەبەر هەوڵدان بۆ تاواندنەوەی مەسـەلەی نەتەوەیی لەژێر دروشمە کۆسمۆپۆلیتەکانو بەڕووکەشی ئاینی، لەکاتێکدا ژیانو ئەزموونەکەی سەلماندوویانە کە هیچ کام لەدەسەڵاتەکان نـاتوانن دیموکراسـی بـۆ عێـراقو حـوکمی زاتـی ڕاسـتەقینە بۆکوردسـتان بێننـەدی جگـە لەدەسـەڵاتی ئێئتیلافـی نیـشتمانی دیموکراسـی کـە چـینی کرێکارتێیـدا ڕۆڵێکـی دەرکـەوتوو دەگێرێت. هێشتا هەندێ مێژو کەسان لە بزووتنـەوەیی کـورددا بەتـەمان بتـوانرێ حوکمی زاتی بەبێ خەباتی گەلی عێراقو هێـزە نیشتمانیو پێشکەوتنخوازەکانی لـەپێناو ڕووخانـدنی دیکتـاتۆریو هێنانـەدی حـوکمی ئێئتیلافـی دیموکراتیـدا بهێنرێتـەدی. هەوڵـدان بـۆ کـەلا خـستنی چـاری مەسـەلەی کـورد لەمەسـەلەی دیموکراسی هەروەك مەسەلەی گەلی کـورد سـەربەخۆبێ لەمەسـەلەی گـەلی عێراق نەك تەنیا زیان بەگشت بزاڤی شۆرشگێڕی لەوڵاتدا دەگەیەنێتو بەس بەڵکو هەروا بـەبزاڤی ڕزگـاریخوازیی نەتـەوەیی کـوردیو، دەبێتـە مایـەی بوژاندنـەوەی دەمارگرژیی نەتەوەیی و کوڕینی خەباتی دیموکراتی دژی شۆڤێنیزم بەکێشەیەکی نەتەوەیی نێوان عەرەبو کورد بۆ بەرژەوەندیی ئیستیعمارو شۆڤێنیزم.

بەمجۆرە ڕاکردن بەدوای واهیمەی نەتـەوەیی بـۆرژوای نووەپـەرێزدا لـەتوانادا نییە ببێتە یـەکێتی هێـزە نیـشتمانی و دیموکراسییەکان بـەڵکو دەبێتـە لیـدانیان بەیەکتری و، لێدانی بزووتنەوەی جەماوەری کە سەرەتای ڕابوونی لەکوردسـتاندا بەدیاردەکـەوتو، دواجـار پێـشکەشکردنی خزمـەتێکی خـۆڕایی بەدەسـەڵاتی دیکتـاتۆری خـۆی. ڕەنگـە زۆر پێویـست نـەبی ئـەوەش بگوترێتـەوە کـە چـاری مەسەلەی کورد بەچەشنێکی دیموکراتیو ڕەوا، کـە لەسـەر هێنانـەدی دیموراسـی لەوڵاتدا ڕاوەستاوە پێویستە پشت بەجەماوەری بـەرینی گـەلو بـەهاوکاری هێـزە نیـشتمانیو نەتەوەپـەروەرو پێشکەوتنخوازەکانی هـەرێمی کوردسـتان و هـەموو عێراق ببەستێ.

گەلی کوردی ئێمە لە تێکۆشانی درێژخایەن وسەختیدا لەپێناو مافـە ڕەواکانیـدا ئەزموونێکی زۆر دەوڵەمەندی کۆکردۆتەوەو هەڵوێستی گشت حزبە ناسیۆنالیـستە

بۆرژواکانی ناودەسەڵات و دەرەوەی تاقیکردۆتەوەو قەناعەتێکی چەسپاو لەلای پەیدا بووە کە چینێکی کۆمەڵایەتی نییەو حزبێکی سیاسی نییە بەکردەوە مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلی کورد بڕیار بدات جگە لەچینی کرێکارو حزبە شیوعییەکەی، ئەم چینەش لەپێناو رزگاربوونی خۆی لەکۆیلایەتی سەرمایە خەبات دەکات ئەوە هەروا خەباتیشە لەپێناو ڕزگاربوونی تەواوی کۆمەڵ لەهەموو شێوازێکی زۆرو جەورو چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی‌و نەتەوایەتی هەیشەیی، بزاڤی نەتەوەپەروەرو ڕزگاریخوازیی دیموکراسی کورد بەشێکە لەبزاڤی ڕزگاریخوازیی دیموکراسی‌و بەشێکە لەبزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازیی گەلانی جیهان، هاوپەیمانییەکی مەوزوعیشە بۆ چینی کرێکاری عێراق‌و ئەمەش لەبەرنامەکەی حزبی ئێمەداکە لەچوارەمین کۆنگرەی نیشتمانیدا لە ١٠-١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٨٥دا بڕیاردراوەو جەختی لەسەر کراوەتەوە کە دەڵێ: بزووتنەوەی نەتەوەیی‌و ڕزگاریخوازیی گەلی کورد بەبەشێك لەبزووتنەوەی دیموکراسی‌و شۆڕشگێڕیی‌و بەهاوپەیمانێکی بنچینەیی پرۆلیتاریای عێراق دادەنرێ لەخەباتدا لەپێناو هێنانەدی ئامانجە ستراتیژییەکانیدا. بزاڤی نەتەوەیی‌و ڕزگاریخوازیی گەلی کورد شوێنێکی دیاری هەیە لەخەباتی بزاڤی نیشتمانی‌و دیموکراسیدا لەپێناو دیموکراسی بۆ عێراق‌و ئۆتۆنۆمی بۆکوردستان.

بەرنامەکەی حزبمان ئەوەی دوپاتکردۆتەوە کە بزاڤی نیشتمانی و دیموکراسی گەلی کوردستان یەکێکە لە لقە گرنگەکانی بزاڤی دیموکراسی وڵاتەکەمان‌و جەماوەری گەلی کورد لەبەرگریکردنی چەوساندنەوەی چینایەتی و لەخەباتیدا لەپێناو داخوازییە دیموکراتییەکانیداو مافە نەتەوەییەکانیدا لەتێکۆشانێکی بێکۆڵداندا بووە، بەئاشتی و بەچەك، لەدژی ئیستیعمارو کۆنەپەرستی و دەرەبەگ. ئەمانە هەموی هۆشمەندی سیاسی و چینایەتییانی قوڵکردۆتەوەو پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەباتی جەماوەری عەرەب و کەمە نەتەوەکان پتەو کردووە و هەستی بەوە کردووە کە بەرژەوەندە نەتەوەیی‌و ڕزگاریخوازەکانی و ئامانجە سیاسییەکانی بەتەواوی لەگەڵ بەجێگەیاندنی شۆڕشی نیشتمانی‌و دیموکراتیدا دەگونجێن. جا لەگۆشەی ئەم ڕاستییانەوە دەبێ بنچینە

مەبدەئییەکانی ئۆتۆنۆمی ڕوون بکەینەوە بەمەبەستی ڕاوەستان بەڕووی ئەو شێواندنانەدا کەحزبە ناسیۆنالیستە بۆرژواکانی عەرەب پەنایان بۆ دەبەن و هەوڵدەدەن لەناوەرۆکی نەتەوەیی و دیموکراسی بەتاڵی بکەنەوە، ئەو بنچینانەش پشت دەبەستن بە:

یەکەم: دیاریکردنی سنوری جوگرافیی کوردستانی عێراق کە ئۆتۆنۆمی دەبێت و لەوناوچانەی کە کوردان زۆرینەی دانیشتوانن.

دووەم: هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسادانەر لە کەشوهەوایەکی ئازادیی دیموکراسییەکانداو لەوێشەوە دەسەڵاتێکی جێبەجێ کردن بێتە کایەوە کە لەبەردەم ئەنجومەنەکەدا بەرپرس بێت.

سێیەم: کەمینە نەتەوەکانی کوردستان مافی بەڕێوەبەریی ناوخۆیی و رۆشنبیری نەتەوەییان هەبێت.

چوارەم: پێکهێنانی ئەنجومەنێك بۆ کاروباری نەتەوەیی کەلەژمارەیەکی یەکسانی عەرەب و کوردو یەك نوێنەری هەر کەمینە نەتەوەیەك پێك بێت و ئەرکی ئەم ئەنجومەنە تەماشاکردنی ئەو ناکۆکییانە دەبێ کە لەنێوان هەیئەتەکانی ئۆتۆنۆمی و هەیئەتەکانی ناوەندا پەیدا دەبن،لەوانەش سەبارەت بەپەیڕەوکردنی یەکسانی لە پێشکەوتنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریداو بڕیارەکانی ئەم ئەنجومەنە بۆ جێبەجێ کردن دەبن.

پێنجەم: نوێنەرێتی گەلی کورد بەپێی رێژەی لەهەموو دانیشتواندا، لەهەیئەتەکانی دەسەڵاتی یاسادانانی ناوەندیداو نوێنەرێتی کردنی لە دەسەڵاتی جێبەجێ کردندا.

شەشەم: بڕیاردانی یاسایەکی بنەڕەتیی دیموکراسی بۆ ئۆتۆنۆمیی هەرێمی کوردستان لەسەر رۆشنایی ئەم بنەمایانەو لەدەستوری کۆماری دیموکراسی عێراقیشدا بەندێکی تایبەتی هەبێت بۆ مەسەلەی کوردو مەسەلەی ئۆتۆنۆمی و ئەو بنچینانەی لەسەریان پێکدێن و بڕیاردانی ئەمە لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانیی عێراقەوە.

بۆپێکهێنانی رژێمی حوکمێکی دیموکراسی لەوڵاتداو هێنانەدی ئۆتۆنۆمی

ڕاستەقینەی کوردستان واپێویستە هەموو کۆششەکان لەسەر ئاستی وڵاتو لەسەر ئاستی کوردستان یەکخرێن و یەکگرن. جا لەبەر ئەوەی بەرنامەیەك هەیە بۆ هاوکاری نێوان هێزە نیشتمانییەکانی عێراقو نێوان حزبو ڕێکخراوە کوردستانییەکان بۆ سەرکردەیی هەیئەتەکانی یاساداناو جێبەجێ کردنی ئۆتۆنۆمی بەشێوەیەکی هاوبەشو، سەرخستنو پەرەپێدانی ئۆتۆنۆمیو قوڵکردنەوەی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتیو پەرەپێدانی کوردستان لە ڕووی ئابوورییەوە بەوپێیە کەبەشێکە لەپەیڕەوکردنی دیموکراسی لەعێراقداو قوڵکردنەوەی ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتییەکەی، بۆ هێنانەدی ئامانجە ڕزگاریخوازییەکانی گەلی کوردو ئەرکەکانی ئۆتۆنۆمی واپێویست دەکەن کەبەرەی کوردستانی دابمەزرێت وەك بەشێك لە بەرەی نیشتمانی دیموکراسی وڵات، ئەمەش بەبێ پشت بەستن بە بزووتنەوەیەکی جەماوەری فراوان نایەتەدی و، بەبێ جەماوەری گەل و پێشڕەوە سیاسیەکانی کە توانای سەرکردەیی کردنی ئەو جەماوەرەیان هەیە، ناتوانرێ باسی توانای ئۆتۆنۆمی و مافە نەتەوەییە ڕەواکانی گەلی کورد بکرێت.

جا لەم هەلومەرجەی ئێستاماندا چۆن تەماشای بەرەی کوردستانی دەکەین؟

لەسەرەتادا دەبێ جەخت لەسەر ئەوەبکرێتەوە کە کۆمەڵگەی کوردستان وەك هەر کۆمەڵگەیەکی چینایەتی تر چینی کۆمەڵایەتی جۆربەجۆری تێدایە کە حزبە سیاسییەکان نوێنەریانن و ئەمانیش ئامانج و بەرژەوەندیی جۆربەجۆرو هەرلەوکاتەشدا هاوبەشیان هەیەو ئەمەش مانای وانییە هەموو چینەکانی گەلی کورد لەبەرژەوەندی و ئامادجی هاوبەشیاندا بگەنە یەکتر، چینی ئەووتۆ هەن مێژوو فەرمانی لەناوچوونی بەسەریاندا داوە، وەك بۆنمونە دەرەبەگی، جا ئەگەر کرێکارانو جوتیارانو زەحمەتکێشانو بۆرژوای بچوكو بۆرژوای کوردی نا (کۆمپرادۆری) لەبەرژەوەندیو ئامادجەکانیاندا لێکتر جیاواز بن ئەوانە هەر لەوکاتەدا لە ئامادجی گشتیی وبنچینەییدا پێکدەگەنەوە بەتایبەتی لەبارەی دامەزراندنی ئۆتۆنۆمیو پێشکەوتنی کوردستانەوە لەلایەنی ئابووریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریداو ڕووکردنە پەیڕەوکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس لەقەوارەی دەوڵەتێکی فرە نەتەوەداو هەرچەندە هەرحزبێك لەو حزبانە بەرنامەو

ئایدیۆلۆژیای خۆی هەیەو بۆ کۆکردنەوەی جەماوەر لەدەوری خۆی کاری پێدەکات و بەرێگەی پروپاگەندەو بیروڕا بلاوکردنەوەو لەرێگەی دامەزراندنی رێکخستنەکانی لەناو جەماوەرداو هەوڵدان بۆ ئەوەی بەرنامەکەی پەسەند بکات، ئەوا هەندێ ئامانجی نەتەوەیی‌و کۆمەلآیەتیشی هەن کە هاوبەشن‌و دەکرێ گشت حزبەکان لەسەریان کۆ ببنەوە. جا لەکۆشەی ئەم ڕاستییەوە، هەردەبێ هاوپەیمانییەکی سیاسی لەنێوان ئەم حزبانەدا پێکبێت بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەیەکی تێکۆشەرانەی هاوبەش کەلەسەر بنەماو مەبدەئەکانی دیموکراسی ڕاست‌و دروست پێکهاتبێ‌و هەموو حزبەکان بەگیانی یەکگرتن وهەستی بەرزی بەرپرسی لەئاست مەسەلەکەی گەلدا لەپێناویدا کاربکەن.

بەتەنگەوە هاتنی ئامانجەکانی گەلی کورد، لەپێشەوەیان دیموکراسی، کەمانای بەدیهێنانی دیموکراسی و پەیڕەوکردنی دەگەیەنێ و لەسەر بنچینەو ئەو مەبدەئانەی باسمان لێوەکردن، واپێویست دەکەن هەرچی بەکۆمەڵ و هاوبەش بن زاڵیان بکەین بەسەر ئەوانەی جیاکەرەوەو جیاوازن، بەمجۆرە پێویستە ئەو بەرەی کوردستانیەی دەمانەوێ بەرەیەکی نەتەوەیی کەلاکەوتوو نەبێ بەڵکو لەچوارچێوەی بەرەی نیشتمانی‌و دیموکراسی وڵاتدا بێت، تەنیا ئەمەیە زامنی یەکێتی تێکۆشەرانەی نێوان گەلانی عەرەب‌و کوردو کەمە نەتەوەکان کەبنچینەیەکە بۆ سەرکەوتن لەهێنانەدی ئامانجە دیموکراتییە بنەڕەتییەکاندا لەهەموو بوارەکانی ئابوری وکۆمەلآیەتی‌و رۆشنبیریدا. ئەم بەرەیەش، هەروەك بەرەی نیشتمانی دیموکراسی لەوڵاتدا پێویستە بۆ بەرێوەبردن‌و چەسپاندن‌و پەرەپێدانی ئۆتۆنۆمی‌و لەپێناو کۆشش تەرخانکردن بۆ نەهێشتنی پاشماوەکانی وێرانی‌و دواکەوتن کە لەسەردەمی دیکتاتۆری شۆڤێنیدا هەبوون، پێویست بەگوتن ناکات کە پێویستە لەکۆشەنیگای دەستکەوتی تەنگەبەر بۆ هەرتوێژێك یان چینێکی کۆمەلآیەتی یان بۆ بەرژەوەندیی هێزێکی سیاسی دیاریکراو تەماشا نەکرێت، چونکە بەرە کوتاڵێك نیە بخرێتە بازاڕەوە بۆ لەسەر زیاد کردن بەڵکو پرۆسەیەکی شۆڕشگێرانەیەو پەرەسەندنی هۆشمەندیی چینایەتی‌و سیاسی چین‌وتوێژە کۆمەلآیەتییە جۆربەجۆرەکان‌و حزبە سیاسییەکانیان دەردەخات کە

هەوڵبدەن بۆ یەکخستنی هێزەکانیان و تەرخانکردنیان بۆ ئامانجە سیاسییە هاوبەشەکانی نێوان ئەم چین و توێژە کۆمەڵایەتییانە، واتە ئامانجەکانی زۆربەی گەل جگە لەهێزە کۆنەپەرستەکانی دوژمنانی ئەو ئامانجانە.

ئەو ئەزموونانەی لای بزاڤی نەتەوەیی کورد گردبوونەتەوە سەلماندویانە کە ناکرێ سەرکردەیی هیچ حزب یان ڕێکخراوێکی سیاسی بزووتنەوەی نەتەوەیی دیموکراسی کورد بەڕێگای هێز و سەپاندن و تیرۆر کوشتار بێت بەڵکو دەبێ لەڕێگەی هێزی نموونە لەدروشمە سیاسییەکان و شێوازی کاری ڕاست و دروستدا بێت بەڕێگەی تێکەڵبوونی ئەم حزب یان ئەویتر لەگەڵ بزووتنەوەی جەماوەردا کە لێوەی فێربن و یان لەپێشڕەویدا بڕۆن پشت بەخواست و ئیرادەی ببەستن و لەبەرنامەکەیدا خواست و ئامانجەکانی زۆربەی گەلی ڕەنجدەر دەربڕن. تەنیا جەماوەرو، لەڕێگەی پەرەسەندنی خەباتی شۆڕشگێڕییەوە، ئەوانە دیاریدەکات کە شایانی سەرکردەیی نین. سیاسەتی مۆنۆپۆڵکردنی کۆرەپانەکەو سەپاندنی ڕاوێژکاری بەسەر جەماوەرداو دابەشکردنی گۆرەپانی خەبات بەناوچەی دەسەڵاتدارییەوەو چوونە ناوشەڕی خوێناوی دژی ئەوانیتر بۆ ڕێگە ایگرتنیان لەئازادیی ئیشکردن لەناو جەماوەردا، جۆرە سیاسەتێکن کە ژێرکەوتنیان لەچارە نووسراوەو بەتەواوی پێچەوانەی کاری هاوبەش و هاوپەیمانین لەپێناو ئامانجە هاوبەشەکانی گەلدا.

حزبی ئێمە هەردەم بەگورجی بەرەنگاری ئەو هەوڵانە بۆتەوە کە خواستویانە کۆرەپانەکەی سیاسەت بۆ خۆیان مۆنۆپۆڵ بکەن، لەڕووی سیاسی و هێزەوە بەرەو ڕوویان بۆتەوەو ئەو کۆششانەی پوچەڵکردۆتەوە کە مەبەستیان بووە دەروکێڕانی حزبی شیوعی لەسەر گۆرەپانی کوردستان کۆتایی پێبهێنن، لەمەشدا لەکۆشەی بەرژەوەندیی جەماوەری گەلی ڕەنجدەرەوە تێهەڵچووەو لەو پێناوەدا کاری کردووەو دەسپاک بووە بۆ ئەمانەوێ بنچینەو مەبدەئەکانی هاوپەیمانی بەمەبەستی هێنانەدی ئەم بەرژەوەندییە. حزبی ئێمە وایدەبینێ کە پێویستە هەموو حزب و ڕێکخراوەکانی دژ بەدیکتاتۆریی لە کوردستانداو لەڕیزی پێشیانەوەش ڕێکخراوی حزبی شیوعی عێراقمان، واتە ڕێکخراوی هەرێمی

کوردستانی حزبی شیوعی عێراق لەبەرەی کوردستانیدا بەشدارین، هەروا نوێنەرانی ناوەندە دیموکراسییەکانی خوێندکاران‌و لاوان‌و ئافرەتان‌و ڕۆشنبیران‌و هەروا لەنێوانی کەمینە نەتەوەکانی هەرێمدا. جا بۆئەوەی ئەم بەرەیەی کە ئێمە دەستبەرداری ئامانجەکان‌و ناوەڕۆکی نیشتمانی‌و دیموکراسی نابین، بتوانێت ئامانجەکانی بێنێتەدی دەبێ لەهێنانەناوەوەی دروشمی دوورەپەرێزو سەرچڵانە دووربکەوێتەوەو، دووربێ لەکۆششی دوورخستنەوەی بزووتنەوەی کورد لەبزووتنەوەی دیموکراسی‌و هاوپەیمانە ڕاستەکانی‌و لەوانەی دەیانەوێ بەدوژمنانی مەسەلەی کوردییەوە ببەستنەوە، واتە بەئیستیعمارو بەهێزە کۆنەپەرستەکانەوە کەکۆششیان بەردەوامە بۆخزانە ناو بزووتنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوازی گەلی کوردەوە بەنیازی ڕووخاندنی‌و دورخستنەوەی لەئامانجە ڕاستەکانی‌و لەهاوپەیمانە بنچینەییەکانی. لەمەوبەرو ئێستاش حزبی شیوعی عێراق دەورێکی دیارو پێشرەوانەی هەیە لە خەباتی گەلی کورداو لەبزاڤی ڕزگاریخوازییەکەیداو مێژووی حزبمان و هەڵوێست‌و قوربانییە گەورەکانی لەپێناوی مەسەلەی ڕەوای گەلی کوردماندا ناسراوو گەشەدارەو ئەمە پێویستی بەشایەتی کەس نییە جگە لەشەیەتیی گەلێ خۆی کە شیوعییەکانی ناسیوەو متمانەی پێداون. حزبی ئێمە ئەمڕۆ وایدەبینێ کە بەرەیەکی کوردستانی لەمجۆرە لەلایەن گەلی کوردمانەوە پشتیوانی‌و لایەنگیری دەکرێت‌و تەواوی هێزە نیشتمانی‌و دیموکراتییەکانی هەموو وڵات پشتگیریی دەکەن‌و لەپێشیشەوە حزبی شیوعیمان. ئەگەر وانەبێ هەر لەڕۆژی یەکەمی دروستکردنییەوە دەبێتە کۆسپێك لەڕێگەی هێنانەدی ئامانجەکانی گەلی کورداو گەورەترین زیانیش بە بزاڤە نەتەوەیی و ڕزگاریخوازییەکەی دەگەیەنێت.

ڕێگای بەرەی نیشتمانییەکان ڕێگەیەکی تاقیکراوەیە بۆ خەبات و ڕەوتی گەلان بەرەو هێنانەدی ئامانجە بەرزەکانی وەهەر ئەمەش شێوازێکی ڕاستە بۆ کۆکردنەوەی هێزە تێکۆشەرەکانی گەل‌و تەیارکردنی لەشکری سیاسی بۆ جەنگ ڕووبەڕووی دوژمن. هەستکردن بەم ڕاستییانە بەڵگەی هۆشمەندییەکی سیاسیی قوڵی حزب‌و ڕێکخراوە تێکۆشەرەکانە لەپێناو ئامانجەکانی گەل‌و نیشتیمانداو

هەستکردنی بەرزی بەرپرسیی مێژوویی سەرشانیان و لەگەڵ ئەمەشدا تەیارکردن و قووڵی هۆشمەندیی سیاسیی و نەرموتۆڵی تەواوی لەسیاسەتدا بۆ وازهێنانی دەستەو تاقم و حزب لە شتە وردەکان و بەرنامەی تایبەتی بەرانبەریەك لەبەردەم ئامانجە سەرەکییەکاندا کەگشت لایەنەکان لەسەریان کۆدەبنەوەو ئەرکی خۆشیانە هێزەکانیان بۆکاری هاوبەش یەکخەن لەپێناو هێنانەدیی ئەو ئامانجە سەرەکییانەدا. ئەمەش مانای واناگەیەنێت کە ئەم یان ئەو لایەن دەستبەرداری ئایدیۆلۆژیاو ڕێکخستنی سەربەخۆو ئازادیی کارو پڕوپاگەندە بۆ بەرنامەی تایبەتییان و سیاسەتەکەیان بن، نەخێر بەڵکو هەروا لەتەکیاندا دەمێننەوە بێ ئەوەی پێکەوە ناکۆك بن. ئەزموونی زۆری بزاڤی نەتەوەیی ڕزگاریخوازیی کورد جەخت لەسەر بایەخی پێکهێنان و پێویستیی بەرەی کوردستانی دەکاتەوە وەك بەشێکی بەرەی نیشتمانی و دیموکراسیی وڵات، لەهەلومەرجی ئەمڕۆشماندا کارێکی بەپەلەو بایەخدار دەبێ کە هەموو حزب و ڕێکخراوە کوردستانییە عێراقییەکان قەبارەیان و کارتێکردنیان هەرچەند بێ بۆخولقاندنی کەشوهەوایەکی باش و ئیجابی بۆ هێنانەدی ئەمە بەرێگەی دوور خستنەوەی کێشە لەسەر مەسەلە گچکەکان و قەدەغەکردنی پێکدادانی چەکدارانەی نێوان تیپەکان و دوورکەوتنەوە لەبیروڕای دەرەبەگییە سیاسییەکان و هاندانی بیروڕای تێکۆشانی هاوبەش لەنێوان حزبە عێراقییەکانداو ڕێزگرتنی بیروڕای ئازادیی بیرو چوونەناو هەرلایەنێك بۆ گشت هاونیشتمانان بەبێ زەبروزۆرو، هەروا پێویستە برایەتی تێکۆشەرانەی نێوان عەرەب و کوردو کەمایەتییە نەتەوەکان پتەوبکرێت و هەرئەمەش بووە بەدرێژایی مێژووی خەباتی عێراق یەکێك لەهۆکارەکانی سەرکەوتن بووە بەسەر ڕژێم و حکومەتە کۆنەپەرست و شۆڤینییەکانداو هەرحزبێك لە حزبە کوردستانییەکان لەسیاسەت و کردەوەکانیدا دوابکەوێت لەڕۆیشتن بەم ڕێگەیەدا لەئەنجامدا خۆی دەبینێتەوە کە لەجەماوەری گەل و خواستە شۆڕشگێڕو ڕەواکانی دوورەپەرێز بۆتەوە.

* * *

دیدارو نامە ئاڵوگۆڕکردن لەبارەی پێکهێنانی بەرەی کوردستانییەوە دەستی پێکردووەو، ئەو حزبە کوردستانییانە کامانەن کە لەوتووێژ لەسەر ڕەشنووسی بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆ، دەکەن، یەکێتی نیشتمانی کوردستان پرۆژەیەکی بۆ ئەم بەرنامەیە خستە بەرچاو، ئێمەش لەحزبی شیوعی عێراق بەرنامەیەکی ترمان هێنایە پێشەوە، ئەم لایەنە سەرەکییانە لەسەر ئامادەبوون ڕێکەوتن:

١-پارتی دیموکراتی کوردستان

٢-یەکێتی نیشتمانی کوردستان

٣-حزبی شیوعی عێراق

٤-حزبی سۆسیالیستی کوردستان

٥-پاسۆک.

ڕێکەوتن لەسەر ئامادەبوونی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و حزبی گەلی کوردستان پێکنەهات چونکە (پدک) بەرهەڵستی ئامادەبوونی نوێنەری حزبی گەل بوو، حزبی سۆسیالیستیش بەرهەڵستی ئامادەبوونی نوێنەری حزبی زەحمەتکێشان بوو.

لەسەر ئەم بنچینەیە هەرحزبە وەفدی خۆی پێکهێنا بۆ وتووێژ لەسەر دوو پرۆژەکەی بەرنامەی بەرە، وەفدی (پدک) بەسەرکردەیی کاک مەسعودو کاک عەلی عەبدولڵاو وەفدی (ینک) بەسەرکردەیی کاک فەرەیدون عەبدولقادرو وەفدی سۆسیالیست بەسەرکردەیی کاک ڕەسوڵ مامەندو، وەفدی پاسۆک بەداخەوە لەیادم نییە بەسەرکردەیی کێ بوو.

بەڵام وەفدەکەی ئێمە قێکهاتبوو لەهاوڕێ دکتۆر رەحیم عەجینەو ئەبوحیکمەتو من، کۆبوونەوەکانی بەرە لەراژان بوو، کاک نێچیرڤان بارزانی لە زۆربەی کۆبوونەوەکاندا بۆ گوێگرتنو سود وەرگرتن لەوتووێژی وەفدی حزبە کوردستانییەکان لەبارەی بەرنامەی بەرەوە ئامادە دەبوو، ئەوکاتە لاوێکی گچکە بوو بەڵام بەعەقڵی سیاسی گەورەبوو. کۆبوونەوەکە لەسەر ئەو پرۆژەیە بڕیاریدا کە لەحزبی شیوعی عێراقەوە پێشکەش کرابوو تا ببێتە بنچینەی وتووێژەکەو، ئەم وتووێژانە بەگیانی هەستکردن بەبەرپرسییەوە دەکران، دوای هەر

کۆبوونەوەیەك دەگەیشتینە ئەنجامی باش، کاك فەرەیدون هەندێ مەسەلەی باس دەکرد وەك زیادەکردن بوو بەسەر شیوعیەکانەوەو گوایە حزبی شیوعی کۆسپە لەڕێگەی هێنانەدی یەکبوونی (؟!) هەردوو حزبی (پارتیو یەکێتی) لەیەك حزبدا! من قسەم لەسەر ئەم موزایەدەیەکردو گوتم: من نامەوێ هەموو ئەو زنجیرە هەڵوێستو کۆبوونەوانە باس بکەم کە لەلایەن حزبی شیوعییەوە لەگەڵ (ینك) تەرخان دەکرا بۆ ئەوەی لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنی (ینك) لابرێن کە پارتی بەدوژمنی ،بەرەکی دادەنا، چەند کۆبوونەوەو دیدار لەگەڵ (ینك) کرانو تەرخان بوون بۆچاری ناکۆکییەکانی نێوان ئەو دوو حزبەو پێویستیی یەکێتیی هێزە کوردستانییەکان، تەنانەت ئەو کۆبوونەوەیەی بۆهێنانەدی بەرە تەرخان بوو لە کۆششو تەقەلای حزبی شیوعی بوو، هەروا من بەگەرمی داواتان لێدەکەم کەبەخێرایی هەردوو حزبتان یەکخەن، هەرکاتێکیش ئەمە پێکهات داوای دەهۆڵو زوڕنا دەکەم بۆ سازکردنی شایی وهەڵپەڕینی چەند ڕۆژە، تۆ کاك فەرەیدون دەزانیت کەبەو قسەیەت خزمەتی یەکێتی هەردوو حزبو یەکێتی حزبە کوردستانییەکان لە(بەرەی کوردستانیدا) ناکەیت. هەموان پشتگیرییان کردم و کاك فەرەیدون پاشەکشەی کرد لەقسەکەی داوای لێبوردنی کرد.

یەکێك لە هەڵوێستە سەلبییەکانی تر هەڵوێستەکەی کاك نەوشیروان بوو کەگوتی ئەم بەرەیە دەستکردی شیوعییەکانەو چۆنیانویست وایان پێکهێناوە، بەپێچەوانەی هەڵوێستی مام جەلال کەپێکهێنانی (بەرەی کوردستانی) بەسەرکەوتنێکی گەورەدانا بۆ یەکێتی هێزە کوردستانییەکانو بەرنامەکەشی شۆڕشگێڕانەو پێشکەوتنخوازانەی گرنگە.

لەکۆتایی وتووێژەکاندا بڕیاردرا پێکهێنانی بەرەو بەرنامەکەیو پەیڕەوەکەی ناوخۆی لەبارەگای حزبی شیوعی عێراق لە(خواکورك)و لەمیواندارییی ئەودا ئیمزابکرێتو، هەرلەوێ ئیمزاکرا، لە(پدك) کاك عەلی عەبدوڵڵا لە(ینك) کاك نەوشیروانو لەسۆسیالیست کاك ڕەسوڵ مامەندو لەحزبی شیوعی عێراق هاوڕێ عەزیز محەمەد ئیمزایان کرد.

بەمجۆرە ڕێکخراوێکی تازە لەدایك بوو کە بۆ ئەوەی ڕۆڵێکی کاریگەر لەدژی

دیکتاتۆری شۆڤێنی و هێنانەدی مافە نەتەوەییە کوردییەکان و دیموکراسییە عێراقییەکان بگێڕێ پشتیپێ دەبەسترا.

پێکهێنانی بەرەی کوردستانی هەرچەندە لەبزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی کوردستاندا ڕووداوێکی گەورە بوو، بۆیەکەمجاریش بوو هەستی هێزە سیاسییە کوردییەکانی بزواند بۆ هەستکردنی بەرز بە بەرپرسی بۆ یەکگرتنی هێزەکانیان لەکارێکی هاوبەشدا بەپێی بەرنامەیەکی سیاسی یەکگرتوو، ئەوەندەش کە گەلی کوردستانی دڵخۆش کرد بەلام هەندێ هێزی سیاسی ناو(جود) هەڵوێستی سەلبییان لەبەرامبەردا گرتەبەر تاکاریکنە سەر چالاکییەکانیو کەرتکردنی یەکێتییەکەی! ئەم کارتێکردنەش هەروا گەیشتە هەندێ لەسەرکردەکانی حزبی شیوعی، وێڕای ئەوەش ڕەوتی ڕووداوەکانو ڕێڕەوی بزاڤی نیشتمانیو دیموکراتیو، ئەنجامەباشەکانی (بەرەی کوردستانی) کەهاتنەدیو بەتایبەتی لەڕاپەڕینە پیرۆزەکەی گەلەکەماندا لەساڵی ١٩٩١داو سەرکردایەتی کردنو ئامۆژگاریکردنیو وەرگرتنی دەسەلاتی بەڕێوەبردنو دەرکردنی هێزە داپلۆسێنەرەکانی حکومەتی بەعسو، پێکهێنانی حکومەتی هەرێمو دانانی یاسای هەڵبژاردنو، هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمو، ڕێکخستنی کاروبارە کۆمەلایەتییەکانی جەماوەری گەلەکەمان لەهەرێمی کوردستاندا، ئەمانە هەمووی دووپاتکردنەوەی ڕاستی ئەوکارە بوو کە ئەنجامماندا، چ جای ئەوەی کوردستان ئەزموونێکی دیموکراتی نەك تەنیا بەعێراق بەڵکو بەگەلانی ناوچەکە پێشکەش کرد.

هەرێمی کوردستانی عێراق بووە لانەوازەی بەرهەڵستکارانی تێکۆشەری عێراقی، لەدژی دیکتاتۆری و بۆ تێکۆشەرانی گەلی کوردمان لەهەرێمەکانی تردا کەلەلایەن ئەو حکومەتە شۆڤێنیستانەی هەرێمەکانی کوردستانیان پێوە لکێنرا بوو ڕاوەدوو دەنرانو، لەهەلومەرجی گراندا لەپێناو مافە نەتەوەییە ڕەواکانیاندا تێدەکۆشن.

# ڕاپەڕینی میللی خۆبەخۆی گەلی عێراقی لەساڵی ١٩٩١دا

سیاسەتی دەسەڵاتی دیکتاتۆری بەتەواوی پشتی بەتیرۆر بەستبوو، لەبواری ئابوریشدا هەوڵی عەسکەرتاریای عێراقی دەداو بەشی زۆری بودجەی دەوڵەت بۆ ئامرازەکانی داپڵۆسین و چەك کڕین و پیشەسازیی سەربازی خەرج دەکراو، سوپایەکی بەهێزی پێ ئامادە دەکرا بۆ پەلاماردانی دەوڵەتانی تر بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی نەوتیان هەیە لە کەنداوو سعودیەو ئێرانو بەتایبەتی ناوچەی عەرەبی وەك (عەبادان و ئەهوان).

وێڕای ئەو یەدەکە زۆرەی نەوت کە عێراق هەیەتی و، بودجەی دەوڵەت لەبنچینەدا پشت بەداهاتی نەوت دەبەستێ، ئەو هەموو داهاتە زۆرەی نەوت بۆ پەرپێدانی نەوت لەبواری پیشەسازیدا، نەپیشەسازی بچووكو نەگران خەرج نەکراوە، هەروا بۆپەرەپێدانی کشتوکاڵو ئاوەدانکردنەوەی وڵاتو پێشکەشکردنی خزمەتی جۆراوجۆر بەگەل و بوژانەوەی رۆشنبیری و چاری گیروگرفتی بێکاریو بۆچاری مەسەلەی نەتەوەیی کوردو بەتایبەتی بۆ مەسەلەی کوردستانی خەرج نەکراوە. بەهۆی ئەم سیاسەتەشەوە رۆژ لەدوای رۆژ باری گوزەران و ژیانی خەڵك ئاڵۆزتر دەبێو، لەهەلومەرجێکی ئاوادا ڕژێمی دیکتاتۆر شەڕی بەرامبەر ئێران ڕاگەیاندو وای گومان دەکرد کە دەتوانێ ئێران داگیر بکات، بەتایبەتی ناوچەی ئەهوازو عەبادان کە لەنەوتدا دەوڵەمەندن، ئەوەم شەڕە هەشت ساڵی خایاندو بەسەدان هەزار کەس لەرۆڵەکانی گەل لەم شەڕەدا بوونە قوربانیو، دواجار ناچاربوو دوای زیانێکی زۆری مادی و بەشەری کۆتایی پێ بهێنێتو تێکشکانێکی گەورەی تووشبوو کەنەیتوانی ئامانجەکانی لەئێراندا بێنێتەدی، هەوڵیدا باربووی ئەم تێشکانە بەداگیرکردنی دەوڵەتی کوێت چاربکات، کەدەوڵەتێکی بچوکی کەنداوەو پارووپەکی چەورەو دەتوانێ بەئاسانی قووتی بدات، بەلام هەستی بەوەنەکردبوو کە دەوڵەتانی کەنداو و سعودی لەستراتیژیی ئەمریکادا هێڵی

سوورن، داگیرکردنی کوێت زۆری نەکێشا تاچەندان دەوڵەت لەگەڵ ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، لەوانەش دەوڵەتانی عەرەبی لەتەقەلای شەڕدا بەشدارییان کردووە بۆدەرکردنی عێراقی دەستدرێژکار لەدەوڵەتی کوێت ئیتر دیسان عێراق تووشی تێشکانێکی گەورەبوو سوپاکەشی بەزەبوونیو بێ چەك گەڕانەوە عێراق.

سوپا لەحاڵێکی زۆرناخۆشدا بوو، جەماوەریش لەناو کینەدا بەرامبەر بەم دەسەڵاتە دیکتاتۆرە دەکولا، هەر کەیەکێك لەسەربازە گەڕاوەکان لەجەنگی ژێرکەوتنو بەزینەوە لولەی تۆپی تانکەکەی کردە وێنەدیواری دیکتاتۆر لەشاری بەسرا ئیتر جەماوەری شارەکە لەڕاپەڕینێکی میللیو سەرانسەریی خۆبەخۆدا ڕاپەڕینو سەربازە گەڕاوەکان بەشدار بوونو هاواریان بەڕووخاندنی زۆردارەوە بەرزبۆوە. دەنگوباسی ڕاپەڕینەکەی بەسرا وەك ئاگرو پوشوو بەناو پارێزگاکانی خواروو فوراتی ناوەڕاستو کوتو هەرێمی کوردستاندا بڵاوبۆوەو، بەڵام ڕاپەڕینەکە بەغداو موسڵو تکریتو ڕومادیی نەگرتەوە، ئەمەش لەبەر هەندێ هۆکاری نەتەوەییو دەمارگیریو تایەفەگەری بوو. ڕاپەڕینەکە لەخۆڕا دەستی پێکرد لەئەنجامی گردبوونەوەی گیروگرفتی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابوریو بژێویو نەتەوەیی، شایانی وتنیشە ڕاپەڕینەکە دیارترین ڕووداوی شۆڕشگێرانەی گەلەکەمان بوو لەدژی دەسەڵاتی دیکتاتۆریی شۆڤێنی، بەمەش ڕێگاکرایەوە بۆ توانای ڕامالینی ئەم ڕژێمە تیرۆریستە دیکتاتۆرە، ئەگەر بمانەوێ کەڵك لەم ئەزمونە وەربگرین پێویستە وەك لای خوارەوە کورتی بکەینەوە:

١. ڕاپەڕینەکە ڕووداوێکی لەخۆڕا (عەفەوی) بوو.

٢. سەرکردایەتییە سیاسییەکان نەبوون کەسەرکردایەتییان بکەنو بەڕێگای ڕاستدا ڕێپیشاندەری بکەن.

٣. درووشمەکانی ڕوون نەبوون بەڵکو ڕووخسارێکی تایەفەگەری بەسەریدا زاڵبوو بەتایبەتی لەبەشی باشوری عەرەبی، ئەگەرچی هەندێ دروشمی نیشتمانیو دیموکراتیش بەدیارکەوتن.

٤. ئـەمریکاو هاوپـەیمانـەکانی پـشتیوانییان نـەکردو،هیچ کارتێکردنێکیـان لەسەرکردایەتیکردنیداو لەئاراستەکردنیدا بەرەو ڕووخانـدنی دەسـەڵات نەبوو.

لەبەر ئەوە هێزەکانی داگیرکاریی لە ناسریە و بەسرا کشانەوەو کاروبارەکانیـان درانە دەست ڕژێمی دیکتاتۆر کە لەژێر زەبری ڕاپەڕینەکەی گەلدا ناڵەی دەهـات، ئەوراپەڕینـەی تـوانی سـوپایەکە ڕاگـرو بێلایـەن بکـات بـەبێ بەشـداریکردنی لەڕاپەڕینەکەو لەڕووخاندنی دەسەڵاتدا لەگەڵ جـەماوەر، بـەڵکو تـەنیا بەوەنـدەی بەسکرد کە خۆبەدەستەوە بـدات و سـوپاگەکان بداتەبـەر دزیو تاڵانکـاریو، وەك خواستبێتیان ئەم سوپایە هەڵوەشێننەوە ئەوەبوو بەسەدان ئەفسەر ئیعدام کـران دوای ئەوەی دیکتاتۆری دەسەڵاتی بەسەر بارودۆخەکەدا گرتـەوە بەسـەدان هـەزار کـەس لەهاونیـشتمانان لەنەجـەفـو بەسـرەو عـەمارەو ناسـریەو حیلـەو دیوانیـەو کەربـەلاو سـەماوەو کـوت سـەربڕدران. ئەمریکاییـەکان خۆیـان بەرپرسـن لەزیندەبەچـاڵکردنی ڕاپەڕینەکـە لەباشـوری عـەرەبیو لەبـەرەلاکردنی دەسـتی دیکتاتۆر بۆسەربڕینی خەڵك.

لەکوردستان بارودۆخەکە بەجۆرێکیتربوو، جەماوەری کوردستان لەژێر دروشمی ڕووخانـدنی دیکتـاتۆریو هێنانـەدی ڕژێمێکی دیمـوکراتیو هەمەلایەنـەی فیـدراڵی ڕابوونو بەرەی کوردستانی هەر لەسـەعاتەکانی یەکەمـەوە جڵـەوی کاروبارەکـانی گرتەدەستخۆو ئیزگەکانی حزبە کوردسـتانییەکانو ڕاگەیانـدنی بـەرەیی دەورێکـی هانـدانو جولانـدنی گێـڕاو ڕێکخراوەکـانی حزبـە هاوپەیمانـەکان دەورگێڕانـی ڕێپیشاندەریو ڕێکخستنیان ئەنجامداو دەسەڵاتیان گرتەدەستو سـوپا بەتـەواوی خۆی دایەدەست جەماوەری ڕاپەڕیوو، دەزگاکانی ئەمن لەبارەگاکانیاندا لەهەنـدێ شاردا بەرگرییان کـرد بـەڵام لەئـەنجامی هێرشـەکانی جـەماوەرو (پ.م)دا کـەوتن. بـەمجۆرە ڕاپەڕینەکـە لەهـەرێمی کوردسـتان لەلایـەن بـەرەی کوردسـتانییەوە سـەرکردەیی کـراو بـەڕێوەبراو پـاش دەرکردنـی دەسـەڵاتی دیکتـاتۆری لـەباری سـوپاییو بەڕێوەبەرییـەوە، بـەرەی کوردسـتانی دەسـەڵاتی گرتەدەسـت،

بەپێچەوانەی ڕاپەڕینەوە لەباشوور کە دەسەڵاتی ڕاپەڕینەکە جێگەی دەسەڵاتی دارماوی نەگرتەوە چونکە سەرکردایەتی سیاسی نەبوو.

دوای لەناوبردنی ڕاپەڕینەکەی باشوور سەدام دکتۆر موکەرەم تاڵەبانی ناردە هەرێمی کوردستانی ئازادکراو، مەسەلەی وتوویژی هێنایە پێشەوە، ئەوکاتە لەهەولێر بووم، لەگەڵ دکتۆر موکەرەم تاڵەبانی چوومە (پیرمام) هاوینەهەواری سەلاحەدین بۆ دیداری کاك مەسعودو سەرکردایەتی (بەرەی کوردستانی) کە ئەوکاتە نەوشیروان‌و ڕەسوڵ مامەندیش لەوێ بوون، دکتۆر تاڵەبانی گوتی دەسەلات ئامادەیە وتوویژتان لەگەڵ بکات، لەهەر کاتو شوێن‌و جێگەیەك یان دەوڵەتێك کە خۆتان هەڵی دەبژێرن بۆ گەیشتنە چارێکی مەسەلەی کوردستانی.

لەبارەی مەبدەئەوە بڕیاردرا بیرۆکەی وتوویژ لەسەر بناغەی ئەوەی دەسەلات خستییە پێش چاو قبوڵبکرێت بەڵام وەك ڕووداوەکان سەلماندیان دەسەلات دەیویست (بەرەی کوردستانی) خەڵبخەڵەتێنێ، ئەوە بوو هێرشی ڕژێمی دیکتاتۆری بۆسەر هەرێمی کوردستان لە ڕۆژی ٣١ی ئاداری ١٩٩١دا دەستی پێکردو هێشتا دکتۆر موکەرەم تاڵەبانی لە هەولێربوو کە هێرشەکەی دەستی پێکردو ناچار بوو بەڕێگای موسڵدا بگەڕێتەوە بەغدا چونکە هێزەکانی حکومەت بەپشتیوانی فڕۆکەی کۆپتەر توانی بەناو بەرگریی(پ.م)دا تێپەڕێت‌و بەخێرایی ڕوو لەهەولێر بکات، بڕیاری کشانەوە لەهەولێر دراو جەماوەر دەستی کردە کۆچبەری‌و لەشارەکانی کوردستانەوە بەرەو ئێران‌و تورکیا دەرچوون‌و، قایل نەبوون لەژێر سێبەری حکومەتی دیکتاتۆری تیرۆری‌و شۆڤێنی بەعسدا بژین، ماڵەکانیان‌و هەرچییان هەبوو بەجێیانهێشتن، ئەگەرچی تووشی زۆرنەهامەتی‌و مامەڵەکردنی خراپی کاربەدەستانی تورکیاو ئێران بوون، ئەگەرچی ڕێڕەوە درێژەکە پڕ لەناخۆشی و پیادەیی ڕۆیشتن بوو بەناو چیاو دۆڵەکاندا ڕۆیشتن بوونەوە، وێڕای سەرماو باران و مردنی منداڵانی گچکە لەبرسان و لەو ڕێگە درێژەدا.

دەمەوێ ئەوەش بۆمێژوو تۆمار بکەم کە جەماوەری کوردستان لەهەردوو هەرێمی باکورو ڕۆژهەلات زۆر بەگەرمی جەماوەری باشووریان پێشوازیی کردو بەپێشکەشکردنی هەر یارمەتییەك کەلەتوانادا بێت، لەدەرمان‌و خۆراكو

جلوبەرگیان بەجەماوەری باشوور پێشکەش کرد، بەو جەماوەرەی قایل نەبوون لەسێبەری تیرۆری شۆڤێنی دەسەلآتی بەعسدا بژین. ئەم کۆچبەرییە مەزنەی جەماوەرە هەرێمی کوردستانی باشور بۆ دەوڵەتانی دراوسێ خۆپیشاندانێکی مەزنی ڕەفز کردن بوو کەبووە مایەی پشتیوانیو بزواندی لایەنگیریی نێودەوڵەتان لەلایەن هەموو گەلانی دنیاوەو لەلایەن ڕێکخراوە دیموکراسییەکانیو حزبو حکومەتەکانەوە بۆمەسەلەی گەلی کوردستانمانو ڕژێمی دیکتاتۆریی شۆڤێنی کەلاخست، بۆیە دەوڵەتانی هاوپەیمان، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنسا ناچاربوون دەسەلآتی دیکتاتۆریی هۆشیاربکەنەرە کەئیتر هێرشی دڕندانەیان بۆسەر کوردستان ڕابگرن.

دوای پاشەکشەی هێزەکانی (ب.ك) لەشارەکانو کشانەوە بۆ قەزاو ناوچەکان، کاك مەسعودو مام جەلالو ڕەسوڵ مامەندو من کۆبووینەوەو بڕیاری بەرگریماندا کە کوردستان بەجێ نەهێڵینو بەلگەنامەی نەبەزینمانو بەزاندنی هێرشەکەی حکومەتمان ئیمزاکرد، داواکردن لەجەماوەر کەرۆیشتنە ناو دەوڵەتانی دراوسێ ڕاگرنو، کارکردنیش دابەشکرا بەجۆرێك کاك مەسعود کاروباری جەنگاوەری لەکەرتی هەولێرو دهۆك سەرکردایەتی بکاتو منیش لەگەڵ ڕەسوڵ مامەند یارمەتی بدەینو، لەکەرتی سلێمانیو گەرمیانیش مام جەلال بەرپرس بێتو، بەمجۆرە دەستمان بەکاری بەرگری کرد. ئێمەش لەلای خۆمانەوە هێزی (پ.م)ی حزبی شیوعی عێراقمان ئاگادارکرد کە ئامادەبن بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی کاك مەسعودو مام جەلال و ئیتر هاتنی بەلێشاوی جەماوەر بۆپەنابەری کەمبۆوە بەلآم هێرشەکانی حکومەت بەردەوام بوو دەیانویست بگەنە قولآیی، ئێمە لەحزبی شیوعی هێزێکی بەرگریمان لە(پ.م)ی حزبی شیوعی کە ٦٠جەنگاوەرێك دەبوون لەهاوڕێیانی قارەمان بەسەرکردەیی (کانەبی گەورە)ئامادەکردو ە ڕەسوڵ مامەندم پرسی کە دەتوانن چەند (پ.م)ی سۆسیالیست بۆبەرگری ئامادە بکەن، گوتی دەتوانێ ٨٠ کەس ئامادە بکاتو، چوومە لای کاك مەسعود و پێمڕاگەیاند کەنزیکەی ١٤٠ جەنگاوەرمان لەحزبی شیوعیو سۆسیالیست هەیەو ئامادەی بەرگرینو لێمپرسی: ئێوە دەتوانن چەند جەنگاوەر بخەنە کۆڕی جەنگەوە؟

لەوەلاّمـدا گـوتی: ئێـستا (١٢) پێـشمەرگەم لەگەڵدایـە، بـەلاّم ئەگـەر پێیـان بلّێم لەگەڵمدا ئامادە دەبن بۆبەرگری بەتەنیا جێمدەهێڵن.

هاتنی هێزەکانی حکومـەت بـەرەو شـەقلاّوە بـەتینتر بـوو هێزەکـانی حکومـەت گەیـشتنە (کـۆڕێ)و هێـزی بـەرگری لـە (پ.م) شـیوعیو یـەکێتی نیـشتمانیو بزووتنـەوەی ئیـسلامیو سۆسیالیـستو پـارتی لەدەربەنـدی کـۆڕێ گردبوونـەوەو لەشوێنەکانی بەرگرییان دامەزران‌و هێرشی بەراوەژوو بۆسەر هێزەکـانی حکومـەت دەست پێکراو توانییان بەرەوپێشچوونیان ڕابگـرن‌و تانکێکیـان سـوتاند کەبـەرەو شـەقلاّوە لـەنێوان (حـوجرانو شـەقلاّوە)دا بـەرەوپێش دەچـوو، دوای ئـەوەش بەچەکی R.B.G چـەند تانـک‌و زرێپۆشـی ترسـوتێنران‌و لەوناوچـەیەدا بەتـەواوی هێرشەکەی حکومەت ڕاگیرا.

لەکەرتی سلێمانیش هێزەکانی حکومەت نەیانتوانی لەشاری سلێمانی تێپـەڕبن‌و هێرشەکەیان ڕاگیراو داوای وتووێـژیان کـرد. لـەم کاتـەدا بڕیـاردرا سـەرکردایەتییە سیاسـییەکان بۆنـاوەوە پاشەکـشە بکـەن منـیش گەیـشتمە نـاوزەنگو لـەوێ کۆبوونەوەیەکی کۆمیتـەی کوردستانی حزبی شیوعی عێراقمان ئەنجامـداو بڕیـاردرا لەسەر بەرگری بەردەوام بـین‌و نەچـینە نـاو وتووێـژ، هـەروا سـەرکردایەتی حزبـە کوردستانییەکانی تـر بۆڕەوانـدوز کشانەوەو بـەبێ ئێمـە کۆبوونەوەیـەکیان کـرد. بڕیاریانـدا وەك سـەرەتا لەگـەڵ حکومـەت بەشـداریی وتووێـژ بکـەن ئینجـا بروسکەیەکمان لەڕەوانوزەوە بۆهات داوادەکات لە کۆبوونەوەی (ب.ك) ئامادەبین. شایانی باسە ئێمە لەکۆمیتەی هەرێم مەکتەبی سیاسیی حزبـی شـیوعی عێراقمـان لەبڕیارەکانمان لە(ناوزەنگ) ئاگـادار کـردەوە، ئەوکاتـە مەکتـەبی سیاسـی لەشـام بوو.

چوومە ڕەواندوزو چاوم بەهاوڕێیان کەوت بەتایبـەتی هـاوڕێ مـەلا حەسـەن کـە ئەوکاتە لەوێ بوو ئاگاداری بارودۆخەکەی ناو حزبەکانی بەرەی کوردستانی کردم، کۆبوونـەوەی بـەرەی کوردسـتانی لەڕەوانـدوز ئەنجامـدرا، بـەئامادەبوونی کـاك مەسعودو مام جەلال‌و کاك عەلی عەبدولاّو نەوشیروان‌و ڕەسوڵ مامەندو قادر عەزیز و سامی عەبـدولڕەحمان‌و نیـنوس‌و یونـادم (وەك بـزانم) لەلایـەنی ئێمەشـەوە مـن

ومەلا حەسەن و وابزانم ئەبوفاروقیش ئامادە بووین.

پاش گفتوگۆ لەبارەی چوونە وتووێژ لەگەڵ حکومەت لەلای خۆمەوە بەدوورو درێژی بارودۆخی نێودەوڵەتیم باسکرد کەپشتیوانی ئێمەیەو باسی کەلاکەوتوویی و لاوازیی دەسەڵاتی دیکتاتۆریم کرد چونکە شەڕەکەی دۆڕاندووەو چۆن سوپا لەپێناو دەسەڵاتی سەدامدا ئیتر شەڕناکاتو، بەعس ڕاستگۆنییە خۆی نابەستێتەوە بەو بڕیارانەوە کەلەگەڵیدا لەسەریان ڕێك دەکەوین، وتووێژ مانای ئەوەیە مۆڵەتێکی تر دەدەینە حکومەت تا ئاهێکی بەبەردا بێتەوەو بارودۆخی خۆی بگێڕێتەوەو حیساب لەگەڵ ئەو ئەفسەرانەدا پاکاتەوە کەهیچ بەرگرییەکی ڕاپەڕینیان نەکردووە، هەروا وتووێژ مانای ئەوەیە بوار بدرێ هەناسەیەکی بەبەردا بێتەوەو پاش ئەوە دیسان هێرش بۆسەرمان دەست پێبکاتەوە. لەبەرئەوەی بەعس، هەروەك ڕووداوەکان سەلماندویانە جێگەی باوەڕنییە، ئێمە لەگەڵ وتووێژدا نین. خۆئەگەر ئێوە بڕیارتاندا بچنە وتووێژەوە ئەوە کای خۆتانە بەڵام نەك بەناوی بەرەی کوردستانی بەڵکو بەناوی حزبەکانتانەوە.

نەوشیروان وەڵامی قسەکانی دانەوەو گوتی ڕاست نییە ئێوە لەناو (ب.ك)دابن و بەرەنگاری بڕیاری زۆربە ببنەوە لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرتان یان لەناو (ب.ك) بمێننەوەو بڕیاری زۆربە جێبەجێ بکەن یان بچنە دەرەوەی بەرەی کوردستانی. لەگەڵ ئەم بۆچوونەی کاك نەوشیروان نەبوومو گوتم هەر حزبێك لەناو (ب.ك) سەربەخۆیەو بیروڕای خۆی هەیەو بڕیارەکان لە(ب.ك) بەکۆمەڵ دەدرێنو، هەرحزبێك بەهەر بڕیارێك قایل نەبێ ئەوا بڕیارەکە بەناوی ئەو حزبانەوە دەردەچێ کە قایلن نەك بەناوی (ب.ك)و دووپاتمکردەوە کەکەس ناتوانێ بڕیاری زۆربە بەسەر ئێمەدا بسەپێنێو ئێمە بەم هەڵوێستە مانای وانییە لەدەرەوەی (ب.ك)دەبین، نەخێر بەڵکو لەناو بەرە دەمێنینەوەو دژی ئەم بڕیارەو هەر بڕیارێکی تر دەبین کەپێی قالیل نەبین، لەکۆبوونەوەکانیش ئامادە دەبینو هەموو مافێکی خۆمان دەبێو هەرمەسەلەیەك لە(ب.ك)دا باس بکرێت ئێمەیش گفتوگۆی لەسەر دەکەین تەنانەت ئەو ئەنجامەش کە وەفدی وتووێژکار پێی دەگەن.

نەوشیروان وەڵامی دایەوە: ئێمەش دەتوانین ئەندامەتیتان هەڵپەسێرین چونکە

هەڵەیەو، خزمەتی هێزە کوردستانییەکان ناکات.

شایانی باسە مام جەلال پشتگیریی قسەکانی منی کردو هەڵوێستە گرژەکانی نەوشیروانی پەسەند نەکردو هەروا هەڵوێستەکەی نەوشیروان لەلایەن کەسیترەوە پشتگیری نەکراو بەدیاردەیەکی سەلبییان دانا لەپەیوەندیی نێوان حزبە هاوپەیمانەکاندا بەتایبەتی لەبەرەی کوردستانیدا. بڕیاریاندا وەفدی وتووێژکار لەگەڵ کاک مەسعودوو مام جەلالو ڕەسوڵ مامەندو قادر عەزیز و یونادم وەك لەیادم بێ‌و، سامی عەبدولڕەحمان پێکهاتو هیواداریی سەرکەوتنم بۆوەفدەکە خواستو سەفەرم بۆشەقلاوە کردو بڕیارمدا ڕۆژی دوایی ماڵئاوایی لە کاک مەسعود بکەم کە ئامادەی ڕۆیشتن بوو بەسەرۆکایەتی وەفدی وتووێژکار بۆ بەغدا. ڕۆژی دوایی لەگوندی(حوجران) نزیك (دەربەندی کۆڕێ) سەردانیم کردو ماڵئاواییم لێکردو هیواداریی گەڕانەوەی بووم بەسەلامەتی. دوای ئەوە وتووێژ گیری خواردو وەفدێك دەهاتو وەفدێك دەچوو بەمجۆرە ئەو مەسەلانەی کە لەوتووێژدا باسیان لێدەکرا لە کۆبوونەوەکانی دەستەی بالآی بەرەدا دەمانخستنە بەرباس‌و لێکۆڵینەوە. هێندەی نەمابوو وەفدی حزبە کوردستانییەکان ڕێکەوتنەکە لەگەڵ بەعس ئیمزا بکەن بەڵام یەکێك لەئەندامانی وەفدەکە ئاگاداری کردنەوە کەدەبێ بگەڕێینەوە بۆ کۆمیتەی بالآی بەرەو ئەوەی لەگەڵ بەعس لەسەری ڕێکەوتووین بیخەینە بەردەمیان، کاتێك وەفدەکە گەڕانەوەو ڕەشنووسی ڕێکەوتنەکەیان هێنا پرسیاری مەسەلەی کەرکوك‌و سنوری هەرێمی کوردستانمان لێکردن و چۆنێتی چارەسەرکردنی گیروگرفتی ناوچە کوردییەکان کە خراونەتە سەر بەڕێوەبەرێتی ناوچە عەرەبییەکان و چۆن مەسەلەی بەعەرەبکردن و گەڕانەوەی پەنابەران بۆ ناوچەکانیان‌و بەتایبەتی بارپێکراوانی کەرکوك‌و گێڕانەوەی ئەو عەرەبانەی هێنراونەتە کەرکوك و، مەسەلەکانی دارایی‌و شتیوا کە لەڕەشنووسەکەدا باسیان نەکراوە، ئیتر ڕەشنووسەکە پەسەند نەکراو دووپاتمانکردەوە کە ئێمە ئامادەنین بڕیاری لەسەر بدەین ئەگەر مەسەلەی سنوری هەرێم‌و کەرکوکیش کەلەناو ئەم سنورەدابێت باس نەکرێت، ئیتر لایەنی حکومی ئەم داخوازییانەی بەتەواوی دایە دواوەو وتووێژ کۆتایی هات، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ حکومەتدا مایەوە لەڕێگەی

دامەزراندنی کۆمیتەی کار ڕێکخستن و چارەسەری گیروگرفتەکانەوە.

لەکۆبوونەوەی کۆمیتەی بالآی بەرەی کوردستانیدا کە لەڕەواندوز پێکهات ئەو بیرۆکەیەمان خستەبەر باسکردن کە پەنابەران بۆ دەوڵەتانی دراسێ هان بدرێن بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانیان و شوێنەکانیان چۆڵ نەکەن و بێنە کۆڕی خەباتی سیاسییەوە لەدژی دیکتاتۆری، بەشدارانی کۆبوونەوە ئەمەیان پەسەندکرد. بڕیاردرا لەناو پەنابەراندا پروپاگەندەیەکی بەرین بلآوبکرێتەوە کە پێویستە بەزووترین کات بگەڕێنەوە ناوچەکانیان، جەماوەر گەڕانەوە بۆماڵەکانیان و دەسەلآت نەیتوانی پرسینەوەیان لەگەڵ بکات و توخنی کەسێکیان بکەوێت، ڕێکخراوەکانی حزبە کوردستانییەکانی هاوپەیمانی ناو (ب.ك) دەستیان بەهاندانی جەماوەر لەدژی هێزەکانی حکومەت و بەڕێوەبەرایەتییەکانیان کردو چەندان خۆپیشاندانی گەورە ئەنجامدران هەروەك بیانەوێ ڕاپەڕینەکە تازە بکەنەوە، ئیتر دەسەلآتی دیکتاتۆریی ناچار بوو هێزەکانی و بەڕێوەبەرایەتییەکانی لەهەرێم بکێشێتەوەو بەرەی کوردستانی سەرلەنوێ کاروباری بەڕێوەبردنی گرتەوە دەست و بەمەش بەڕێوەبەرێتی دیکتاتۆری لەسەر خاکی ئازادکراوی هەرێم کۆتایی پێهات.

**دەستکەوتەکانی بەرەی کوردستانی:**

١. پێکهێنانی کۆمیتەکانی بەرە لەگشت قەزاز پارێزگاکان.

٢. سەرکردەیی بزووتنەوەی جەماوەر بۆدەرکردنی هێزەکان و بەڕێوەبەرێتی دیکتاتۆری لەهەرێم.

٣. ڕێکخستنی کاروباری دارایی و وەرگرتنی ڕەسمە گومرگییەکان لە کەلوپەلە هاتووەکان و دەرچووەکان و دابەشکردنیان بەسەر بەڕێوەبەرێتی و حزبەکانی بەرەی کوردستانیدا.

٤. دامەزراندنی حکومەتی ئیئتیلافی کوردستانی کە حزبی ئێمە بەیەك وەزیر تێیدا بەشداربوو کەوەزارەتی تەندروستی پێدرا.

٥. کۆمیتەی بالآی بەرە بەسەرچاوەی بڕیارەکان و یاساکان دانرا

تانەوکاتەی پەرلەمانی هەرێم هەڵدەبژێردرێ.

٦. دانانی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمان.

٧. لەچەند کۆبوونەوەیەکدا مشتومڕێکی درێژ ئەنجامدرا دەربارەی سیستەمی ڕێژەییو دائیرەیی لەهەڵبژاردنداو، دواجار ڕێژەیی بڕیار درا چونکە زۆرتر دیموکراسی بوو ولاتیش لەیەك دایەرەی هەڵبژاردندا یەکدەخات، پێشنیازمانکرد کە ڕێژەکە ١٪ بێت بەلام پارتی پێشنیازی کرد ٧٪بێتو ئامانجیش لەمە ئەوەبوو کەنوێنەرانی حزبە بچوکەکان نەگەنە پەرلەمان.ئێمەش دەستبەرداری ١٪ بووین بۆ ئاستی ٥٪ بەلام پارتی لەسەر پێشنیازەکە سوور بوو بەنابەدڵی بڕیاری لەسەردا، لەسەر ئەوەی کە سووربوو یان یاسای هەڵبژاردن بەناوی (ب.ك) بەو پێیە کەدەستەیەکی یاسادانەرە پەسەند نەکرێ، یان ئەوەی پارتی دەیەوێ پەسەند بکرێ. بەمجۆرە بەناچاری بڕیاردرا بۆئەوەی هاوپەیمانی بەرەیی کوردستانی بمێنێتەوە تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی حزبە بچوکەکانیش بێت.

٨. پرۆسەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان ڕێکخرا. بەمبۆنەیەوە دەڵێین پرۆسەی خۆئامادەکردن بۆرۆژی دەنگدان لەکەشوهەوایەکی تەواو دیموکراسیدا بەڕێوەچوو، لەبارەی بلاوکردنەوەو دابەشکردنی بەرنامەکانی هەڵبژاردنو بلاوکردنەوەی لیستی پاڵێوراوانو پروپاگەندەو کۆڕوکۆبوونەوەی جەماوەریو ڕێڕەو، بەلام دەنگدان هەرلەسەعاتەکانی یەکەمەوە تادوایی ساختەی تێدا کرا، ئەمەش لەلایەنی هەردوو حزبی (پدك و ینك) کەموونافەسەی یەکتریان دەکرد. کۆبوونەوەیەکی لایەنە بەشدارەکانی هەڵبژاردن لەگەڵ کۆمیتەی بالای هەڵبژاردنەکاندا کراو، هەموان دانیان بەوەدا نا کەدەنگدان بەجۆرێکی ساختەکاری و بەشێوەی ئاشکرا بەڕێوەچوو، کاك مەسعود ناچاربوو وتەی دا کە ئەم هەڵبژاردنە ساختەی تێدا کراوەو دانی پێدانانێو،

پێشنیاز دەکات بەسەرپەرشتی نێودەوڵەتیو لەکەشوهەوایەکی دوور لەساختەکاریو دوای شەش مانگ هەڵبژاردنی تازە بکرێت.

حزبی شیوعی یادداشتێکی پرۆتێستو بێزاری بەرامبەر بەم ساختەکارییە پێشکەشکردو هاوڕێ عەزیز محەمەدی سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی لەدژی ئەم تەزویرە وتەی بۆڕاگەیاندنی دەرەوە دەربڕی و، ئالەم کەشوهەوایەدا کۆبوونەوە سازکرا کەتەرخان بوو بۆچاری ئەو گیروگرفتە ئاشکرابووەو ئێمە بیرۆکەی ڕێکەوتنمان لەنێوان لیستەکانی بەشداری هەڵبژاردن هێنایە بەرباسو پێشنیازمان کرد بەشی هەردوو حزبی (پدك و ینك) (٧٥) کورسی بێتو حزبەکانی تری بەشداری هەڵبژاردن کە بزووتنەوەی ئیسلامیو حزبی سۆسیالیستو حزبی شیوعیو حزبی گەل بوون هەموویان پێکەوە (٢٥) کورسییان هەبێت، بەلآم هەردوو حزب و بەتایبەتی (پدك) بڕیاریان لەسەر نەدا. پێشنیازیان کرد ڕێژەی ٧٪ لابدرێو بکرێتە ١٪ بەلآم حزبەکانی تر ئەمەشیان دایەدواوە چونکە حزبی گەل بەمجۆرەش هیچ کورسییەکی وەرنەدەگرت. هەروا زەحمەتکێشان لەگەڵ (ینك) هاوپەیمان بوو لەیەك لیستدا بەمەرجێك دوو کورسییان لەلیستە هاوبەشەکەدا پێبدرێ، بەلآم بزووتنەوەی ئیسلامی قایل بوو، سۆسیالیستو شیوعی پێشنیازەکەیان پێ قبوڵ نەبوو هەرچەندە سۆسیالیست سێ کورسیو حزبی ئێمەش دووکورسی پێ دەبڕا، لەسەر ئەو بنچینەیەی لەبەر ئەوەی دوای شەش مانگ سەرلەنوێ هەڵبژاردن دەکرێتەوە بۆچی پەلە بکرێت، لەکاتێکدا هەردوو حزب بەڵێنی سەرلەنوێ هەڵبژاردنەوەیان شکاند (تا ئەم هەڵبژاردنەی دوایی کە لە٢٠٠٤دا دوای ڕووخاندنی ڕژێمی دیکتاتۆری ئەنجامدرا).

# شەڕو کوشتاری کورد و کورد

هەردوو حزبەکە، پاش ئەوەی کورسییەکانیان (پەنجا بەپەنجا) لەناوخۆیاندا دابەشکردو پەرلەمان دابەشبوو کێشەیەکی توندیان لەنێواندا دروست بوو، ئەندامانی ینک نەهاتنەوە لەکۆبوونەوەکانی پەرلەماندا ئامادە بن‌و ئیتر شەڕوکوشتاری ناوخۆ لەنێوان دوو حزبەکەدا قەوما. حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق دەستی کرد بەکۆکردنەوەی حزب‌و کەسایەتییە سەربەخۆکانی هەرێم‌و حزبەکان لەهەرێمەکانی تری کوردستاندا کە لەهەرێمی کوردستانی خوارووی دەژیان‌و چەند وەفد پێکهاتن بۆ دیدار لەگەڵ سەرکردایەتی (پدك و ینك) بۆڕاگرتنی کوشتارو چاری ئاشتییانەی ناکۆکییەکان بەڕێگای مشت‌ومڕو بەئامادەبوونی ئەوانی تر، بەلام ئێمە لەمەدا سەرکەوتوو نەبووین، کۆمیتەیەك لەحزبە کوردستانییەکان و بەرهەڵستکاریی عێراقی پێکهات بۆسەرپەرشتی شەڕ ڕاگرتن و وەك سەرەتایەکی کۆتایی هاتنی بەلام هەروا ئەمیش لە ئەرکەکەیدا ژێرکەوتو، پەیوەندیی نێوان هەردوو حزب چووە زەلکاوێکی خوێناوییەوەو، هەموو کۆششەکان بۆیەککگرتنەوەیان ژێرکەوتن‌و، تا مەسەلەکان گەیشتنە ڕوودانی ئەوەی هەرگیز بەبیرماندا نەدەهات، ئەویش ڕێکەوتنی (پدك) بوو لەگەڵ حکومەتی دیکتاتۆری‌و شۆفێنی بەعس لەسەر ناردنی هێزێکی زرێپۆش لەسوپای عێراقەوە بۆداگیرکردنی هەولێرو دەرکردنی (ینك) لەشارەکەو دانەوەی بەڕێوەبەرێتی بە پدك.

لەڕاستیدا ئەمە کارێکی لەناکاوی سەلبی بوو لای گەلەکەمان، کەوتنە پرسیار کەوابوودوژمنی گەلی کورد کێیەو کێ مافەکانی گەلەکەمانی داگیرکردووەو پیسترین شێوازی تیرۆری شۆفێنی و شەڕی کیمیایی و شەڕی ئەنفالی دژی گەلەکەمان و برافە ڕزگاریخوازە نیشتمانییەکەی و دژی (پدك) خۆی بەکارهێناوە....؟ لەرۆژی هێرشدا بۆسەرهەولێر پەیوەندیمان لەگەڵ (ینك) کرد

کەئەوکاتە کاك کۆسرەت بەرپرسی بوو پێمان گووت ئێمە ئامادەین هاوکاریتان لەگەڵ بکەین بەمەرجێ هەمووومان لەهەولێر بمێنینەوەو بەرگری لەدژی هێزەکانی حکومەت ڕێکبخەینو لەتواناشماندا هەیە ئەوە بکەین و پێویستە پەیوەندیی نێوانمان بەشێوەی بەردەوامی ڕێکخەین، بەلاّم ینك بڕیاری پاشەکشەی لەهەولێر دابوو لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە پێیان گوترابوو کەئەوان (واتە ئەمریکییەکان) هێزە هێرش بەرەکەی عێراقی بەفرۆکە بۆمباران دەکەنو ڕێگەیان نادەن بگەنە بەغدا، بەلاّم ئەمریکییەکان بەڵێنەکەی خۆیان نەبردە سەر، لەبەر ئەوە بڕیاری پاشەکشەیان لەهەولێردابوو بەلاّم ئەم مەسەلەیەشیان لەئێمە شاردەوەو پاشەکشەیان کرد بێئەوەی ئاگادارمان بکەنەوە، بۆیە ئێمەش ناچار بووین مەکتەبی سیاسی بەرینە شەقلاّوەو کۆمیتەی ناوخۆی هەولێر مایەوەو پاشەکشەی نەکرد، بارەگای کۆمیتەی ناوەندی درایەبەر هاوەنو راکێتو لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە پەلامار برایە سەر بارەگای مەکتەبی سیاسیو، هەرچی تێدابوو تالاّنکراو، لەلایەن هێزەکانی پارتییەوە هێرش کرایە سەر ماڵی هەندێ لەشیوعییەکان و لەوانەش ماڵەکەی من.

ینك پاشەکشەی کرد بۆسەر سنوور لەگەڵ ئێراندا، بۆ(ناوزەنگ)و پارتی دەسەلاّتی بەسەر هەموو هەرێمدا گرت. کاك مەسعود ڕووی کردە سلێمانیو منیش بەدوایدا ڕۆیشتمو داوای دیدارم لەگەڵ کردو دیتم و مەترسییەکانی ئەم سیاسەتەم بۆباس کرد، سیاسەتی پشتبەستن بەهێزی دوژمنو لەدژی نەیارە سیاسییەکانو موناف‌ەسەکار(نەیار) بەدوژمنی سەرەکی دابنرێتو، دووژمنی سەرەکی، بەدوژمنێکی دووەمین دابنرێ بەڵکو تەنانەت بڵێ هاوپەیمانێك ئەگەرچی بۆ کاتێکیش بێت. پێمگوت نابێ ئەمە بەسەرکەوتن دابنێینو مەسەلەکە کۆتایی هاتووە. (ینك) پەنا دەباتەبەر شەڕی پارتیزانی و پەلاماری شەوانەو بارودۆخەکە بەیەکجاری دانامرکێتەوەو، ئەمەش مانای گەڕانەوەی هێزەکانی عێراقە بۆ کوردستان بەبەڵگەی یارمەتیدانتانەوە لەدژی (ینك) جا ئاخۆ ئەم هەڵوێستە چی لێدەکەوێتەوە.

داوامکرد لەگەڵ (ینك) ئاشتببنەوەو وەفدێکیشمان بەسەرکردەیی هاوڕێ ئەبو

رەنا نارد بۆقسەکردن لەگەڵ مام جەلال‌و ڕاگەیاندنی بیرۆکەی ئاشتبوونەوە بەڵام مام جەلال دووپاتی کردەوە کە ئەوان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ کوشتار لە(پارتی)و بەمنزیکانە دەگەڕێنەوە بۆدەسەلات. چەند ڕۆژێك زیاتر تێپەڕی نەکرد هێرشی (ینك) بۆسەر شوێنەوارەکانی (پارتی) دەستپێکراو ئەمی دوایی ناچار بوو لەگشت قەزاو ناوچەکانی پارێزگای سلێمانی و لەگەرمیان (کفری)، کەلار،و صمود) و ناوچەکانی کۆیەو قەلادزەو ڕانیە پاشەکشە بکات. واپێدەچیّ ئەم پرۆسەیە لە نێودەوڵتیدا نەخشەی بۆ کێشرابێت چونکە کاتێك هێرشی (ینك) گەیشتە خاڵ‌وشوێنێکی تایبەتی شەڕی نێوان هەردوولا وەستا، لەو شوێنە خاڵی پاسەوانی دانرا وەك ئێمە لەدوو دەولەتدا بین، هێزەکانی تورکیاش هاتن بۆ چاودێریی ئاگربەست لەو ناوچانەی ناوەڕاستی سنوری هەردوولا بوون هەروا هێزی دیکەی تورکیا هاتنەناوەوەو لەهەولێر مانەوە. هەرلەوکاتەوە هەرێم بەدوو بەڕێوەبەرێتییەوە دابەشکرا، بەڕێوەبەرێتی هەولێرو دهۆك بەسەر کردەیی (پارتی)و بەڕێوەبەریی سلێمانی‌و گەرمیان‌و چەمچەماڵ‌و قەلادزەو ڕانیەو کۆیە بەسەرکردەیی(ینك). ینك هەولیدا هێرش بۆگێڕانەوەی شەقلاوەو پیرمام (سەلاحەدین)و دواجار هەولێرو ڕەواندوز دەست پێبکات، بەلام هێزەکانی تورکیاو فرۆکەو زرێپۆشەکانی پەلاماری هێزەکانی (ینك)یانداو گێڕایاندنەوە بۆشوێنەکانی خۆیان‌و (ینك) ئاگادارکرانەوە کە ڕێگەیان نادەن لەسنوری خۆیان دەرچن.

پاش کشانەوەی (ینك) بۆسەر هێڵی سنوورو دەسەلاتگرتنی (پارتی) بەسەر دەسەلاتی هەرێمدا، ئەوجا پارتی حکومەتی هەرێمی دامەزراند، پێش دامەزراندنی وەفدێکی مەکتەبی سیاسیی (پدك) هاتنە سەردانی مەکتەبی سیاسیی حزبی شیوعی‌و وەفدەکە داوای بەشداریی حزبیان کرد بەیەك وەزیر لەوەزارەتی هەرێمدا، لەباری مەبدەئییەوە بڕیاری بەشداریمان لەوەزارەتدا داو داوامانکرد وزیرێکی تریش زیاد بکریّ بەلام گوتیان لەو داوایە دەکۆڵینەوەو لەماوەی دوو ڕۆژدا وەلامتان دەدەینەوە، پرۆژەی بەرنامەی وەزارەتەکەمان بۆناردن گوتیان لێی دەکۆڵینەوەو هەروا لەماوەی دوو ڕۆژدا وەلامتان دەدەینەوە، لەپرۆژەکەدا جەخت کرابۆوە لەسەر کشانەوەی هێزەکانی ڕژێم لەهەرێم بەزووترین کات،

بـەرەڵاگردنی ئازادییـە دیموکراتییـەکانو سـەربەخۆیی وەزارەتو پابەنـد بـوون بەجێبەجێ کردنی بەرنامەکەی وهەڵدان بۆسازدانی دیالۆگ بۆئاشتبوونەوەی نێوان (پدك و ینك).. پاش دوو ڕۆژ وەفدی (پـارتی) هاتـە سـەردانی بارەگای مەکتـەبی سیاسی حزب لەشەقڵاوەو وەڵامی پێشنیازەکانمانی پێبـوو، بڕیاریـان نـەدابوو دوو وەزیرمان هەبێت بەڵکو تەنیا یـەك وەزیـر، هـەروا بڕیـاری وەزارەتـی کـشتوکاڵیان نەدابوو بەڵکو وەزارەتی تەندروستی، بڕیاریان لەسەر ئەو پرۆژەی بەرنامەیە دابوو کە بۆوەزارەت پێشکەشمان کردبوو.

بەمجۆرە وەزارەتی هەرێم بەبێ (ینك) دامەزراو وەفدێکمان ناردەلای مام جەلال بـۆ ڕوونکردنـەوەی بەشـداریمانو پێـشنیازەکانمان لەپرۆژەکـەی بەرنامەکـەی وەزارەتدا، لەوانـە دەرکردنـی هێزەکـانی عێـراق لەهـەرێم و هەوڵـدان بـۆ وتووێـژی نێـوان (ینـك و پـدك) ئـیتر (ینـك) لەهەڵوێـستمان گەیـشتن و بـێ چەندوچـوون لایەنگیری بوون.

هـەروەك لەمـەوپێش گـوتم پـاش ئـەوەی (ینـك) هێرشـی بۆسـەر شـوێنەواری (پارتی) لەناوچـەکانی سـلێمانی و قـەڵادزەو ڕانیـەو کۆیـەو گـەرمیانو چەمـچەماڵ دەست پێکردو هێزەکانی (پارتی) بۆ ئەوشوێنانەی بۆیـان دیـاریکرابوو کـشانەوە، (ینك) بەڕێوەبەرێتییەکی سەربەخۆی دامەزراندو داوای لەحزبی شیوعی کوردستان کـرد لـەم بەڕێوەبەرێتییـەدا کـەناوی لێنرابـوو (حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان) بەشداریی بکـات بـەڵام ئێمـە قایـل نـەبووین لـەم حکومەتـەدا بەشـداریی بکـەین و پێمانگوتن ئێمە بوونی دوو حکومەتی کوردستانی لەهەرێمدا پـشتگیریی ناکـەینو لەگەڵ ئەوەنین هەرێم دابەشـبکرێتو ئەگـەر ئـەم حکومـەتان ناونـا بەڕێوەبـەرێتی لەسـلێمانی و گـەرمیانو قـەڵادزەو ڕانیـەو کۆیـەو چەمـچەماڵ ئـەوا ئێمـە لـەم بەڕێوەبەرێتییەدا بەشداری دەکەین، ئەگەرنا ئەوا ئێمە لۆمـە نـاکرێین لەبەشـداری نەکردنداو، لەسەر خەباتی بـەردەوامان درێـژە دەدەیـن بـۆ یەکخـستنی هـەرێم و یەکخستنی حکومەت، بەڕێگەی دیالۆگو وتووێژ بۆچاری ناکۆکییـەکانو گەیـشتنە ئاشتبوونەوەی بـەرفراوان لەکوردسـتاندا. بـەمجۆرە خـەباتو چالاکی سیاسـیمان بـەردەوام بـوو، وامانـدانا کـە یەکخـستنەوەی هـەرێمو یەکخـستنەوەی هـەردوو

بەڕێوەبەرێتی لەحکومەتی هەرێمداو ئاشتبوونەوەی بەرفراوان ئەڵقەی مەرکەزین لەئەرکەکانماندا.

کاتێ ئاڵۆزی و کێشەو ناکۆکی نێوان هەردوو حزب (پدك و ینك) بەقۆناغی جۆربەجۆردا تێپەڕبوو، لەکێشەی هەڵبژاردنەوە بۆناو پەرلەمانی کوردستانو، ڕێکەوتن لەسەر دابەشکردنی پلەوپایەکانی دەسەلاتداری بەپێی مەبدەئی پەنجا بەپەنجا لەدەسەلاتو پەرلەمانداو خۆکێشانەوەی (پدك) لەپەرلەمانو شەڕی ناوخۆی نێوانیانو ڕاگرتنی شەڕەکەو، دابەشکردنی هەرێمی کوردستان بۆ دوو بەڕێوەبەرێتی و دەستکردنی وتوویژ لەنێوانیاندا بەئامادەبوونی هاوڕێ عەزیز محەمەدو،بەردەوامبوونی ئەم دیدارانە بەبێ هێنانەدی هەنگاوەکان بەرەو یەکێتی هەردوو بەڕێوەبەرێتی و ئەنجامدانی ئاشتبوونەوەی بەرفراوانو دواجار یەکخستنی پەرلەمان.

بەلام تانووسینی ئەم دێڕانە دابەشکردنی هەرێم و یەکخستنی هەردوو بەڕێوەبەرایەتی وەك خۆیان بێ چارەسەرکردن ماونەتەوەو پێموایە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆبەرژەوەندیی تەسکی حزبایەتی کە بۆتە کۆسپی ڕێگە چارەی ئەم مەسەلە گرنگە، جاکۆسپو تەگەرە هەرچی بنو هەرچەندێك بەرژەوەندییەکان لێکجودابنو، کێشەسیاسییەکان لەپێناو دەسەلاتدا هەرچۆنبن بەرژەوەندیی یەکبوونی هەرێم لەهەر بەرژەوەندییەکی تایبەتی بەهێزترەو، زووبێ یان درەنگ هەردەبێ ئەم ئەرکە ژێدارەی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی کوردستان بێتەدی.

# پێکهێنانی حزبی شیوعی کوردستان

مەسەلەی بنیاتنانی حزبی شیوعی کوردستان بەستراوە بەبزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستانەوە وێرای بوونی چینە کۆمەڵایەتییەکان و بوونی کێشەی چینایەتی نێوانیانو، بەشێوەی تایبەتی کێشەی نێوان جوتیارانی زەحمەتکێشو دەرەبەگو خاوەن موڵکەکانو، دروستبوونی ناوەندیی کرێکاری، وەك کرێکارانی نەوت لەکەرکوك و هێڵی ئاسنین. هاوڕێی شەهید فەهد، هەر لەرۆژانی یەکەمی دامەزراندنی حزبی شیوعی عێراقەوە، هەستی بەتایبەتمەندیی کوردستان کردبو، ئەوەبوو حزبی شیوعی عێراق مافی چارەنووسی بۆگەلی کورد بڕیارداو یەکەمین شت ئەوەی بڕیاردا کە ڕێکخستنێکی تایبەت بۆ حزب لەکوردستان بەناوی لقی کوردیی حزبی شیوعی عێراقەوە پێکبێت، دووەمین مافەکەیەتی کە بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی هەبێتو، هەروا گەلی کوردی هاندا بۆپێکهێنانی حزبێکی دیموکراسی کوردستانی لەعێراقدا. دانینا بەپێکهاتنی کۆماری مەهاباد لەکوردستانی ئێرانداو ژمارەیەك لەهاوڕێیانی شیوعی کوردی نارد بۆیارمەتیدانیو شارەزابوونی ئەزموونی ئەم کۆمارە ساوایە.

دەوڵەتی عێراق لەچەند نەتەوەیەکی جۆربەجۆر دامەزرا بەتایبەتی لەهەردوو نەتەوەی سەرەکی عەرەب و کورد کە هەردووکیان مافی چارەنووسیان هەیە. بەلاّم کوردستان خرایە سەر دەوڵەتی عێراق کە لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە نەتەوەی عەرەب فەرمانڕەوایی دەکات، گەلی کورد مافی خۆی لەبڕیاردانی چارەنوسیدا پەیڕەونەکردووە، چەندان ڕابوون و شۆڕش لەوپێناوەدا بەرپاکران، بەلاّم بەدڵڕەقییەکی شۆڤێنیستانە لەلایەن حکومەتەکانی بەرودوای عێراقەوە سەرکوتکراوە، چەندان بزووتنەوەو ڕێکخراوەو حزبی سیاسیی نەتەوەپەروەرو دیموکراسی پێکهاتوون، لەهەلومەرجی زۆرگراندا لەپێناو دەرخستنی مافەکانی گەلی کوردستاندا خەباتیانکردوەو ئەم ڕێکخراو و حزبە کوردستانییانە بەپشتگیریی و لایەنگیریی حزبی شیوعی عێراق توانیویانە بگەنە ئەو قەناعەی

کەخەبات لەپێناو سەندنی مافە نەتەوەییە ڕەواکانی لەناو دەوڵەتی دیموکراسی عێراقدا، ڕێگای ڕاستە بۆئەو خەباتەی پێویستە هاوبەش بێت لەنێوان گەلی عەرەبدا کەسەربەخۆیی و سەروەریی نیشتمانی و دیموکراتی دەوێ، گەلی کورد لەپێناو مافە نەتەوەییە ڕەواکانی لەناو عێراقێکی سەربەخۆو دیموکراتدا خەبات دەکات.

لەسەر ئەم بنچینەیە بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستانی پەرەی سەندو ڕێکخراوەو حزبە کوردستانییەکان هاتنەکایەوە تاهەریەکەیان دەوری خۆی ببینێت لەسەرکردەیی جولانەوەکەداو، بەمەش حزبی شیوعی عێراق کەوتە پێشەوەی ئەم پەرەسەندنەو ئەم واقیعە تازەیەی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستانی، هەردەشبوو بەوردی لەم پەرەسەندنە بکۆڵێتەوەو لەسەر ڕۆشنایی مەبدەئەکانی مارکسیزم-لینینیزم بۆپەرەسەندنی ڕێکخراوە حزبییەکەی بۆئەوەی دەسەلاتی فراوانی هەبێت لەناو سنوری هەرێمی کوردستانی عێراقدا، تاشوێنی خۆی لەم بزاڤەدا بگرێت و، بەچالاکی لەگەڵ حزبە کوردستانییەکان لەکاردا بێت تارۆڵی ئاسایی خۆی لەبزاڤی گەلی کوردستاندا بگرێتەبەر. بەم بۆنەیەشەوە دەبێ بڵێین حزبی شیوعی دەستیدایە پەرەپێدانی ڕێکخراوەکەی لەکوردستان بەپێی پەرەسەندنی مێژوویی بزاڤەکە خۆی، ناوەکەشی لە(لقی کورد)ەوە گۆڕی بە(لقی کوردستان)و لەلقی کوردستانەوە بۆڕێکخراوی هەرێمی کوردستان و دەسەلاتیشی بەرینترکرد بەتوانای بەستنی کۆنگرەو دانانی بەرنامە سیاسییەکەی و پەیڕەوی ناوخۆی هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکەی .

حزبە کوردستانییەکان قایل نەدەبوون هەڵسوڕان لەگەڵ ڕێکخراوی حزبی شیوعی عێراق لەهەرێمدا بکەن بەڵکو جەختیان لەسەر هەڵسوڕان لەگەڵ حزبدا دەکرد نەك لەگەڵ ڕێکخراوەکەی، لەسەر ئەم بنچینەیە دەبوو کاروباری واقیعی بگیرێتەبەر بۆگۆڕینی ڕێکخراوەکە بۆحزبێك چونکە پێویستییە ئەم ئاڵوگۆڕە دادەسەپێنێ، حزبی شیوعی عێراق خۆی ئامادە دەکرد بۆئەنجامدانی پێنجەمین کۆنگرەی خۆی، کۆنگرەی ئاڵوگۆڕو نوێکردنەوەو، لەبەرنامەی پێنجەمین کۆنگرەدا دانانی حزبێکی شیوعی لەکوردستانی عێراقدا.

ئەوکاتــە وتــارێکم نووســی کەلەڕۆژنامــەی حزبــدا لــەبارەی ئــەم مەســەلەیەوە بڵاوکریەوەو، دەمەوێ لێرەدا وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی بڵاوی بکەمەوە.

## شیوعییەکانی کوردستان چ جۆرە حزبێکیان دەوێت

*لەبارەی ڕێژەییەوە ماوەیەکی درێژە لەتــەواوی ڕێکخراوەکــانی حــزبەو دەســتە جۆربەجۆرەکانیدا مــشتومڕ دەســتی پێکــردووە لــەبارەی بەڵگەنامــەی بەرنامــەیی پەیڕەوی ناوخۆوە کەکۆمیتەی ناوەندی حزب هێنانییە بەرگفتوگۆلەسەرکردن وەك خۆئامادەکردن بۆ پێنجەمین کۆنگرەی حزب کە بڕیارە بــەم نزیکانــە ببەســترێت. هەروا کۆمیتــەی هەرێمی کوردستان لەسەر ڕۆشــنایی بڕیــاری کۆمیتــەی ناوەنــدی، بەڵگەنامــەی بەرنامــەیی هــەرێم و پــەیڕەوی نــاوخۆی بۆگفتوگــۆ لەســەرکردن بڵاوکردەوە.*

*گــرنگترین شــتێك لــەم بەڵگەنامــە ناوەنــدییو هەرێمییــەدا مەســەلەی گــۆڕینی ڕێکخــراوی هــەرێمی کوردســتانە کەببێتــە حزبــی چینــی کرێکــارو زەحمەتکێشانی کوردستان.*

*لەتەواوی مشتومڕەکانی نــاو کۆنفرانــسەکانو دەستەحزبییە جۆربەجۆرەکانــدا ئەنجامگیریی یەکگرتوو نەبوو، بەڵکو لەم گفتوگۆیانەدا چوار ڕێباز بەدەرکەوتن:*

*ڕێبازی یەکەم جەخت لەســەر ئــەوە دەکاتــەوە کــە(بــاروبۆخی حزبــی لــەبارەی ڕێکخــراوی حزبــەوە لەهــەرێمی کوردســتاندا وەکــو خــۆی بمێنێتــەوە بــەبێ هــیچ ئاڵوگۆڕێــك) واتــە بەســتەڵۆکی لەســەر ڕابــوردو، بــەبێ هــیچ ئــاڵوگۆڕێکی گــرنگ کەبەسەر بزاڤــی ڕزگــاریخوازیی نیشتمانی کوردستاندا هــاتووە، تاشــیوعییەکانی کوردستان ڕۆڵو شــوێنی خۆیــان لــەبزاڤی گەلەکەیانــداو لەبــەرەی کوردســتانیدا و لەپەیوەندییان لەگەڵ حزبە کوردستانییەهاوپەیمانەکاندا بگرن.*

*ڕێبازی دووەم جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەڕێکخراوی هــەرێمی کوردســتان ناوبنرێت حزبی شیوعی بەڵام هەروەك یەکێك لەڕێکخراوەکانی حــزب بمێنێتــەوەو، هەندێ دەسەڵاتی لەبواری هەرێمەکەدا بدرێتێ.*

ڕێبازی سێیەم جەخت لەسەر پێکهێنانی حزبی شیوعی کوردستانیی سەربەخۆو جیابۆوە لەحزبی شیوعی عێراق دەکاتەوەو، ئەم ڕێبازە لەگەڵ چالاکییەکی تری دەرەوەی حزب یەکدەگرێتەوە، دەیەوێ باز بەسەر ڕووداوەکاندا بداتو ئەم ڕێبازە لەدوورەپەرێزیو گرتنەبەری ئاسۆیی نەتەوەییەوە تێهەڵدەچێ.

ڕێبازی چوارەم کەدەمەوێ لەم وتارەدا باسی لەسەر بکەم ئەوەیە ڕێکخراوی هەرێمی کوردستان لەبارەی ڕووخسارو ناوەرۆکیشەوە بگۆڕدرێو ببێتە حزبێکی مارکسی- لێنینی، حزبی چینی کرێکارانو جوتیارانو ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێڕو تەواوی زەحمەتکێشان لەهەرێمی کوردستانداو لەپەیوەندییەکی یەکێتیدا بێت لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقدا.

لەسەرەتادا هەردەبێ مەسەلەیەکی گرنگ ڕوونبکەمەوە کە لەبنچینەدا هاوپەیوەندە لەگەڵ پێکهێنانی حزبی سیاسیی چینی کرێکارو زەحمەتکێشان کە قورسایی چەوساندنەوەی چینایەتیان لەسەرە، پێکهێنانی حزبێکی لەمجۆرە لەسەر بوونی چینی کرێکار وەستاوە لەسەر خەباتەکانی بۆچاکردنی باری گوزەرانو کۆمەڵایەتیو سووککردنی چەوسانەوەو، درێژەپێدانی خەبات، لەوڵاتانی سەرمایەداریی پەرەسەندوودا، بۆدامەزراندنی سۆسیالیزمو، کۆتایی هێنانی چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن لەلایەن مرۆڤەوەو، لەوڵاتانی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانیدا هەروا پشت دەبەستێ بەپەرەسەندنی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی لەدژی ئیمپریالیزمو لەپێناوی سەربەخۆیی نیشتمانی و دیموکراتی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا.

حزبی شیوعی عێراق لەسەر ئەم بنچینەیە لەساڵی ١٩٣٤دادامەزراوەو، ڕێکخراوەکانی مارکسی لەکوردستاندا لەساڵانی چلەکاندا دامەزراونو پێشتر ئەڵقەی مارکسیی لەناو ڕۆشنبیرانی کوردستاندا پێکهاتوونو، هەروا ڕێکخراوی حزبمان بەناوی (لقی کوردیی) حزبی شیوعی عێراق لەساڵی ١٩٤٥دا دامەزراوە.

لەڕەوتی پەرەسەندنی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستاندا، حزب ڕێکخراوەکەی خۆی لەکوردستان پەرەپێداو ناوی لێنرا (هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق) دەسەڵاتی بەستنی کۆنگرەی تایبەتی خۆیو هەڵبژاردنی

سەرکردایەتییەکەی و بڕیاردانی بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی پێدراو، لەساڵی ١٩٦٩دا بۆیەکەمجار ئەم مافەی پەیڕەوکرد کەکۆنگرەی یەکەمی پێکهات و لەوێدا بەرنامەو سیاسەتەکەی بڕیاردراو پەیڕەوی ناوخۆ نەهێنرایە پێشەوەو تەنیا ئەوەندەکرا کە بەپەیڕەوی ناوخۆی حزبەوە پابەند بین.

بزافی رزگاریخوازیی کوردستان لەماوەی ئەم ساڵانەداو هەر لەبەرپابوونی شۆڕشەکەی کوردستانەوە لەساڵی ١٩٦١دا پەرەسەندنێکی گرنگو گەورەی بەسەردا هاتووە هەرچەندە هەوڵدراوە لەڕووی راگەیاندنەوە لەنێودەوڵەتاندا تیشکی لەسەر نەبێت.

ساڵی ١٩٦٣ بۆیەکەمینجار لەدوای شەڕی دووەمی جیهانەوە، مەسەلەی کورد لەلایەن کۆماری میللی مەنگۆلیاوە خرایە پێش هەیئەتی نەتەوە یەکگرتووەکان، وەك مەسەلەی گەلێك لەسەر دەستی فەرمانڕەوایانی شۆڤێنی عێراق دووچاری چەوساندنەوەی نەتەوەیی بووەو پێویستی بەچارکردنە بەپێی مەبدەئەکانی هەیئەتی نەتەوە یەکگرتووەکان لەمافی نەتەوەکانو گەلاندا لەبڕیاردانی چارەنووسی خۆیاندا بەدەستی خۆیانو رزگاربوونیان لەچەوساندنەوەی نەتەوەییو بۆپێکهێنانی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆیان. بەڵام داواکە بەفیتی لایەنە دەوڵەتییە دیاریکراوەکان کێشرایەوە دواوە چونکە بەپێی بیروڕاو بەئەنجام گەیشتنی ئەو لایەنانە بارودۆخی نێودەوڵەتی گونجاو نییە، بەڵام من لەگەڵ ئەو بەئەنجام گەیشتنەدانیمو ئەگەر ئەو داوایەی هێنانەپێشەوەی مەسەلەی کورد نەکێشرایەتە دواوە مەسەلەی کورد لەوکاتەوە زیاتر دەبووە جێگەی بایەخی گەورەتری نێودەوڵەتان و لەوچوارچێوەیە دەردەچوو کە مەسەلەیەکی (ناوخۆیی عێراق) بێت. لەگەڵ ئەوەشدا گەلی کوردمان لەسەر خەباتی رزگاریخوازیی کۆڵنەدەرانەی درێژەیداو بەسەرکردەیی پێشڕەوە سیاسییەکانی و راپەڕینە پیرۆزە ئازایەکەی لەئاداری ١٩٩١دا و قایل نەبوون بەژیان و سەر شۆڕی بۆ رژێمی حوکمی دیکتاتۆریی شۆڤێنی و داخوازیی مافی ڕەوای خۆی لەبڕیاردانی چارەنووسی خۆیدا بەدەستی خۆی و، ئەوەبوو هەڵوێستێکی لەئاست ئەوەی گەلەکەمان دووچاری چەوساندنەوەی شۆڤێنی و دڕندانە بووە بەدەستی

فەرمانڕەوایانی بەغداوە، دەڵێین هەڵوێستێکی وای بەسەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا سەپاند چ لەبارەی میللی و ڕەسمییەوە.

بەمجۆرە مەسەلەی کورد لە مەسەلەیەکی مرۆڤایەتییەوە بووە مەسەلەیەکە پەیوەندیدار بەچارەنووسی گەلێکەوە بەڵام هێشتا پارسەنگی هێزەکانی نێودەوڵەتان و ناوخۆ نەبۆتە یارمەتیدەر بۆئەوەی گەلی کوردمان مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی بەخواستی ئازادیی خۆی پەیڕەو بکات و، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و هێزە دیموکراسی و لیبراڵەکانی ناوخۆی (عێراق) پەیڕەوکردنی ئەم مافەی گەلی کوردستانمانی لەچوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی فیدراڵدا بڕیارداوە، ئەمەش بەپێکهێنانی کۆمارێکی کوردستانی فیدراڵی. لەم دواییەدا گەلەکەمان ئەمەی پەیڕەوکرد و لەوەدا دەرکەوت کەئەنجومەنێکی نیشتمانی کوردستانیی هەڵبژارد و حکومەتێکی هەرێمی دامەزراند و لەڕێگەیە بۆدانانی دەستورێکی فیدراڵی و دانانی یاساو سیستەمەکانی هاوپەیوەند بەم قەوارە سیاسییەوە.

ئاڵوگۆڕەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی کوردستان و پێداویستەکانی ئاڵوگۆڕ لەژیانی ناوخۆیی حزبدا، وای لەسەرکردایەتی حزب کرد کە ئەم باروتۆخە تازەیە لەلایەنی سیاسی و ڕێکخستنەوە لەبەرچاو بگرێت و لێیبکۆڵێتەوەو، بڕیاریدا ڕوو لەئاڵوگۆڕی جەوهەری بکات لەمامەڵەکردندا لەگەڵ هەموو ئەوانەی ژیان تازەگەریی هێناوەتە پێشەوەو، ڕانەوەستان لەڕووی خواستی شیوعییەکانی کوردستاندا کە دەیانەوێ لەبزاڤی رزگاریخوازیی گەلی کوردستانداو لەبەرەی کوردستانیدا ڕۆڵی خۆیان بگێڕن و، بەچەشنێکی کاریگەرانەو بەسود لەبنیاتنانی نیشتمانەکەیان و گەلەکەیاندا بەشداریی بکەن و، هەستکردنیان بەبەرپرسی لەئاست ئەم ئەرکە گەورەو پیرۆزەدا بەرزبکەنەوەو ببنە شایانی بەرزکردنەوەی ئاڵای مارکسیزم–لینینیزم لەکوردستانی نیشتمانیانداو، بەرگری لەمافەکانی زەحمەتکێشان و سەرکردەیی خەباتیان لەپێناو دیموکراسی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا.

من پیموایە دەبێ ئەم حزبە لەسەر ئەم بنچینانەی خوارەوە دابمەزرێت:

١. پێکهێنانی حزبێکی شیوعی بۆهەرێمی کوردستانی عێراق.

٢. ڕاستەوخۆ بەرپرس بێت لەبەستنی کۆنگرەی نیشتمانی بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ ناوەندێکی دەرەوەی خۆی بکات. بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی بڕیاربدات وسەرکردایەتییەکەی، کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی (جێبەجێ کردن وسیاسی) هەڵبژێرێت.

٣. حزبی شیوعی هەرێمی کوردستانی عێراق تەواوی بەرپرسیی لەئەستۆیە بۆنەخشەکێشانی سیاسەتی تاکتیکی و ستراتیژیی خۆی و هەرچی پەیوەندی بەکاروباری هەرێمی کوردستانی عێراقەوە هەبێت.

٤. لەبەر ئەوەی هەرێمی کوردستان هێشتا لەناو هەرێمی فیدراڵیدایە لەگەڵ کۆماری عێراقی فیدراڵ پێویستە حزبی شیوعی عێراق بەرپرس بێت لەهەموو کاروبارەکانی عێراق، بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی تایبەتی و کۆنگرەو سەرکردایەتی و سیاسەتەکەی هەبێت.

٥. دامەزراندنی پەیوەندییەکی فیدراڵی لەنێوان حزبی شیوعی عێراق و حزبی شیوعی هەرێمی کوردستاندا بەیەکسانی تەواو.

٦. یەکێتییەك لەنێوان هەردوو حزب دروست دەکرێ بەناوی یەکێتی شیوعییەکانی عێراق و یەکێتییەکە کۆنگرەیەکی یەکگرتوو دەبەستێ لەنوێنەرانی هەردوو حزب بەرنامەیەکی عێراقی بەهەردوو بەشەکەیەوە، عێراقی و کوردستانی و پەیڕەوێکی ناوخۆ کە پەیوەندی هەردوو حزب ڕێکدەخات بڕیاردەدات. سەرکردایەتییەکی یەکگرتووش هەڵدەبژێرێ کە ئەم یەکێتییە سەربەخۆیی هەردوو حزب لەسنووری هەردوو هەرێمی عێراقی و کوردستانیدا لەدەست نەدات، کەهەردوو لایان خۆیان بەرێوەبەرێتی کاروبارەکانیان ئەنجام بدەن، وێڕای پابەند بوون بە بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی یەکێتییەکەوە.

# هۆکارەکانی پێکهێنانی دوو حزب و یەکێتی نێوانیان

ڕەنگە هەندێ کەس بەلایانەوە سەیر بێت لەولاتێکی فرەنەتەوەدا دوو حزب هەبن چونکە لەسەر هەندێ نەریتی هەڵەی ناوجولانەوەی شیوعی ڕاهاتوون کە جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە لە دەوڵەتێکدا حزبێکی شیوعی هەبێت، بەڵی لەگەڵ ئەم مەسەلەیە ئاوا مامەڵەمان دەکرد بێ ئەوەی سەرنج و قوڵبوونەوەمان هەبێت لەسەر پەرەسەندنی بزافی نیشتمانی و بزووتنەوەی چینی کرێکار و پەرەسەندنی زانستەکان، بەتایبەتی پەرەسەندنی تەکنەلۆژیی یەکجار زۆرو کارکردنی لەسەر هێزەکانی بەرهەمهێن و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان، هەروا جیاوازی نێوان دەوڵەتێکی پێکهاتەی یەك نەتەوەو دەوڵەتێکی دوو نەتەوە یان فرەنەتەوە. ئەم نەتەوانە کەلەپەرەسەندنی کۆمەلایەتی و مێژوویی و پێکهاتەی دەروونی و ڕەسم و دابونەریتیشدا لەیەکتری جیاوازن... لەهەلومەرجی دەسەلاتداریی بەستەلۆکیی بیروباوەڕدا (دۆگماتیزم) لەناو جولانەوەی شیوعییدا ژیان هەندێ باری ئالۆزکاوی سەپاند کەپتر لەحزبێکی شیوعی لەدەوڵەتێکی فرەنەتەوەدا پێکبێت، وەك یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو چیکوسلۆڤاکیاو هندو ئیسپانیاو یوگۆسلاڤیا ئەم حزبانەش هەموویان لەحزبێکی یەکێتیدا یەکیان دەگرت، هەرچەندە بیرۆکراسی و ناوەندێکی تەواوی ڕووی ڕاستیی دامەزراندن و سەربەخۆیی ئەم حزبانەیان لەکۆمارە یەکگرتووەکانداو یان لەناوچەو یان هەرێمەکانیاندا شێواندبوو.

شیوعییەکانی فەلەستین و ئەردەن لەحزبێکدا بوون، کەحزبی شیوعی ئەردەنی بوو، جاوێرای هەلوێستە باشەکانی حزبی شیوعی ئەردەن لەبواری مەسەلەی فەلەستینداو بایەخی تایبەتی بەو مەسەلەیە، بەلام شیوعییەکانی فەلەستین نەیاتوانی ڕۆڵی خۆیان لەبزافی نیشتمانی فەلەستین و لەڕێکخراوی ڕزگاریخوازدا

ببینن چونکه لەحزبی شیوعی ئەردەنیدا بوون. لەبەر ئەوە حزبی شیوعی فەلەستینییان پێکهێنا. هەر لەوکاتەشەوە ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن و لەبزافی ڕزگاریخوازیی فەلەستینداو لەڕێکخراوی ڕزگاریدا ڕۆڵی خۆیان دەبینن و، چالاکی و تەقەلای خۆیان بۆ مەسەلەی ڕزگاریی نیشتمانەکەیان تەرخان کردووە، هەرچەندە شیوعییە فەلەستینی و ئەردەنییەکان سەر بەیەك نەتەوەن کەنەتەوەی عەرەبە.

دەمەوێ لەو هاوڕێیانە کەدژی پێکهێنانی حزبی شیوعی هەرێمی کوردستانی عێراقن بەیەکسانی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقداو یەکێتی هەردوو حزبەکە بپرسم‌و بڵێم: ئاخۆ ئەو هاوڕێیانە لایەنگیریی ئەوە دەکەن کەحزبی شیوعی فەلەستینی بەشێك بێت یان ڕێکخراوێك بێت لەڕێکخراوەکانی حزبی شیوعی ئیسرائیلی. لەسەر ئەو بنچینەیەی فەلەستین حوکمی زاتی دەبێ بۆکاتێکی کورت یان درێژ؟

جا ئەگەر وەڵامەکە بە نەء بێت‌و هەردەشبێ وابێت جائیتر بۆچی لەوانە داوادەکەن حزبی شیوعی کوردستان بەشێك بێت لەڕێکخراوەکانی حزبی شیوعی عێراق؟ یان ڕێکخراوی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق هەروەکو خۆی بمێنێتەوە بەبێ هیچ ئاڵوگۆڕێکی جەوهەری لەقەوارەیەکدا جگە لەناوگۆڕین لەگەڵ هەندێ ئیمتیازاتی کەمدا؟! هەروا هەڵوێستە مەبدەئییەکانی حزبی شیوعی عێراق لەمەسەلەی کورد هەڵوێستی باش‌و بەجێیەو هەموو کەس پەسەندی دەکات، هەرلەسەرەتای لەدایکبوونییەوە وابووە، بەڵام شیوعییەکانی عێراق جێی شیوعییەکانی کوردستان ناگرنەوە بەتایبەتی لەپێکەوەبوونیاندا لەگەڵ گەلە ڕەنجدەرەکەیانداو بزافی ڕزگاریخوازیی کوردستان‌و پێشڕەوە سیاسییەکانی. هەرئەوانن پێش هەرکەس مەسەلەی گەلەکەیان لاگرنگ بێت بەڵام پێویستیشیان بەپشتیوانی‌و لایەنگیری نێونەتەوەییە لەلایەن هاوڕێ شیوعییەکانی عێراقیان‌و هاوپەیمانەکانیانەوە لەهێزە دیموکراتییەکان بۆ مەسەلەی ڕزگاریی نیشتمانی‌و مافی گەلی کوردستان لەبڕیاردانی چارەنووسیدا.

من بەتەواوی لەوباوەڕەدام کاتی ئەوە هاتووە حزبی شیوعی هەرێمی کوردستانی عێراق پێکبێت و حزبێکی سەربەخۆبێت لەنەخشەکێشانی

سیاسەتەکەیداو لەبەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆیداو لەبەردەم گەلی کوردستانو چینی کرێکارو زەحمەتکێشانیداو لەبەردەم برافی ڕزگاریخوازیی نیشتمانیدا بەرپرسە. دەبێ شیوعییەکانی عێراقیش دڵخۆش بن بەم کۆڕپە تازەیە کە لەحزبی شیوعی عێراقەوە پەیدابووەو پەروەردە بوونو فێربوونو تێگەیشتنیو پێکهێنانی قەوارەکەیو پەروەردەبوونی بەگیانی نێونەتەوەیی لەسەر دەستی ئەم حزبە دایکە ئەنجامدراوە.

لەسەر حزبی دایك پێویستە بەتەنگ ئەم کۆڕپەیەوە بێت دەستگیرۆیی بکات تا ڕابێ و لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ و بەهەنگاوی جێگیر بەرێگای خزمەتکردنی مەسەلەی کوردستاندا بەکوردو تورکمان و کلدو ئاشوریەوە بڕوات و لەسەر کارو خەبات بەردەوام بێت بۆپتەوکردنی پەیوەندی برایانە عەرەب و کورد و کەمینە نەتەوەکان لەیەك دەوڵەتی یەکێتی ئارەزوومەندانەدا، نەك ئەم حزبە هەر(بەناو) لەدایك بێت و پەککەوتەو شێواو و لەژیانی سیاسیی کوردستاندا لەپەراوێزدا بێت، بێ ئەوەی گەلەکەمان بوون و دەورگێڕانی لەبزافی رزگاریخوازیی گەلی کوردستانماندا هەست پێبکات.

هەلومەرجەکە بۆ بەرژەوەندیی فرەلایەنی و دیموکراسی گۆڕدراوەو، شتەکان وەك پێشان لەباری ڕاوەستاودا نەماونو ڕاستیش نییە لەسەر هەندێ کاتێگۆری بمێنێتەوە(هەروەك مەبدەئمان بنو نەگۆڕدرێن!) چونکە یاسایەکانی دیالەکتیك جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بزووتنەوەی شتەکان بەردەوامنو بەردەوامیش لەبارێکەوە بۆبارێکی تر دێنە گۆڕین، ئەمەش لەئەنجامی گردبوونەوەی چەندایەتی و ئاڵوگۆڕیی چلۆنایەتی. جائەگەر لەڕابردووی نزیکدا هەندێ ئەحکام ڕاست بووبن، مانای وانییە ئەمڕۆش هەر ڕاستن. ئەمڕۆ لەڕوسیاو هەندێ وڵاتی تر پتر لەحزبێکی شیوعی هەن ، بێئەوەی کێشەی دوژمنانەیان لەناودا بێتو، یەکتریش دەبینن و کۆبوونەوەی هاوبەشیش دەکەن و هاوکاریشیان دەبێ، لەڕابردوودا کێشە لەنێوان حزبە شیوعییەکان و حزبە سۆسیال دیموکراتەکاندا هەبوونو سروشتێکی دوژمنانەو نارێکەوتنی هزری و پێکنەگەیشتنیان لەنێواندا بوو، بەلام ئەمڕۆ سروشتی هاوکاریو هاوپەیمانیو دیالۆگی بنیاتنەرانەیان لەخۆگرتووە بۆگەیشتنە

هێنانەدی بەرەکانی چەپو لەوانەیە لەسەر مەسەلە ستراتیژییەکانیش بەتەواوی بگەنە یەك. لەڕابوردووی نزیکدا زۆر مەسەلە هەبوون (قەدەغەبوون) بەڵام ئەمڕۆ بوونەتە پێداویستییەکانی ژیان.

ئەرکی شیوعییەکانە لەومەسەلە تازانەی ژیان دەیانهێنێتە پێشەوە بەچاکی تێبگەن و لێیان حاڵی بن ئەگەر وانەکەن لەڕەوتی پرۆسەی شۆڕشگێڕانەی دنیای ئەمرۆمان دوادەکەون بەتایبەتی لەو ئاڵوگۆڕە مەزن و زۆرانەی لەهەموو لقەکانی زانستدا، بەتایبەتی لەبواری تەکنەلۆژیو ئاسمانی دوورو کۆمپیوتەردا ژیان هێناونیەتەپێشەوە. هاوڕێیانیش وەك خەڵکی تر لەیەك ئاستی رۆشنبیریو زانستو تێگەیشتنی تازەگەریو شیکردنەوەو بەئەنجام گەیشتندا نین، کاتێکیش مەسەلەی گۆڕینی ڕێکخراوی هەرێمی کوردستان بۆ حزبی شیوعی کوردستان هاتە پێشەوە لەلایەن شیوعییە عێراقییەکانەوە وەکو یەك لێی تێنەگەیشتنو، بەهەڵوێستی جۆربەجۆر ڕووبەڕووی بوونەوەو هەندێ لەهاوڕێیانی عەرەب بەجۆرە حەساسییەتێکی نەتەوەیی شۆڤێنی بەرەنگاری بوونەوەو دایانە دواوەو لەلایەن هەندێ لەشیوعییە کوردەکانیشەوە بەجۆرێك لەبەرچاوتەنگی نەتەوەییو دەمارگیری و دوورە پەرێزی نەتەوەیی ڕووبەڕووی بوونەوەو داوایانکرد سەربەخۆییو جیابوونەوەی تەواوی لەحزبی شیوعی عێراق هەبێت.

ئاشکراو دیارە کەهەمیشە شیوعییەکان هەڵوێستی پشتیوانو لایەنگرییان لەدەرەوە دەبێ لەمەسەلەی گەلانداو رزگاربوونی نیشتمانییان لەداگیرکاریو خستنەسەرو پێوەلکانی بەزۆرو، لەئاست مافی خۆیان لەبڕیاردانی چارەنووسدا بەمافی هێنانەدی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆشیانەوە، بەڵام لەناوەوە شیوعییەکان یەکێك لەگرنگترین گۆشەی پێشڕەوە سیاسییەکان پێکدێنن لەپاڵ پێشڕەوە نیشتمانییەکانیتردا، لەخەباتدا لەپێناو هێنانەدی ئامانجەکانی گەلەکەیاندا لەرزگاریی نیشتمانیو هێنانەدی سەربەخۆییو دیموکراتیو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا. یان لەپێناو یەکێتی برایانەی ئارەزوومەندانەداو، هێنانەدی قەوارەیەکی سیاسی فیدراڵی لەدەوڵەتێکی دوونەتەوە یان فرەنەتەوەدا. لای ئێمە هێشتا پێداویستییەکانی هێنانەدی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆ

لەئارادانین‌و هۆکارەکانی ئەمەش هاوپەیوەندن بەهەلومەرجی دەرەوەو ناوخۆوە. بەلاّم هەندێ لەشیوعییەکانی نەتەوەی گەورەی فەرمانڕەوا دەکەونە هەڵویستی دژ بەپەیڕەوکردنی مافی چارەنووس لەلایەن نەتەوە ژێردەستەکەوە ئەمەش لەکاتێکدا کە پێداویستییەکانی پەیڕەوکردنی دێنە پێشەوە (چ سەربەخۆیی یان یەکێتی ئارەزوومەندانە)! بەمەش لەڕاستیدا دەبنە نەتەوەپەروەری شۆڤێنی.

لێرەدا دەمەوێ بڵێم مەبدەئەکانمان و تیۆریەکەمان کە مارکسیزمی لێنینیزمەو بەرنامەو پەیڕەوەکانی ناوخۆمان هەردەم جەخت لەسەر مەبدەئی مافی بڕیاردانی چارەنووسی بچووك‌و گەورەی گەلان دەکەنەوە، بەپێکهێنانی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆشەوە.

جا ئەگەر ئەمە لەبارەی سیاسییەوە گونجاوبێت، ئەی بۆچی گونجاو و هەقێکی ڕەوای شیوعییەکان نەبێت، بۆنەتەوەو گەلانی ژێردەست‌و زۆرلێکراو، کەحزبی شیوعی سەربەخۆیان لەناو هەرێمە نەتەوەییەکەیاندا یان لەناو کۆمارە یەکگرتووەکەیاندا پێکبێنن‌و پەیوەندیی برایانەی یەکێتی لەگەڵ حزبی شیوعی نەتەوەی سەردەستدا دامەزرێنن؟

لەوباوەڕەدام ئەمە زۆر پێویستە و هەردەبێ وابێ چونکە یەکێك لەمەرجەکانی سەرەکیی دامەزراندنی حزب لەم حزبەشدا هەیەو لەسەر بوونی قەوارەیەکی سیاسیی پێکهاتووە (سەربەخۆبێ یان یەکگرتوو) بۆنەتەوەی ژێردەستەو زۆرلێکراو، کەئەمەش بەپێی دەستورو یاساکان و سیستەمە تایبەتەکانی هەرێمی ئەو نەتەوەیە دیاری دەکرێ‌و، دەستەی یاسادانان‌و جێبەجێ کردنی هەیە، وێرای بوونی دەستورو یاسایەکان ودەسەلاّتی یەکێتی یاسادانان‌و جێبەجێکردنی هاوبەش. هەموو ئەمانە شیوعییەکان ناچاردەکەن کە ڕێکخستنی حزبی خۆیان لەچوارچێوەی ئەم دامەزراوە هەرێمی‌و نەتەوەیی‌و یەکێتییەدا پێکبهێنن.

جارێکی تریش، کەئێمە بەرەو بەستنی دووەمین کۆنگرەی هەرێمی کوردستان وپێنجەمین کۆنگرەی حزب دەڕۆین، داوا لەهەموو شیوعییەکان‌و بەتایبەتی شیوعییەکانی کوردستان دەکەم، ئەم مەسەلەیە بەگیانێکی حزبی بەرزوهەستی بەرزی بەرپرسیارییەوە گفتوگۆی لەسەر بکەن‌و بەرپرسانە لەئاست هێنانەدی

حزبی شیوعی هەرێمی کوردستانی عێراقدا بنو، بۆپاراستنی یەکێتی حزبی شیوعی عێراق بەهێنانەدی یەکێتی هەردوو حزب بەناوی یەکێتی شیوعییەکانی عێراقەوە. داوا لەهاوڕێیانی عەرەبیش دەکەم کەئەم مەسەلەیە باش تێبگەن و دەستپێشخەری پەسەندکردنی بەگیانێکی نێونەتەوەیی ڕاستگۆیانەوە بکەن. هەروا داوا لەهاوڕێیانی کوردستانی دەکەم کەدەستبەرداری دەمارگیریی نەتەوەیی و دوورەپەرێزی بن و کۆششیان تەرخان بکەن بۆ بیرۆکەی دامەزراندنی حزبی شیوعی هەرێمی کوردستان و یەکێتی نێوان ئەم حزبەو حزبی دایك، حزبی شیوعی عێراقی سەربەرزمان.

من بەتەواوی دڵنیام لەگەیشتنە ئەم ئامانجە پیرۆزە تاڵای مارکسیزم-لینینیزم لەئاسمانی کوردستان و هەرێمی کوردستاندا بشەکێتەوەو، برایەتی عەرەب و کورد و کەمینە نەتەوەکانی تورکمان و کلدو ئاشور بچەسپێت و، عێراقی یەکگرتووی دیموکراسی ببێتە نیشتمانی برایەتی نەتەوەیی ڕاستەقینە.

هەروا دەمەوێ خوێنەری بەرێز لەو مشتومڕە ئاگادار بکەم، نەك تەنیا لەبارەی پێکهێنانی حزبی شیوعی کوردستانەوەو بەس، بەڵکو هەروا لەبارەی پەیوەندیی هەردوو حزبەوەو، ئەمەش لەکۆنگرەی دووەمی ڕێکخراوی هەرێمدا کە پێکهێنانی ئەم حزبەی تێدا بڕیاردراو لەکۆنگرەی پێنجەمی حزبی شیوعی عێراقدا، کە بیرۆکەی فیدراڵی(یەکێتی) تێدا باسکراو، ئەم باسە لەهەردوو کۆنگرەی یەکەم و دووەمی حزبی شیوعی کوردستانیشدا دووبارە کرایەوەو هەروا لەشەشەمین کۆنگرەی حزبی شیوعی عێراقدا خرایە بەرباس، بەڵام ئەم پەیوەندیی یەکێتییەی نێوان هەردوو حزب پەسەند نەکراو، دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە من هێشتا لەسەر ئەو باوەڕەم کە باشترین پەیوەندیی ئەوەیە هەردوو حزب پەیوەندیی یەکێتییان لەنێواندا بێت. هەموو جارێکیش من بیروڕای تایبەتی خۆم دەپاراست و، ڕووداوەکانیش سەلماندیان کەپەیوەندیی ڕاستیی ئێستای نێوان هەردوو حزب لەپەیڕەوکردندا پەیوەندییەکی یەکێتییە بۆ ئەوەی لەمەدا دەقێك هەبێت. حزبی شیوعی کوردستان سەربەخۆیی تەواوی لەنەخشەکێشانی سیاسەتی خۆیداو لەهەڵوێست گرتنەبەرو پێکهێنانی کۆنگرەکانی و لەهەڵبژاردنی

سەرکردایەتییەکەیدا بەبێ هیچ دەستێوەردانێکی حزبی شیوعی عێراق پەیڕەو دەکات، ئەوەتە پێکهێنان‌و قەوارەی حزبی شیوعی عێراق بۆتە ڕاستییەك لەبزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی کوردستانداو، ئەم حزبە بۆیە لەدایك بووە تاپێبگات‌و گەورەبێت تائەرکەکانی خۆی کۆتایی پێبهێنێت لەهێنانەدی مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلی کوردستانمان لەعێراق وپاشان ڕووکردنە هێنانەدیی یەکبوونی کوردستان‌و دامەزراندنی کۆمەڵگەی دیموکراسی‌و دادپەروەریی کۆمەلایەتی‌و بنیاتنانی سۆسیالیزم.

زۆر لە شیوعییەکان لەکێشەی هزری و ناوخۆیی لەحزبدا حاڵی نەبوون‌و، بەچەشنێکی مەبدەئی وای تێنەگەیشتوون کەمەسەلەیەکی پێویست‌و ژیارییە لەحزبداو، بێ ئەوە حزب دەبێتە جەستەیەکی بەستەڵۆکی بێژیان. ئەمە لەکاتێکدا حزب وەك هەرزیندەوەرێکی زیندوو لەدایك دەبێ‌و پێدەگاو گەورە دەبێ‌و پیردەبێ‌و پاشان بەهێنانەدیی ئامانجە ستراتیژییە دوورەکانی کۆتایی دێت‌و، هەموو ئەم پێکڕاڵکان وپەرەسەندنەش لەکۆڕی کێشەی نێوان ڕاست و چەوت و نێوان لەدایکبوونی نوێ و مردنی کۆن و، لەنێوان هۆشمەندیی و لەخۆوە تێهەڵچوون ڕوودەدا.

هەستکردن بەلەدایکبوونی نوێ کارێکی گرنگە لەکارو چالاکی حزبداو، لەسەر ڕۆشنایی ئەمەیە حزب سیاسەتی خۆی دیاری دەکات و بیروڕایەکانی پەرەپێدەداو هەر لەسەر ئەم بنچینەیەش بوو بیرۆکەی دامەزراندنی حزبی شیوعی کوردستان لەساڵی ١٩٥٣-وە پەیدابووە. لەگەڵ هاوڕێ سەلام عادل (ئەبو ئیمان) بەشێوەیەکی سەرەتایی ئەم مەسەلەیەم باسکردووە بەڵام هاوڕێ سەلام لەگەڵ ئەم بیرۆکەیە تەبابوو دەیگوت ئەم مەسەلەیە یان بیرۆکەیە ڕۆژێك دێ پێبگات و پێبەپێی پەرەسەندنی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان خۆی بسەپێنێت. کاتێکیش ئەو بیرۆکەیە هێنرایە ناوەوە کە ڕێکخراوی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی عێراق بگۆڕدرێ بەحزبی شیوعی کوردستان، لێتێگەیشتنی لەناو حزبی شیوعی و ڕێکخراوی هەرێمدا جیاواز بوو، هەندێك لەگەڵیدا بوون هەندێك بەرهەڵستکاربوون، لەبارەی بەرهەڵستکارانەوە، دەیانگوت ئەمە لەیەك دەوڵەتدا نابێ دوو حزبی

شیوعی هەبن، کەسانی تر هەبوون دەیانگوت ئەمە کارێکی کەرتکارانەیەو دەبێ لێپرسینەوەی لەسەر بکرێت، داواکارانی حزبی سەربەخۆی شیوعی کوردستان بەرهەڵستی ئەمەبوون کەباسمکرد، بەڵام ئەوانەی لایەنگیری بیرۆکەی دامەزراندنی حزبی شیوعی کوردستان بوون لایەنگریی ئەو بەندەیان نەکرد سەبارەت بەپەیوەندیی فیدراڵی نێوان هەردوو حزبو، ئەو دارشتنەیان هێنایە پێشەوە کە لەپەیڕەوی ناوخۆی حزبی شیوعی کوردستاندا هاتووە، هەروەك ڕوونیشمکردەوە من تائەمرۆش دەستبەرداری بیرۆکەی فیدراڵی نێوان هەردوو حزب نەبووم. هەردەبێ ڕۆژێك بێت کەئەم بیرۆکەیە پێبگات؟

لەم بوارەشدا دەمەوێ بۆهاوڕێیانی حزبی شیوعیم جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە ئەرکی سەرشانیانە پابەندبن بەمەبدەئەکانی کێشەی فیکری لەناوحزبداو، بڕیاریش هەرهی زۆربەیە ئەگەرچی ڕاست بێت یات هەڵەبێتو، کەمایەتی وەك هزر دەمێنێتەوەو بەس، لەوانەش ڕووداوەکان درێژ یان کورت بخایەنن ڕاستو دروستی هزری کەمایەتی دەربخەنو، لەبارێکی واشدا لەوانەیە بگۆڕدرێ بۆزۆربە. دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوەش بکەمەوە کەئەوە هەناسەیەکی درێژو بەردەوامی پێدەوێ، هەروا دەڵێم ئەو شتەش کە شیوعی قاڵدەداو دەیکاتە شیوعییەکی ڕاستەقینە، نەبەزیو ئازاییەکەی لەپێش دوژمناندا نییە چونکە ئەمە شتێکی بەڵگە نەویستەو هەردەبێ وابێ، بەڵکو وێڕای ئەوەش دەبێ خۆڕاگربێت لەکێشەی ناوخۆیی حزبدا، چونکە ئەم کێشەیە بەزۆر شێوازو مەبەست بەڕێوەدەچێت: هەندێکیان مەبدەئینو هەندێکیان دووەمینو هەندێکیشیان کەسایەتیو هەلپەرستانەنو هەشیانە بەشێوازێکی چەوتو تەنانەت ووروژێنەرانەش دەهێنرێنە ناوەوە.

زۆر لەکەسانی شیوعی باش بەرگەی ئەم کێشە جۆربەجۆرانەیان نەگرتو لەحزب دەرچوونو دوورکەوتنەوەو، زۆریشیان کەوتنە سەر هەڵوێستی دوژمنایەتی کردنی حزبو دەستیاندایە تێکدانی یەکێتی حزب بەتایبەتی ئەوانەی ڕەوشتیی خۆخۆییان بەسەریاندا زاڵبوو... مێژووی کەرتبوونەکان لەناو حزبی شیوعی عێراقماندا شایەتی ئەمەیە، لەبەر ئەمەشە دەبێ شیوعی پێشبینی ڕووبەڕوو

بوونەوەی هەموو ئەم کێشانە بکاتو، دەبێ بەرگەیان بگرێت و بەچەشنێکی ڕاست بەشدارییان تێدا بکاتو هەڵنەخزێتە سەر کێشەی کەسێتی خۆبەخۆو ورووژێنەر. مــن لــەڕەوتی حزبیمــدا ڕووبــەڕووی ئــەم کێــشانە بوومەتــەوەو لەگـــەڵ چەرمەســەرییەکانیاندا ژیــاوم، بــەڵام بــەهیچ جۆرێــك نەخزاومەتــە ســەر شــتی خۆبەخۆمو ورووژێنەر، بەدرێـژایی هێڵەکـەش پابەنـدی کێشەی مەبدەئیو ڕاستو دروست بوومو، لێرەدا نامەوێ چەندان نمونـەی ئەمـە بـاس بکـەم چـونکە هەنـدێ لەهاوڕێیان دەگرێتەوەو ئەمەش خزمەتی حزب ناکات.

# سەفەرکردن بۆ مۆسکۆ بەڕێگای نهێنی

زۆرجار سەردانی مۆسکۆم کردووە لەکاتی خوێندنیشمدا لەقوتابخانەی حزب دووساڵی تێدا ژیاومو ئەمانەش هەمووی بەشێوەیەکی ئاسایی بوون و پەساپۆرتم هەبووەو بەفرۆکە سەفەرم کردووە کەماوەی چەند سەعاتێك و بێ ماندوو بوون دەگەیتەجێ. بەلآم جارێکیان نەدەتوانرا بگەمە شامو لەوێشەوە بگەمە مۆسکۆ چونکە ئەوکاتە لەسەر سنوری عێراق و ئێرانو تورکیا بووم لەناوچەی (خواکورك) ئەمەش دوای ئیمزاکردنی پێکهێنانی بەرەی کوردستانی و بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی لەساڵی ١٩٨٨دا. حزب لەشوێنێك مەحەتەیەکی هەبوو کاری گەیاندنی هاوڕێیان بوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت و ئەفغانستان بەشێوەی نهێنی. منیش دووچاری هەندێ نەخۆشی بووم بۆیە مەکتەبی سیاسی بڕیاری دا بۆچارکردن سەفەری مۆسکۆ بکەم.

جابەم ڕێگە نهێنییە گەیاندمیانە مەحەتەکەو دوو ڕۆژ لەوێ مامەوەو دوای ئەوە دامیانە دەست (قاچاغچی)و سواری ئۆتۆمبیل بووینو کاتێکی درەنگ گەیشتینە شوێنێ تێپەڕبوون لەسنووری شورەوی و پیشانیاندام کە ئەمە ئەو شوێنەیە دەبێ لێوەی تێپەڕیم.

شوێنەکە دۆڵێکی لێژو قووڵبوو بۆ چوونە خوارەوە دەبوو لەسەر زەوییەکە دانیشیت وبەرەوخوار بەولێژییەدا بەزەوییەکی بەردو ڕەقدا خۆت بەردەیتەوەو بخلیسکێیتە خوارەوە، جانتایەکیشم پێبوو کە جلی ژێرەوەو تاقمی تەراشو پێلآوی تێدا بوو. تەماشامکرد زەحمەتە بەم درەنگە ئەم سەرچڵییە بکەم بەلآم لەناخی خۆمدا بڕیارمدا کە دەبێ ئەمەبکەم، بۆیە دانیشتمو قاچەکانم بۆ پێشەوە درێژکردو بەخێرایی بەو بەرەولێژییەدا خۆم بەردایەوەو بەرەوخوار بێ هیچ تەقەلایەك شۆڕبوومەوەو بەردە وردەو خۆڵ بەسەروپشتماو بەگشت لەشما دەکەوتنە خوارەوەو، گەیشتمە بنەوەی دۆڵەکەو ئیتر دەبوو بەبەرزایی ئەوبەری

شۆڕەویدا هەڵگەڕێمو پێش ئەوەی بەتەواوی تاریك بێت تێپەڕیم، بەخێرایی بەو بەرزاییەدا هەڵگەڕام تا گەیشتمە تەلە دڕکاوییەکانی سنوور کە ڕێگەی دەوریـیەی پاسەوانی سنوور بەدرێژایی سنورو بەنزیکیدا تێپەڕ دەبێت، کەمێك وەستام تاپشوویەك بدەم چونکە ماندوو بووم بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بەم تەلە دڕکاوییانەدا تێپەڕیمو، هەوڵمدا کەمێك تەلەکان بەرز بکەمەوەو بەژێریدا بخشێم، پاش تەقەلایەکی زۆرو دڕاندنی جلەکانم بەتەلەدڕکاوییەکانو ڕوشاندنی لەشم لەتەلەکان تێپەڕبوومو تەماشام کرد ڕووناکییەك بەدیارکەوتو فیکەو جەرەس لێدرا پاش دوو خولەك چەند سەگێك دەرکەوتن کە بەرەوڕووم دەهاتن منیش لەجێی خۆم بێ جووڵە دانیشتم، سەگەکان گەیشتنو لەبەرامبەرم چۆکیان دادا بێ ئەوەی پەلامارم بدەن، دوای کەمتر لەپێنج خولەك ئۆتۆمبیلی پاسەوانانی سنوور گەیشت، دەوریاندامو بەوردی گەڕامیانو پاش ئەوەی دڵنیا بوون کە چەکم پێنییە دەستیان بەلێکۆڵینەوە لەگەڵمدا کرد، پرسییان کێمو بۆچی بەم ڕێگەیەدا هاتوومو چۆن تێپەڕبووم...تاد. ئینجا چاویان بەستمەوەو سواری ئۆتۆمبیلیان کردمو بەچاوبەستراوی بردمیانە نزیکترین خاڵی سنوور، ئینجا ئەفسەرێکی بەرپرس هاتو دەستی بەلێکۆڵینەوە کرد گوتم پەیوەندی بەکۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی سۆڤیەتەوەو فلان کەسەوە بکات ئەوکاتە پێتان دەڵێن چی پێویستە بیکەن.

بەتەنیا لەژێر زەمینێکداو لەژێر چاودێرییەکی توندا دایانناو بۆناودەست لەگەڵمدا دەهاتنو، خراپترین خواردنیشیان دەدامێ. لەم بەندییەدا سێ ڕۆژ مامەوە بۆ ڕۆژی دوایی وەڵامی مۆسکۆ هاتەوە، لەبەندیخانەکە دەرچوومو بردمیانە ئوتێلو لەوێ توانیم خۆم بشۆمو جلە دڕاوەکانی ڕێگەم بشۆمو یەك شەو لەم ئوتێلە مامەوەو بۆ بەیانی سواری ئۆتۆمبیلێکی گچکەیان کردمو لەفڕۆکەخانەی (باکۆ) پایتەختی ئازەربایجانی شورەوی دایانگرتمو هیچیان نەگوت لەوە بەولاوە کە لەهۆڵی فڕۆکەخانەکە چاوەڕوانبم، زۆرم چاوەڕوانکرد تانیوەڕۆ کەس بانگی نەکردم، چوومە پرسگەو لێمپرسین ئاخۆ ناوم لەلیستی سواربوانی فڕۆکە بەرەو مۆسکۆ هەیە، تەماشای لیستەکەیان کردو ناوم نەبوو، چوومەلای بەرپرسی ئەو سەفەرە ئەویش گوتی کەس ناوی منی نەداوەتێ، تەنیا (٥٠) پەنجا

دۆلارم پێبوو گوتم ئـەم پارەیـەتان دەدەمـێ کـە بمگەیەننـە مۆسـکۆ بـەڵام قایـل نەبوو، واپێدەچوو زۆرتری پێـدەوێ بـەڵام مـن لـەوە زۆرتـرم نـەبوو، ئینجـا گـوتی کەمێك چاوەڕوانبە. چاوەڕوانم کرد تادوای نزیکەی سەعاتێك لەمیکرۆفۆنەوە بـانگ کــرام، بەرپرســەکە گــوتی ئــەوا هــاتوون دەتبەنــە ئــۆتێلی حزبــی شــیوعی ئازەربایجانیو بـەمجۆرە گیروگرفتەکـەم چارەسـەرکراو بـۆ ڕۆژی دوایـی گەیـشتمە مۆسکۆ.

# کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لە بێروت ساڵی ١٩٩١

ئێمە دەستپێشخەریمان کردو پێشنیازێکمان خستە بەردەم کۆبوونەوە یاخود کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی ئەمەش دوای ڕاپەڕینەکەی گەلی عێراق کە گشت شارو قەزاو ناوچەکانی عێراقی گرتەوەو بەئامانجی ڕووخاندنی دەسەلاَت بوو، (جگە لەشارەکانی بەغداو موسڵ‌و ڕومادی و تکریت و سامەڕا)، بەیروت هەڵبژێردراو کەشوێنی کۆنگرە بێت ئەمەش بۆ وتوویژ لەسەر بارودۆخی عێراق دوای ئەوەی گەل دیواری ترس‌و تۆقاندنی ڕووخاند لەبەرانبەر ئەو توندو تیژییە فاشیستەی ڕژێمی بەعس لەدژی بزافی نیشتمانی‌و دیموکراسی عێراقی بەکاری هێناو، بەتەواوی پەنای بۆبرد بەمەبەستی پاراستنی حوکمەکەی‌و جێگیرکردنی‌و، سەرلەنوێ گەلی عێراق سەلماندی کە هەردەسەلاَت‌و ڕژێمێك، هەرچەند ڕێوشوێنی زۆرداری و داپڵۆسین و تیرۆری فاشیستانە بەکاربێنێت ناتوانێت لەبەردەم ڕابوون‌و تواناو خواستی گەلدا خۆی ڕابگرێت.

بەمجۆرە کۆنگرە مێژوویەکە بەسترا کە ئەگەر نەڵێم هەموو لایەن‌و پێکهاتەو کەسانی لەسەر ئۆپۆزیسیۆن ئەوا زۆربەیان ئامادەی بوون، تەنانەت ڤیتۆی ناقایلبوون لەبوونی لایەنی دیاریکراو، لەحیسابی بانهێشتن‌و ڕێکخستنی کۆنگرەدا هەڵوەشێندرایەوەو ئەمەش کەوا ڤیتۆ نەما بۆیەکەمین جاربوو لەمێژووی هاوچەرخی عێراقداو لەوەرچەخانی پەرەسەندن‌و ڕووداوە گەورەکانی مێژوودا ڕوویدات.

هیچ لایەنێکی بەرهەڵستکاریی عێراقی ئامادە نەبوو تەنانەت پێشبینی ئەوەشیان نەدەکرد کە توڕەیی گەل ئاوها بتەقێتەوەو پەرەبسێنێ‌و ببێتە ڕاپەڕینێکی سەرانسەری لەخۆڕا قەوماوی بەهێز لەدژی ڕژێمی دیکتاتۆریی شۆڤێنیست‌و، هەروا درێژەی ڕووداوەکانی ڕۆژانەی ڕاپەڕینیش ئاگادار نەبوون مەگەر لەڕێگەی ڕاگەیاندنی دەرەوە ئاگاداری بووبن. تیپەکانی بەرهەڵستکاری

لەدەرەوە سەرنجیان بڕیبووە پەرەسەندنی ڕاپەڕینەکە، بەئیسلامیو نەتەوە پەروەرو لیبراڵەکانیانەوە چاویان لەوەبوو ڕژێم بڕوخێ تا بازبدەنە سەر دەسەڵاتو، کەس بیری لەوە نەدەکردەوە کە بێتە ناوەوە، واتە بگەڕێنەوە بۆعێراق تابەشداری بکەنو ئامۆژگاریو سەرکردایەتی جولانەوەی شۆڕشگێرانەی خۆبەخۆ بکەنو هێزو دروشمەکانی یەکخەن. سەرکردەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لەدەرەوە یەك بەدوای یەکدا سەردەکەوتنە سەرمینبەری (کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لەبەیروت) بەڵام کەسیان باسی مەسەلەی بنچینەییان نەدەکرد، مەسەلەی گۆڕینی ڕاپەڕینە لەخۆڕایەکە بۆ پرۆسەیەکی شۆڕشگێڕی کە ئامانجەکانی ڕۆشنبن‌و ڕێوشوێنەکانی کاری هاوبەش یەکبخرێن، هەروا لەڕاگەیاندنی دەرەوە ئەو دروشمانەمان گوێ لێدەبوو کە کەسانی بەشداری ڕاپەڕینەکە دەیانگوتەوە بەتایبەتی ئەو دروشمانەی بۆ مونافەسەو بەناڕێکی دەگوترانەوەو، هەندێکیان گوتنەوەی ئەوانەبوون کەکۆمەڵانی شیعە لەبۆنەکانی شیعەدا دەیانگوتنەوە وەك نمونە (وەلی نییە هەر عەلییە)و شتیوا، بۆیە پێویست بوو دەستبەجێو بەجیدی ڕوو بکرێتە ناوەوە بۆئەوەی لەم وەرچەرخانە مێژووییەدا کەڕۆژبەڕۆژ نیشانە سەرەتاییەکانی لەدەستچوونی ئامانجەکانی زۆرتر دەبوون ئەو ڕۆڵەی کە بۆ ئۆپۆزیسیۆن پێویستە بگێڕن.

جا لەبەر ئەوەی ئەم ڕاپەرینە سەرکردایەتییەکی سیاسی نەبوو، هاوپەیمانەکان وایان بەچاکترزانی دەسەڵاتەکەی سەدام بمێنێ نەك عێراق بەبێ دەسەڵات بمێنێتەوە، بەڵام مەرجەکانی خۆیان بەسەریدا داسەپاندو ئەمەش بەپێی ڕێکەوتنەکەی خۆبەدەستەوەدانی بەسوپای هاوپەیمانان کە بەڕەشماڵەکەی سەفوان ناسراوە.

داوام لێکرا لەم کۆنگرەیەدا قسە بکەم بەڵام قایل نەبووم لەکەشوهەوایەکی ئاوادا قسە بکەم کەجدێتیو هەستکردن بەبەرپرسێتی لەئاست چارەنووسیی گەلی عێراق و کارکردن بۆ ڕووخاندنی دەسەڵاتی بەعسی فاشیست، دەرنەبڕی، داواشم لەمەکتەبی سیاسی حزبی ئێمە، حزبی شیوعی عێراق کرد کە بگەڕێمەوە کوردستانو لەگەڵ هاوڕێیاندا کە لەناوەوە کاردەکەن لەپرۆسەی شۆڕشگێڕیی

گەلەکـەمانو ڕاپەڕینــە پیرۆزەکەیـدا بەشـداری بکـەمو، هەڵـسوڕانی بـەرەی کوردسـتانی ببوژێنـەوە بـۆ سـەرکردەیی ڕاپەڕینەکـەو وەرگرتنـی دەسـەڵات و بەڕێوەبەرێتی هەرێمی کوردستان، مەکتەبی سیاسی بڕیاری لەسەر سەفەرەکەمداو بۆ ڕۆژی دووەم سەردانی بارەگای مەکتەبی سیاسیی حزبی دیموکراتی کوردسـتانم کردو، گەیشتمە ئەویٚ کاك مەسعودم نەدی بەرەو هەرێمی کوردستان کەوتبوەڕیٚو لەویٚ کاك عەلی عەبدوڵام دی کـە ئـەویش بـەنۆرەی خـۆی چاوەڕوانی گەڕانـەوەی بۆهەرێم دەکرد، لەرۆژی دوایی گەیشتنمە (ڕاژان) کاك عەلی عەبـدوڵا ئۆتـۆمبیلێکی بۆئامادە کردمو نامەیەکی پێدام کە لەخاکی سنووری ئێرانـەوە (پیرانـشار–خانـە) ڕێگەی تێپەڕبوونو چوونە ناوعێراقم پێبدریٚ. بەمجۆرە پـاش دوورکەوتنەوەیـەکی درێژ لەسـاڵی ١٩٧٣وە تـا سـاڵی ١٩٩١ گەیـشتمە (حـاجی ئۆمـەران) تەماشـامکرد دێهاتەکانی هەردوو قەراغی ڕێگا کاولکراو و بارپێکراونو لەدوای خـاڵی سـنوورەوە تـا ڕەوانـدوز یـەك مـرۆڤم نـەدیو دیانـەش نیـوە بـەتاڵ بـوو بەدیهاتــە وێـرانو بارکراوەکاندا تێپەڕبووم تا گەیشتمە (پیرمام–هاوینە هەواری سەلاحەدین) کـەکاك مەسعودو هەیئەتی ئەرکانەکەی لـەویٚ دادەنیشتن. پـاش حەسانەوەیەکی کـورت لەخانەی میوانداری ژوورێکم بۆ تەرخانکراو خۆم شەشتو سـیٚ سـەعاتێك نووسـتم، پاشان هەستامو ڕۆیشتمە هۆڵەکە، لەوێدا کـاك مەسـعود پێـشوازیی میوانـەکانیو پـەیامنێرانی ڕۆژنامــەکانو ئاژانـسەکانی دەنگوباسـی دەرەوەی دەکـردو باسـی بـەرپابوونی ڕاپەڕینەکـەو ڕۆڵـی بـەرەی کوردسـتانی لەبـەڕێوەبردنی کوردسـتاندا بـۆدەکردن دوای ئـەوەی دەسـەڵاتی بەڕێوەبـەریو حزبـیو سـەربازیی ناچـاری خۆکـشانەوە لەهـەرێمی کوردسـتانی عێـراق بـوون بەشـاری کـەرکوكو بەشـەکانی بەرێوەبەرییەوەو، چۆن سوپا بەرگری لەدەسـەڵاتی دیکتـاتۆریی شـۆڤێنی سـەدام نـەکردو خۆیانـدا بەدەسـت جـەماوەرەوە. باسـی ڕۆڵـی پێـشمەرگەی بـۆ ڕوون دەکردنەوە کە چۆن تێکەڵی جەماوەر بوونو پارێزگاریی ئاسایش دەکـەنو، چـۆن هێزەکانی پێشمەرگە بەشداریی جەماوەری ڕاپـەڕیووی کـەرکوك هێرشـیان بۆسـەر هێزەکانی حکومەت بردووەو لەدەسەڵاتی حوکمی بەعس ڕزگاریان کردووە.

پاش دوو ڕۆژ لەگەیشتنمە (پیرمام) ڕووخسەتم لەکاك مەسعود خواسـت تابـچمە

هەولێرو پەیوەندی بەهاوڕێیانم لەرێکخراوی هەولێر بکەم ئەویش کاك کەریم شەنگاریی لەگەڵم نارد تا بمگەیەنێتە هەولێر. هاوڕێیانمان بارەگای یەکێتیی گشتی نەقابەکانیان لەهەولێر کردبووە بارەگای خۆیان چونکە دەکەوێتە ناوەندی هەولێرو لەسەر گرنگترین چوار ڕیانی سەرەکیو، بەرامبەر هۆڵی میدیا کە کۆبوونەوەو ئاهەنگو شانۆگەرییەکانی تێدا دەکرێتو لەگشت ڕوویەکەوە هۆڵێکی زۆر باشە بەڵام وەك هەموو شوێنەکانی تر کەوتە بەر تاڵانیو دزیو وێرانکاریو، هیچ لایەنێك لەم دواییەدا نەبیّ توانای چاکردنەوەیان نەبوو.

پەیوەنیم بەهاوڕێیانەوەکرد بۆهەموویان شتێکی ناکاو بوو، هەموو هاوڕیّو دۆستانی حزبو جەماوەری هەولێر هەواڵی گەیشتنەوەمیان بیستو خەڵکێکی زۆریان هاتنە بارەگای نەقابەکان بۆبەخێر هاتنەوەم. دوای ساڵانی درێژ کەلێیان دوور بووم، بۆرۆژی دوایی پەیوەنیم بەسوعادی کچمەوەکرد کە لەبازاڕی ناوەندی هەولێر فەرمانبەربوو، لەگەڵ هەردوو کچەکەی (میدیاو مەهاباد) دەژیا لەخانوویەکی گچکەی گەڕەکی (٧ی نیسان)دا، کە دوای کوشتنی مێردەکەی (عابدین نەسرەدین) بەرووداوی ئۆتۆمبیل لەلایەن دەزگاکانی میرییەوە، بێوەژن مابۆوە.

چەند جارێك لەگەڵ هاوڕێیان کۆبوومەوە، بەرپرسی رێکخستنی حزبی ناوەوە تائەوکاتە هاوڕیّ عومەر عەلی شێخ(ئەبوفاروق) بوو، پێشنیازم بۆکردن کە ئەوجەماوەرە ڕێکخەین کەوابەپەرۆشەوەو بەژمارەیەکی زۆر دەهاتنە بارەگای حزب، گوتم ئەم پشتگیرییە فراوانەی جەماوەری گەلەکەمان بۆ حزب بەردەوام نابێت ئەگەر حزب بایەخیان پێنەدا، چونکە جەماوەر چاوی لەوەیە پەیوەندی لەگەڵ حزب بەتین بکات تا ببێتە ڕابەری خەباتی جۆربەجۆریانو بەرگری لەبەرژەوەندییەکانیانو هێنانەدی ئامانجەکانیان لەژیانێکی باشترداو، لێکۆڵینەوەی دیاردەی باوەڕکردن بەحزب تا ئەم باوەڕکردنە لەجێی خۆی بێت، ئەمەش بەوە دەبیّ کە پەیوەندیی لەگەڵ جەماوەرەکە رێکخرێتو درێژەی پێبدرێت و پەرەی پێبدرێت لەرێگەی کاری تێکۆشەرانەی ئەوتۆوە کەزۆرترین کۆڕو کۆمەڵی جەماوەری تێدا جۆش بدرێت، بەڵام هاوڕێیانمان وێڕای لایەنگیریی

ئەم پێشنیارە لەبارەی تیۆرییەوە، هیچ بڕیارێکیان لەبارەیەوە نەداو بەدرێژی پیلانی کارکردنیان بۆدانەڕشت لەبەر ئەوە دیمان ئەم جەماوەرە لەحزب دوور دەکەوێتەوەو ڕوو لەحزبەکانی تر دەکات، بەتایبەتی ئەو حزبانەی دەسەڵاتیان گرتەدەست،دوای ماوەیەك هەوڵماندا هەندێ کاروبار ئەنجام بدەین تا باوەڕی جەماوەر بەحزب بگەڕێتەوە دیسان لەدەوری حزب کۆبنەوە بەڵام نەمانتوانی ئەمە بێنینەدی‌و، تائێستاش گیرۆدەی دوورە پەرێزین لەجەماوەرو زۆر زەحمەتە چاری نەخۆشی دوورە پەرێزی لەجەماوەر بکرێت مەگەر بەنەخشەکێشانی پیلانێکی کارکردنی دیراسەکراوو واقیعی بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیی لەگەڵ جەماوەرو بەڕێوشوێنی کاری جۆربەجۆری ئابوری‌و، هزری‌و، ڕۆشنبیری‌و، هونەری‌و، وەرزش‌و، کۆمەڵایەتی‌و هێنانی ئافرەتان بۆکارو تێکۆشان لەپێناو مافەکانیانداو بەرپاکردنی هەڵمەتێك لەدژی ئەو هێزو حزبانەی کەبەئاشکراو پەردەپۆشی لەدژی ئەم مافانەیان دەوەستن.

# پەیوەندی لەگەڵ بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان لە تورکیا

حزبی شیوعی عێراق بایەخێکی تایبەتی داوە نەك تەنیا بەبزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان لەعێراقداو بەس، بەڵکو هەروەها لەهەرێمەکانی دیکەی کوردستانی دابەشکراودا، ئەمەش بەڕێگەی بەهێزکردنی پەیوەندیی لەگەڵ حزبە شیوعییەکانی ئێران و تورکیاو حزبە کوردستانییەکانی ئەم دوو هەرێمەو حزبە کوردییەکانی سوریا، وەك لەپێشەوە گوتم کۆشش و تەقەلامان لەگەڵ حزبی تودەی ئێران بۆپەسەندکردنی مەسەلەی مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلی کوردو گەلانی دیکەی ئێران وەك ئازەربایجان و تورکمان و بلوش و پێکهێنانی پەیوەندیی هاوپەیمانی لەگەڵ حزبی دیموکراتی کوردستان سەرنەکەوتن. هەڵوێستی ئەو حزبەمان بەنامەبدەئی دانا لەئاست چاری مەسەلەی نەتەوەیی گەلانی ئێران، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەنیمان لەگەڵ حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران برایانەو هاوکارانە بوو، زۆریشمان کۆشش بەخت کرد بۆپاراستنی یەکێتییەکەی و پێکهێنانی هاوپەیمانی لەگەڵ حزبە کوردستانییەکانی ترو لەگەڵ حزبە دیموکراسییەکانی ئێران وەك فیدائیانی زۆربەو کەمایەتی و کۆمەڵەو، لەگەڵ بزاڤی رزگاریخوازیی گەلانی دیکەی ئێران و، ئەوەندەی تۆزێکیش دەستمان نەخستە سیاسەت و ڕێوشوێنی کارکردنی خۆیانەوە.

حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و حزب وڕێکخراوە کوردستانیەکانی تر، بەچەشنێکی بەرپرسانە لەهەلومەرجی بزاڤی رزگاریخوازیی کوردستانی عێراق تێگەیشتن و هیچ کارو چالاکییەکیان نەکرد هەڵوێستی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانی عێراق لەئاست حکومەتی ئێران شلۆق بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەزگای هەوالگری ئێران (موخابەرات) چەندان چالاکیو هەڵسوڕانی تیرۆریستانەی ئەنجامدا، ئەوەبوو بەشێوەیەکی نامەردانە سەرکردەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران تێکۆشەر دکتۆر عەبدوڕەحمانی قاسملوی شەهید کردو دوای ئەویش دکتۆر سادقی شەرەفکەندی شەهیدکرد، هەروا سنووری لەگەڵ هەرێمی

کوردستانی عێراق بەزاندو دەوارگەکانی پەنابەرانی (حدکا)ی لەکۆیە بۆمبۆردومان کردو دەستدرێژیی کردە سەر بارەگاکانی ڕێکخراوەو حزبە کوردستانییەکانی ئێران کەلەهەرێمی کوردستانی عێراقدا بوون. (حدکا) بەو سیاسەت و هەڵوێستە ڕاست و دروستانەی لەئاست بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستاندا بەگشتی ڕێزو خۆشەویستی و پشتگیریی حزبەکانی کوردستانی عێراقی دەستخست.

کاتێکیش لەسوریا بووین، کەساڵی ١٩٧٨ دوای هێرشی دڕندانەی حکومەتی بەعس لەبەغدا بۆسەر حزبمان پەنامان بردە بەر سوریە، لەوێ چەند حزبێکی کوردستانی تورکیەمان بەڕێگەی هاوڕێ ڕەمۆ شێخۆ (ئەبو جنگۆ) ناسی وەك حزبی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیە بەسەرکردەیی تێکۆشەری ناسراو کەمال بورقای و حزبی کوك و حزبی شیوعی بەسەرکردەیی (تەسلیم تورا) و دواجار پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) دەبێ ئەوەش بڵێم کە حزبی ئێمە لەگەڵ حزبی شیوعی تورکیا هەوڵیدا بۆئەوەی چاری مەسەلەی کورد لەتورکیا پەسەند بکات، هەردوو حزبی شیوعی عێراق و حزبی شیوعی تورکیا گەیشتنە ئەوەی کە گەلی کورد لەتورکیا مافی بڕیاردانی چارەنووس و دامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆی هەیەو، ئەمەش وەرچەرخانێکی گەورە بوو لەسیاسەت و هەڵوێستەکانی حزبی شیوعی تورکیدا لەئاست چاری مەسەلەی کوردو، یارمەتیدەر بوو بۆ بەدیارکەوتنی ڕەوتێکی نێونەتەوەیی لەبزاڤی دیموکراسی تورکیاداو هەروا هەڵوێست و سیاسەتی شۆڤێنییەکانی لەتورکیادا زۆر لاوازکردو هەڵوێست و خەباتی هێزەکانی ڕزگاریخوازیی لەکوردستانی تورکیادا بەهێزکرد[١٦].

دوای ناسینی حزبە کوردستانییەکانی تورکیاو چاوپێکەوتنی زۆری نێوان حزبی ئێمەو حزبە کوردستانییەکانی تورکیاو ئێران و عێراق و حزبە کوردستانییەکانی سوریە، بیرۆکەیەکمان خستە پێش چاو بۆپێکهێنانی کۆمیتەیەکی ڕێکخستنی کاروباری نێوان ئەم حزبانە، ئەم بیرۆکەیە لەلایەن مام جەلال‌و کەمال بورقای‌و

(١٦) لەناسین و پەیوەندی چەندان ساڵی نێوان حزبە کوردستانییەکانی باکوری کوردستان و حزبی ئێمە هاوڕێی نووسەر هیچ باسی ڕۆڵی ڕێکخراوی حزبی لەقامیشلی نەکردووە کەخۆم بەرپرسی بووم لەو بوارەدا کارێکی زۆرمان کردووە..—وەرگێڕ-

د.عەبدوڕەحمان قاسملو کە لەدەرەوەی ئێران ئەم دەستپێشخەرییەی پێدرا، پەسەندکراو هەروا تێکۆشەری پێشکەوتنخواز حەمید دەروێش پەسەندی کرد. کۆبوونەوەیەکی هاوبەش لەنێوان مام جەلال و کەمال بورقای و حەمید دەروێش و، عەزیز محەمەد و کەریم ئەحمەد دا ئەنجامدراو، لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە کۆمیتەیەکی ڕێکخستنی کاروباری نێوان حزبە کوردستانییەکانی چوار هەرێمەکەی کوردستان پێکبێت. لەسەرەتادا بڕیاردرا کۆمیتەیەکی ئامادەکاری لەو حزبانەی ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون پێکبهێندرێتو هاوڕێ عەزیز پێشنیازی کرد کە حزبی شیوعی عێراق لەم کۆمیتەیدا ئەندام نەبێت بەڵکو ببێتە ئەندامی چاودێر ئەمەش لەبەر دووهۆ: یەکەمیان چونکە حزبی شیوعی عێراق حزبێکی کوردستانی نییە بەڵکو حزبێکی عێراقییەو دووەمیان ویستمان کۆشش لەگەڵ حزبە شیوعییە براکانی هەرسێ وڵاتەکەی تر بەخت بکەین بۆپەسەندکردنی بیرۆکەی ئەم دەستپێشخەرییەو بەرگری کردنی، کۆبوونەوەکە تێکۆشەری پێشکەتنخواز حەمید دەروێشی بەسکرتێری کۆمیتەکە هەڵبژاردو کۆمیتەی ئامادەکاریی منیشی ڕاسپارد کە پرۆژەی بەیاننامەیەك بنووسمو بیخەمە بەردەمی کۆبوونەوەی ئایندەی کۆمیتەی ئامادەکاری، لەبەیاننامەکەدا دامەزراندنی ئەم کۆمیتەیەو هۆیەکانی ئەم دامەزراندنەو پەرەسەندنی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان ڕوون بکرێتەوەو، لەپێش حزبە کوردستانیو کوردییەکانی تردا بۆهاتنە ناوی دەرگا ئاواڵە بکرێتەوە. (بەمبۆنەیەوە دەبێ بگوترێ پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ئەندامی کۆمیتەی ئامادەکار نەبوو ئەندامێتییەکەی تائەوکاتە هەڵپەسێردرابوو، کە ناکۆکییەکانی لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستانی عێراقو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران چارەسەر بکات) پرۆژەی بەیاننامەکەم ئامادە کردوو گەیاندمە کۆمیتەی ئامادەکار، چونکە خۆم ئامادە کردبوو بۆگەڕانەوە بۆهەرێمی کوردستانی عێراق، لەبەر ئەوە بۆم نەکرا سەرنجدەریی کۆمیتەی ئامادەکار بکەم، دوای ئەوە بیستم کەکۆمیتەکە دوو کۆبوونەوەی لەئەوروپا بووەو، پەرەسەندنێك بەسەر بارودۆخی (حدکا)دا هات کەئەوەبوو تێکۆشەر د.قاسملو بەدەستی موخابەراتی ئێرانی تیرۆر کراو هەروا بارودۆخی (ینك) ئاڵوگۆڕی

بەسەردا هات و چووە کێشەیەکی توندەوە لەگەڵ (پەدك و سۆسیالیست) بۆیە کۆمیتەکە بەبێ بڕیارو بەهۆی هەلومەرجی نالەبارەوە هەڵوەشێندرایەوە.

بەهۆی تێکۆشەر ڕەمۆ شێخۆوە (پەکەکە) مان ناسی وهەرئەویش دیدارێکی لەگەڵ عەبدوڵا ئۆجەلانی دامەزرێنەرو سکرتێری پارتی کرێکارانی کوردستاندا لەماڵی خۆیان (ئەبوجنگۆ) بۆ ڕێکخستم. پێش هاتنی ئەو لەماڵەکە ئامادەبووم و، پاش پێنج خولەك لەئامادەبوونم گەنجێکی کەمێك باڵابەرز ئامادەبوو، چەند ڕۆژنامەیەکی تورکی لەبندەست بوو، دەستی یەکمان گوشی‌و ئەبوجنگۆ پێشکەشی کردم کەسەرۆکی (پەکەکە)یەو بەگەرمی بەخێرهاتنم کرد، گوتی ئەم ڕۆژنامانە وێنەی منیان بەفراوانی بڵاوکردۆتەوەو حکومەتی تورکیا لەدووم دەگەڕێت تابمگرن. لەڕاستیدا ئەو ڕۆژنامەی هێنابوونی بەگەورەیی وێنەکەیان بڵاوکردبۆوە کە کەسێکی مەترسیدارە.

(پەکەکە) هەرلەسەرەتای دامەزراندنییەوە کەوتە کێشەیەکی تیرۆریستانە دژی ئەوانەی بەدوژمنی دادەنان‌و ، هێرشی ڕەشەکوژیی سەرکردەو کادیرانی حزبو ڕێکخراوە کوردستانییەکان لەتورکیادا دەستپێکردو بەچەند کردەوەیەکی تیرۆریستی قەبارەی خۆی سەپاند، چ لەدژی حکومەتی تورکیاو چ لەدژی حزبە کوردییەکان، تەنانەت ئەو حزبانە وایان دانابوو کە پێکهێنانی ئەم حزبە نەخشێکی میتی تورکیایە، بەڵام ئەم بەئەنجام گەیشتنە ڕاست نەبوو، چونکە ڕەوتی (پەکەکە)و ئۆجەلانیش خۆی ئەوە بوو کە تەنیا خۆیان لەگۆڕەپانی کوردستانی تورکیاداو بەڵکو لەتەواوی هەرێمەکانی کوردستاندا بمێننەوە، چونکە ئۆجەلان خۆی بەسەرکردەی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان دادەناو، لەبەر ئەوە دەبێ گشت حزبە کوردستانییەکانی تر پاکتاو بکات، ئەودەم گۆڕەپانی کوردستانی تورکیای بۆبەتاڵ دەبێ‌و دەتوانێ پرۆسەی ڕزگایخوازیی تێدا سەرکردایەتی بکاتو، لەهەرێمەکانی دیکەی کوردستانیش هەربەمجۆرە تابتوانێ ڕزگاریان بکاتو یەکگرتنی کوردستانی مەزن بێنێتەدی!

لەم یەکەمین دیدارەدا خۆی قسەی کردو ئامانج و ئەرکەکانی (پەکەکە)ی بۆ ڕوونکردمەوەو هێرشی کردە سەر حزبە کوردستانییەکانی کوردستانی تورکیاو

وایـدانان کـە پەککەوتـەن و نـاتوانن ئامانجـەکانی گـەلی کوردسـتان لـەتورکیادا بێننـەدی، ئەمـە پـێش ئـەوەبوو کەشۆڕشـی چـەکداری لـەدژی حکومـەتی تورکیـا ڕابگەیەنێت. لەکاتێکدا لەم پەیڤە دوورو درێژەیدا بەتەواوی بواری نەدام کە منـیش بـارودۆخی بزاڤـی ڕزگـاریخوازیی کوردسـتان و هەلومەرجەکـەو خاسـیەتەکانی و تایبەتمەندییـەکانی بزاڤـی هـەر هـەرێمێك و پێکهێنـانی سـەرکردایەتییان لەهـەر هەرێمێکداو سەربەخۆییان و بەرپرسییان لەنەخشەکێشانی سیاسەتی خۆیاندا باس بکەمو ڕوونی بکەمەوە کە تەنیا حزبێك ناتوانێ سەرکردایەتی بزاڤی ڕزگـاریخوازیی کوردستان لەهـەموو هەرێمەکانیـدا بکـات...تـاد، بـەڵێنی دیـدارێکی تـرم پێدا کـە منیش باس بکەمو باری سەرنجی خۆم لەسەر قسەکانی ئـەو ڕوونبکەمـەوە، بـەلام بۆم دووپاتکردەوە کەپێویستە هەوڵبـدرێ بۆیەکخستنی هێـزە کوردسـتانییەکانی تورکیاو نەهێشتنی ناکۆکییەکان و، کۆتایی هێنانی بارودۆخی کێشەی توندوتیژیی نێوان حزبە کوردستانییەکانی تورکیا، مەسەلەی پێکگەیشتن لەگەڵ ئـەم حزبانـەم خستەبەرچاوی بۆباسی ناکۆکییەکان وگەیشتنە ئاشـتی لـەنێوان ئـەم حزبانـەداو، ئەمەی پەسەند کرد، پەیوەندیم لەگەڵ سەرکردایەتی ئـەو حزبانـەدا کـردو بـەڵێنی کـاتو شـوێنی ئـەم پێکگەیـشتنەم لێـوەرگرتن و لـەڕۆژی دیـاریکراودا هـەموویان لەماڵی(ئەبوجنگۆ) لەشام ئامادەبوونو لەلایەنی ئێمەشەوە هاوڕێ عەزیز محەمـەد و مـن ئامـادەبووین، هـاوڕێ عـەزیز بـارودۆخی بزاڤـی ڕزگـاریخوازیی کوردسـتانی بەگشتی باسکرد کە چۆن دەبێ بەکار ڕێکخستن وهاوکاری هەر یەکە لەناو هەرێمی خۆیـداو لەگـشت لایـەکی کوردسـتاندا بجوڵێتـەوە. پـاش ئـەوە تێکۆشـەر کـەمال بورقای قسەی کردو پشتگیریی قسەکانی هاوڕێ عەزیزی کـرد لـەبارەی بـارودۆخی هەرێمەکانی کوردستانەوەو، پێویـستیی یەکخستنی هێـزە کوردسـتانییەکان وەك مەرجی دەستخستنی هەرپێشکەوتنێك بۆچاری مەسەلەی کـورد لەهـەر هـەرێمێکی کوردستانداو، ناکۆکیو لێکیچڕان و هێز بەکارهێنان بۆچاری ناکۆکییەکان، ڕێگـەی هەرپێـشکەوتنێك دەگـرن و، بـەڵکو لەڕاسـتیدا خزمـەتی دوژمنـانی سـبزاڤی ڕزگاریخوازیی گەلی کوردستان دەکەن، جا ئەوانەی ئەوکارانە دەکەن بیانەوێ یـان نەیانەوێ.

پاش کۆتایی قسەکانی بورقای هەموان کەوتنە باسی کاروکردەوەی تیرۆریستانەی (پەکەکە) لەدژی حزبە کوردستانییەکان و تیرۆرکردنی سەرکردەو کادیرو ئەندامانی حزبە کوردستانییەکانی تر، ناقایلی خۆیان لەسەر ئەم ڕێبازە دەربڕی کە تەنیا بۆبەربەرەکانی هێزە کوردستانییەکان دامەزراوە.

پاش تەواوبوونی قسەکانی هەموان ئەم پێشنیازانەمان بۆکردن:

١. دوور کەوتنەوە لەبەکارهێنانی زەبروزەنگو پرۆتیستۆکردنی لەنێوان حزبە کوردستانییەکانی تورکیادا.

٢. پێکهێنانی کۆمیتەی ڕێکخستنی کاروبار بەمەبەستی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان بەرێگای دیالۆگ و وتووێژی برایانەو ڕێکخستنی چالاکیی هاوبەش.

٣. پێویستی داننان بەهەڵەی بەکارهێنانی زەبروزەنگداو پابەستەبوون بەوەی لەمەولا لەنێوان لایەنەکانی بزافی ڕزگاریخوازیی کوردستاندا بەگشتی پەنا بۆبەکارهێنانی ئەم جۆرەکارانە نەبرێت.

هەموو حزبە کوردستانییەکانی تورکیا ئەم مەبدەئانەیان پشتگیریی کرد جگە لە (پەکەکە). ئۆجەلان گوتی: من ئێستا ئەوە پەسەند ناکەم و داننانێم بەوەدا کە بەکارهێنانی زەبروزەنگ هەڵەیەو بوارم بدەنێ تا قەناعەت دەکەم کەئەم شێوازە هەڵەیە. هەموان سوربوون لەسەر ئەوەی پێویستە دانبنرێ بەم هەڵە گەورەیەداو بەبێ ئەوە هیچ هاوکارییەك لەگەڵ (پەکەکە)دا نابێ، عەبدوڵڵا ئۆجەلان وەڵامیدانەوە: ئێوە لەسەر پێکهێنانی بەرەی خۆتان یان هەر هاوکارییەك بڕۆن و هەرکاتێکیش قەناعەتتان هێنا بەپێویستیی بوونی ئێمەش ئەوکاتە ئامادە دەبین بۆهاوکاری.

بەمجۆرە کۆبوونەوەی هاوبەشی نێوان حزبە کوردستانییەکان لە تورکیادا بەژێرکەوتن و لێکدابڕان کۆتایی هات. ئەم کۆبوونەوەیەش لەپێش ئەوەدا بوو کە (پەکەکە) شۆڕشی چەکداریی لە کوردستانی تورکیادا ڕاگەیاند، دوای ڕاگەیاندنی شۆڕشی چەکداری دژی حکومەتی تورکیا پەیوەندیی نێوان (پەکەکە)و ئەم حزبانە زۆرتر ئاڵۆز بوو، ئۆجەلان ڕایگەیاند کە یان ئەم حزبانە دێنە پاڵ شۆڕشی

چەکداریو لەبارەی سیاسییەوە پشتیوانی دەکەنو یارمەتی پێشکەش دەکەنو باوەڕدێنن بەسەرکردایەتی شۆڕش لەلایەن (پەکەکە)وە، یان بەناپاك دادەنرێنو پێویستە بەربەرەکانی بکرێنو بەبەشێك لەدوژمن دابنرێن. ئەم سیاسەتە هیچ کام لەهێزە کوردستانییەکانی تورکیای بۆلای خۆی نەهێناو جگلە لەمەش پەیوەندی پەکەکە لەگەڵ حزبە کوردستانییەکان لەئاستی بەرپرسیدا نەبوو، بەڵکو پەیوەندیی نەیارانەی بەردەوامبوو تائاستی بەکارهێنانی توندو تیژی لەدژیانو، (پەکەکە) خۆی بەحزبی گشت هەرێمەکانی کوردستان دادەناو، ئەو سنوورانەی بەسەر هەرێمەکاندا سەپێندراون نەدەناسیو لەوباوەڕەدابوو هیچ لایەنێکی کوردستانی بۆی نییە ڕێگەی چالاکی سیاسیو حزبیو پێکهێنانی بنکەی گەریلاکانی لەهەر هەرێمێکدا لێبگرێتو، ڕێکخستنێکی سەر بەحزبیی سەر بەخودی خۆی دامەزراندو ڕۆژنامەی دەرکردو لە ڕۆڵەکانی هەرێمی کوردستانی عێراقی لەگەریلاکانی خۆیدا وەرگرتو بنکەی لەنزیك سنووری تورکیا دامەزراندو تورکیاش هێزەکانی خۆی لەسەر سنوور مۆڵدەدا و پانتاییەکی فراوانی بەقوڵایی پانزە تا بیستوپێنج کیلۆمەتری لەناو خاکی هەرێمی کوردستاندا داگیرکردو حکومەتی تورك هەڕەشەی داگیرکردنی لەکوردستانی خواروو دەکردو هەروا لێدانی بنکەکانی (پەکەکە) بۆیە بەرەی کوردستانی ناچاربوو هەموو حزبە کوردستانییەکان لەگشت هەرێمەکاندا بۆکۆبوونەوەیەکی هاوبەش بانگ بکات بۆباسکردنی دیاردەی بوونی حزبە کوردستانییەکانی هەرێمەکانی تر لەناو هەرێمی کوردستانی عێراقداو مەرجەکانی ئەم مانەوەیە، بڕیاردرا بارەگایان تەنانەت لقیشیان لەکوردستانی عێراقدا هەبێتو ڕۆژنامە دەربکەن و چالاکی سیاسی ئەنجام بدەن، بەڵام ڕێگەیان نادرێ چالاکیی شەڕو کوشتاریان هەبێ و خاکی کوردستانی عێراق لەدژی دەوڵەتانی دراوسێ بەکاربێنن، بەڵام (pkk) بەم بڕیارە ڕازی نەبوو هەرلەوکاتەشەوە (pkk) کەوتە جەنگەوە لەگەڵ بەرەی کوردستانیو بەتاتیبەتی لەگەڵ هەردوو حزبی فەرمانڕەوا (پدك و ینك).

جائێمە وێڕای بەرهەڵستکاریی سیاسەت و شێوازەکانی (pkk) هەمیشە لەدژی کوشتاری نێوان حزبە کوردستانییەکان بووینو، داوامان دەکرد بەڕێگای دیالۆگ و

گفتوگۆ ناکۆکییەکان چارەسەر بکرێن، لەبەر ئەوە پەیوەندیەکانی خۆمان لەگەڵ (pkk) پاراستو لەدیدارەکانمان لەگەڵیاندا ڕەخنەمان لەسیاسەتو ڕێوشوێنی کارکردنیان دەگرتو داوامان لێدەکردن ڕاوێژکاریی بکەنو کۆمیتەی کار ڕێکخستن لەنێوان خۆیان و حزبە کوردستانییەکاندا بۆ چاری ناکۆکییەکان پێکبێننو ، پەیوەندییەکانی پدك و پەکەکە بەجۆرێك ئالۆزبوون گەیشتنە ئاستی شەڕوکوشتار بۆیە وەفدێکمان لەخۆمو هاورێ ئەبوداود لەهەردوو حزبی شیوعی عێراق و کوردستان و عەبدولخالق زەنگەنە لەبزووتنەوەی میللی کوردستان پێکهێناو، لەوکاتەشدا کەسایەتی سیاسیی ناسراو عەلی قازی لە کوردستانی ئێرانەوە هەروا کەسایەتی ناسراوی کورد لە کوردستانی تورکیاوە عەبدولمەلیك فورات گەیشتنە لامان و داوامانکرد لە وەفدەکە بەشدار بکرێن بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ عەبدوڵا ئۆجەلان بۆداوای ڕاگرتنی شەڕەکەی نێوان (پدك و پەکەکە)و چاوپێکەوتن لەگەڵ (پدك) بۆدیالۆگو وتووێژی نێوان هەردوو لایان و ئەگەر هەردوو لاش ئامادەبوونی ئەم وەفدە یان لایەنێکی تر بەباش بزانن بۆئامادە بوون لەگەڵیاندا تا وتووێژەکەیان سەرکەوتوو بێت. ئێمە لەسەر دیدارەکانی وەفدە هاوبەشەکە کاك مەسعود بارزانیمان ئاگادارکردەوەو، لەگەڵ پەکەکە ڕێککەوتین کە پرۆژەی ڕێکەوتنێکی نێوان وەفدەکەو (پەکەکە) لەبارەی ڕاگرتنی کوشتارو قایلبوونیان بەوتووێژ لەگەڵ پدك ئامادە بکەین، هەربۆ ڕۆژی دوایی پرۆژەکەمان ئامادەکردو دانەیەکمان لێنارد بۆ کاك مەسعود، بەڵام دوای ئەوەی پرۆژەکەمان خستە بەردەست ئۆجەلان ڕەتی کردەوەو هەر مەسەلەی وتووێژی ڕەتکردەوە، هەروەك لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە ڕێکنەکەوتبێو، ئێمە گەیشتینە ئەوەی موخابەراتی سوریا بەڕاگرتنی شەڕو وتووێژی نێوان هەردوولا قایل نەبووبێتو، هەروا برسکەیەکمان لەکاك مەسعودەوە پێگەیشت کە کوشتار ڕاگرتنو وتوێژ پەسەند ناکات. بەمجۆرە تەقەلای وەفدەکە ژێرکەوت و عەلی قازی بەبێ گەیشتنە ئەنجامێکی ئیجابی گەڕایەوەو، پێش ئەوەی ڕوویکاتە شام مۆڵەتی لەکاك مەسعود خواست –هەروەك چۆن وەفدەکەشمان– پێش گەیشتن بە عەبدوڵا ئۆجەلان هەروای کرد.

**لێرەدا ئەو نامەی پێشنیازانە دەخەمە پێش چاو کەوەفدەکەمان پوختی کردەوەو وێنەیەکی لێنارد بۆ ئۆجەلان:**

*برای تێکۆشەر عەبدوڵا ئۆجەلانی بەڕێز*

*ئەمینداریی گشتی حزبی کرێکارانی کوردستان...!*

*بەپێی بەرژەوەندیی بزاڤی رزگاریخوازیی کوردستان و بزاڤی دیموکراتی گەلانی ناوچەکەو ئاسایش‌و سەقامگیری‌و ئاشتی لەم وڵاتانەداو، لەگۆشەی هەستکردنمانەوە بەبەرپرسیی لەئاست گشت ئەم ئامانجە پیرۆزانەداو، چارەنووسی گەلی کوردستان، داواتان لێدەکەین ئەو باروبۆخە پڕ لەکڵۆڵییە کۆتایی پێ بهێنرێت کەوا گەلەکەمان‌و بزاڤی رزگاریخوازییەکەی تێیدا دەژین، ئەمەش لەئەنجامی ئەو وەزعە نائاساییەو کوشتاری ناو هەرێمی کوردستانی عێراق، کەماوەیەکە لەنێوان حزبی دیموکراتی کوردستان (پارتی)و حزبەکەتان، پارتی کرێکارانی کوردستان p.k.k هەڵگیرساوەو، ئەو هەموو خوێن لەبەر رۆیشتن و زیانە گەورانەی بەگەلەکەمان و مەسەلە رەواکەی گەیاندووە.*

*داواتان لێدەکەین و ئەم پێشنیازانەتان دەخەینە پێش:*

*یەکەم: دەستبەجێ کوشتار راگیرێت، ئەگەرچی لەلایەن ئێوەشەوە بێت لەهەموو ناوچەکاندا.*

*دووەم: دیدارێکی نێوان هەردوو حزب لەسەر ئاستی سەرکردایەتی، بەئامادە بوونی حزب و کەسایەتییە کوردستانی و عێراقییەکان، بەمەبەستی گەیشتنە رێکەوتنێك ئەم مەسەلانەی خوارەوەی تێدا بێت:*

*١. کۆتایی کوشتارو هێنانەدیی ئاشتی لەناوچەکەدا.*

*٢. چاری گیروگرفت و ناکۆکییەکان بەرێگای ئاشتی و دیالۆگی دیموکراسی و بەبێ پەنابردنە بەر بەکارهێنانی چەك. هێنانەدیی پەیوەندی لەسەر بنەمای رێزگرتنی یەکتر بۆ بەرژەوەندیی بزاڤی رزگاریخوازیی کوردستان.*

*٣. مانەوە p.k.k لەهەرێمی کوردستانی باشوور بەوجۆرەی رێکەوتنی*

لەسەر پێکدێت و ڕێگەنادرێت بەحکومەتی تورکیا کە بیکاتە بیانووی داگیرکردنی خاکی هەرێمی کوردستانی عێراق.

٤. لەبەرچاوگرتنی هەلومەرج و تایبەتمەندییەکانی بزووتنەوەکەمان لەهەر هەرێمێکی کوردستاندا.

٥. تەرخانکردنی تەقەلاو چاکردنی کاری هاوبەشی نێوان حزب و هێزە کوردستانییەکان بەجۆرێك کەپەیوەندیی برایانەی خەباتمان بۆ خزمەتی مەسەلە هاوبەشەکانمان بهێنێتەدی و پتەو بکات.

سێیەم: وێنەیەکی ئەم نامەیە بۆ کاك مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان دەنێرین و، داوای لێدەکەین ئەم پێشنیازانەی لاپەسەند بن و کۆششی ڕاگرتنی کوشتار بکات و، وەفدی خۆیان بۆ چاوپێکەوتنی چاوەڕوانکراو پێکبێنن و ڕێکەوتنیش لەسەر ئەوە بێت کەکام لەحزبە کوردستانی وکەسایەتییەکان بەشدار دەبن.

لەگەڵ سوپاس و پێزانینمان.

حەمید مەجید موسا سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراق ، کەریم ئەحمەد سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی کوردستان–عێراق، عەبدولخالق زەنگەنە سکرتێری بزووتنەوەی میللی کوردستان، عەبدولمەلیك فورات نوێنەرێکی پێشوو لەپەرلەمانی تورکیاداو حەفیدی شێخ سەعیدی پیران، عەلی قازی کوڕی قازی محەمەدی شەهید سەرکۆماری کوردستان لە مەهاباد

١٩٩٧/٨/٢٥

بارئالۆزیی هەردوو لابەتینتر بوو، دوای ئەوە دەستمان نەخستە کارەوەو داوای دیدارمان لەگەڵ ئەم یان ئەو لایەندا نەکردو، هەروا پەیوەندیی نێوان ینك و پەکەکە لەئالۆزبووندا بەرەو هەڵچوون‌و داچوون دەچوو پاش ئەوەی (پەکەکە) بنکەکانی لەناوچەی سلێمانی و قەڵادزەو رانیە دامەزراندو، لەدیدارەکاندا لەنێوان(پدك وتورکیاو ینك و تورکیا)دا لە وتە دەربڕینەکانیاندا باسی ئەو کارو کردەوە تیرۆریستانەیان دەکرد کە (پەکەکە) ئەنجامیان دەداو، حزبی شیوعی کوردستان تەقەلایەکی تایبەتیدا بۆهێواشکردنەوەی بارئالۆزیی نێوان هەردوو حزب (پدك و ینك) لەلایەك و (پەکەکە) لەلایەکی ترەوە، بەڵام (پەکەکە) ئامادە نەبوو شێوازی کارو سیاسەتەکەی بگۆڕێت‌و، شایانی باسە حکومەتی سوریە زۆر یارمەتی (پەکەکە)ی داو، مەڵبەندی سەرکردایەتی لەشام بوو، بنکەی مەشق پێکردنی لایەنگرانی لەناوچە شاخاوییەکانی ناو سوریادا دامەزرێندرابوون، هەروا لەناوچەی بوقاعی لبنان‌و عەبدوڵا ئۆجەلان خۆی سەرپەرشتی ئەم مەشق پێکردنانەی دەکردو سەرپەرشتی ئەو قوتابخانە حزبییەی دەکرد کە بۆمەشقی کادیرانی دامەزراندبوو، هەروەك پەرستگایەکی چۆڵی ئاینی وابوو بۆتێگەیاندن‌و فێربوونی ئەوەی سەرۆك ئاپۆ دەیڵێ و ئەوەی ئەو دەینووسێت دەبنە سەرچاوە هەموان دەبێ پابەندی بن.

پەکەکە حزبێکی داخراوە، ئەوەی دەیەوێت بچێتە ناوی ناتوانێ لێیدەرچێت بەتایبەتی کادیران‌و ئەندامانی پێشکەوتووی هەیئەتە حزبییەکان، سەرکردایەتی دادگایی کادیران‌و سەرکردەکانی حزب دەکات جگە لەسەرکردەی باڵا (کەهەڵەناکات). ئەندامی حزب دەبێ پشتگیریی بێ چەندو چوونی سەرۆك بکات. لەناو حزبیشدا ژیانی دیموکراسی نییەو، هیچ وتووێژێکی ئازادانەی تێدا ناکرێ، بەپێی دیسپلینی رێکخستن، بۆهەر مەسەلەیەك کەڕووبەڕووی حزب‌و یان سیاسەتەکەی و یان هەڵوێستەکانی لەو ڕووداوانەی لەناودان ببێتەوە. ڕێگە بەبوونی بیروڕای جیاواز نادرێت، خۆئەگەر یەکێك لەئەندامان بیروڕای ناکۆکی خۆی دەربڕێ دەبێ ئامادەش بێت بۆ لێپرسینەوەیەکی توند یان بۆدادگایی کردن‌و سزا بڕیاردان لەدژی لەوانەیە بگاتە ئیعدام.

هەر لەوکاتانەداو لەپێناو چاکردنی پەیوەندییەکانی بەرەی کوردستانیدا بڕیاردرا وەفدێکی بەرە سەردانی عەبدوڵا ئۆجەلان لەیەکێك لەبنکەکانی گەریلاکانی لەناوچە شاخاوییەکانی نێوان سوریاو لوبنان بکات، وەفدەکە بەسەرۆکایەتی مام جەلال و ئەندامەتی نوێنەرێکی (ینك) تێکۆشەر جەبار فەرمان بوو، لەجیاتی حزبی گەلی کوردستان سامی عەبدوڕەحمان لەحزبی شیوعی کوردستان (کەریم ئەحمەد)و لەجیاتی (پدك) فەلەکەدین کاکەیی‌و غازی زێباری بوون. لەکاتو شوێنی دیاریکراودا بەئۆتۆمبێل ڕوومانکردە ئەو بنکەیەی عەبدوڵا کردبوویە بارەگای خۆی‌و، پاش نزیکەی سێیەکی کاتژمێرێك گەیشتین‌و چووینە بەردەرگای دۆڵێکی شاخەکە، ڕۆژێکی باراناوی بوو کەبەهێواشی دەیباراندو زەوی تەڕبوو ڕۆیشتن لەسەر ئەو خاکە قوڕینە گرانبوو، وێڕای ئەوەش لەئۆتۆمبیلەکانمان دابەزین‌و چووینە ناو دۆڵەکەو نزیکەی چارەکە سەعاتێك بەپێ ڕۆیشتین‌و دوای ئەوە ئیشارەتمان بۆکرا کە لەدۆڵەکەوە سەرکەوینە سەرشاخەکە، بەقسەمانکردن و بەم خاکە قوڕینەدا ڕوومانکردە بەرەوژوورو پێڵاوەکانمان قوڕێکی زۆریان هەڵگرتبوو، من لەپێشەوەی وەفدەکەدا دەڕۆیشتم‌و دوای منیش کاك جەبار فەرمان دوای ئەو مام جەلال و ئەوانیتر. ئارەق بەلەشماندا دەچۆڕاو، یەکەم کەس گەیشتمەجێ‌و عەبدوڵا لەسەر لوتکە لەپێشوازیماندابوو کە گەیشتم تەماشام کرد بەدیمەنی ئەو خەڵکە سەرکەوتووە پێدەکەنێ، پیمگوت: ئەرێ کاك عەبدوڵا بۆچی ئێمەیان بەم ڕێگەیەدا هێنا، ئاخۆ هیچ ڕێگەیەکی تر نەبوو، ئایا ڕێگەی ئۆتۆمبیل بۆبنکەکەتان نییە؟ لەوەڵامدا گوتی: ویستم تاقیتان بکەمەوە. گوتم: کاك عەبدوڵا پێویستمان بەتاقیکردنەوە نییە چونکە خۆمان پێشمەرگەین‌و بەچیاو دۆڵ‌و پێدەشتەکانی کوردستاندا هەربەپێ دێین‌و دەچین‌و ڕەنگە تۆ خۆت پێویستت بەتاقیکردنەوە بێت. گوتی: من مەبەستم تۆنییە، بەڵکو مەبەستم لەوانی ترە. گوتم: هەموویان پێشمەرگەن‌و ژیانێکی سەختیان تاقیکردۆتەوەو دەبێ خۆت مەشقی تێپەڕبوون لەم چیایانەو سەرکەوتن و دابەزین بەپێ بکەیت. پاش دەدەقیقە مام جەلال و ئەوانیتر گەیشتن‌و عەبدوڵا لەپێشوازییاندا بوو، دەستەیەکیش لەپێشمەرگەی حزبەکەی لەبنکەکەیدا لەئافرەت‌و پیاو ئامادە

کردبوو بۆ پێشوازیی وەفدی بەرەی کوردستانی، خۆپیشاندانو دەستگوشینی هەموو پێشمەرگەکان لەلایەن وەفدەکەوەو، پاش کەمێك حەسانەوە کۆبوونەوەی نێوان وەفدی بەرەو سەرکردایەتی (پەکەکە) پێکهات.

مام جەلال بارودۆخی عێراق و هەرێمی کوردستانی باسکردو ئەو سەرکەوتنەی ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی ئاداری ۱۹۹۱ بەسەرکردەیی بەرەی کوردستانی هێنایەدیو، مام جەلال لەکۆتایی وتارەکەیدا داوای باشکردنی پەیوەندیی نیوان بەرەی کوردستانیو (پەکەکە)ی کرد کە بایەخێکی تایبەتی بدرێ بەشۆڕشەکەی کوردستان لەتورکیادا چونکە هەرێمی کوردستانی تورکیا گەورەترین هەرێمە، لەڕووی خاك و لەڕووی گەلیشەوە، باسی ئەو شۆڕشانەی کرد کە گەلی کوردستانمان لەهەرێمی کوردستانی تورکیا بەرپای کردوونو باسی پەیمانی سیڤەرو بایەخی ئەو پەیمانە لەکۆمەڵەی نەتەوەکان و پاشان خۆدزینەوەی دەوڵەتانی هاوپەیمان لەپەیمانەکە، بەتایبەتی ئینگلتەرا و فەرەنسا و سازشکاری کردنێك لەگەڵ حکومەتەکەی کەمال ئەتاتورك، هەروا باسی کرد کەپێویستە لایەنگیریی بیروڕای گشتیی نێودەوڵەتان دەستخەینو لەو ڕێوشوێنانە دوور بکەوینەوە کە ڕووی ڕاستی مەسەلەی نیشتمانیو نەتەوەییمان دەشێوێنێت.

پاش ئەوە عەبدولڵا قسەی کردو پشتیوانی لەقسەکانی مام جەلال کردو جەختی لەسەر پەیوەندیی برایانەو تێکۆشەرانەی نێوانمان کردەوەو بەڵێنیدا کە لەهەموو ئەوشتانە دوور دەکەوێتەوە کە سەریەشەمان لەگەڵ حکومەتی تورکی بۆدروست دەکات. ئینجا ئەوانی تریش هەربەوڕێبازەدا قسەیان کردو جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە پێویستە هاوپەیمانی لەهەموو هەرێمەکانی کوردستان لەنێوان حزبە کوردستانییەکاندا پێکبێت و خۆلەناکۆکی و کێشەی حزبی دوور بخەینەوە بۆ بەرژەوەندیی بزافی ڕزگاریخوازیی کوردستان بەگشتی، پاش بەسەر بردنی ڕۆژێك لەم بنکەیەداو لەگەڵ کاك عەبدولڵا ئۆجەلان هەمووومان لەژێر تابلۆی دیواریی (سەرکردەکە)دا ڕاوەستاین و خۆیشی لەگەڵماندا بوو بۆگرتنی وێنە بۆ بیرەوەری. پاش ئەوەی ئۆتۆمبیل لەبارەگای بنکەکە ئامادەکران نەك لەبەردەرگای دۆڵەکە کە لەوێوە بۆسەر لوتکەی چیایەکە سەرکەوتین لەکاتی هاتنماندا بۆ بنکەکەو

عەبدولاّ دەیویست تاقیمان بکاتەوە ئایا دەتوانین سەرکەوینە سەرچیاکە؟! کاتی سـواربوونی ئۆتۆمبیلـەکان بـەکاك عەبـدولاّم گـوت: لەسـەرکەوتنی چـیاکەدا دەرچـووین؟ بـەمجۆرە مالّئاواییمـان کـرد بـەهیوای باشـبوونی پەیوەنـدی لەگـەلّ پەکەکـە بـەو هیوایـەی شـێوازی کـارکردن‌و تێکۆشـانی کـە لـەهێزەکانی بزاڤـی رزگاریخوازیی کوردستان‌و بەتایبەتی لەحزبە کوردستانییەکانی تورکیـاو لەبـەرەی کوردستانی‌و، لەپەرەسـەندنەکانی بـارودۆخی نێودەولّـەتی دوورەپـەرێزی دەخـات بگۆرێت. هەربۆگالّتەو پێش ئەوەی سواری ئۆتۆمبیلەکـە ببم عەبدولاّ پێـی گـوتم: ئایا وادەبینی من گۆرِدراوم و عاقلّ بووم. هەموو پێکەنین‌و لەوەلاّمدا گـوتم رۆژانـی ئایندە ئەوە دەسەلمێنن...دیاربوو لەوەوبەر لەهەلّوێستێکی تردا من گوتبووم کاك عەبدولاّ هێشتا میزاج‌و سۆز دەیجولّێنێ نەك عەقلّ‌و، ئەم قسەیەی لـەکاتی خۆیـدا پێگەیشتبۆوە.

رۆژانی دواتر پاش ئەم دیدارەی نێوان بەرەی کوردستانی‌و (پەکەکە)و رێکەوتن بۆ باشـکردنی پەیوەنـدیی نێـوان هـەردوولا و چـاری هەنـدێ گیروگرفـت وشـێوازی کاری چەوت.. جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کەپەکەکـە ئامـادە نییـە بـەکردەوە پابەنـدبێ بـەو رێکەوتنانـەوە کـە لـەنێوان خـۆی‌و لایەنـە کوردسـتانییەکانی تـردا دەیگاتێ. جارێکی تر دیسان پەیوەندییەکان ئـالّۆز بوونـەوەو گیروگرفـت سـەریان هەلّدایـەوەو چـەند دیـدارێکمان لەگـەلّ سـەرکردایەتی مەیدانیانـدا بـوو بۆچـاری گیروگرفتەکان‌و، کاك عەبدولاّ وەفدێکی حزبـی ئێمـە، حزبـی شـیوعی کوردسـتانی بانگکرد بۆسەردانیان لەشام‌و، مەکتەبی سیاسیی حزب بریاریدا کە بـەدەنگ بـانگ کردنەکەیانەوە بچین و سەردانیان بکەین‌و وەفدەکـەمان لـەمن (کـەریم ئەحمـەد)و مەلا حەسەن‌و حەیدەر شێخ عەلی پێکهات‌و وەفدەکەمان چووینە مالّێك کـە حزبـی شیوعی عێراق بۆمانەوەی سەرکردەو کادیرانی حـزب بـەکرێی گرتبـوو، نەچووینە میوانداریی(پەکەکە)، هەرکە گەیشتینە شام هـەوالّمان بۆنـاردن کەئێمـە ئامـادەین بۆدیداریان، ئەندامی مەکتەبی سیاسـیی حزبەکـەیان لەگـەلّ هاورێیـەکی ئێمـە کـە حزبـی جێهێـشتبوو لەگـەلّ ئەوانـدا بـوو هـات‌و بانگهێـشتیان کردینـەوە کـە لەمیوانداریی ئەواندابین و جێگەیان ئامادە کردووە، بـەلاّم ئێمـە وامـان بەباشـزانی

هەرلای خۆمان بین، ئینجا داوامانکرد کاتێك دابنێن بۆچاوپێکەوتنی کاك عەبدولاّ بۆدانانی بەرنامەی کاری کۆبوونەوەی هەردوو وەفدەکە، لەکاتی دیاریکراوداو لەبارەگای کاك عەبدولاّ پێکەوە کۆبووینەوەو، هەرلەوێ قوتابخانەی حزبییان هەبوو، بەرنامەی کارمان داناو لەبارەگاکەیان کە لەدەرەوەی (دیمەشق) بوو دەرچووین بەهیوای دیدار لەکۆبوونەوەی تەرخانکراودا بۆباسی خاڵەکانی بەرنامەی کارو ڕێکەوتنی نێوانهەردوو حزبمان. ئەوەبوو دیدارەکە ئەنجامدراو ژمارەیەکیش لەسەرکردەکانی (پەکەکە) ئامادەی بوونو سەرنجماندا ئەوانە بەوشەی (سەرۆکم) بانگی عەبدولاّ دەکەنو بەدەوری مێزی وتووێژدا ڕاوەستابوون تا عەبدولاّ فەرمانی دانیشتنی پێدان ئیتر هەریەکەیان لەجێی خۆی دوور لەسەرکردە دانیشتن و کەسیان جگە لەعەبدوللاّ بەشداریی قسەکردنیان نەکرد.

دوای کۆتایی باسی بەرنامەی کار بڕیارماندا لەکۆبوونەوەکەوە بەیاننامەیەك بەئیمزای هەردوو حزبی شیوعی کوردستانو پارتی کرێکارانی کوردستان لەدژی پەلامارە شۆڤێنییەکەی تورکیا دەرکرێت و لەڕۆژی ١٩٩٧/٥/١٧دا ئەم بەیاننامەیە بلاّوکرایەوە.

**لێرەدا دەمەوێ دەقی بەیاننامەکەو ئەو رێکەوتنەی لەنێوان هەردوولادا ئیمزا کراو هەروا نامەی من بۆ عەبدوڵاو وەڵامەکەی ئەو لێرەدا دیسان بڵاوبکەمەوە:**

***رێکەوتنی دووەمی نێوان حزبی شیوعی کوردستان-عێراق و پارتی کرێکارانی کوردستان pkk***

** * **

*بەپێی هەست بەبەرپرسی کردنی مێژوویی سەرشانی هەردوو حزب: حزبی شیوعی کوردستان-عێراق، پارتی کرێکارانی کوردستان، لەبارەی چارەنووس و مەسەلەی گەلی کوردستان و گشت گەلان و کەمینە نەتەوەکانی تر کە لەکوردستان و ناوچەکەدا دەژین بەتایبەتی لەم قۆناغە سەخت و گرنگەی مێژووی خەباتی گەلەکەمان و بزاڤی رزگاریخوازیی گەلی کوردستان و پەلاماری کۆلۆنیالی و ئیمپریالی بۆسەرناوچەکە، وەفدێکی تایبەتی پارتی کرێکرانی کوردستان بەسەرۆکایەتی هاورێ عەبدوڵا ئۆجەلان سەرۆکی پارتەکە، گەیشتنە وەفدێکی حزبی شیوعی کوردستان-عێراق بەسەرۆکایەتی هاورێ کەریم ئەحمەد سکرتێری حزب لەرۆژی ١٩٩٧/٥/٦دا، دیدارەکە لەکەشوهەوایەکی دۆستانەو هاورێیانەداو بەهەستکردنی بەرزی بەرپرسیی مێژووییەوە بەرێوەچوو، باسی پەیوەندیی دووقۆڵی هەردوولاو ئەو پەرەسەندن و ئاڵوگۆرانەکرا کە لەکوردستان و ناوچەکەدا بەرێوەدەچن و هەردوولا جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە بزاڤی رزگاریخوازیی نیشتمانی کوردستان لەهەموو ناوچەکاندا (لەهەرێمەکاندا) و لەم ساڵانەی دواییدا توانیویەتی هەندێ سەرکەوتن و دەستکەوتی گرنگ لەلایەنی ناوخۆو دەرەوەدا بێنێتەدی، هەر لەوکاتەشدا هەندێ دیاردەی نەگاتیف بەدیار کەوتن وەك دابەشبوون و گیروگرفتی ناوخۆی بێ بنەوان و کاروبارەکان لەم ئاستەدا نەوەستان بەڵکو پەرەیانسەندو گەیشتنە شەرو کوشتاری سەربازی، ئەمە لەکاتێکدا قۆناغی مێژوویی ئەمرۆ بزاڤی گەلەکەمانی پێدا تێپەڕدەبێ وادەخوازێ هێزەکان لەهەموو ناوچەکان (هەرێمەکان)ی کوردستان یەکبخرێن و لەبەرەیەکی نیشتمانی کوردستانیدا گشت هێزە سیاسییەکان کۆبکاتەوە بۆسەرکردایەتی خەباتی*

گەلەکەمان لەپێناو هێنانەدی ئامانجەکانیداو دەستخستنی مافە نەتەوەییە ڕەواکانمان تاگەیشتنە مافی بڕیاردانی چارەنووس.

مەسەلەی نیشتمانی ڕزگاریخوازیمان مەسەلەیەکی ڕەوایەو بەستراوە بەدیموکراسییەوە لەو دەوڵەتانەی بەشەکانی کوردستانیان ئیستیعمار کردووە (لکاندویانن بەخۆیانەوە)، بۆیە لەسەر هێزەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان پێویستە لەگەڵ هێزە دیموکراسییەکانی هەریەکێك لەم دەوڵەتانەدا هاوپەیمان بن، لەپێناو هێنانەدی ڕژێمێکی دیموکراسیدا کەدەربڕی خواستەکانی گەلەکەمان بێت و بەکردار مافی چارەنووس بۆ گەلی کوردستان دابین بکات لەسەر بنچینەی یەکێتی فیدراڵی دیموکراسی یان هەرشێوازێکی دیکەی دابینکردنی مافە ڕەواکانی گەلەکەمان لەسەر بنچینەی مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلان.

هەروەولا باوەڕیان وایە کە مەسەلەی کورد، مەسەلەی گەلێکی دابەشکراوو مافخوراو ناکرێ چارەسەر بکرێ بەرێگای ئاشتی نەبێ‌و لەسێبەری ڕژێمێکی دیموکراسیدا نەبێ لەهەموو پارچەکاندا، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی خواستەکانی گەلی کوردستان بۆدابینکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی لەناو ئەو دەوڵەت ورژێمەی تێیاندا دەژی و لەسەر بنچینەی دیموکراسی، هەروا ئەزموونە مێژووییەکان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە مەسەلەی گەلانی شەیدای ڕزگاری بەرێگای سەربازی‌و توندو تیژیی و ڕاوەدوونان‌و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی چارەسەر ناکرێت... لەگۆشەی ئەو باروەدۆخەوە کە بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستانی لەهەریەشێك (هەرێمێکدا) لەبەشەکانی کوردستان پێیدا تێپەڕدەبێت، درێژکردنی دەستی پشتگیریی‌و یارمەتی بۆ بەشەکانیتر، کارتێکردنی باش‌و پۆزەتیڤیان دەبێ‌و بەمەسەلەیەکی گرنگ‌و پێویست دادەنرێن، چونکە مەسەلەکە پێویستی بەئاشتی‌و دیموکراسی‌و هاوکاری‌و بەیەکبوون هەیە. خەباتی هەریەشێکیش کارێکی جیدی دەکاتە سەر بەشەکانی تر، بەتایبەتی خەباتی گەلەکەمان لەباکوورو باشووری کوردستان، ئاشکرایە سەرکەوتنی هەریەشێك سەرکەوتنە بۆ بەشەکانی تر، بۆیە دوژمنانی گەلەکەمان هەوڵدەدەن دەستکەوتەکانی گەلەکەمان لەهەموو پارچەکاندا، بەبێ ڕێزگرتنیان لەمەبدەئەکان

و یاسانێودەوڵەتییەکان، لەباربەرن.

جا لەم تێهەڵچوونەوە، لەسەر هێزەکانی بزاڤی نیشتمانی پێویستە لەپێناوی فراوانترین هاوکاریدا خەبات بکەن کە خەباتی هەریەشێکی لەگەڵ بەشەکانی تریدا بگونجێت.

هەردوولا جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە هەریەشێك (هەر هەرێمێك) بارودۆخێکی خەباتگێرانەی تایبەتی خۆی هەیەو هێزەکانی بزاڤەکە لەهەریەشێکدا خۆیان تایبەتمەندیی ئەم بەشە دیاریدەکەن بەڵام هەرلەوکاتەشدا ستراتیژییەکی گشتیو فراوان هەیە ئامانجەکەی یەکگرتنی کوردستانو رزگارکردنی گەلەکەیەتی، چونکە بارودۆخی بزاڤی کوردستان ئاڵۆزو هاوپەیوەندە بەهۆی پارچەکردنی ناڕەوایانەوە کە بەسەر کوردستاندا سەپێندراوەو بەپێچەوانەی خواستی گەلەکەمانەوە کە لەدەیەی دووەمی چەرخی بیستەمدا ئەنجامدرا.

بزاڤی رزگاریخوازیی ئێمە بەتەنیا ڕوو بەڕووی رژێمێکی شۆڤێنی نەبۆتەوە، بەڵکو ڕووبەڕووی چەند رژێمێکی شۆڤێنی جۆربەجۆر بۆتەوەو، ڕووبەڕووی بەرژەوەندەکانی ئیمپریالیزمە لەناوچەکەدا کەئەمەش وا لەپێشڕەوە سیاسییەکانی کوردستان دەکات لەشوێنی بەرپرسیو ئەوئەرکانەدا بن کە لەهەریەشێك لەبەشەکانی کوردستاندا ڕاگەیەندراون. هەروا پێویستە هێزەکانیان یەکخەنو کاروبارەکانیان بەهاوکاری لەگەڵ یەکتردا بێننەدی و لەبارودۆخەکان بەشێوەیەکی واقیعبینانە بکۆڵنەوەو پەندو تاقیکردنەوەو ئەزموونی خەباتیان بەهاوکاری لەنێوخۆیاندا ئاڵوگۆڕ بکەن.

هەروا هەردوولایەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هەرلایەنێك یان حزبێکی کوردستانی لەهەر پارچەیەکدا ئەگەر لەگەڵ دوژمنانی گەلەکەمان و لەسەر حیسابی خەباتی گەلەکەمان لەبەشەکانی تردا هاوکاری بکەن، ئەوا زیان بەمەسەلەی گەلی کوردستان و چارەنووسەکەی دەگەیەنن.

لەسەر بنەمای ئەم بۆچوونە هزرییانە هەردوولا گەیشتنە ڕێکەوتنێك لەسەر ئەم ئەرکانەی لای خوارەوە:

یەکەم: هەوڵدان بۆئامادەکردنی بارودۆخێکی گونجاو بۆپتەوکردنی ئاشتییەکی

هەمیشەیی و بەربلاو لەباشوری کوردستاندا بەڕێگەی ڕێکەوتنی نیشتمانی لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستانداو هەوڵدان بۆ ڕووکردنە دیالۆگی دیموکراسی و لەژێر چەترێکی کوردستانیداو بەسەرپەرشتیی هەموو هێزەکان و دۆستانی گەلەکەمان و دەستەبەرداربوون لەبەکارهێنانی چەك بۆچاری ناکۆکییەکان و ، چاری مەسەلەی حوکم و دەسەلات بەڕێگەی هەڵبژاردنی دیموکراتیانەی ئازاد، پاش ڕەخساندنی باروئۆخێکی گونجاو بۆ هەڵبژاردن و بەبەشداریی گشت حزب و هێزە کوردستانییەکان و کەسایەتییە نیشتمانی و ڕۆشنبیرە سەربەخۆکان.

دووەم: هەوڵدان بەشێوەیەکی جیدی لەپێناو هێنانەدی بەرەی کوردستانی لەهەر هەرێمێکداو پێکهێنانی پەیوەندییەکان و هاوکاری و برایەتی و یارمەتی کاروباری تێکۆشەرانەی نێوانیان.

سێیەم: پێویستە ئەم بەرەیانە، لەناو خۆیاندا وتووێژ بکەن لەسەر چۆنیەتی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەم یان ئەو دەوڵەتی ناوچەکە، بەمەرجێك ئەم پەیوەندییانە لەدژی خەباتی گەلەکەمان لەبەشەکانی تردا نەبن.

چوارەم: قەدەغەکردنی چەك بەکارهێنان بۆچاری ناکۆکییەکان کە دەشێ لەنێوان حزبە کوردستانییەکاندا لەکاتی هێنانەدیی ئەم بەرەیانەدا بەدیاربکەون بەڵکو دەبێ پەنابەرنەبەر دیالۆگی دیموکراسی و ناوبژی گرتنەبەری شێوازی ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆگرتنی برایانەو دروستکارو نۆزینەوەی چارەسەری پۆزەتیڤانەی ناکۆکییەکان.

پێنجەم: کوردستان گۆڕەپانێکە بۆخەباتی هەموو حزبە کوردستانییەکان کەمافی پەیڕەوکردنی خەباتی سیاسی و ڕێکخراوەیی و ڕاگەیاندنی هەیە، بەشێوازی دیموکراسی و بەپێی پێوانە ڕەواکان و، دەبێ هیچ حزبێك لەدژی ئەم مەبدەئانە ڕانەوەستن.

شەشەم: هەردوو حزب لەکاردا دەبن بۆپەیداکردنی باروئۆخێکی گونجاوی دیداری نێوان حزبە کوردستانییەکان لەهەموو بەشەکانداو لەسەر ئاستی کوردستان و کارکردن بۆگەیشتنە بڕیارو هەڵوێستی هاوبەش لەوانەش بەستنی

کۆنگرەی نیشتمانی گشتیی کوردستانی بۆئەوەی گشت هێزە کوردستانییەکان‌و کەسایەتییە نیشتمانپەروەرەکان بگرێتەوە، ئەمەش لەپێناو دانانی پیلانێکی نیشتمانی لەهەموو بوارەکانداو لەوانەش چالاکیی دیبلۆماسی‌و ڕاگەیاندن لەسەر ئاستی دەرەوەو دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەزمانی بیانی و دامەزراندنی تەلەفزیۆن و ئیستگەی ڕادیۆی نێودەوڵەتی هاوبەش.

حەوتەم: هەردوو حزب پڕیاوەڕن کەئەم بارودۆخەی بزاڤی ڕزگاریی پێدا تێپەڕدەبێ تێکچڕژاو وگرانەو ئەو پیلانە دوژمنانەیەی لەدژی گەلەکەمان‌و دوا ڕۆژەکەی ڕێکدەخرێ، واپێویست دەکەن تەواوی ڕێکخراوە کوردستانییەکان لەخەباتێکی ڕاست‌و دروست‌و هاوبەشداو بەشێوازی جۆربەجۆر بەشداری بکەن، لەپێناوی هێنانەدیی ئامانجە ڕەواکاندا. دەرچوونی هەرحزب یان ڕێکخراوێك لەهاودەنگیی کوردستانی زیانێکی زۆر گەیاندنە بەمەسەلەی ڕەوای گەلەکەمان.

هەشتەم: هەردوو حزبی شیوعی کوردستان–عێراق‌و پارتی کرێکارانی کوردستان لەمەوبەرو ئێستاش کاردەکەن بۆجەخت کردن لەسەرئەوەی بزاڤی نیشتمانی کوردستان زۆری کردووە بۆ گەیشتنە چارێکی ڕەوای مەسەلە ڕەوایەکەمان، بەڵام ئەو دەوڵەتانەی چەند بەشی کوردستانەکەمانیان ئیستیعمار کردووە (پێیانەوە لکێندراون) گوێ نادەنە داخوازییە ڕەواکانیان‌و لەکارابوون بۆتێکشکاندنی جوڵانەوەکەمان بەناشیرینترین ڕێوشوێن‌و ئەمەش بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی شۆڤێنی لەدژی گەلەکەمان‌و بوونی نیشتمانیی، ئەمەش بۆتە هۆکاری ئەوەی هێزەکانی بزووتنەوەکە ئەم کردەوەی داپڵۆسین‌و دڕندانەیە بەپەنا بردنەبەر چەك وەڵام بدەنەوە لەپێناو بەرگریکردندا لەمەسەلەی ڕەوای گەلەکەمان.

نۆیەم: هەردوو لایەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە چاری ئاشتی و دیموکراسی مەسەلەی کورد لەباکوری کوردستان سەرکەوتوو نابێ ئەگەر ئەوە بەچاوی بایەخ تەماشا نەکرێ کە پارتی کرێکارانی کوردستان لایەنێکی سەرەکی وتووێژو دیالۆگ بێت شانبەشانی تەواوی هێزە نیشتمانییەکانی تری کوردستان.

دەیەم: هەردوولا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بزاڤی نیشتمانی

ڕزگاریخوازیمان دوژمنایەتی گەلانی دراسێ ناکات، لەوانەش گەلانی عەرەب کە چەندان پەیوەندیی مێژوویی و ڕۆشنبیری و خەباتی سەدان ساڵ پێکیانەوە دەبەستێتەوە، هەر بەوچەشنە لەبارەی هەردوو گەلی فارس و تورکەوە. گەلی ئێمە ژیانو ئاشتیو برایەتی لەگەڵ ئەم گەلانەدا خۆشدەوێ، بەڵام خەبات لەدژی ڕژێمە ڕەگەز پەرستە زۆردارەکانە کەسادەترین مافی نەتەوەییو مرۆڤایەتی دەدەنەدواوە، لەکۆشش و تەقەلادان بۆلەناوبردنی گەلەکەمان بەپیسترین شێوازی چەك بەکارهێنانی وەك چەکی کیمیایی.

پانزەیەم: هەردوو حزبەکە هەوڵدەدەن بۆیەکخستنی هێزو توانا لەپێناوی بەربەستیی هەرهێرشێکدا بۆسەر کوردستان یان بۆسەر بەشێکی، لەلایەن لایەنە دوژمنەکانەوە کە هەوڵدەدەن دەستبخەنە کاروباری ناوخۆوە یان بەڕێوشوێنی تر.

دوانزەیەم: هەردوولا جەخت دەکەنەوە کە کوردستان موڵکی کوردەو هەروا موڵکی هەموو نەتەوەو گەلەدێرینەکانە کە شانبەشانی گەلی کورد دەژین و شارستانی ڕەسەنیان بنیاتناوە، وەك گەلی ئاشووریو کلدانو تورکمانو عەرەب...تاد. گەیشتنی گەلی کورد بەوەرگرتنی مافە نیشتمانییە زەوتکراوەکانی مانای دابین کردنی مافەکانی ئەم نەتەوانەشەو یەکسانی تەواویانە لەگەڵیدا، لەوانەش مافەکانی بەڕێوەبەری و ڕۆشنبیری و، ئەم بەرپرسییە مێژووییە دەکەوێتە سەر ئەستۆی حزب و ڕێکخراوەکانی ئەم نەتەوانە بەوەی چارەنووسی نیشتمانی و مافەکانیان ببەستنەوە بەچارەنووسی گەلی کوردەوەو، دەبێ نەبنە ئامراز یان کلکی نەتەوەیی ئەو ڕژێمانەی کوردستانیان داگیرکردووەو دەیانەوێ مافەکانی گەلی کوردستان بسڕنەوەو دەسکەوتەکانی لەباربەرن، بەڵو پێویستە بەگیانی بەرپرسیی مێژووییەوە تەماشای خەباتی گەلی کوردستان بەهەموو نەتەوەو تایەفەو ئاینەکانییەوە بکەن، هەروا دەبێ هۆشیارو ئاگادارین لەبەرانبەر نەخش و پیلانی دوژمناندا کە هەوڵدەدەن کوردستان بکەنە گۆڕەپان و بنکەی بەرژەوەندەکانی ئیمپریالیزم.

بەم بۆنەیەشەوە داوا لەهەردوو حزبی پارتی دیموکراتی کوردستانو پارتی کرێکارانی کوردستانو هێزە کوردستانییەکانی تر دەکەین، کە لەدژی نەخشەکانی

سڕینەوەی مەسەلەی گەلەکەمان بووەستن بەبیانووی ئاشتیو ئاشتبوونەوەو دروستکردنی جێگرێکی ساختەو هەوڵدان بۆ گۆڕینی باشووری کوردستان بەگۆڕەپانێك بۆ تەقینەوەو پیلانگێڕان لەدژی خواستو ئاواتی گەلەکەمان گەلانی ناوچەکە.

سیانزەیەم: لەسەر ئەو بنچینانەی سەرەوە، هەردوو حزب لەدژی پرۆتۆکۆڵەکانی عەسکەریو ئاسایشی تورکی–ئیسرائیلی دەوەستن کە پێچەوانەی ئامانجەکانی گەلانی عەرەبو بەتایبەتی هەردوو گەلی فەلەستینو سوری خۆڕاگرو ئامانجی ئەم نەخشانەش ئەوەیە دوژمنایەتی ئاواتەکانی گەلی کوردستان بکرێت لەپێناو هێنانەدیی خواستە نەتەوەییە ڕەواکانیدا.

چواردەیەم: هەردوو حزب وایدەبینن کە بارودۆخێکی مەوزوعی گونجاو هەیە بۆ پەرەپێدانی بزاڤە رزگاریرخوازەکەمان، ئەگەر بتوانین گیروگرفتو کەموکورتییەکانی کاروباری تێکۆشانمان چارەسەر بکەینو ئەگەر بتوانین بارودۆخێکی ناوخۆیی گونجاو بۆ بزاڤەکەمان دابین بکەین بەوپێیەی کە بەردی بناغەیە بۆ بەهێزکردنی بنکەی جوڵانەوەکەمانو بەتایبەتی یەکخستنی هێزە نیشتمانییەکانو ڕێکخستنو ئامادەکردنی جەماوەری گەلە تێکۆشەرەکەمان کە خۆی خاوەنی بەرژەوەندیی ڕاستەقینەو هێزی مرۆیی تاقیکراوەن لەپێناو هێنانەدی ئامانجە نیشتمانیو دیموکراسییەکانو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا.

پانزەیەم: ئەو ئەرکانەی لەم بەڵگەنامە مێژووییەدا باسیانکراوە وایپێویست دەکەن پەنا ببرێتەبەر دیالۆگو هاوکارییو بەدواداچوونی هەمیشەیی، لەبەرئەوە هەردوولایەن بڕیاریاندا کۆبوونەوەی هاوبەشی سەرکردایەتی و لەکاتی کورت کورتدا لەپێناو بەدواداچوونی ئەو ئەرکانەی لەسەرەوە دانراون ئەنجام بدەن.

## لێرەدا دەقی نامەکەم بۆ عەبدوڵا ئۆجەلان بڵاو دەکەمەوە

*برای بەرێز عەبدوڵا ئۆجەلان.!*

*براتان کەریم ئەحمەد سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی کوردستان.*

*سلاوێکی گەرم...*

*کەشوهەوای یەکجار ئاڵۆزی بزاڤی رزگاریخوازیی نیشتمانی گەلی کوردستان، پاڵیپێوەنام و هانیدام کە ئەم نامەیەتان بۆ بنووسم، لەبارەی هەندێ بابەتەوە کە ویستم لەگەڵتان وتوویژی لەسەربکەم.*

*ئێوە دەزانن گەلی کوردستان لەسەدەیەك زیاترە لەپێناو رزگارکردنی نیشتمانەکەیداو لەپێناو پێکهێنانی قەوارەیەکی سیاسیی سەربەخۆدا خەبات دەکات. لەم رێڕەوەشدا زۆر شێوازی جۆربەجۆری گرتۆتەبەرو هێندە قوربانیی بەختکردووە کە لەژماردن نایەت. بەڵام کۆسپ و تەگەرەکانی رێگری ئەم رێڕەوە نەیانهێشتووە ئەم ئامانجە پیرۆزانە بێنەدی. ئەم کۆسپو تەگەرانەش دوو رەهەندیان بووە، یەکێکیان هەرێمی-نیودەوڵەتی و، ئەویتریان لەناو بزاڤەکەمان خۆیدا بووە، بەمەش بەرپرسێتی سەرنەکەوتنی شۆرش وڕاپەڕینە نیشتمانییەکانی گەلەکەمان، چ لەسەر ئاستی هەموو کوردستان یان لەسەر ئاستی هەر هەرێمێك لەهەرێمەکانی کوردستانی دابەشکراو دەکەوێتە سەر ئەستۆی سەرکردایەتییەکان لەم بزووتنەوەیەدا.*

*لەلایەکی تریشەوە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتانی هەرێمەکەو سیاسەتی شۆڤێنییان بەرانبەر گەلی کورد، بەرژەوەندەکانی دەوڵەتانی ئیمپریالیزم کە لەقەبارەی کێشەدا بۆدابەشکردنی بازاڕەکانی ناوچەکەو جیهان لەئارادابوو. پاڵیپێوەنان بۆدابەشکردنی کوردستان، لکاندنی هەربەشێك بەدەوڵەتێکی دراوسێوە. ئەم دەستدرێژیو تاوانانە لەدوای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر دەستپێکران،و ئەنجامی پەیمانی لۆزان بوون. هەرئەمەش زیاتر مەسەلەی کوردی ئاڵۆزکرد. ئەم دابەشکردنەش کە بەخواستی گەلی کورد نەبوو، بەڵکو*

بەپێچەوانەوە لەدژی خواستەکەی بوو، لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمانەدا بووە هۆی خولقاندنی تایبەتمەندییەك بۆهەریەشێك لەم بەشانە. ئەم تایبەتمەندییانە بەسترانەوە بەڕەهەندەکانی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتی جیاوازی هەریەکێك لەم دەوڵەتانەی بەشەکانی کوردستانی پێوە بەسترانەوە.

گەلی کوردستانیش لەباشووروو باکوورو خۆرهەڵاتدا بەبەرپاکردنی شۆرش وەڵامی ئەم تاوانانەیان دایەوە. بەڵام دەوڵەتانی ڕەگەزپەرست بەهەموو شێوەیەکی سیاسیو رۆشنبیریو سەربازیی درندانە پەلاماری ئەم شۆڕشانەیانداو وێڕای ئەوەش هەر نەیانتوانی لەناویان ببەن. دوای هەرشکستییەك شۆڕشێکی تر هەڵدەگیرسایەوە.

لەکوردستانی عێراق شۆڕشەکان زنجیرەیەکی هاوپەیوەند بوونو یەك لەوای یەك هەڵدەگیرسان. جا ئەگەرچی پیلانە شومەکەی ساڵی ١٩٧٥ لێدانێکی بەئازار بوو سرەوێندرایە شۆڕشەکەی ئەیلول بەڵام گەلەکەمان بەخێرایی بەرپەرچیی ئەم پیلانەی دایەوەو، لەراپەرینە جەماوەرییەکەی ساڵی ١٩٩١دا، بزاڤی گەلەکەمان گەیشتە لوتکەو، کوردستان لەدایەرەو دام و دەزگاکانی رژێمی دیکتاتۆری پاکرایەوە. بەمجۆرەش لەکوردستانی ئێران و دوای شۆڕشەکەی گەلانی ئێران کە رژێمی شاهەنشاهییان ڕووخاندو بووەهۆی دامەزراندنی حکومەتێکی تازە، بەڵام حوکمی جمهوری ئیسلامی، هەروەك رژێمەکانی پێشوو مافەکانی گەلی کوردی پشتگوێ خست و دڵرەقانە لەبزووتنەوەی نیشتمانیو دیموکراسی ئێرانو لەبزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردی سرەواند.

لە کوردستانی تورکیا لەهەفتاکانی ئەم سەدەیەدا، گەلەکەمان توانی لەسەر پێ بوەستێو گۆرەپانی کێشە لەگەڵ رژێمی عەسکەرتاریای تورکیدا بکاتەوەو، رێکخراوی سیاسیو حزبەکان دامەزرێنێ. یەکێك لەوحزبانە حزبەکەی ئێوەیە (پەکەکە) کە هەڵگیرسانی شۆڕشی چەکداریی راگەیاندووە، لەپێناو هێنانەدی ئامانجو داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کوردمان لەکوردستانی تورکیادا.

لەم باسکردنە مێژووییە خێرایە مەبەستم ئەوە بوو رۆشناییەك بخەمەسەر ئەو راپەرین و بزووتنەوە رزگاریخوازییە نیشتمانیانە، تا ڕوونی بکەمەوە کە ئەم

بزووتنەوانـە لەبەشـەکانی کوردسـتاندا لەئاسـتێکی وەك یـەکی کـارو ڕێکخـستندا نـەبوون. چـونکە هۆکـاری دابەشـبوونی کوردسـتان کـارێکی وایکـردووە ئاسـت و شێوازو تەماشای ڕێگای چارەسەرکردنی ئەم داخوازییانەی وەك دروشم دارێژراون، لەهەریەشـێکدا جۆرێـك و لەبەشـەکانی تـر جیـاوازبن. بێگومـان پانتـایی ئـەم جوداوازییانـە لەهـەر بەشـێکیدا بۆتـە هـۆی ئـەوە کـە لەهـەر بەشـێکدا حـزب و ڕێکخراوەو سەرکردایەتی تایبەتی خـۆی هـەبێت‌و شـێوازی خـەبات‌و کۆبوونـەوەی ئـەم هێزانـە لەبەرەیـەکی هاوپەیمانیـدا یـان لـەهاوکاری و کـردەوەی هاوبەشـی سـەربازیی‌و سیاسـیدا کـە بـەپێی ئـەم تایبەتمەندییانـە دەستنیـشان کـراون. لەئەنجامـدا لەمەویـەرو ئێـستاش لەهـەموانی کردۆتـە پێویـست کـە بـەقوڵی لـەم تایبەتمەندییانە بکۆڵنەوە تا بەکەمترین شت بگەنـە لێك تێگەیشتن‌و هەڵوێستی هاوبەش‌و هاوسەنگ بۆڕێکخستنی کاروبارو چالاکییەکانیان بەشێوەیەکی وا نەبێتە پێکدادانی شێوازەکانی خـەباتمان بـەڵکو وابێـت هەنـدێکیان ئـەوانی تریـان تـەواو بکـەن. بـەڵام بەداخـەوە لەهەلومـەرجی بزووتنەوەکـەمان بەجیـدی‌و پێکـەوە نەکۆڵیوەتـەوەو لەلایـەن هـەموو باڵـە جۆربـەجۆرەکانی ئـەم بزاڤـەوە شـیمان نەکردۆتەوە. هۆکاری ئەمەش لەپلەی یەکەمدا دەگەڕێتەوە بۆ کێشەو زۆرانبـازیی نابەجێ‌و بێ بنـەوانی نێـوان باڵـەکانی جوڵانەوەکـەمان لەسـەر ئاسـتی هـەرێمی‌و لەهەموو کوردستاندا بەگشتی.

برای بەڕێزم. !

ئێوە دەزانن ئەو دەوڵەتانەی بەشەکانی کوردستانیان پێوە لکێنـدراون، ڕێبـاز یان سیاسەتی چارکردنی مەسەلە نەتەوەییە نیشتمانییە ڕەواکەی ئێمـەیان نییـە. بەهیچ جۆرێکیش ئامادەنین لانی کەمی ئەم مافانە بڕیاربدەن.

مێـژوو سـەلماندوویە کـە ئـەم دەوڵەتانـە کێشەو ناکۆکییـان لـەبارەی هـەموو شـتێکەوە هەیـەو، لەسـەر ئـەو کێـشانەی نێوانیـان بـەردەوامن، تـەنیا لەسـەر مەسەلەی کورد نەبێ کە هـەموویان لەسـەر ڕیشەکێشانی خواست‌و ئامانجەکانی کوردو هێشتنەوەیان بە بەشبەشکراوی‌و لەسەر چەوسانەوەی نەتـەوەی کوردمـان ڕێککەوتوون.

هەردەبێ ئێوە سەرنجتاندابێ، کەهەر لەوکاتەوە ڕاپەڕینە جەماوەرییە گەشەدارەکەی ساڵی ١٩٩١ لەلایەن گەلەکەمان لەباشووری کوردستاندا بەرپاکراو پاش ئەوەی بەرەی کوردستانی بەڕێوەبردنی هەرێمی کوردستانی عێراقی گرتۆتە دەستو یاسای هەڵبژاردن دانراوەو پەرلەمان هەڵبـژێردراوەو حکومەتێکی هەرێم پێکهاتووە، ئەم دەوڵەتانە کەوتوونەتە کۆبوونەوەی هاوبەشو هاوکاری لەناو خۆیانداو نەخشەکێشانی پلانی هاوبەشیان بۆلەباربردنی ئەم ئەزموونەو لەناوبردنی. بەڵام دوای دەستپێکردنی شەڕو کوشتاری ناوخۆی نێوان (پدك و ینك) ئەم کۆبوونەوە هاوبەشانەیان کۆتایی پێهێنا. بۆچی ئەمەیان کرد؟ چونکە ئەوەی مەبەستیان بوو ڕوویدا. ئامانجەکەی هاتەدی. ئەو ئامانجەی کە دەبوو بەلەشکرەکانیانو دەزگای هەواڵگیرییانو تابوری پێنجەمیان بیهێننەدیو پارەی زۆری تێدا خەرج بکەن، کورد خۆیان ئەوەیان بەڕێگای یەکتر کوشتن هێنایەدی. خۆمان و بەدەستی خۆمان دەستمان بەلەناوبردنی ئەزموونەکەمان کرد، لەم سنوورەشدا نەوەستان، بەڵکو دەستیان کردە دانانی کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم کۆششی ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکەی کوردستانی عێراق و، کۆششی ئاشتبوونەوەی نێوان لایەنە بەشەڕهاتووەکان، هەردەوڵەتێکی هەرێمەکە لەدوای لایەنێکەوە وەستان و یارمەتی و پشتگیریی هەڵویستیان کردن، ئەمەش وای لێهات لایەنە بەشەڕهاتووەکان بکەونە هەناسە برکێی ڕاکردن بەدوای وەرگرتنی یارمەتی لەیەکێك لەو دەوڵەتانەی هەرێمەکە. ئەم سیاسەتەش لەلایەکەوە ئەو لایەنانەی لاوازکردو لەلایەکی تریشەوە بەستنییەوە بەدام و دەزگاو نەخشەکانی دام و دەزگا سیاسییەکانی دەرەوە تا لەئەنجامدا بتوانن ئەم ئەزموونەش لەناوبەرن.

دابەشکردنی کوردستانی عێراق بەدوو بەڕێوەبەرێتییەوە ئەنجامی پیلانگێڕانی ئەودەوڵەتە هەرێمییانە بوو جا ئاخۆ پەنابردنە بەر یەکێك لەو دەوڵەتانەو داواکردنی یارمەتییانو چوونە ناوموعادەلەی کێشەکانی هەرێمەکەوەو بەشداریی لەگۆڕەپانی ئەم یارییانەدا، لەبەرژەوەندیو قازانجی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی گەلەکەماندا بوو؟ ئایا ئەو پشتگیرییو یارمەتییەی دەیانبەخشییە

لایەنە کوردییە ناکۆکەکان لەبەر چاوی ڕەشی گەلی کوردو کوردستانی وڵات بوو؟

ئایا ئەو پشتیوانی و یارمەتییانە لەو پێناوەدا بووە کە ئامانجە نەتەوەیی‌و نیشتمانییەکانمان بەدەست بێنین. ئایا لەبەرژەوەندیی خودی ئەم حزبانە خۆشیاندابوو؟ ئایا سەربەخۆیی سیاسی‌و هزرییان مایەوە؟ بۆوەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە دەڵێم: بێگومان نەء.

ئالەم بارەیەوە دەمەوێ سەرنجتان بۆڕێکەوتنە دووقۆڵییەکەی حزبی ئێمەو حزبەکەی ئێوە ڕابکێشم کە بەرهەمی چەندان کۆبوونەوەی نێوانمان بوو. ئێمە لەوێ بەڕاشکاوی‌و ئاشکرا لەسەر سیاسەتی دەوڵەتانی هەیمەکەو پیلانگێڕییان و ئەنجامەکانی ئەوە قسەمان کرد.

ئێمەو ئێوە لەڕێکەوتنەکەماندا جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە بزاڤی ڕزگاریخوازیمان لەهەرێمەکانی کوردستان تایبەتمەندیی خۆیان هەیەو ئێمە دەبێ ئەم تایبەتمەنییانە لەبەرچاو بگرین، لەسەریشمانە پشتیوانی‌و لایەنگیری هەموو بزووتنەوەکانی هەرێمەکانی تر بکەین. گوتیشمان سەرکەوتنەکانی بزووتنەوەکەمان لەهەربەشێکی کوردستاندابن سەرکەوتنن بۆگشت بزووتنەوەکانی تر. دوژمنانیشمان ئەم ڕاستییە دەزانن بۆیە لەپێناو نەهێشتنی ئەم سەرکەوتنانەدا کاردەکەن.

ئایا ئێمەو ئێوە نەبووین لەڕێکەوتنەکەماندا جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە بەکارهێنانی چەک‌و توندوتیژی لەپێناو چاری ناکۆکییەکانی نێوان حزبە کوردستانییەکاندا قەدەغەیە؟ ئەی جەختمان نەکردەوە کە پێکەوە هەوڵبدەین بۆئاشتبوونەوەی نێوان پارتی‌و یەکێتی؟ ئەدی سووربوونی خۆمان ڕانەگەیاند کە بەجیدی هەوڵبدەین لەپێناو پێکهێنانی بەرەی کوردستانیدا لەهەر بەشێکی کوردستانداو، لەپێناو ڕێکخستنی کاروباردا لەنێوان ئەم بەرەیانەداو یەکخستنی ڕاگەیاندنمان‌و گوتاری سیاسیمان لەسەر ئاستی دەرەوەو دنیا؟

جەختمان لەسەر ئەوە نەکردەوە کە هەربەشێك هەلومەرجی تایبەتی خەباتی خۆی هەیەو حزب‌و ڕێکخراوی تایبەتی خۆی هەیەو ڕوونمان کردەوە کە هەربەشێك شێوازو دروشم و هەنگاوەکانی خەباتی خۆی دەستنیشان دەکات. داسەپاندنی

شێوازێکی دیاریکراو یان کۆمەڵە دروشمێکی دیاریکراو زیان دەگەیەنێ بەتیپەکانی بزاڤەکەمان یەك لەدوای یەکو، لەهەموو بەشەکانداو دواجار زیاندەگەیەنێ بەبزاڤی گەلی کوردستانمان بەگشتیو، دەبێتە کۆسپی ڕێگەی هاوکاری و خەباتی هەموو باڵەکان؟ ئێمە دانماننـاوە بەڕەوایەتی خەباتی گەلی کوردماندا لەدژی ڕژێمی عەسکەرتاریا لەتورکیاداو شێوازی توندوتیژیی ئەم ڕژێمەو دژایەتی کردنی سیاسەتە ڕەگەزپەرستییەکەی . جەختمان کردەوە کە پێویستە یارمەتی و پشتیوانی لەگشت ئاستە جۆربەجۆرەکاندا پێشکەش بکرێتو، کەناڵە جۆربەجۆرەکانی ڕاگەیاندن بۆجوڵاندنی جەماوەرو گەرمکردنی خەباتیان بەکار بهێندرێن. بەڵام لەرێکەوتنەکەشماندا ئەوەمان دووپاتکردەوە کە بوونی چەکدارانەی ئێوە لەکوردستانی عێراقداو، ئەنجامدانی هەڵسوڕانی پارتیزانی لێرەو لەسنوری هاوبەشەوە، زیاندەگەیەنن بەبزووتنەوەکەمان لەم بەشەداو بیانوو دەدرێتە فەرمانڕەوایانی تورکیا کە دەستێوەردانی سەربازی لەخاکەکەماندا بکەنو دەست لەکاروبارمان وەربدەنو مەسەلەکەمان پتر ئاڵۆز بکەن، کەئەمەش دەبێتە هۆی بەرینکردنی گۆڕەپانەکانی شەڕی ناوخۆو دانانی کۆسپو تەگەرەی زۆرتر لەبەردەم پرۆسەی ئاشتبوونەوەدا. بەڵام ئەوەشمان دووپاتکردەوە کە هەموو بەشەکانی کوردستان دەبێ ببنە گۆڕەپانی کاری سیاسی و ڕاگەیاندن بۆهەموو حزبە کوردستانییەکان. دەشبێ پێداویستییەکانی پێشکەوتنو پەرەسەندنی ئەم بوارە پەیدابکرێن.

ئێمە لەگەڵ ئێوە لەسەر هەموو ئەم مەبدەئانە ڕێکەوتین. بەڵام بەداخەوە هیچ بەندێکی ئەم ڕێکەوتنە جێبەجێ نەکراو ڕەنگە کارەکە بەپێچەوانەوە ئەنجامدرابێ. ئێوە لەکاتێکدا هیچ بەشدارییەکتان نەبووە بۆکۆتایی هێنانی کوشتاری ناوخۆی نێوان پدك و ینك و خۆتان کردە لایەنێك لەم کوشتارەداو گۆڕەپانەکەیتان زۆرتر ئاڵۆزو فراوانتر کردو لەئەنجامدا چارەسەرکردنی قورسترو گرانتر بوو بۆئەو لایەنانەی لەپێناوی ئاشتیدا کاردەکەن.

وێڕای ئەمەش پرۆسەی ئاشتیو ئاشتبوونەوە لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٨–ەوە دەستپێکراو چەند هەنگاو بۆپێشەوە چوو، وێڕای بوونی هەندێ کەموکوڕیو

سستی لەڕەوتی پرۆسەکەدا، ئێمەی گەلی کوردستان‌و هێزەکانی ئاشتی پێیان گەشبینین‌و لەسەر کۆششمان بەردەوام دەبین‌و، بەتوندی لەم پرۆسەیەو لەپێناو سەرکەوتنیدا پشتگیری دەکەین. بەڵام ئێوە لەم کاتەدا کوشتارتان لەدژی پارتی دیموکراتی کوردستان‌و لەخاکی کوردستانی عێراق گەرمتر کردوو لێرەو لەوێ گوتاری ڕۆژنامەگەری وادەڵێن کە پێچەوانەی سادەترین ڕێوشوێنەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی گەلەکەمانن‌و لەسەر هەموو ئەو خاڵانەی ئێمەو ئێوە لەسەریان ڕێکەوتووین یەکناگرنەوە.

ئێوە لەکاتێکدا لەلای خۆتانەوە یەك لایەنە کوشتار لەگەڵ هێزەکانی عەسکەرتاریای تورکیا ڕادەگرن و داوای چاری ئاشتی بەڕێگای دیالۆگ، دەکەن، کەچی شەڕی کورد لەگەڵ کورد گەرمتر دەکەن. تەنانەت لەسنوری کوشتار لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان تێپەڕ دەکەن. ڕووەو کوشتار لەگەڵ جەماوەری ئاشتیخوازی کوردستانی عێراق. ئەو هەواڵانەی بەڕێگای کەناڵە تایبەتییەکانی خۆمان پێماندەگەن داخێکی قووڵ‌و بەئازارمان تێدا دەخولقێنن. ئەم هەواڵانە وایرادەگەیەنن کەهێزە چەکدارەکانی ئێوە ڕێگە لەهاونیشتمانان دەبڕنەوەو قەراغی لەوەڕگەو کێڵگەو باخەکان مینڕێژ دەکەن‌و بیرەئاوەکان دەتەقێننەوە، هەروا خەڵکی بێوەی لەگوندەکانیان قەدەغە دەکەن هاتوچۆی شارو شارەدێهاتەکان بکەن. ئەم هەواڵانە ڕایدەگەینن کە هێزەکانتان هەندێ لەگوندەکان دەسوتێنن و ڕۆڵەکانی گەلەکەمان بەوە تاوانبارتان دەکەن کە مێرد منداڵەکانیان لەلایەن ئێوەوە دەفرێنرێن.

وێڕای هەموو ئەمە، گەورەترین مەترسی‌و زۆرترین زیان لەوێوە دەست پێدەکەن کە حزبە کوردستانیەکان بکەونە چوارچێوەی ئەم ناکۆکییە ناوخۆییانەوەو ناو تۆڕی کێشەی پێکداچرژاو لەنێوان دەوڵەتانی هەرێمەکەداو دەگەنە ئەو بەئامانج گەیشتنەی دەتوانن یاری بەزۆر ئەوراقی جۆربەجۆری هەرێمەکە بکەن‌و سودیان لێوەربگرن. ئێمە لەوباوەڕەداین کەمێژوو سەلماندویە ئەمە یاریکرنە بەئاگر. لەکۆتاییدا ئەو حزبە دەسوتێ کە دەچێتە ناو ئەم یارییەوەو زیانی کوشندەش بەبزووتنەوەکەمان دەگەیەنێت. بەتایبەتی ئەگەر

زانیمان کە کەسانی ئەم کێشە هەرێمییە هەموویان لەدوژمنانی ناسراو و نوندڕەوین لەدوژمنایەتی کردنی گەلی کوردستانمانداو لەدژی مافە نەتەوەییە ڕەواکانی. لەحاڵێکی وادا ئەنجامی ئەمە زۆرترسناك و مەرگهێنە. بەپێچەوانەی ئەمەوە بەتەواوی، لاباڵە جۆربەجۆرەکانی ناو بزافی رزگاریخوازیی نیشتمانیمان پێویستیان بەپەیوەندیی پتەو هەیە لەگەڵ هێزی نیشتمانیو پێشکەوتنخوازو دیموکراتیدا لەناو ئەم دەوڵەتانەدا کە بەشەکانی کوردستانیان پێوە لکێندراوە. لەسەرمانە ڕیزی دۆستەکانمانو لایەنگرانی دیموکراتی زۆرتر بەهێز بکەین وپاڵیان پێوەبنێین بۆچەسپاندنی ڕیزەکانی دیموکراسییەکان لەپلەوپایەکانی فەرمانڕەوایدا. کەئاڵوگۆڕی دیموکراسی لەم دەوڵەتانەدا بجوڵێنین و لەپرۆسەی ئەم ئاڵوگۆڕەدا بەشداربین. چونکە لەسایەی رژێمە دیموکراسیەکاندا دەتوانین مافە ڕەواکانمان بەرێگەی ئاشتی دەستخەین.

برای بەڕێز عەبدوڵا ئۆجەلان..!

لەوکاتەدا کە سەرەتای قەیرانی نێوان ئێوەو پارتی دیموکراتی کوردستان بەدیارکەوت حزبی شیوعی کوردستان دوارۆژی ئاڵوگۆڕی ئەمەی دەدی و دەخوێندەوە. لەبەر ئەمە بەگیانی هەستکردن بەبەرپرسی لەئاست چارەنووسی گەلی کوردستان دەست پێشخەریمانکردو هەوڵماندا ناکۆکییەکانی نێوان ئێوەو ئەوان بەرێگەی وتووێژی برایانە چارەسەربکەین و ڕادەیەك بۆ ئەم کوشتارە دابنێین هەرلەقۆناغەکانی یەکەمییەوە تا بواری ئەوە نەدەین ئەم کوشتارە قوڵتر بێتەوەو، لەم پێناوەشدا پرۆژەیەکی ئاشتبوونەوەمان پێشکەش کردن. لەسەرەتادا ئەم پرۆژەیەتان لاپەسەند بوو. بەڵام کاتێك کۆبوونەوەو لەسەر بنچینەی کۆمەڵێك خاڵی بەرنامەیی پرۆژەکەمان دارشت ئێوە ڕەتتان کردەوەو پێی قایل نەبوون. ئێستاش کە تەماشای تابلۆکە دەکەین، ئاڵۆزی و پێکراچرژانی زۆری تێدا دەبینین و دەستەکانی بیانیش ڕەنگرێژیی خۆیان تێداکردووە. ئێوەش لەمەدا بەشێکی بەرپرسیاریتان دەکەوێتە ئەستۆ. بەڵام هێشتا لەوباوەڕەداین کە بواری ئەوەماوە ڕێگەیەکی ئاشتی لەپێناو لیك تێگەیشتن و ئاشتبوونەوەی کوردستانیدا بدۆزینەوە.

برای خۆشەویستم. !

دەوڵەتانی هەرێمەکە هەوڵدەدەن ڕەوتی کوشتار لای هێزەکانتان لەدژی هێزە چەکدارەکانی ڕەگەزپەرستی تورکیا بگۆڕن بۆ کوشتاری نێوان ئێوەو پارتی دیموکراتی کوردستان. واتە بۆشەڕی کورد لەدژی کورد. لەئەنجامیشدا دەیانەوێ توانایەکانی کورد لەدژی یەکتری ئاراستە بکرێن لەجیاتی ئاراستەکردنیان لەپێناو پێشکەوتنی بزاڤی نیشتمانی کوردستانداو دەیانەوێ ئەو توانایانە بەفیڕۆ بدەن و مەترسی بزاڤی شۆڕشگێڕیی کوردستان لەخۆیان دووربخەنەوە.

حەزدەکەم باری سەرنجتان ڕابکێشم بۆئەوە کە ئێستا دەوڵەتانی هەرێمەکە بەتایبەتی تورکیا زۆر دڵخۆشن بەم کوشتارەی ئێوەو پدك. هەن تەماشای دەکەن و هەن هەوڵدەدەن زۆرتر ئاگری شەڕو کوشتار هەڵگیرسێنن و هەوڵدەدەن بەهێزی بکەن و ئاگرەکەی خۆش بکەن. لێرەدا دەپرسم جائەگەر ئەمە ڕاستیی بارودۆخەکە بێت: چ قازانجێك لەم کارەساتە چاوەڕوان دەکەین؟

برای بەڕێزم. !

سەرکەوتنی ئەزموونی کوردستانی عێراق و دامەزراندنی کۆڵەکەکانی، سەرکەوتنە بۆهەموو بەشەکانی تر و لەپێش هەموویانەوە کوردستانی باکوور. ژێرکەوتنی ئەم ئەزموونە ژێرکەوتنە بۆ هەموو بەشەکانی تر. سەرکەوتنی بزاڤی ڕزگاریخوازیی و چاری مەسەلەی کورد لەباکوری کوردستان، بەسەر جەستەی شکاو و مردووی کوردستانی باشووردا تێپەڕنابێت. بەڵکو سەرکەوتنی هەردووکیان لەوێوە دێت کە هەردووکیان بەیەکتری تێکەڵبکرێن و هێزی هەردوو بزاڤەکەش ئالەمەدا شاردراوەتەوە.

برای خۆشەویستم.. !

لەتێهەڵچوون لەم ڕاستییانەوە و لەهەستکردنەوە بەبەرپرسێتیی کەسێتیی و حزب لەبەرمبەر چارەنووسی گەلەکەم و جوڵانەوە ڕەواکەیدا، کە (حشك) یەکێکە لەلاباڵە سەرەکییەکانی. بەئەرکی خۆمزانی ڕاستەوخۆ ئەم نامەیەتان بۆبنێرم و ئەو ڕاستییە بخەمە بەردەمتان کە پیلانێکی هەرێمگیری گەورە لەدژی گەلەکەمان هەیەو بەچالاکی دادەڕێژرێ. جا ئەگەر هەموان دەستبەرداری بەرژەوەندیی

تەنگەبەری حزبی نەبین، بەخێرایی دەستپێشخەری نەکەین بۆچاری جیاوازییەکان و ناکۆکییەکانی ناوخۆمان، بەڕێگەی دیالۆگی برایانە ئەوا خۆمان بەدەستی خۆمان ئامرازی سەرکەوتنی ئەم پیلانە دەخەینە ژێردەستی دوژمنەکانمان.

بەمجۆرەو هەر لەتێهەڵچوونی هەستکردنم بەبەرپرسی بەرامبەر سەرکەوتنی پرۆسەی ئاشتی و ئاشتبوونەوەی نێوان پدك و ینك کەئێمە لە(حشك) ئەمەمان کردۆتە ئەڵقەی ناوەندی لەسیاسەتەکەمانداو لەخەباتی حزبماندا.

جارێکی تریش بەپێویستم زانی لەنامەکەمدا جەخت لەسەر ئاشتبوونەوەی نێوان ئێوەو پارتی دیموکراتی کوردستان بکەمەوە کەکارێکی بایەخدارە لای ئێمەو لای گشت دڵسۆزان و ئاشتیخوازانی گەلەکەمان. هەریەکەشیان ئەویتریان تەواو دەکەن و دەبنە پێگەو کۆڵەکەی یەك بۆیەکتر لەبەر ئەوە من جارێکی تر داواتان لێدەکەم و هانتاندەدەم بۆکارکردن بەپێی ئەم ڕێبازە.

برای خۆشەویستم.!

تکام وایە ئەم نامەیەم بەوردی بخوێنیتەوە، دوور لەسۆزو هەستی بەجۆش و دوور لەکارتێکردنی هەواڵی جەنگەکانی نێوان ئێوەو پدك و بەئەقڵیەتێکی نیشتمانی و شۆرشگێڕی و بەگیانی کوردانە کەلەپێناو مافە نیشتمانی و دیموکراسییەکانی گەلەکەماندا خەبات دەکات. داواکارم لەکۆشەنیگای ئەم مەبدەئە پیرۆزانەوە لەنامەکەم بکۆڵیتەوەو، لەپێناو پەیرەوکردنی واقیعدا هەنگاو بنێیت.

## ئەمەش وەڵامی نامەکەم کە لەئۆجەلانەوە وەرمگرت:

*بەرێز کەریم ئەحمەد..!*

*سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی کوردستان..!*

*نامەکەتانم پێگەیشت، جا لەبەر ئاڵۆزییەکانی ئەم قۆناغە ئێمە ئەوەڵامی نامەکەتاندا دەڵێین (بەڵێ).*

*لەبەر بایەخی مێژوویی و ئاڵۆزییەکانی قۆناغەکە، ئێمە لەگەڵ ئەوخاڵانەداین کە دەرتانبڕیوەو جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە باستان کردوە، کە زۆر نەخشەو پیلانگێڕان هەن لەدژی کوردستان جێبەجێ دەکرێن. لەبارەی کوشتارو ڕێوشوێنی چارەکردنییەوە، دەشێ باری سەرنجەکەتان ناکۆک بن لەگەڵ هەڵسەنگاندنەکانماندا، بەڵام وێڕای ئەوەش دەستکردن بەقۆناغی دیالۆگ و بەبوونی دەورگێڕانی ئێوە کە ئاواتەخوازین.*

*جا لەپێناو ڕوونکردنەوەی ئەم قۆناغەدا، ئێمە ئامادەی یەکتر دیتنین لەگەڵ حزبەکەتان، بەڵام لەسەرتان پێویستە ئەم مەسەلەیە نەخەنە چوارچێوەیەکی تەنگەبەرو دابەشکردنەوەو لە قەوارەی گیروگرفتی بوونی pkk لەباشووردا نەبێ، چونکە مەسەلەکە لەمە گەورەترو فراوانترە..ئێوە دەزانن واشنتۆن و ئەنقەرە ولەندەن لەدژی شۆڕشەکەمان ڕێکدەکەون و ئەمەش بەگشت کوردستانەوە هاوپەیوەندە، لەبەر ئەوە ئێمە وای نابینین و قایل نابین بوونی pkk لەباشوور بخرێتە گۆشەیەکی تەنگەبەرەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوانە سوورن لەسەر جێبەجێ کردنی پیلانەکانیان لەدژی باکوور. ئاڵێرەوە مافی هیچ ڕێکخراوێکی باشوور نییە بەمشێوە خراپە کاربکەن. پێویستە ئاستی نێوان باکوورو باشوور یەکخەین و داخوازییە نیشتمانی و دیموکراسییەکان بەشێوەیەکی شیاو بهێنرێنە پێشەوەو هەرئەمەشە جەوهەری مەسەلەکە.*

*کەواتە جارێکی تریش لەژێر ناوو سێبەری تورکیادا گوتیان "ئێمە ڕێکەوتنی*

نێوان باکوور و باشوور بەفیڕۆ دەدەین" ئەمەش شتێك نییە جگە لەمێنانی باروئۆخێکی وەك باشووری لوبنان...چارەسەرێك بەتورکیاوە هاوپەیوەندبێ چارەسەر نییە... ئێمە هەر لەسەرەتاوە دەمانەوێ ئەوانە خۆیان نەخەنە چوارچێوەی ئەم فێڵانەوە. چارێکی سیاسی ناوخۆیی لەنێوان کورددا مەسەلەیەکی پێویستە، بەڵام قسەکردن بەناوی تورکیاوەو بەڵێن پێدان و زامنێتی پێدانی، دیارە کوشتارەکە قووڵ دەکاتەوە.. دەرکردنی pkk لەباشوور بەناوی تورکەوە شتێك نییە جگە لەکارو بزووتنەوە لەدژی شۆڕش و لەدژی نیشتمانپەروەری. چاری ڕاست و دروست ئەوەیە کوردان خۆیان ناکۆکییە سیاسییەکانیان چارەسەربکەن و، ئاشتی لەباکوورو باشوور پێویستە، ڕێکەوتن پێویستە، هەروا دیالۆگ پێویستە... ئێمە ئامادەی هەموو ئەمەین و ئامادەین بۆ ڕێکەوتن و هەرلەم تێهەڵچوونەشەوە ڕوو دەکەینە کارکردن لەپێناو ڕێکخستنی کۆنفرانسێك بۆئاشتی لەنێوان کورداو باهەموو هێزەکانی باکوورو باشوور تێیدا بەشداربن.

لەسەر ئەم بنچینانە، پێویستە دیالۆگمان لەنێواندا هەبێت و پەرەی پێبدەین، لەبارەی هەڵوێستتان و پەیوەندیتان بەم مەسەلەیەشەوە سڵاوو سوپاستان پێشکەش دەکەین و هیواداری سەرکەوتنتانین.

عەبدوڵا ئۆجەلان

ئەمینداریی گشتی پارتی کرێکارانی کوردستان

Pkk ١٨ای ئەیلولی ١٩٩٨

دوای ئەوە ڕووداوەکان بەبارێکی خراپدا پەرەیان سەندو حکومەتی تورکیا زەبری دەخستە سەر سوریا کە عەبدوڵا ئۆجەلان بداتەوە یان لەسوریا دووری بخاتەوە، نامەوێ بچمە باسی چۆنیەتی دەرکردنی ئۆجەلان لەسوریا چونکە ڕاگەیاندن بەوردی بەدوای ئەم مەسەلانەدا چوو تا ڕۆژی دەستگیرکردنی لەلایەن میتی تورکییەوە لە کینیاو پاشان گواستنەوەی بەفرۆکەیەکی تایبەتی بۆیەکێك لەدوورگەکانی تورکیا لەناو دەریاداو دادگایی کردنی و حوکمدانی بەئیعدام پاشان گۆڕینی حوکمەکەی بەزیندانی هەمیشەیی. بەڵام لێرەدا دەمەوێ سەرنجێك دەربڕم: دەبوو عەبدوڵا ئۆجەلان پێش هەمووشتێك ئەو دەوڵەتە مسۆگەر بکات کە بەپەنابەرییەکەی قایل دەبێ، شتێکی گرنگتریش ئەوەبوو دەبوو بچێتە یەکێك لەبنکەکانی گەریلاکانی (پەکەکە)و لەناو هاوڕێیانیداو لەژێر پارێزگاریی ئەواندا بژی و شانبداتە بەرئەو ژیانەگرانەی کە هاوڕێیانی تێیدا دەژیان، بەهەرحاڵ ئەو ڕێگەیەی بەباشزانی کەخۆی هەڵیبژارد.

هەرئەوساڵەی کە ئۆجەلانی تێداگیرا هاوڕێ ئەبوداود (حەمید مەسا)و من (کەریم ئەحمەد) وەکو وەفدێکی حزبی شیوعی عێراقو حزبی شیوعی کوردستان بانگکراین بۆ کۆنگرەی حزبی شیوعی ئیتالیا کەلەشاری فلۆرێنسا پێکهات، لەنامەیەکدا داواکارییەکم خستە بەردەمی کۆنگرەکەو تێیدا گوتبووم کە پێویستە کۆنگرەکە یەکەم بەرگری لەمەسەلەی گەلی کورد لەتورکیادا بکاتو ڕەخنەش لەهەڵوێستی حکومەتی ئیتالیا بگرێت چونکە قایل نەبوو کە عەبدوڵا ئۆجەلان بەپەنابەر وەربگرێت و بوەهۆی دەستگیرکردنی، نامەکەشم خوێندەوەو سکرتێری حزبی شیوعی ئیتالی پەسەند کردنی پێشنیازەکەی لەلایەن کۆنگرەوە ڕاگەیاند.

من وێڕای سەرنجی زۆرم لەسەر عەبدوڵا ئۆجەلان بەڵام لەم چەشنە هەڵوێستانەدا پێویستە بەرگری لەماف و دادپەروەری و لەو تێکۆشەرانە بکرێت کە دەکەونە دەست دوژمنانی شۆڤێنیست. عەبدوڵا پەیمانی دابووە حکومەتی سوریا کە لەئامۆژگارییەکانیان دەرنەچێت، لەبەر ئەوە لەژێر تەوقی سیاسەتی سوریدا دەیناڵاندو کاتێکیش سوریا کەوتە بەرزەبری تورکیاو هەڕەشەکانی دەستبەرداری (pkk)و عەبدوڵا بوو، فەرمانی دەرچوونی لەسوریا پێدا لەکاتێکدا دەبوو ئەبدوڵا

پەیوەندییەکانی لەگەڵ حزبەکانی بزاڤی کوردستانی بەهێزبکات بەتایبەتی لەگەڵ هەرێمی کوردستانی عێراق، هەروا لەگەڵ حزبو ڕێکخراوەکانی بزاڤی رزگاریخوازیی کوردستاندا ڕێکنەبوو. دەبوو حزبەکانی بزاڤی رزگاریخوازیی کوردستان پارێزگاریی لەو کۆمیتەی ڕێکخستنی کاروبارە بکەن کە لەشام لە(ینك)و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و حزبی سۆسیالیستی کوردستان لەتورکیاو حزبی دیموکراتی پێشکەوتنخوازی کورد لەسوریا پێکهاتبوو، دەبوو هەوڵیش بدرێ ئەم کۆمیتەیە خۆی فراوان بکاتو (پدك)و (پەکەکە) و حزب و ڕێکخراوەکانی تر بچنە ناوی. هەوڵیش بدرێ کار بکرێتە سەر (پەکەکە) تا سیاسەتی دوورەپەرێزیو شێوازەکانی کارکردنی خۆی بگۆڕێت و، ئەم کۆمیتەیە هەوڵی پێکهێنانی پەوەندی هاوپەیمانی لەگەڵ حزبە شیوعییەکان و بزووتنەوەی دیموکراتی کە مافەکانی گەلی کورد پەسەند دەکەن بدات. چونکە بزاڤی رزگاریخوازیی کوردستان پێویستی بەیەکخستنی سیاسەتو هەڵوێستەکانی بوو تادەستەبەشێکی سیاسی هەرێمگیری لەناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دامەزرێنێ، بەلام چالاکی ئەو کۆمیتەی ڕێکخستنی کاروبارە ڕاگیراو بزووتنەوەکە کەوتە کێشەی ناوخۆو نەتەوەییو شۆڕشەکەی کوردستان لەتورکیادا بەسەرکردەیی (پەکەکە) لەبزاڤی رزگاریخوازیی کوردستان و بزاڤی دیموکراسی نێودەوڵەتی بەگشتی دوورە پەرێز بوون.

ئێستاش پێموایە دوای گەیشتنی گەلی کوردمان لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا بەفیدراڵیو جێگیربوونی قەوارە سیاسیەکەی دەبێ لێکۆڵینەوەیەکی تازە بکرێ بۆبزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان لەهەموو هەرێمەکاندا بۆگەیشتنە ئەنجامگیریی نوێ لەسەر ڕۆشنایی ئەزموونەکەی هەرێمی کوردستانی عێراق، دوای جێگیربوونی ڕژێمی دیموکراسی فیدراڵی و دوای ئەوەی گەلی کوردمان لەکوردستانی عێراقدا پەیڕەوی مافی خۆی بکات لەهێنانەدی کۆمارێکی فیدراڵی کە قەوارەی سیاسی و بەڕێوەبەری و یاسادانەریی خۆی لەهەرێمەکەدا هەبێت و، دەکرێ ئەم شارەزاییەو ئەم ڕێبازە بەتەواوبوونی قەوارەی فیدراڵی تەواو بکرێ و دوای جێگیرکردنی سنووری هەرێمی کوردستانی عێراق چاری مەسەلەی کەرکوك وەك گرنگترین

مەسەلەیەك لەبواری دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستانی عێراقدا.

ئەرکی بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کوردستانە لەم مەسەلانە بەلایەنی نیگاتیڤ و پۆزەتیڤیـــەوە بـــە وردی بکۆڵێتـــەوە... بـــەلاّم هەڵبـــژاردنی رێگـــە چـــارەی راستودروستی مەسەلەکانی ناوهەرێمەکانی دیکەی کوردستان، هەر ئەرك و مـافی بزاڤـی رزگـاریخوازیی کوردسـتانە لەهـەر هەرێمێکدا بـەپێی هەلومـەرجی تایبـەتی خۆیان.

# کـۆتـایـی

نـاوی دەنـێم کۆتـایی چـونکە ئـیتر کۆتـایی وەرگرتنـی بەرپرسـیی حزبییـەو گەیشتوومەتە تەمەنێکی گەورە کەبەشـێکیم لـەپێناو وەرگرتنـی مـافی فێربوونـدا، هەرلەمندالْیمەوە بەسەر بردووە، مۆڵەتی فێربـوونی ئاسـاییم بـۆ نـەخولْقاوە، وەك هەموو ئەو مندالآنەی مۆڵـەتی فێربوونیـان لەسـێبەری داکو باوکیانـدا بۆخولقـاوە. ئـەرکم ئـەوەبوو کاربکـەمو فێـربمو هـەردووکیان پێکـەوە بگـونجێنم تـاتوانیم بەڵگەنامەی فێربوون وەربگرم. بەڵام سالانی تری تەمەنم هەر لەسالی ١٩٤٤-ەوە سەرقالی کارکردن بووم لەریزەکانی حزبی شیوعی عێراقـدا، واتـە تەمـەنی حـزبیم ئێستا گەیشتۆتە پـتر لەشەسـت سـالْ، لەبـەر ئـەوە لـەدووەمین کـۆنگرەی حزبـی شیوعی کوردستاندا داوام لـەهاورێیانم کـرد کـە لەبەرپرسـیی کۆمیتـەی ناوەنـدیو لەسـکرتێریی حـزب بمبـوورن، پـاش ئـەوەی حزبـی شـیوعی کوردسـتان بـووە ڕاستییەكو بەرنامەی سیاسیی نیشتمانیو کۆمەلآیەتیو پەیڕەوی نـاوخۆی هەیـەو ڕێکخراوەکانی چەسپیوونو سەرکردایەتی خۆی هەلّدەبـژێرێو، پەیوەنـدی لەگـەلْ حزبـــە کوردســـتانییەکان پێکهـــات و هاوپـــەیمانیی لەگـــەلّیان بەســـتووەو پەیوەندییەکانی لەسەر بنچینەیەکی ڕاستودروست لەگەلْ حزبی شـیوعی عێراقـدا بڕیاردراو، بووە حزبێکی سەربەخۆ لەهەرێمی کوردستانی عێراق. هـەموو کۆششـی خۆم بەختکرد تائەم حزبە لەسەر بنچینەیەکی ڕاسـت ودروسـت پێکبێـتو، بـەپێی ڕێبازێکی مارکسی-لێنینـیو ڕێوشـوێنە لێنینییـەکانی ڕێکخسـتن بـڕوات بـەڕێوەو ڕۆڵێکـی دیـاری لـەبزاڤی رزگـاریخوازیی نیـشتمانی کوردســتاندا ببینێــتو هاوپەیمانییـەکی سیاسـی فـراوان لـەنێوان حـزب ورێکخـراوە کوردسـتانییەکاندا پێکبێت چونکە ئەمە پێداویستییەکی مێژووییە لەم قۆناغەدا کە بزووتنەوەکـەمانی پێدا تێپەڕدەبێت.

لەم ڕێگەیەشدا ڕووبەڕووی بەرگرییەکی توند بووینەوە لەم ڕەوتانەی خوارەوە:

١. ڕەوتـــی بەســـتەڵۆکی بیروبـــاوەڕ کـــە ناوەرۆکەکـــەی شـــۆڤێنیزمی ناسیۆنالیستی عەرەبەو ئـەم ڕەوتـە پێـی لەسـەر ئـەوە دادەگرت کـە پێکهـاتنی دوو حزبـی شـیوعی لەوڵاتێکـدا هەڵەیـەو ئەمـە تەقەلایـەکی جیابوونەوە خوازییە.

٢. ڕەوتی دوورەپەرێزی نەتەوەیی لەشـیوعییە کوردەکانـەوە کـە جـەخت لەسـەر پێویـستیی پێکهـاتنی حزبێکـی شـیوعی کوردسـتانی جیـاواز لەحزبی شیوعی عێراق دەکـاتو، بەرزکردنـەوەی دروشمـی پێکهێنـانی دەوڵـەتێکی کوردسـتانی لـەم قۆناغـەدا، ئـەم ڕەوتـە مەترسـییەکی دروستکرد بۆسەر یەکێتی شـیوعییەکان لـە کوردسـتاندا، کـە ئـەوەبوو دەستە بەشێکیان پێکـەوەناو دوایـی بـووە هـۆی کـەرتکردنی یـەکێتی شیوعییەکان و دامەزرانـدنی حزبێـك بـەناوی حزبـی کـاری سـەربەخۆی کوردستان.

٣. ڕەوتـــی کۆسمۆپـــۆلیتی کەجـــەختی لەســـەر ئـــەوە دەکـــردەوە کـــە هەرکۆششێك بۆپێکهێنانی حزبێکی شیوعی کوردستانی جیابوونەوەیـە لەحزبی شیوعی عێراقو دامەزراندنی حزبێکی (شیوعی نەتەوەییە).

٤. بەڵام لۆجیکی ئاڵوگۆڕەکانی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیو هەستکردن بـــەم ئاڵوگۆڕانـــەو، پەرەســـەندنی بزاڤـــی ڕزگـــاریخوازیی کوردســـتانو حەتمیـــەتی ســـەرکەوتنی بزاڤـــی ڕزگـــاریخوازیی نیـــشتمانی و مـــافی بڕیـــاردانی چارەنووســـی گـــەلان و پێکهێنـــانی ڕێکخـــراوەو حزبـــە سیاسـییەکانی نەتەوەپـەروەرو دیموکراتخـوازی بزاڤەکـە، لـە بـۆرژواو وردە بـۆرژوا، ئەمانـە بـێ چەندوچـوون بوونەتـە هۆکـاری پێکهێنـانی حزبێکی سیاسی بۆچینی کرێکاری کوردستان تالەم بزاڤەدا ڕۆڵی خۆی ببینێتو، لـەم قۆناغـەدا بەچەشـنێکی مـەوزوعی بزاڤـی ڕزگـاریخوازیی کوردســـتانو دیموکراســـی پێکـــەوە هاوپەیوەنـــد بکـــاتو لـــەپێناوی دیموکراسیدا گەلی عەرەبی عێراق خەبات دەکاتو یەکخستنی دروشمـی دیموکراسی بۆعێراق و فیدراڵی بۆکوردستان یەکخستنی هێـزو خـەباتی

هاوبەشــی هــەردوو گەلەکــەو، بڕیــاردانی مــافی چارەنووســی گــەلی کوردستانەو ئەمەش مانای خەباتە لەدژی شۆڤێنیزمی عەرەبی‌و لەدژی دوورەپەرێزی نەتەوەیی‌و...تاد.

٥. حزبــی شــیوعی عێــراق لــەم واقیعــە گــۆڕدراوەی کۆڵییــەوەو بڕیاریــدا ڕێکخراوی حــزب لەهــەرێمی کوردســتانی عێراقــدا بگۆڕێــت بــۆ حزبێکــی خۆبەخۆو، گشت ئەو بڕیارانەشی پەسەندکرد کەلــەدووەمین کــۆنگرەی ڕێکخراوی هەرێمدا درابوون. بەمــەش حزبــی شــیوعی کوردســتان بــووە حزبێکــی شــەرعیی خــاوەن قــەوارەو سیاســەت‌و بەرنامــەو پــەیڕەوی ناوخۆو سەرکردایەتی هەڵبژێردراوی خۆی.

دەڵێم دوای ئەم کارە گەورەیە بۆدامەزراندنی حزبی شیوعی کوردستان—عێـراق و گەیــشتنمە تەمــەنێك کــەئیتر نــاتوانم بەوهیمــەت‌و توانــا جەســتەییەی پێــشووم کاربکەم و ئەرکە حزبییــەکانی ســەرکردایەتی ئــەنجام بــدەم‌و، دوای ئــەوەی حــزب بۆتــە خــاوەنی کــادری شــایان بۆســەرکردایەتی حــزب، بڕیارمــدا دەســتبەرداری بەرپرسی لەسەرکردایەتی حزبدا ببم و بوار بۆ هاوڕێیانی تر ئاواڵە بکەمەوە کەئــەم ئەرکەو ئەم فرمانە گەورەیە ئەنجام بــدەن، ئەمــەش لــەدووەمین کــۆنگرەی حزبــدا بوو هەروەك چۆن لەمەوبەر باسمکرد، هەروا لەسێیەمین کۆنگرەی حزبدا کە لــە ٨ تــا١٠ی نیــسانی ٢٠٠٤ پێکهــات، داوای لاچــوونم کــردو داوای گــەرمم لەئەنــدامانی کۆنگرە کرد کە بەدەنگ داواکەمەوە بێن، کۆنگرەکە بڕیــاری لەســەردا، منــیش بــۆ کۆنگرەکە جەختم کردەوە کە سەربازێکی ئەو حزبەم (لێرەدا وشەی سەربازم بۆیە بــەکارهێنا چــونکە لەهەمووکــەس زۆرتــر زەبــت‌و ڕەبتیــان هەیــەو زیــاتر پابەنــدن بۆجێبــەجێ کردنــی فــەرمان‌و ئەرکــەکان) جــا ئەگــەر حــزب هــەر ئــەرك‌وکارێکی پێسپاردم ئامادەم بۆجێبەجێ کردنی. هەروا وتەی کاریگەرم بەبەشدارانی کــۆنگرە پێــشکەش کــرد بۆهانــدانیان کــە چارەســەری گیروگرفتــە ناوخۆییــەکان بکــەن بەتایبــەتی چــاری مەســەلەی دوورەپــەرێزی لەجــەماوەرو، مەســەلەی دیموکراســی نــاوخۆیی‌و ســـەرکردەیی بەکۆمــەڵ‌و کــارکردنی لەخۆبوردووانــەو پــەیڕەوکردنی

ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆگرتن و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەو بەهێزکردنی ڕێکخراوەکانی حزب و هاوپەیمانییە سیاسییەکان...تاد. ئەمەش وتارەکەیە لێرەدا بۆیادگار بڵاوی دەکەمەوە:

**دەقی ئەو وتارەی لەبەردەم نوێنەرانی سێیەمین کۆنگرەی حزبی شیوعی کوردستان لە نیسانی ٢٠٠٤ دا پێشکەشم کرد..**

**هاوڕێیانی خۆشەویست نوێنەرانی سێیەمین کۆنگرەی حزبی شیوعی کوردستان..!**

***سڵاوی گەرمتان لێدەکەم و هیوادارم کۆششەکانتان بەسەرکەوتنی کاروبارەکانی کۆنگرەی سێیەممان سەرکەوتووبن و بگەینە نەخشەکێشانی سیاسەتێکی نوێ بەپێی ئەو ئاڵوگۆڕە گەورانەی لەعێراقدا ڕوویانداوە، هەروا لەکوردستاندا لەبوارەکانی سیاسیی و هێزیی و ڕێکخستندا کە ئەوەبوو ڕژێمی دیکتاتۆریی شۆڤێنی بەڕێگەی شەڕی ئەمریکاو بەریتانیا ڕووخێندرا. ئێمە حەزماندەکرد ئەمە بەڕێگەی هێزە تێکۆشەرەکانی گەلی عێراقمان ڕوویدات ئەوەتە عێراق داگیرکراو ئەمە بووە ڕاستییەکی هەست پێکراو کەدەبێ بەچەشنێکی مەوزوعی مامەڵەی لەگەڵ بکرێ و ئەوە زامن بکەین کەجارێکی تر دیکتاتۆریی نەگەڕێتەوەو داگیرکردنەکە کۆتایی بێت و سەربەخۆیی و سەروەریی نیشتمانی بێتەدی و لەگەڵ کەوتنی ڕژێمی دیکتاتۆردا هەموو دامودەزگاکانی بەڕێوەبردن و سەربازی و ئاسایش و حزبی و یاسایەکانیشی ڕووخێندران، بۆئەوەی دەزگا نیشتمانییەکان لەسەر بنچینەیەکی نوێ جێگەیان بگرنەوەو بەشێوەیەك بن دەربڕی بەرژەوەندەکانی گەلی عێراق بن بەگشت نەتەوەو تایەفەو چینە کۆمەڵایەتییەکانییەوە لەدامەزراندنی عێراقێکی نوێدا، عێراقی دیموکراسیی و فیدراڵی و فرەلایەنی، کە بنچینەکەی بۆدانرا بەوەی ئەنجومەنەکانی حوکم دامەزراو وەزیرەکان دانران و کاتی گواستنەوەی دەسەڵات بۆعێراقییەکان دیاریکراو کۆتایی داگیرکردن و دانانی یاسای بەڕێوەبردنی کاتیی دەوڵەت، کەئەمە بەهەنگاوی یەکەم دادەنرێ بەرەودامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراق لەسەر بنەمای***

یەکێتی فیدراڵی ئارەزوومەندانەو هەڵبژاردنی پەرلەمان بەپێی دەستووری هەمیشەیی‌و دامەزراندنی حکومەتی دیموکراسی ناوەندیی فیدراڵی.

هەموو ئەم هەنگاوو ئاڵوگۆڕە پێشکەوتوانە کۆسپ و تەگەرەو گیروگرفتیان دێتە ڕێگا کەهێزو ناوەندی جۆربەجۆری ناوخۆیی و هەرێمەکەو ناوعەرەب دەیانهێننە پێشەوەو، دەبنە ڕێگری دامەزراندنی عێراقێکی نوێ، هەروا بەجۆرێکی هەست پێکراو لەگەڵ کاروباری تێکدەرانەی تیرۆریستی پێکدادەدەن‌و ئەمانەش پاشماوەکانی ڕژێمی ڕووخاوو هێزە ئاینییە توندڕەوکانن کە دەیانەوێ دیکتاتۆری بگەڕێننەوەو زۆرداریی سەلەفی خاوەن پرۆژەی کۆنەپەرستانەی نادیموکراتی داسەپێنن، لەبەر ئەمە گەلێك گیروگرفتی گەورەو مەترسیدار لەڕێگای هێنانەدی ئەم ئەرکە نیشتمانی‌و دیموکراتییە پێشکەوتنخوازانەدا ڕووبەڕووی هێزە کوردستانی و دیموکراسییە عێراقییەکانمان بوونەتەوەو، دەبێ ئاماژە بۆئەوەش بکەم کەسەقامگیریی سیاسی‌و ئاسایش دوو مەرجی سەرەکین بۆ بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکانە.

هەموو ئەم ئەرکانە کەئەرکەکانی قۆناغی گواستنەوەن و لەحوزەیرانی ئایندەوە دەستپێدەکرێن تا دەگاتە دامەزراندنی حکومەتی هەڵبژێرداوی عێراق بەپێی دەستووری هەمیشەیی کە پرۆژەکەی پێشان ئامادەکراو بەپێی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت خرایە بەردەم گەل‌و گەلێك دەستکەوتی یاسایی‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی تێدا هێنرانەدی، کە گەل‌و هێزە نیشتمانییەکانی دەخەنە بەردەم تاقیکردنەوەی پەرەوکردنی یاساو بەجێگەیاندنی ئەرکە سیاسی‌و دیموکراسییەکان، بۆئەمەش پێویستە هەموو هێزە نیشتمانی‌و دیموکراسییەکان کۆبکرێنەوە بۆخستنەکاری وزەو توانایان لەپرۆسەی پەیڕەوکردندا. دەتوانم جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە ناتوانرێ ئەم ئەرکانە جێبەجێ بکرێن بەبێ بەشداریی جیدی و کاریگەرو بەرپرسانەی بزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی بنچینەیی کوردستان و، بەبێ یەکخستنی هێزە سیاسییەکان لەبەرەیەکی کوردستانیداو بەشداریکردنی لەپێکهێنانی بەرەی نیشتمانی و دیموکراسی عێراقدا، هەروا ناشتوانرێ فیدراڵیزم لەکوردستاندا بەچەشنێکی دامێنەرانە پەیڕەوبکرێت

کە دەربڕی خواستەکانی گەلی کوردستان بێت، بەبێ یەکخستنی هەردوو بەڕێوەبەرایەتییەکەو پێکهێنانی هاوپەیمانی کوردستانی فراوان و چوونە ناوهەڵبژاردنی هەرێمەوە بەلیستێکی هاوبەش بۆنوێنەرایەتی کردنی گشت هێزە کوردستانییەکان لەپەرلەمانی هەرێمداو هەروا بەشداری و نوێنەرێتی لەپەرلەمانی فیدراڵیدا لەڕێگەی چوونە هەڵبژاردنی گشتییەوە دیسان بەلیستێکی هەمەلایەنە لەگەڵ هێزە دیموکراسییەکانی عێراقدا.

لەم بارەیەوە دەمەوێ پێشنیازێك بخەمە بەردەمی کۆنگرەکەمان، کە پێویستە دروشمی لیستێکی هاوبەشی هێزە دیموکراسییە کوردستانییەکان و کەسایەتییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی هەرێم پەسەند بکرێت بۆهەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێم وکاتێکئەم دروشمە نەیەتەدی دەبێ حزبمان پرۆژەی ئیئتیلافی تر بێنێتە پێشەوەو دەستپێشخەری تری هەبێت بۆ هاوپەیمانی لەهەڵبژاردندا کە بخرێتە بەردەم هێز و کەسایەتییە دیموکراسییە کوردستانییەکان ئەمەش بەپێی بەرنامەیەکی هەڵبژاردن کە لەسەری ڕێکەوتن و ڕێژەی هەموو لایەنە بەشدارەکانی ناوئیئتیلافەکە لەلیستی هاوبەشی هەڵبژاردندا ڕێکەوتنی لەسەر بکرێت.

هاوڕێیانی خۆشەویست..!

هاوپەیوەندیی مەوزوعیانەی نێوان دیموکراسی و فیدراڵی، لەسەر ئێمەو تەواوی هێزە کوردستانییەکان دەکاتە پێویست کە کۆشش و توانایان لەگەڵ هێزە دیموکراسییەکانی عێراق یەکخەن چونکە بەبێ ئەوان ناتوانن فیدراڵی پەیرەوبکەن و ناشکرێ بەبێ فیدراڵی دیموکراسی ڕاستەقینە لەعێراقی نوێدا هەبێت، کەئەمەش ئاستی کەمی مەسەلەی یەکێتی ئارەزوومەندانەیە کە گەلی کوردستانمان وەك چارێکی مەسەلەی کورد لەعێراقدا لەهەلومەرجی ئێستای عێراقی فرەنەتەوەدا خستوویە پێش چاو.

گەلی کوردستانمان مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی هەیە بەدەستی خۆی، بەدامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی سەربەخۆشەوە، هەروا مافی خۆی هەیە لەیەکبوونی نیشتمانی و نەتەوەییدا، گەلەکەمان لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا

ئاستی کەمی یەکێتی ئارەزوومەندانەی هەڵبژاردووە، لەم هەلومەرجەدا مافی خۆی بەکارهێناوە بۆیەکێتی لەگەڵ گەلی عەرەبدا کە دەبێ پێشوازیی لەم یەکێتییە بکاتو پێی خۆش بێتو دەستی دۆستایەتیو برایەتی بۆ کورد درێژبکاتو هەروا داوای پێکەوە کارکردنی لێدەکات بۆرێکخستنی ئەم یەکێتییە لەسەر بنچینەی یەکسانی لەمافو ئەرکەکانداو، پێکەوە کارکردن بۆبنیاتنانی دەوڵەتی نوێی دیموکراسی وفیدراڵی عێراق.

هاوڕێیانی خۆشەویست. !

سەرکردایەتی حزب، کۆمیتەی ناوەندی، لەسەر کارکردن لەهەلومەرجێکی نێودەوڵەتی و هەرێمگیری و عێراقیو کوردستانی ئاڵۆزوگران درێژەیدا، دەشێ لەگێڕانەوەی بارودۆخی دەرەوەو ناو عێراق و ئاڵۆزییەکانی دوور بکەومەوە، تازیاتر بێمە سەرباسی هەلومەرجی کوردستانی و هەلومەرجی شەڕی ناوخۆ لەهەرێمدا. هەروەك ئاشکرایە هێزە سیاسییەکان بەتایبەتی هەردوو حزبی (پدك و ینك)و هاوپەیمانەکانیان چوونە ناوکێشەیەکەوە (کەلەکاتی خۆیدا نەبوو) لەپێناو وەرگرتنی دەسەڵاتداو ئەمەش بووە هۆی نەهێشتنی گرنگترین دەستکەوتی بزافی کوردستانیمان لەهەرێمدا، کە ئەویش بەرەی کوردستانییە، بۆئەوەی هەردوو جەمسەر بەتەنیا چارەنووسی دەسکەوتەکانی ڕاپەڕینەکەی گەل لەئاداری ۱۹۹۱دا بگرنەدەستو، ئەم کێشەیە درێژە پێبدەن تابەکارهێنانی توندوتیژی چەکدارانەو، دواجار دابەشبوونی هەرێم بەدوو بەرێوەبەرایەتییەوە، حزبی ئێمە لەم بارودۆخەدا ئەرکی ناوەندیی دەستنیشانکرد کەکۆتایی هێنانی کوشتاری نێوان هەردوو حزبەو دەستکردنە بەدیالۆگ بۆچاری ناکۆکییەکانو، کۆششەکانی نێودەوڵەتان و ناوخۆش سەرکەوتن و کێشەی چەکدارییان کۆتایی پێهێناو زەمینەیەك ئامادەکرا بۆگفتوگۆ بەئامادە بوونی هاوڕێ عەزیز محەمەد کە لەئامادە بوونی کۆبوونەوەکانی نێوان هەردوولادا بەردەوام نەبوو چونکە تائەمڕۆ نەبۆتە چاری ناکۆکییەکان، جاوێڕای باشبوونی پەیوەندیو نزیکبوونەوەی هەڵوێستەکان لەمەسەلەی مافەکانی گەلی کوردستانمانداو، ئەم کێشەیە ئەنجامێکی هزریو

دەروونــی خراپــی هــەبوو بۆجــەماوەری گەلەکــەمان بــۆ بزافــی رزگــاریخوازیی نیـشتیمانی کوردسـتان، ئـەمڕۆش ئێمـە زۆر پێویـستمانە ریزەکانمـان یەکخـەین و هێزەکانمـان لەبەرەیـەکی کوردسـتانیدا کۆبکەینـەوە بـەپێی بەرنامەیـەکی تـازە بۆپــەیڕەوکردن و پەرەپێــدانی فیــدراڵی و، ئەنجامــدانی چاکــسازی دیموکراســی و ئابووری و بەپێوەبەرێتی و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان...تاد.

ئەرکەکانی قۆناغی گواستنەوەو چەسپاندنی فیدراڵی لەدەستووری هەمیشەییدا پێویـستی بەیەکخـستنی کۆشـشەکانە بۆتێپـەڕکردنی گیروگرفتـەکان و زاڵبـوون بەسەریاندا ئەمەش بەبەرزکردنەوەی هەستکردن بەبەرپرسێتی مێـژوویی، لەئاسـت بزووتنەوەکەمان بەدەستبەرداربوونی حزبایـەتی تەسـك کـە بۆبزافی کوردسـتان و بنیاتنانی عێراقێکی نوێ تەنیا دەبێتە ئەنجامی سەلبی.

حزبی ئێمە لەبەرامبەر ئـەم کێشەیەدا هەڵوێستێکی سـەلبی گرتەبـەر و لـەدژی وەستایەوەو وایدانا کـە لـەکاتی خۆیدا نییـەو حـزب ڕانەکێشرایە لای لایـەنێك و تائەمڕۆش هەڵوێستی خۆی پاراستووەو بانگەشەی بۆچاری ناکۆکییەکان بەڕێگای ئاشتی و چوونە وتووێـژی ڕاسـتەوخۆوە کـردووەو داوایکـرد چـاری ناکۆکییـەکان بەڕێگای ئاشـتی بکرێـت و دیالۆگی ڕاسـتەوخۆی نێـوان لایەنـە بەشـەڕهاتووەکان چاربکرێت و ئەمڕۆ هەریەو ڕێبـازەدا دەڕوات لەگـەڵ لەبەرچـاوگرتنی هەلومـەرج و ئاڵوگۆڕەتازەکـان و بەرژەوەنـدیی بزافــی رزگــاریخوازیی نیـشتمانی کوردسـتانی و دیموکراسی و یەکێتی هێزەکان، چونکە لەسەر حزبمان بوو دەوری خـۆی بگێرێـت بۆکۆکردنــەوەی هێــزە سیاســییەکان و چــاری ناکۆکییــەکان بــەڕێگای دیــالۆگی دیموکراسی ڕاستەوخۆ لەهەیئەتەکانی بەرەی کوردستانیدا، یان بەڕێگای دووقۆڵی و، هەوڵدان بۆئەوەی گشتیی بخرێتە پـێش تایبەتییـەوە وەك ڕێبـازێکی سیاسـیی جێگیر.

***هاوڕێیانی خۆشەویست..!***

***دەمەوێ لەبواری کارو چالاکی حزبدا هەندێ مەسەلەی بنەڕەتی لەژیانی حزبدا ڕوون بکەمەوە، هەرچەندە لەراپۆرتی ڕێکوپێکیدا بەشێوەیەکی فراوان باسکراوەو ئەمانەن:***

1. ***هێزی حزب لەوەدایە بتوانێت لەگشت بوارەکانی کاروچالاکی سیاسی و هزری و ڕێکخستندا سیاسەتێکی ڕاستو دروست نەخشە بکێشێتو، ئەولایەنە ڕێکخراوەییە بێت بتوانێ ببیگەیەنێتە کۆمەڵانی خەڵکی فراوانتر بۆپەسەند کردنی وبەرگری لێکردنی و بەوسیاسەتەی خۆی دابنێ کەبەرژەوەندییەکانی دەردەبڕێ تاببێتە هێزێکی مادی.***
2. ***هەروا هێزی حزب لەوەدا پەیوەندیی فراوانو بەهێزی لەگەڵ ناوەندە جۆربەجۆرەکانی جەماوەردا هەبێت و لەدەوری کۆببنەوەو بەرگریی لێبکەن، ئەمەش پێویست بەسیاسەتێکی ڕاستودروستی ڕێکخستن دەکات بۆگەیشتنە جەماوەرو بەرگریکردن لەبەرژەوەندەکانی بژێویو خزمەتگوزارییانو، ڕاکێشانی جەماوەر بۆکارکردن و خەباتی بەردەوام بۆهێنانەدیی ئەو بەرژەوەندانەو بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشمەندیی سیاسیو چینایەتی تا هەست بەبایەخی ژیانی ڕێکخستنو، سیاسیو، نەقابیو، پیشەییو، دیموکراسی بکات...تاد. هەر لەڕێگەی خەباتی بەکۆمەڵی ڕێکوپێکەوە مافو داخوازییەکانی جەماوەری فراوان دێنەدی. لەبەر ئەمەیە پێویستە ڕێکخستنی حزبی بەهێز بکرێت، کادری لێهاتوو شارەزا پەروەردە بکرێن و نێوەندیی دیموکراسی و ڕێکخراوە جەماوەرییەکان بەهێزبکرێن.***
3. ***لەسەر حزب پێویستە چاو بخشێنێتەوە بەشێوازەکانی ڕێکخستنیو ڕێکخراوە جەماوەرییەکانداو، خۆی لەکەسانی تەمەڵ و تەوەزەل و چەنەباز ڕزگاربکات ولەمەش مەبەستم ئەوەیە لەریزەکانی حزبدا جێگای ئەو کەسانە نەبێتەوە. ئەمەش مانای وانییە پەیوەندییان لەگەڵ بپچڕدرێ بەڵکو دەبێ بکرێنە لایەنگرو ئۆستی حزب وەك***

جەماوەرە فراوانەکە، چونکە ڕیزەکانی حزب جێگەی ئەوانەی نییە کە ئەرکە حزبییەکانی ناوپەیڕەوی ناوخۆی حزب جێبەجێ ناکەن.

٤. بەرنامەڕێژیی کارکردنی تەواوی هەیئەتەکانی حزب، هەرلەشانەوە تا کۆمیتەی ناوەندی و پێداچوونەوەی جیدی بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بەرنامانە.

٥. پێکەوە گونجاندنی گشت هەیئەتە حزبییەکان لەکاروباری جێبەجێکردنداو لە وتوویژو مشتومڕدا کە لەناو کۆبوونەوەکانداو لەکەشوهەوایەکی هاوڕێیانەدا ئەنجام دەدرێن بۆگەیشتنە بڕیاری پێگەیشتوو، بەدوور لەکێشەی کەسێتی.

هاوڕێیانی خۆشەویست.!

بۆ ئەوەی هەموو یەکگرین و خواستمان یەکخەین بۆئەوەی حزب بکەینە حزبێکی جەماوەری کاریگەر تابتوانێ ڕۆڵی مێژوویی خۆی لەبزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی و دیموکراسی گەلی کوردستانماندا بگێڕێتو پەیوەندیی مەوزوعی نێوان خۆیو بزاڤی نیشتمانیو دیموکراسی عێراق پتەوبکات وێڕای بەهێزکردنی گیانی هاوکاریی نێونەتەوەییو تێکۆشانی هاوبەشی کوردو عەرەبو نەتەوەکانی تورکمانو کلدانو ئاشوریو نێوان هەموو تایەفەکان و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی عێراقی.

هەروا دەمەوێ باری سەرنجتان بەلای مەسەلەیەکی گرنگدا وەربگێرم ئەویش ئەمەیە کەنابێ هەستوسۆزی نەتەوایەتیو کاردانەوە پاڵمان پێوە بنێن بۆپەسەند کردنی هزی کاڵوکرچو پێنەگەیشتوو کەزیان بەحزبو بزاڤی ڕزگاریخوازیی گەلەکەمان دەگەیەنن. دەبێ بایەخی گەورەی پتەوکردنی پەیوەندیی مەبدەئی و یەکێتی کارومزری نێوان هەردوو حزبی شیوعی عێراق (حزبی دایک)و حزبی شیوعی کوردستانمان بەچاکی تێبگەین. هەموو پێکەوە لەکاردابین بۆچەسپاندنی دیموکراسیو هێنانەدی فیدرالیزم و پەرەپێدانی و، پێبەپێی ئەم پەرەسەندنەش دەکرێ پەیوەندییەکە پەرەبسێنێو بگاتە ئاستێك کەلەگەڵ ئەم پەرەسەندنەدا

بگونجێت بۆبەرژەوەنـدیی هـەردوو حـزبو هـەردوو گـەل، بەتایبـەتی پتـەویی پەیوەندی نێوان هەردوو حزب مێژوتوانایە بۆ هەردووکیان. دەبێ ئێمە وەکو یەك حزب لەکارداببن بۆبنیاتنانەوەی عێراقی نوێ.

حزبی شیوعی عێراق تاقە حزبێکـی عێراقییە کە بەنـەگۆڕی لایەنگیری مـافی چارەنووسی گەلی کوردستانمان دەکات. ئەم حزبە دەورێکـی پێشڕەوانەی بـووە لەمەسەلەی فیدراڵیزمـدا لەکاتێکدا کەلەئەنجومـەنی حـوکم دا مشتومڕی لەسـەر دەکـراو نوێنـەرانی بزاڤـی کوردسـتانیش لەئەنجومەنـدا شـایەتی ئەمـەن، دەبـا هەڵوێستو دەسەڵاتی سیاسی ئەم حزبە بەمێزبکەین چونکە مێزێکە بۆحۆمـان و، بالەناو بزاڤەکەماندا بەربەرەکانی نەتەوایـەتی تەنگەبـەر بکـەین، ئەمانـە هـەمووی زەمینەیەکی پتـەو دەخـولقێنن بۆ کاروتێکۆشـانی حزبـی شـیوعی عێـراق لـەدژی شـۆڤێنیزمی عـەرەبی و بۆبـەرگری لـە مـافی گـەلی کوردسـتانمان لـەبڕیاردانی چارەنووسـیدا، بەدامەزرانـدنی دەوڵـەتی نیـشتمانی سـەربەخۆو یـەکێتی نەتەوەییشەوە.

ئێمە ڕووبەڕووی ئەرکی سیاسی مەزنو گرنگ دەبینەوە کە وامـان لێـدەخوازن بەرپرسییەکانمان هەست پێبکەین کە کۆششمان تـەرخان بکـەین بۆبـەهێزکردنی شوێنو پایەی حزبو دەورگێڕانی لەبەشداریدا بۆهێنانەدی ئەم ئەرکانـە بەرێگـەی بەهێزکردنی پەیوەندیمان و کاری هاوبەشمان لەگەڵ هەموو حزبە نیشتمانپەروەرو دیموکراتخوازەکانی کوردستانو عێراقـدا. هـەروا دەبـێ پەیوەندییـەکانمان لەگـەڵ حزبە شیوعییە براکانو حزبە کرێکارییـەکانو بزاڤـی ڕزگـاریخوازییو دیموکراسـی جیهاندا فراوانو بەهێز بکەین، ئەمەش بەرێگەی ناردنی وەفدی هاوبەشـی هـەردوو حزب و یان بەپەیوەندییە تایبەتییەکانی خۆمان.

هاورێیانی خۆشەویست.!

لـەکۆتایی گوتارەکەمـدا تکـام وایـە کۆنگرەکـەمان لەکارەکانیـدا سـەرکەوێ و بەهەڵبژاردنی کۆمیتەیەکی ناوەندیی نوێ کۆتایی بێت لەکەسانی گەنج و ڕۆشنبیرو لێهـاتوو دامێنـەر، لەوانـەی شـارەزایی و ئاسـتی هـزری و سیاسـی و ڕێکخـستنی

باشیان هەیە بۆئەوەی حزب بەرەو پێشەوە ببرێت و بکرێتە حزبێکی جەماوەری بەتایبەتی کە ئێمە لەسەردەمێکی نوێدا دەژین و کاروباری تێکۆشەرانەی سەرکردایەتی کردن پێویستی بەتوانای گەنج و پڕ لە زیندوویەتیو دینامیکیو داهێنانو تێگەیشتنی هەموو شتێکی نوێی ئەم سەردەمەمانن.

سەرکەوتن بۆسێیەمین کۆنگرەی حزبەکەمان، حزبی شیوعی کوردستان.

باپتەوبێ پەیوەندیی مەبدەئییانەی نێوان حزبی شیوعی عێراق و حزبی شیوعی کوردستان.

سەرکەوتن بۆ بیروباوەڕی مارکسیزم–لینینیزم.

باسەرکەوێ خواستی گەلی عێراق بەهەموو نەتەوەکانییەوە بۆپێکهێنانی دەوڵەتێکی دیموکراسی هەمولایەنەی فیدراڵی لەعێراقدا.

# سەرچاوەکان

١. دانراوەکانی یوسف سەلمان یوسف (فەهد).
٢. سەمینە ناجی یوسف (ڕەوتی تێکۆشەرێك)
٣. زەکی خەیری (هەوڵدان بۆ نووسینی مێژووی حزبی شیوعی عێراق).
٤. عەزیز سیباهی (دەیان ساڵ لەمێژووی حزبی شیوعی عێراق) و (حزبی شیوعی عێراق و مەسەلەی کشتوکاڵ لەعێراقدا).
٥. حەنا بەتاتۆ (عێراق) سێ بەش.
٦. عەبدولرەزاق ئەلحسەنی (مێژووی وەزارەتەکانی عێراق)
٧. مەسعود بارزانی(بارزانی و بزاڤی رزگاریخوازیی کورد)
٨. فایەق بەتی (وژدان).
٩. سالح حەیدەری (یاداشتەکان).
١٠.سالح دوگلە (لەبیرەوەریدا)
١١.جەلال تالەبانی(کوردو کوردستان)
١٢.عەبدوڕەحمان قاسملۆ (کوردستان)

# پێڕست



بیروباوەڕی نیشتمانپەروەری و رزگاریخوازی بەتەوژمێکی پەرەسەندو لەناوماندا بڵاوبووبۆوەو، خەباتی شیوعییەکان لەپێشەنگی بزووتنەوەی نیشتمانیدا بوو بێ ئەوەی لایەنێک پێشبڕکێی لەگەڵدا بکاتو، ئێمەی ناو (حزبی شیوعی) هەردەم ئامادەی هەموو شتێک بووین جگە لە سەرشۆڕکردن بۆ کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزم. گیانی پێشکەوتوانەی شیوعییە پێشەنگەکانی عێراق و قوربانییەکانیان و خۆنەویستییان بوو ئێمەی زیاتر سوورکرد بۆ چوونە کۆڕی شێوازەکانی خەباتەوە، هەرئەوەش بوو بۆ تاهەتایە حزبی شیوعی بەگیانی خۆبەختکاری و شەهیدبوونێکی ئەووتۆ ڕەنگ کرد کەلەگشت گۆشەیەکی جیهانی ئەمڕۆماندا نمونەی کەم بووە، تائێستاش وتەکانی فەهدی دامەزرێنەری حزب لەگوێی من و گشت شیوعییە عێراقییەکان و لەپێش ئەوانیشدا لەگوێی دوژمنانی شیوعییەتدا دەزرنگێنەوە کە لەکاتێکدا بەرەو پەتی سێدارە هەنگاوی دەنا هاواری کرد: شیوعییەت لەمردن بەهێزترو لەسێدارە بڵندترە.

ڕەوتی تێکۆشان بەردەوامە بەو ڕێگەیەدا کەئەوان لەپێناوی نیشتمان و گەلەکەیان دا قوربانیان دا